لەسەر ئەرکی کۆسرەت رەسول عەلی
جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان چاپکراوە

# ئینسکلۆپیدیای هەولێر
# (ئەربیل)

چاپی یەکەم ٢٠٠٩







# ئامێرە مۆسیقییەکانی هەولێر

وریا ئەحمەد

زانای گەورەی کورد مەسعود محەمەد دەنووسێت:[1] لە کتێبخانەی جەلیزادان کتێبێکی دەسنووس هەیە بە ناوی (الاذکار للامام النواوي) بە خامەیێکی ڕەنگین وهونەرکار نووسراوەتەوە، لە کۆتایی کتێبەکە مێژووی نووسینەوەی هەیە و ساڵی (٧٧٦)ی کۆچی بەرامبەر (١٣٧٤)ی زایین، واتە پێش نزیکەی (٦٣٣) ساڵ نووسراوەتەوە. خۆشبەختانە ناوی خۆی و نشیمەنی بە ڕەوانی دەنووسێ (خضر بن عمر الکوردي الکویسنجقلي موطنا)[*] کە ئەمە خۆی بەڵگەیە لە لایەنی مێژوویی ڕووتیشەوە ئەوەمان تێ دەگەیەنێت، کە ناوی (کۆی سنجاق) لە حوکمی عوسمانی کۆنترە! جا لەو ساڵانەی دوایی لە پاشکۆیەکی ڕۆژنامەی (الثورة)ی بەغدادا، گوتارێکی دکتۆر (مستەفا جەواد)م خوێندەوە (بەر لەمەرگی بە چەند مانگێک) لەسەر مەقامی عێراقی، لە ئاخەلێوەی ئەو گوتارەدا باسی دووکەس دەکات کە لە ڕێگای ئەوانەوە (زاراوەی فارسی-ناوی مەقامەکان) بەرەو ڕۆژئاوای وڵاتی عەرەب بڵاو بووەوە، بەنیسبەت دووەمەوە دەڵێت (الجمال المشرقي خضر بن عمر الکوردي) بێگومان ئەم مۆسیقارە هەمان خۆشنووسەکەی کتێبی (نواوي)یە، بەر لە (٦٣٢) ساڵ یەک لە دوو مۆسیقاری هەرە گەورەی ئیسلام، هونەرمەندو ڕۆشنبیرێکی کۆیی بووە! بەر لەوەی گوتارەکەی (دکتۆر مستەفا جەواد) ببینم ئەوەم هەبوو لەو (٢٠٠) ساڵەی چەرخی نۆزدەم و هەژدەمدا، کۆیێ شارێکی ئاهەنگ دۆست و مۆسیقاساز بووە، مەلای گەورە دەیفەرموو: لە کوردستانی ئێرانێ گۆرانی پەیدا دەبوو، لە سلێمانی تەوش و تراش دەکرا، لە کۆیە چەرخ

دەدرا!

مام قادری حەمامچی لە کۆیە بۆی باسکردم و گوتی:[٢] باوکی (سەمەد)ی چاوەشیش واتە (مەمەند)، کە لە کۆیە لە سییەکاندا زورنای بە بن هەنگڵی لێداوە. مام قادر (مەبەستی لە ئامێری-قیرب)ە، کە زورناکە لە جیاتی دەم بە هەمانەیەک فووی تێدەکرێت و هەمبانەکەش بە قۆڵی موزیکژەن هەرجارە پڕ لەهەوا دەکرێتەوە، ئەم ئامێری (قیرب - زورنا هەمبان) وەک بیستوومە لە ئەسڵدا هی مییللەتی (سکۆتلاند)ەو لە زۆر وڵاتیش لە (جوق - تیپی موزیکی سوپا)دا بەکاردێت.

فەقێ ئەحمەدە کوڕەی مەولوودخوێن بۆی باسکردم و گوتی:[٣] ئەو زەمان دەرویشێکی دەفژەن دەهات خەڵکی دەورەیان لێدەدا، شمشاڵ هەر لە کۆنەوە هەبووە، لە زۆربەی گوندان شمشاڵژەن هەبوو، بلوولی شوانان هەبوو، سەردەمانێکیش ئەو (مەمەند بابی حەسەن چاوەشی) لچی برابوو، لە شەڕدا گوللەی پێکەوتبوو لچی نەمابوو، ئامێرێکی هەبوو (هەمبانە)کەی پڕ دەکرد لە هەوا، هەمبانەکە زیاد لە لوولەیەکی وەک سەرە زورنای پێوە گرێدرابوو، بە هۆی پڕکردنی ئەو هەمبانە لە هەوا، زۆر ئاوازی بەجۆشی پێ لێدەدا.

مامۆستا تایەر ئەحمەد حەوێزی



نووسیویەتی:[٤]

١) (جەلال ئەفەندی حەوێز ئاغای) ساڵی (١٩٣١)، کە بووە بە مامۆستا ئامێرەکانی (عود)و (کەمانجە)ی هەبووە و ژەنیونی.

(مەلا فەتحوڵلای مەلا عەباسیش) گرامەفونی هەبووە.

٢) (قادر ئاغای سلێمان ئاغای محەمەد ئاغا)ی ئامێری (قانوون)ی هەبووەو ژەندوویەتی مەقاماتی باشیشی زانیوە.

(عەلی غالب)، کە لە کۆیە بەڕێوەبەر ی گومرگ بووە، خەڵکی بەغدایێ بووەو (حەمید ئەفەندی) مەئموری بەریدیش ئامێرەکانی (قانون، کەمان، تەپڵ)ی هەبووە، تاقمێک بوون زۆر خۆش و تەواو



بوون، موزیکیان دەژەند.

مامۆستا تایەر دیسان دەنووسێت: بە پایزان و زستانان زۆر دەنگخۆشی لای (سەردەشت)و (سابلاغ) پەیدا دەبوون، بە شێوەی موکریانی گۆرانییان دەگوت، بە زۆری بەستەو بەندی شاییان دەگوتن، هەندێکیان هەتا سەرەتای بەهاریش لەکۆیە دەمانەوە، هەندێ لەوانە ئامێرەکانی (دووزەلە)و (تەپڵ)یشیان پێ بوو، پیشەیان هەر گوتن بوو.

مامم کەریمی حەمە مەلای بۆی گێڕامەوەو گوتی:[٥] قادرئاغا هەبوو لە کۆیە، ماڵی لە گەڕەکی (هەواوان) بوو دەنگی خۆش بوو، کاتێک لە عەسکەری گەڕایەوە ئامێرێکی (قانون) ی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، ئەو وەختە لە کۆیە جارێ کەس ئامێری قانونی هەر نەشدیتبوو! بیرمە ئەو قانونەی دەژەند، مەقامی چاکی پێ دەژەند، لە عەسکەری فێری بووبوو!

کاک جەلال جۆباری شاعیر بۆی گێڕامەوەو گوتی:[٦] بۆ مامۆستا (جەلال حەوێز)یش یادی بەخێر، شەوێکیان لە ماڵیان دانیشتبووین، میوانێکی عارەبی هەبوو، هەستا چوو(عود)ەکەی هێناو دەستی بە عودژەنین کردو چەند ئاوازێکی لێدا، ئاگام لێبوو میوانەکەی زۆرچاک گوێی لە عودژەنینی مامۆستا جەلال حەوێز گرتبوو، ئەو ئاوازانەش، کە

ئەو شەوە ژەندنی هەر ئاوازە باوەكانی ناوچەی كۆیە بوون.

(عەبدولواحێد حاجی ئاغا مستەفا)، كە لە عەسكەری ژەنینی ئامێرەكانی فوو، فێر ببوو، كاتی خۆی رۆڵێكی بەرچاو و دیاری هەبووە، لە فێركردنی منداڵ و مێرمنداڵی شاری سلێمانیدا.

مامۆستا كەریم شارەزاش بەم شێوەیە بۆمان دوا:[٧] ئامێرەكانی موزیكی وەک (دەهۆڵ و زورنا)، لەتەک ئامێرەكانی دیكەی موزیک، وەک (شمشاڵ، بلوێر)، بەتایبەتی (بلوێر)، كە زۆرتر بەدەست، شوان و گاوانەوە، دەبینرا، ئەمە وەک سەرەتایەكی زۆر كۆن، بەڵام دوای هاتنی ئینگلیزەكان، حكومەتی عیراق دامەزراو ماوەیەكیش بزووتنەوەی (شێخ مەحمودی نەمر)، كە لەو ماوەیەدا گەلێ ئامێری موزیک بۆ قوتابخانەی یەكەمی كۆیە رەوانەكرا، لەوانە ئامێرەكانی (كەرەنا، بوق، تەپڵ، تاس مەعرف (سەنج)بوون، قوتابیان خۆیان باندی موزیكیان پێكهێناو، تارادەیەک دەیانتوانی ئەو باندانەی موزیک، بەرێوە ببەن، هەر كاتێكیش كێشەیەكی ژەنینی یەكێک لەو ئامێرانەی موزیكیان تووش بوایە، بۆ لای مامۆستا (جەلال حەوێز) دەچوون، ئەو زۆرباش ئامێری (تەپڵ)ی دەژەندو لە ئامێرەكانی دیكەیش سەری دەردەكرد، شایانی



باسە مامۆستا جەلال حەوێز ساڵی (١٩٣٠) وەک مامۆستای سەرەتایی لە كۆیە لە قوتابخانەی یەكەمی كۆیەدا، بەمامۆستای سەرەتایی دامەزرابوو، وەک مامۆستا (باكووری)یش لە كتێبی (تەمەن)دا ئاماژەی بۆ كردووە (باكووری لە پۆلی یەكی سەرەتایی، لە قوتابخانەی دووەمی كۆیەدا، لە(عود) ژەنینی مامۆستا جەلال حەوێزەوە،حەزی چۆتە ئەو هونەرەوە!)

مامۆستا باكووریش دەنووسێت:[٨] ساڵی (١٩٣٥) لە قوتابخانەی (كۆیەی دووەم) لە پۆلی یەكەمی سەرەتاییدا قەیدكرام، لەو ساڵەو ساڵی دواتریش یەک مامۆستام دێتەوە بیر، كە مامۆستا (جەلال حەوێز) بوو، ئەم مامۆستا جەلالە، ئامێرێكی (عود)ی هەبوو، لە رۆژانێكی وانەی(سروود)مان هەبوایە، بە عوددوە دەهاتە لامان و سروودەكانی بە یارمەتی ئامێری عودەوە، بۆ دەگوتین و فێری دەكردین! كاتێكیش ساڵی (١٩٥٧) لەكۆیە، وەک مامۆستای زمانی (ئینگلیزی) دامەزرام، لە دوكانی (بابەكە قادر) جارێكی دی مامۆستا جەلالم دیتەوەو گوتی: ئەو عوددەم هەرماوە، بەڵام هەندێ كەم وكورتی هەیە، منیش عوودەكەم لێ وەرگرت و هەموو كەماسیم بۆ تەواوكرد و بۆم ناردەوە، جا لە منداڵییەوە ئەو عوودەی مامۆستا (جەلال حەوێز) شێوەكەی، دەنگەكەی، لەمێشكم و خەیاڵمدا





مایەوە! هەموو هەستم لە لای ئەوە بوو، حەزم دەکرد منیش ئامێری عودم هەبێت و گۆرانی بلێم.......)

مامۆستای مۆسیقازانی نەمری کورد ولیەم حەننا دەڵێ:[9] یەکەم هونەرمەند، کە لە سلێمانی بایەخی بە ئاوازو مۆسیقا دابێ، هونەرمەند عەبدولواحید مستەفا بووە، کە لە سەرەتادا ئەفسەر بووە لە تورکیا و کە گەڕاوەتەوە تیپێکی گۆرانی و مۆسیقای لە سلێمانی دامەزراندووە.

حەمە گەمحان ساڵی (١٩٥٦)یش (ڕیکۆردەر)ێکی کڕی و دەستی بە تۆمارکردنی بەرهەمی گۆرانیبێژانی وەک: (سێوە، مەلائەسعەد، تایەر تۆفیق) و ئی دی کرد، زۆربەی جار ئەو تۆمارکردنانە بە یارمەتی موزیکی موزیکژەن (باکووری)یەوە دەبوو.[10]

مامە غەوسە بۆی باسکردم و گوتی:[11] باوکم لە دەفژەنیدا نموونەی کەم بوو، مەگەر (سمایل سەرمابردوو)، چونکە ئەوەی دوایی لە دەفژەنی و لە (مەقام گوتن)یشدا زۆر بە توانا بوو. لێرە لە هەولێر ماڵی لە گەڕەکی (سێتاقان) بوو! هەرچەندە دەنگیشی خۆشنەبوو، بەڵام مەقامزان و دەفژەنێکی کەم هاوتابوو، یەک دوو ساڵ پێش ئێستا کۆچی کرد، کاتێ کۆچی کرد، تەمەنی حەفتا ساڵ یا زیاتر دەبوو، ئەو هونەرکارە بە ئەسڵ هی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لە تەکیەی (شێخ کاکە) لێرە لە هەولێر چەند جارێک دەفی بۆ لێداوم.

حاجی عەبۆی دەفژەن دەبێتە خوارزای (عەلی کۆر)، کە گۆیندەیەکی بە ناوبانگی کوردە، هەروەها گوتی: هەرجارێک سافی هیرانی باپیرم دەهاتە هەولێر، دەبوایە ئەو عەلی کۆرە لە خزمەتی بێ و گوتنی بۆ بڵێ! حاجی عەبۆ خەڵکی هەولێر بوو، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە لای باوکم وردە وردە





(قۆریات)و (غەزەل)و ئەوانەی گوتووە، حاجی عەبۆ نەک هەر گوتنەکان بگرە دەفژەنییەکەش هەر لە هیران فێربووە. باوکم دەیزانی حاجی عەبۆ دەنگخۆشە، جا کاتێک لە زەمانی (تورکان) جلی سەربازی لەبەردەکەن، لە ناو (سوورچی)یان تفەنگی لێ دەستێنن، ئەویش بەو هۆیەوە نەیوێرابوو، بۆ هەولێر بگەڕێتەوە و لای باوکم لە هیرانێ مابووەوە، دواتر هەر لەوێ ژنیان بۆ خواست و لە ئەنجامدا لە تەکیەی هیرانێ بوو بە مەقام و غەزەل خوێنێکی بێ وێنە، ئەو حاجی عەبۆیە سوودی زۆری لە خاڵم (شێخ نەجمەدین) وەرگرتووە، چونکە خاڵم لە (مەقامات)دا بەحر بووە! بۆ دەنگیشی کاتێک خاڵم لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا بوو، ئینجا من گوێم لە دەنگی بوو، خاڵم بەو تەمەنەش هەموو کەس خۆی لەبەر دەنگی



رانەدەگرت!

لە کتێبی ئامێرەکانی مۆسیقای کوردیدا نووسراوە:[12] لە هەولێریش (سدیق عەبدولقادر) ناسراو بە (مشکۆ) برای (خدری عەولای مەرجان) بووە، (مام قادر محەمەد) کە دەکاتە زڕبابی هونەرمەندی میللی ناودار (خدر مەرجان) و بابی مشکۆ، لە گەڵ زورناژەنان مام خدر مەرجان و بابی (سەعدی نادر) دەهۆڵی کوتاوە.

لە کتێبی ئامێرەکانی مۆسیقای کوردیدا نووسراوە:[13]

وەستا (غازی سەرخۆش شێخۆ دەباغچی) ساڵی (١٩٥٠) لە شاری هەولێر لە (قەلا) لەدایک بووە، ئەمڕۆ خەریکی کاری پێستە لە ئامێرەکانی (دەف)و (دەهۆڵ)و (زەرب)گرتنە، ئەم پیشەیەش لە باوکی خۆیەوە فێربووە. لەهەولێر هەر لە کۆنەوە ناودارترین دەفژەنان ئەمانە بوونە: (سەید ئیبراهیم سەید مەولود میرزا) و مامۆستاکەی (دەرویش رەمەزان سلێمان) و مام (ونس قەساب هەولێری) و (عەبولقادری کاک مستەفای کاک عەبدوللای هیرانی) و مامۆستاکەی، کە دەکاتە شاعیری ناودار (سافی هیرانی)، کە باوکی خۆی بووە، (سمایل سەرمابردوو)، کە (دەفژەن) و (مەقامزان)بووە، (حاجی عەبدوللای دەفژەن) و (مەلا عەبدوللا قوندیل) و (دێوانە خدر) و (دەرویش مستەفا) و (دەرویش عەبدوللاحوسێن محەمەد).

لە هەولێریش زەرب یا تەپڵ کوتان:[14] (موحسین بەکر عەلی)و گۆرانیبێژان (جەلال سەعید)و (عوسمان حوسێن)و (ساڵح سەرچناری)و ئەمڕۆش دەیان (زەرب)و (تەپڵ)ژەنی چاکمان هەن هەر بۆ نموونە (شوان قەرەداخی).

ناوی هەندێ لە (تەپڵی سەر سێپا) کوتە ناودارەکانی هەولێر:

بەکر عەلی: ناسراو بە(مام خێلە) لە هەولێر چاکترین تەپڵی سەرسێپای کوتاوە، ئەوە نەک هەر خۆی، بەڵکو براکەیشی (سەید محەمەد) ئەمڕۆ کوڕەکەی (موحسین بەکر)، کە من ڕۆژی





(١٩٨٧/٢/٦) لە هەولێر لەناو تەکیەی (شێخ فوئادی نەوەی شێخ شەریف) چاوم پێی کەوت و زانیم: کە ساڵی (١٩٣٤)لە ناو قەلای هەولێر لە دایک بووە، لەناو تەکیەکانی شاری هەولێردا، بۆ کۆڕی زیکرو خواپەرستی ئەم ئامێری تەپڵی سەرسێپایەی ژەندووە، جگە لەمە لە ئاهەنگی شادی و خۆشیشدا، بە ئامێری (تەپڵ - دمبک)یان وەک خۆیان دەڵێن (دومبەڵەکی شەربە) بەشداری کردووە، دیارە ژەنینی ئەم ئامێرانەیش وەک زووتر گوتمان لە باوکی خۆیەوە فێربووە. خەلیفە(باقی ئەیوب فەتاح):

ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی (١٩٨٧/٢/٢٦) لە ناو تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمایی چاوم پێی کەوت، ساڵی (١٩٥١)لە ناو قەلای هەولێر چاوی کردۆتەوە، ئەو کاتەی من چاوم پێی کەوت بۆم دەرکەوت: ئەو پیاوە ماوەی هەژدە ساڵە لە تەکیەکانی ناو شاری هەولێردا، خەریکی کوتانی ئامێرەکانی ڕەزمی وەک: تەپڵی



سەرسێپا و دەفی دەروێشییە، دەفژەنیش لە یادی بەختیار (سەید محەمەدی مام خێلە)، کە باشترین تەپڵی سەرسێپا ژەن بووە، فێربووە، جگە لەوانە هەر لە ناو شاری هەولێردا (خەلیل تۆفیق) لە ئامێری تەپڵی سەر سێپاژەنیدا، ناوداربووە، دیسان هەر لە هەولێر (دڵشاد عەبدولقادر شێخ شەریف) و (فەیسەل خدر) و گەلێکی دی موزیکژەنی ئەم ئامێری (تەپڵی سەرسێپا) یە هەن. لە رۆژهەڵاتی کوردستانیش لە شاری (سنە)، دەتوانین ئاماژە بە (دەروێش ئەمین) و (حاجی سەیفە) وەک دوو تەپڵ ژەنانی ئەم ئامێرەوە بکەین.

ئامێری کدوولە:[١٥] رۆژی (٦/١/٢٠٠٨) لە گەڵ لیژنەی (گەرانی مەیدانی) کە بە دوای گۆرانی فۆلکلۆریدا دەگەرێت و سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانە، بە مەبەستی گۆرانی کۆکردنەوە، بۆ شارۆچکەی (مەخموور) چووین، جا ئەو ئامێرەمان لای کاک (مەلا رەسول مەولود مامە شێخ) کە بە (مەلا رەسول بندیان) ناسراوە دیت و وێنەیان گرت، ئامێرەکە لە جۆری ئامێرەکانی (رەزم وکوتان)ە، لە (کدوولە-کوولەکە) یەکی بچووکی بە قەد پرتەقاڵێک پێکهاتووە، دەسکێکی داری بۆ دروستکراوە، پارچەیەک پێستێکی مامزیش بۆ جوانی لەو دەسکە ئاڵێنراوە، وردە بەرد و زیخ و ئەوانەی تێکراوە، بە وێنەی ئامێری (خەشخاش)ی بیانییە، بە لەرانەوەی دەسکەکەی (خشە خشی) لێوەدێت. کاک مەلا رەسول، کە داوامانکرد ئەو ئامێرەی پێ نەداین، دیارە بۆ ئەو وەک گوتی بۆنی باوک و باپیرانی لێدێت، بۆیە مافی خۆی بوو نەیدا، ئامێرەکە بۆ ساڵانێکی کۆن دەگەرێتەوە.

ئامێری شمشاڵی ئاسن:[١٦] لە هەولێر نەک دەژەنرێت، بەڵکو هەر لەکۆنەوە دروستیش دەکرێت، ئەوەتانێ حاجی ئەحمەد مستەفا ئەحمەد کە ساڵی (١٩١٤) لە هەولێر لە دایکبووە، کاتێک ساڵی (١٩٨٧) بۆ ئەم مەبەستە چاوم پێی کەوت گوتی: کون کون کردنی شمشاڵی ئاسن بە ئامرازی (درێل) بە منداڵی لە وەستای خۆم (وەهاب سەمەد) و (خەلیل چەخماخچی) فێربووم.

یەکێک لە شوانە شمشاڵژەنە ناودارەکانی ناوچەی هەولێر مام عەلی مستەفا کاموسەکی:[١٧] لە ناوچەی خۆشناوەتی بە ژەنینی ئامێری شمشاڵی ئاسن ناوی دەرکردووە، باب و باپیرانیشی، کە



بە ماڵی (مستەفا شوان) بەناوبانگن هەر شوان و شمشاڵژەن بوونە.

بۆ باڵەبانژەنانی دەڤەری هەولێریش:[18] باڵەبان ژەنی بلیمەتمان زۆرن، هەر بۆ نموونە و تەنیا لەم دەرفەتەدا: سەمەد مەمەند حەسەن، عەزیز عوسمان خەلەکانی و ئومێد باڵەبان و هەرێم سەلاح و محەمەد خدر و هی تریش.

بۆ زورناژەنانی ناوداریش لە ناوچەی هەولێر کۆچکردووان:[19] ئەحمەد گواری، خدر مەرجان، مام زەنوون، عوسمانۆکی کۆیە، خدری عەولای شێخەی، مام حەمەدەمینی مامی حەمەسوور زورناژەنی ناودار، سەیدە کۆرە و سەید کەریمی کوڕی.

بۆ ئامێرژەنانی (بلوول - بلوێر)[20] مام دێوانە شاکر ئاورەحمان حەمەدەمین: ساڵی (1911) لە گوندی (باش تەپە) هاتۆتە دنیاوە، ئەمڕۆ کۆچی کردووە، وەستای هەموو ئامێرە فوو ویستەکانی وەک: بلوێرشامی، زورنا، دووزەلە، تاک زەل، شمشاڵی ئاسن بوو، ژەنینی شمشاڵی ئاسن و دووزەلە لە (حوسێنە کۆری) خەڵکی گوندی (سۆریەش) و بلوێر و زورنایش لە زورناژەن (حەمەدەمین چاوەش)، کە لە نەوەی (خورشید مام دۆم) بوو، هەروەها سوودی لە (سەیدە کۆرەش) دیتووە. بۆ وەستای دروستکاری ئامێری (تەمیرە - تەمبوور) لە هەولێر: (21) لە هەولێریش چاوم بە وەستا (یونس شاکر مەجید - ونس خەتات) کەوت، کە ئەوکاتە ئامێری تەنبوور و عوود و هەتا ئامێری کەمانیشی، ڕەنگە ئامێری دیکەیشی، دەسکاری دەکرد و گەر ئەو ئامێرانە بشکابان، یان بتەقیبان، ئەو توانای چاککردنەوەیانی هەبوو، دواتر ئاگام لێ بوو، دەستی بە دروستکردنی ئامێری (تەنبوور- ساز)یش کرد، ئەمڕۆش (عەبدولقادر)ی کوڕی، لە هەولێر لەسەر هەمان ڕێچکەی باوکی دەڕوات، لە دروستکردن و کاری چاککردنەوە و جوانکاری ئامێرەکاندا گەلێ لێهاتووە.

لە قانوون ژەنەکانی هەولێر و دەوروبەریشی: (ئەنوەر تاهیر مام خدر)ە، کە بە (مەلا ئەنوەر) ناسرابوو، ئەو نەمرە لە دەرچووانی خولی دووەمی (پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی - بەغدا) بوو، کە ئەوکاتە لە هەموو عێراقدا هەر ئەو پەیمانگەیە هەبوو، ساڵی خوێندنی (1961 - 1962) لەو پەیمانگەیە دەرچووە و یەکەمجار لە شاری کەرکووک بە مامۆستای سروود و مۆزیک دامەزراوە، دواتر لە (تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە)دا، چ وەک ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر یا دەستەی بەڕێوەبەر یانیش قانوون ژەنی تیپ تا ڕۆژی کۆچەکەی لە کاری هونەریدا بەردەوام بووە. هەر لە شاری هەولێر قانوون ژەنان (مستەفا ڕەئووف) و (جەلال عەزیز زەینەل) هەن.

سەرچاوەکان:


1) مەسعود محەمەد. کتێبی (حاجی قادری کۆیی) بەشی یەکەم.
2) گۆڤاری ڕامان ژمارە (113) لاپەڕە (188- 189).
3) گۆڤاری ڕامان ژمارە (114) لاپەڕە (167- 170).
4) گۆڤاری ڕامان ژمارە (115) لاپەڕە (184- 190).
5) گۆڤاری ڕامان ژمارە (116) لاپەڕە (189- 191).
6) گۆڤاری ڕامان ژمارە (117) لاپەڕە (172- 179).
7) گۆڤاری ڕامان ژمارە (120) لاپەڕە (173- 179).
8) گۆڤاری ڕامان ژمارە (123 ) لاپەڕە (161-165 ).
9) گۆڤاری ڕامان ژمارە (128) لاپەڕە (150).
10) گۆڤاری ڕامان ژمارە (131) لاپەڕە (144- 145).
11)گۆڤاری ڕامان ژمارە (133) لاپەڕە (137-141 ).
12) وریا ئەحمەد. کتێبی (ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی) هەولێر ساڵی (1989) چاپخانەی ئەمینداریتی ڕۆشنبیری و لاوان. لاپەڕە (32 ).
13) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (34).
14) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (46).
15) گۆڤ-اری (چلاواز)ی ژمارە (23-24)ی ساڵی (2008). ڕووی ناوەوەی بەرگی دواوەی گۆڤ-ارەکە.
16) وریا ئەحمەد. کتێبی (ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی) هەولێر ساڵی (1989) چاپخانەی ئەمینداریتی ڕۆشنبیری ولاوان. لاپەڕە (111).
17) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (114).
18) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (80-82).
19) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (102-104).
20) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (126-127).
21) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (136-137)



# ئامێرە مۆسیقا کۆنەکانی دەشتی هەولێر

هۆشیار عەبدوڵلا

لە دێر زەمانەوە لەو دەڤەرەدا ئەو جۆرە ئامێرانە هەبوون و هەن، لە ئاهەنگی بووک گواستنەوە و بۆنەکاندا بەکارهاتوون و بەکاردێن، لەوانە (دەهۆڵ و زورنا)، (شمشار-شمشاڵ)، (دووزەلە)، (بلوور-بلوێر)، (دەف)، (نایە-نای)... (دەهۆڵ و زورنا) یەکێکە لەو ئامێرە موسیقایە کۆنانەی ئەو دەڤەرە و کوردستان. (دەهۆڵ و زورنا) لەو دەڤەرەدا (دۆر و زورنا)ی پێدەڵێن، هەر لە کۆنەوە لەکاتی بووک گواستنەوە و ئاهەنگەکاندا بەکارهاتووە، کاتێک کە یەکێک لە گوندەکانی دەڤەرەکەدا ژنی بێنایە، ئەوە دەبووا بە دەهۆڵ و زورنای بهێنایە. ئەگەر کابرا هەبوونبوایە، واتە دەوڵەمەند بووایە، ئەوە بۆ ماوەی (٧) حەوت شەو و (٧) رۆژان شایی و هەڵپەرکێی دەگێرا، خۆ ئەگەر کابراش دەست کورت بایە، ئەوە هەر یەک دوو رۆژ شایی دەگێرا، واتە هەرکەس بە پێی توانای خۆی، (دەهۆڵ / دۆر)یش لە زۆربەی گوندەکانی دەڤەرەکەدا لە کاتی (پاشیو و بەربانگ)دا لە مانگی رەمەزاناندا بەکاریان هێناوە، یەکێکی دیکە لە ئامێرە کۆنەکانی ئەو دەڤەرە (دووزەلە)یە، هەندێ جار (پیک و دووزەلە) شی پێدەڵێن، وشەی (زەل) بە مانای (قامیش-قەمیش) دێت، (دووزەلە) واتا (٢) دوو قامیش، ئەم ئامێرەش لە (٢) دوو زەل پێکهاتووە و لە تەنیشت یەک لێکی دەبەستن، کە پێی دەگوترێ (جۆتە) بۆیە ئەو کەسەی لەو دەڤەرەدا دووزەلە باش لێبدا دەڵێن: فلانە کەس جۆتەی باش لێدەدا، ئەمەش وەستای کارامەی خۆی هەیە، هەموو کەسێک نایزانێ دروستی بکات، چەند کونێکی تێدەکا بەهۆی شیشێک یان تەلێک کە لەسەر ئاگر سۆری دەکەنەوە قامیشەکەی پێ کون دەکەن، گەلێک جاران بۆ لەیەکبەستنی هەردوو (زەل)ەکە قیریان بەکاردێنا، جاری

واش هەبووە لە ئێسکی باڵ یان لولاکی ئێسکی (خەرتەل)ی، کە باڵندەیەکی گەورەیە و هەندی عەلیشیشێک دەبێت، دووزەلەیان لێ دروستکردووە، ئەو جۆرە باڵندەیەش جاران لەو دەڤەرەدا زۆربووە، بە تایبەتی لە چیای (دێدەوان)دا، ئەم جۆرە ئامێرە فۆلکلۆرییەش لە زۆربەی هەرە زۆری ناوچە و دەڤەرەکانی کوردستانی گەورەدا باوە و لە شایی و گۆڤەند و ئاهەنگەکاندا بەکاردێت، وەکو دەڤەری (هەکاری) بەتایبەتی لە (دەشتی گەوڕ) یدا، (گەڤەر)، ناوچەی موکریان، گەرمیان، لەناو کوردەکانی خوراسان لە باکوری رۆژهەڵاتی ئێران، بەتایبەتی لە ناوچەکانی (قوچان) و (شیروان) و (دەرەگەز) بەکاردێت، لەوێ پێیدەڵێن (پیق و دووزەلە)، تەنانەت ئەو ئامێرە لەناو عارەبانیش بەکاردێت. (دەف) یان (دەفە)، ئەم ئامێرە لەو دەڤەرەدا تایبەت بوو بە تەکییەکان، بەتایبەتی رێبازی قادری لە کاتی زیکر و مەولودخوێندنەوەدا بەکارهاتووە و بەکاردێت، (نایە-نای) ئەم ئامێرەش لەگەڵ حەیران گوتندا زۆر بەکارهاتووە، (شمشاڵ-شمشار) یەکێکە لە ئامێرە رەسەنە هەرە کۆنەکانی دەڤەرەکە و کوردستان، لە مادەیەکی فافۆن یا ئاسن دروست دەکرێت، نەزم و ئاوازێکی زۆر خۆشی هەیە، لە شمشاڵ ژەنە بەناوبانگەکانی ئەو دەڤەرە (عەبدوڵلا) ناوێک بووە، کە بە (عەولا جریە) ناسرا بوو، بە گوێرەی قسەی ئەو کەسانەی، کە دیویانە و گوێیان لە ئاواز و دەنگی شمشاڵەکەی بووە و ئەوەی باسی لێوە دەکەن، چی لە (قالە مەڕەی موکریان) کەمتر نەبووە، هەردەم شمشاڵەکەی لەبەر پشدێنی بووە، هەرکاتێ ئارەزووی کردبێ شمشاڵەکەی لەبەر پژدێنی دەرێناوە و لێیداوە (بلوور) یان (بلوێر) لە باکووری کوردستان و دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ (بلوور)ی پێدەڵێن، لەناو کوردەکانی تورکمانستان (بلیر) ی پێدەڵێن، ئەمەش لەو دەڤەرەدا هەر لە قامیشی گەورە و ئەستوور دروست دەکرێ، بەلام لە دەڤەری سەرحەدی باکووری کوردستاندا لە داری گوێز دروست دەکرێت، ئەمەش بە زۆری لە دوادوا و کۆتایی هاتنی شایی و هەڵپەرکێ بەکاردێت، لە بلوورڤانەکانی ئەو دەڤەرە خوالێخۆشبوو (مام دێوانە شاکر)ی (باوکی ئەبو زێد) بوو، لە زورنا ژەنەکانی دەشتی هەولێر لەوانە خوالێخۆشبوو حەمەد مەندۆ (١٩٠٠-١٩٥٩) بوو، لە ساڵی ١٩٠٠ لە گوندی (حەسارۆک) لە دایک بووە، ئەو پیاوە زورنا ژەنێکی بلیمەت و کارامە بووە، لاوکیشی دەچڕی، دەگێڕنەوە دەڵێن توانیویەتی زورنا بە کەپووی لێبدا، سەید کەریم ناسراوە بە (سەیدە کوێرە) خەڵکی ناوچەی بەڕانەتی بووە (سەیدە کوێرە)ی باوکی سەید کەریم بە رەسەن خەڵکی گوندی (دارەبەن)ی ناوچەی بەڕانەتی باکووری شاری هەولێرە، حەیرانبێژ و زورنا و شمشاڵ و بلووری باش لێداوە، هەر تەنیا (سەید کەریم)ی هەبووە لە شاری هەولێر و دەوروبەری بەناوبانگ و ناسراو بوو. حەمە سوور (حەمە سوور) ئەو پیاوە ئەو هەموو ئامێرە فووکراوانەی وەکو زورنا، شمشاڵ، نای، بلوور، دووزەلە، بە باشی لێدەدا. هەرچەندە زورنای لێدەدا و چاوەش بوو، بەلام هەتا بڵێی پیاوێکی مەند و لەسەرەخۆ و بە ئەدەب و پیاوانە بوو، لە ساڵانی حەفتاکان لە گەڕەکی سەیداوەی هەولێرماڵیان نزیک ماڵمان بوو، لە ساڵانی نەوەدەکاندا وابزانم ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە، مام حەمە سوور زاوای (سەعدی نادر چاوەشی) بوو، مام سەعدی کاتی خۆی دەهۆڵیشی لێدەدا، هەنووکەش لە ژیاندایە و لە شاری هەولێر نیشتەجێیە، مام دێوانە شاکر باوکی ئەبو زێد، تەمبورڤان هەمیشە دەمدیت بلوێرێکی لەبەر پشدێنەکەی رادەکرد، لە کۆتایی و دوادوا هاتنی شایی و هەڵپەرکێدا دەستی بۆ بلوورەکەی بەر پشدێنی درێژ دەکرد و بلوورەکەی دەردێنا و بۆ ماوەیەکی کەم بلووری لێدەدا یان گەلەک جاران لە چایخانان، بەتایبەتی لە چایخانەی حاجی مستیل و (قاوەخانەی عەبۆ) ی بلوورەکەی دەردێنا و بۆ ماوەیەک لێیدەدا. مام برایم چاوەش و خدر مەرجان، باوکی هونەرمەند یەحیا مەرجان لە زورنا ژەنەکانی ئەو دەڤەرەن، جاران ئەوەی زورنای لێبدایە پێیان دەگوت (چاوەش) لەلای خەڵکی زۆر خۆشەویست نەبوو، بە چاوێکی نزم تەماشا دەکرا، دەیانگوت فلان کەس چاوەشە! لەم بارەیەوە چەند ئیدیۆمێک لە دەشتی هەولێر سەری هەڵداوە، بۆ نموونە دەیانگوت: دەڵێی چاوشە، یا بوویتە چاوەش، یان خۆ چاوەش نی!.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (٢٨)ی ساڵی (٢٠٠٧) بلاوبۆتەوە.

# بلوێر و زوڕنا ژەنەکانی پیرە هەولێری

لاڤە محەمەد





ئەگەر کەمێک بۆ رابردووی میللەتەکەمان بگەڕێینەوە و لاپەڕە گەش و پڕشنگدارەکانی هەڵبدەینەوە دەبینین زۆر یادگاری بە تام و چێژی گرتۆتە خۆی، کە هەمیشە بەنەمری ماودتەوە، یەکێک لەوانەش سازکردنی بەزم و شایی و هەڵپەڕکێی کوردەوارییە، کە بەهۆی دەهۆڵ و زوڕناوە جۆش و خرۆش دراوە و گەورەترین شایی رەشبەڵەکی لێ هاتۆتە بەرهەم. بێگومان دەهۆڵ و زوڕناش وەک دوو ئامێری فۆلکلۆری لەمێژینەی ئەوسا و ئێستاش توانیویەتی رەسەنایەتی خۆی بپارێزێ و هەمیشە لە بەردڵان بێت، هەر بەو بۆنەش دەمانەوێ رۆشنایییەکی تەواو بخەینە سەر ئەو زوڕناژدنانەی، کە ساڵانێکی زۆر بەو کارەود خەریکن و تا بەئەمرۆ دەگات چەندین ئاهەنگ و هەڵپەڕکێی حەوت شەو و حەوت رۆژدیان بەڕێود بردوود.

## زوڕنا ژەنە دیارو بەناوبانگەکان

لەدەشتی کاکی بەکاکی ئەو پیرە هەولێرەدا، گەلێک زوڕناژەنی دیارو بەناوبانگ هەڵکەوتوون، کە بەشانازییەکی زۆرەوە هەموو تەمەنی خۆیان لەگەڵ زوڕناژەنی بەسەر بردووە، هەرودک زوڕناژەنان، سەید کەریمی گوندی گردئارەق و خدر مەرجان و سەمەد مەمەد حەسەنی، ناسراو بە (سەمەدە گۆج) و محەمەد خدر ساڵح و چەندانی دیکە، کە ئێستا زۆربەیان لەژیاندا نەماون و کۆچی دواییان کردووە، بەڵام لەدوای خۆیان ئەو فۆلکلۆرە جوان و رەسەنەیان وەک یادگارییەکی زیندوو بۆ ئێمە جێهێشتووە، کە هەمیشە شانازی پێوە دەکەین.

## مام کانەبی زوڕناژەن

ئەو زوڕناژەنەی، کە هەمیشە

لەبەر چاوانە و پتر لە ئاهەنگ و زەماوەندەکاندا ئامادەیی هەیە، مام کانەبی زورناژەنە، بۆیە ئەو بەرێزە، هەگبەی ئەرشیفی خۆیمان پێشکەش دەکات و بەسەلیقەوە باس و سەربوردەی خۆی لەگەڵ زورناژەنیدا دەگێڕێتەوە. مام کانەبی ئەحمەد عەبدولکەریم لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٧)ی گوندی (عەزە)ی سەر بەمەڵبەندارێتی قوشتەپەیەو لەتیردی کەلورە، وەک خۆی رۆشنایی دەخاتە سەر، هەر لەساڵی (١٩٧٤)وە فێری لێدانی ئامێرە هەواییەکانی وەک دووزەلەو بلوێرو زورنا بووە و لە ژیانی هونەریدا بلوێری بۆ حەیرانبێژان مستەفا خەزنەیی و حوسێن کێشکەیی و چەندان حەیرانبێژی دیکە لێداوە. چونکە سەرەتا کاتێ شوان بووە لەگوندی (داڵداغان) خووی بەبلوێر لێدان گرتبوو.

**شایی حەوت شەو و حەوت رۆژە**

مام کانەبی سەبارەت بەو پیشە فۆلکلۆرییە دەڵێ: ئەگەر بەراشکاوی باس لەپیشەی زورنا ژەنی بکەین وەک جاران نەماوە، ئێمە ئێستا کەم کەمە بۆ کۆڕی شایی و هەڵپەرکێ بانگهێشت دەکرێین، بەڵام جاران ئەو کارەی ئێمە هێندە بەرمێن بوو هەر وەبەر رانەدەگەیشتین، چونکە ئێمە چەندین جار شایی (٧) شەو و (٧) رۆژەمان گێڕاوە بێ ئەوەی هەست بەماندوویەتی و شەکەتی بکەین، جگە لەوەی چەوراتییەکی باشیشمان پێ دەبرا.

**شانازییەک بۆ سەید کەریمی زورناژەن**

جاران زورناژەنی زۆر باش و بەناوبانگ هەبوون، بەتایبەتی لە دەشتی هەولێر، ئێستا بەشانازییەوە باسیان لێوە دەکەین و یادگارییەکانیان بەتام و چێژەوە دەگێڕینەوە، بەڵام من لەدەشتی هەولێر (سەید کەریم) بە زورناژەنە هەرە باشەکان دادەنێم و تواناو سەلیقەیەکی لەڕادەبەدەری هەبوو بۆ ئەو پیشەیەو تەمەنێکی زۆربشی لەپێناودا بەسەربرد.

**دروستکردنی بلوێرو زورنا**

سەبارەت بەدروستکردنی زورنا و بلوێرو هەندێک لە ئامێرە هەواییەکانی دیکە، بەرێزیان گوتی: بلوێر لەکوردستانی خۆمان لەقامیش دروست دەکرێت و شوانەکانی بەر مەڕو ماڵات لەدەشتەکان و لەکاتی لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتدا فوویان تێکردووە و خۆشترین ئاوازی بەجۆش و خرۆشیان پێ چڕیوە، بەڵام زورنا لەشاری موسڵ دەکرێ و وەستای تایبەتی خۆی هەیە، چونکە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بلوێردا هەیە، لەوێدا نرخی دروستکردنی هەر زورنایەک (٣٠٠- ٤٠٠) دیناری چاپی سویسرییە، کەچی جاران باشترین جۆری زورنایان بە (٧٥- ١٠٠) دینار بۆ دروست دەکردین.

**بلوێرەکانی عومەر بەرزنجی**

ماوەیەک لەمەوبەر گەنجێکی سوورکەڵەی شاری بەغدا بەناوی (عومەر بەرزنجی) لەچوار دەوری پیرە قەڵاتەکەی هەولێر بلوێری لە قامیش دروست دەکردو بەخەڵکی شارەکەی دەفرۆشتەوە، جگە لەوەی بەدەم رێگاوەش خۆشترین ئاوازی بەو بلوێرانە دەچڕی، بەو کارەی خەڵکێکی زۆری لەدەوروەی خۆی کۆدەکردەوە و ناچاری دەکردن دانەیەکی لێ بکڕن، بەڵام دواتر ئەم بەرێزە لەبەر چاومان ون بوو، پاشان وام بەرگوێ کەوت، کە لەلایەن رژێمی ئەوسای بەعس تیرۆر کراوە، چونکە ئاوازی بەجۆش و خرۆشی پێشکەش بە خەڵکی شاری هەولێر دەکرد.

**ئەبوبەکری بلوێرفرۆش**

هەر لەهەمان شوێن مرۆڤێکی کورتە باڵای قەڵەوی چوارشانە بەناوی (ئەبوبەکر محەمەد ئەمین ئەحمەد مەخمووری) خەریکی فرۆشتنی سەرجەم ئامێرە هەواییەکانی وەک باڵەبان و بلوێرو شمشاڵ و نایی و فلووت و دووزەلەیە، بۆیە ئەویش لەبارەی ئەو ئامێرە فۆلکلۆرییە رەسەنانە گوتی: من هەر لە ساڵی (١٩٨٩)وە خەریکی دروستکردنی ئەو ئامێرانەم لە قامیش و کانزا و حەیزەران، من هەر لەمنداڵییەوە حەزم بەو ئامێرانە دەکردو ئێستا دەزانم هەموویان بژەنم، سەبارەت بەنرخەکانیش لەنێوان (٥) هەزار و (١٠) هەزار و (١٥) هەزار دینار دایە، ئەوانەی ئەو ئامێرە رەسانانەمان لێ دەکڕن زۆربەیان خەڵکی شارەکەی خۆمانن و ئەوانەن کە بەسەردان لە هەندەرانەوە دێنەوە کوردستان، ئیدی بەدیاری لەگەڵ خۆیاندا دەیبەنەوە، دواجار حەزدەکەم ئاماژە بەوەش بکەم، کە من بۆ نزیکبوونەوە لەو ئامێرانە زۆر سوودم لە بەرێز (عەزیز خەلەکانی) بینیوە.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١٣) ٢٠٠٥، بڵاوبۆتەوە.

# لە تەواشیحەوە تا ئەگلەنجە

**فوئاد عەلی ڕەشید خۆشناو**

شێوە و شێوازەکانی بنەڕەتی بەهاکان لە ڕووی لێکۆڵینەوە کە دێنە بەر باس، بە پێی ڕەگ داکوتانی چەندین ساڵەیان لە ڕووی کەلتوور و ئەنترۆپۆلۆژی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا دەبنە ناسنامەی کۆمەڵگا.

لەبەر تیشکی ئەو ڕاستییەدا کە بەهای (کەلتوور- مێژوو- ئەتنوگرافیا- بلیمەت - سۆفیایەتی) لە کەوڵ و ناو هێسک و پرووسکی مێژووی هەولێرێ ئەم بنچینانە هەردەم دەژێنەوە، سەردەم بە سەردەم و سات بە سات و پێ بە پێ خۆ داوێنە بەر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە.

بەهەمان شێوە ئەگەر سەرئەنجامی ترسناکی ئەم ڕووکارە بەرەواژ بکەینەوە، کە گرنگی بە ئەتنوگرافیا و فەلسەفەی تایبەتی سروشتی نەدا یا شووڕەی پاراستنی بۆ شوون چن نەکرێ، لێرە دەستووری زمان و مێژوو پەیڕەوی ناکات و دەرگا دەکەوێتە سەرپشت و نارەسەنایەتی و بە دیۆمەرەسەن دەم لە شەقارەکانی برینی ڕەسەنایەتی دەنێت و دەبێتە ماڵ کاولی ڕەسەن.

ئەمە ڕاستییەکی ئاشکرایە زۆربەی نەتەوەکان لەو باوەڕەدان چیلکە پووشێکی لە بنمیچی سواندەی بەرهەیوانی مێژووەوە بەربێتەوە قەومانێکە لە کەلتوور و کەلتووری نەتەوە دەقەومێ. یەکێک لەو سۆنگە و چیهرە پاک و تەمیزانەی، کە دێنەوە بەریاد و یادکردنەوەی داڕێژینەی ڕێژنەوەی بە تەخمیس کردن و خۆداوێتە بەرچاو و شعوران، "ئەبولبەرەکات ئەلموبارەک کوڕی ئەبولفەتح ئەحمەد کوڕی ئەلموبارەک کوڕی مەوهوبی لەخمیی"د. نازناوی "شەرەفودین"ە و بە "ئیبنولمستەوفی ئەربیلی" بەناوبانگە. پیاوێکی باش و خاوەن چاکە و گران و بێ فیز بوو. لە نیوەی مانگی شەوالی ساڵی (٥٦٤ک تەمووزی ١١٧٠ی ز) لە قەڵاتی هەولێرێ هاتۆتە جیهان، واتە پاش کۆچی دوایی زەینودین عەلی کوچک، کە دامەزرێنەری ئەتابەگییەکەی هەولێرێ و باوکی ئەلمەلیک ئەلموعەزەم موزەفەرەدین گۆگبۆری بووە، ئیبنولمستەوفی وەزارەتی هەولێرتی لە دەست بووە.

شارەزایی و ڕۆشنبیری ئیبنولمستەوفی واقیعی ئەو سەردەمەی هەولێر و ئیسلامی شێتگیر کردووە، واتە ئەو سەردەم دەزگای ڕۆشنبیری هەولێر هەموو شێوە و شێوازەکانی زانستێکی عەرەبی و ئیسلامی تێدا زەنە کردووە. چونکە ئەو شارە لەو سەردەمەدا ببوو بە کان و مۆئەسەساتێکی ڕژێنە تیشکی زانست، بەوەش گەواهیدارە، کە دەزگا و قوتابخانەی خوێندن و فێرکردنی زۆری تێدا بووە. لە قەڵاتێ چوار قوتابخانە و چوار خانەقا و بنکەیەکی حەدیسیشی لێ بووە. دوا بەدوای ئەوەش لە مزگەوتەکانیدا حوجرەی فێرکردن هەبووە. ئەو خاوەن قەڵەم و زانایانەش، کە بۆ هەولێرێ هاتوون، بە تەواوی ئیبنولمستەوفی سەرنجی بۆ خۆی ڕاکێشاون. زانا و مێژوونووس و شارەزا لە هەموو لایەکەوە هاتوونەتە هەولێرێ. ئیبنولمستەوفی کاریگەرییەکی زۆری بەسەروانەوە هەبووە. ڕادەی پەرۆشی لەوانەوە کاری تێ کردوون، ئیبنولوستەوفی نەیهێشتووە ناویان کوێربێتەوە لە سەرچاوەکانی خۆی باسی کردوون. لەو سەردەمەی (هونەری قورئان خوێندن و تیلاوە و تەواشیح) بۆ یەکەم جار سەری

هەڵداوە. وەكو زانای ئایینی گەورە ـــ "یونس كوڕی سەعید كوڕی عیسا" پێیدا هەڵداوە-ئەو هونەرە لە رووی شارستانیەت و كەلتوورەوە پێشی شوێنەكانی دیكە پەیدابووە و گەشەی كردووە: وەكو "یەلمان كوڕی كەیلوک كوڕی عوسمانی هەولێری و محەمەد كوڕی یونس كوڕی ئەبولبەرەكاتی موسڵی و محەمەد كوڕی مەككی كوڕی عەبدوڵڵای هەولێری و محەمەد كوڕی ئەلحوسەین كوڕی ئەبوبەكری موسڵی و محەمەد كوڕی محەمەد كوڕی ئەلموبارەک كوڕی جبریلی هەولێری و یەعقوب كوڕی نەسر كوڕی یەعقوبی بەغدادی ئەلدارقزی" و ئەوەتا "زەكییودین عەبدولعەزیم كوڕی عەبدولقەوی" كە بە "ئەلمونزیری"ی ناسراوە و ساڵی (٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز) كۆچی دوایی كردووە، بە زانا و نووسەرێكی گەورەی ئەوكاتە ناسراوە. دەڵێت: ئیجازە (بەڵگەنامە)ی لەو زانا گەورەیەی هەولێری (ئیبنولموستەوفی) وەرگرتووە. ئیبن خەلەكانیش دەگێڕێتەوە لە گوتەكەی (ئەلمونزیری) دەچێت: دەفەرموێ: زۆرم گوێ بۆ شل كردووە و زۆرم لێ بیست. گەلێكیشم لەو فەرمایش و گێڕانەوە و خوێندنەوانەی بیستووە، كە بۆ ئەو زانا و شێخانەی خوێندۆتەوە، كە لە هەندەرانەوە هاتوونەتە خزمەتی، كە (ئەلمونزیریش) كە باسی ئیبنولموستەوفی مامۆستای دەكات، بە "شێخی زۆر بەڕێز و پیاوچاک و پیرۆزی كوڕی شێخی زۆر بەڕێز" ناوی دەبات. بە نووسینی "د. موحسین محەمەد حوسێن" ئەوانە زانا و تەواشیحی دینی و فێرگەی بەردەستی ئەو زانا و بلیمەتە هۆشیاردن. هەر هەموویان باسی مەردایەتی و رێز و میوان نەوازی و قودرەتی سەخاوەتی دەكەن و پێیان هەڵداوە.

لە هەولێری، جاران وەها دەبوو لەسەروبەری هاویندا یا لە مانگی ئاب، كە مانگی گەرم و گڕوسۆی سروشت دەهات، لە ئێوارانی بەرەو رۆژئاوا بوون، لە دەمە دەمی تاریكی و مەغریبدا لەسەر قەڵاتێ سەربانەكان هەموویان گۆسكە و جەڕەیان پڕ لە ئاو دادەنا. سەرولوولەی زاركی گۆسكەكانیان بە توولەییێكی تەنک دەبەست و گرێ دەدا تا مێشوولە و زیندەوەری چووكە نەچێتە ناوییەوە. كە مرۆ لە دوورەوەی قەڵاتێ تەماشای دەكرد جوان و سەرنج راكێش بوو.

دوو پیاوی دوورە گوندی هەولێرێ، شەوێ لەم شارە دەمێننەوە و ناتوانن بگەنەوە گوندی. بەرێكەوت لە قەڵاتێ، لە ماڵە ناسیاوێک دەمێننەوە. ئێوارێ دەچنە سەربانی تەماشای خوارەوە و خوار ژێری قەڵاتێ دەكەن و دادەنیشن لە ناوێ گۆسكە دەخۆنەوە. سارد و سازگار و شیرین و بەتام دەبێ. یەكیان دەڵێ تەوهو تەوهو... ئەوانیش پێشتر لە گوندی بە بەرگوێیان كەوتووە، ئاوی گۆسكانی قەڵاتێ ئەگەر زۆری لێ بخۆیەوە سەرخۆش دەبێ. یەكێكیان لە بیر و دڵ رادەچێ، تووشی دڵەراوكێ و رەجاڵی بێ ئەسڵ و ئەساس دەبێ و تووشی غەنیمە و دڵ رۆیشتێ و سەوادی بێ هۆشی دەچێ، وا دەزانی ئەو ئاوە هەروایە خۆی سەرخۆش دەكا و وا دەزانی سەرخۆش بووە. دەڵێتە هاورێكەی كوڕە فلان، لە ئاوی گۆسكەی هەرام زۆر نەخۆیەوە! لەزگە من سەرخۆش دەبم! خانەخوێش ئاگای لەو سەین و بەینە دەبێ. تێر تێر پێدەكەنێ و دڵ نەوازیان دەكا و دەڵێ: كوڕە وانییە هەی كالفامینە ئەوە خەیاڵە.

ئەو شێوە تەرز و شێوازە هونەرییەی (تەواشیحی و تیلاوە هونەرییەی قورئان و سەڵاوات كردن و مەولوود) دەگەڕێتەوە سەرەداوی ئەو سەردەمە لە مێژووی هەولێر. لەبارەی دینداری و خواناسی و (هونەری تەواشیحی) لە قالبی گۆرانی و مەقامات و مەوالات گوتن قوتبێک بووە. ئەم سەرگوزشتەیە دەستاو دەست دێ و دەماودەم هاتووە و بە عادەتی ئەدەبیاتی زادە و تەخمیسی هەولێری دێ و دەگێردرێتەوە. دوای ئەو مێژووە بە چەندان ساڵ، لە هەندێک شوێنان پەیدابووە و یەكەم تنۆک، كە رژابێ لە هەولێرێ بووە.

دێینەوە بەر سەروبەری یەخەگیری سەردەمانی چلەكان، دەبینین لە چەند سەرچاوە و نووسیناندا باسی ژیان و سەربردەی كەڵە پیاوی مێژوویی مەلا فەندی هەولێرێ دەكرێ. ئەو قسە و رەفتاری لە مەلا فەندی دەنووسرێت و دەگێڕنەوە شەوق و حەنینی زێدە رۆناهی هونەریانەی مەلا فەندی شەوقێكی نوور بووە لە ئەسنافی هەولێر و هەولێرییان.... مەلا فەندی دانیشتووی گوندی باداوان بووە، كە باداوان ئێستا گەڕەكێكە لە شاری هەولێرێ، مەلا فەندی گوتی

ئاوی باداوان ناخۆم ئەگەر ئاوی حەوزی مزگەوتی قەلاتێ نەبێ.

دیانگێڕایەوە. کابرایەک بەخۆ و گویدرێژەکەی لە هەردوولای تێرکی سەرپشتی گویدرێژەکە هەرلا و دوو جەرەی تێوە دەکرد و دەچوو بەسەر دەکەت، لە قەلاتێ ئاوی لە حەوزی مزگەوتی قەلاتێ دێنا لە باداوانی بۆ مەلا فەندی دەبرد.

مەلا فەندیش بە عادەتی خۆی ئەو ئاوە نەبا نەیدەخواردەوە، ئاوی ژێر زەوی بە قرچەی هاوینێ گەرم نەدەبوو و هەر فێنک و سارد بوو، بە چلەی زستانێش ئاوی ژێر زەوی سارد نەدەبوو گەرم و خۆش بوو مەگەر مەلیک لە بەغدا بهاتبایە هەولێرێ لای دەدا لای "مەلا فەندی". هەر هەموو جار دەهاتە لای لە روونکردنەوەی ئەم خالە شتێک دەگێرمەوە لە زاری تەواشیح زانی بەتوانا "وەستا جەلال چەغماغچی" لە وەعز و دانیشتنی ئێوارانی مزگەوتی مەلا فەندی قەلاتێ هێندەی نوێژی هەینی خەلکی تێدا کۆدەبوونەوە و شتێکی لە شێخ مستەفا دەگێڕێتەوە دەلێ: لە ئێواران شێخ مستەفا بەدوای دەناردم، منیش تەواشیحی مەقاماتی فارسی و کوردی و تورکی و عەرەبیم بۆ دەگوت.

ئەو تا دەهات خەنیمە دەبوو تنۆک تنۆک فرمێسکی لە چاوان دەهاتە خوارێ. رەنگی دەگۆڕا دەچووە دنیایێکی دیکە، نەشئە بەخش و چاویشی دەبریسە چاوەکانم، چاوەکانی دەئالۆزان زەینی ئالۆز دەبوون و لەخۆی ون دەبۆوە و تا دەمەکی نەدەهاتەوە بەرخۆی، کە دەهاتەوە بەرخۆش دەستی لە سینگی دەدا و دەیگوت "جەلال ئەو مەقاماتانە قووتی روحن".

لەرێی گێرانەوە چەشنی ئەوتۆن لە رۆژ و سات و کۆی خۆیاندا روویان داوە، وەک هەناردنی مەلا فەندی بەدوای (سەید مەردان) لە کەرکوکێ، کە مەقام زان و دەنگخۆشی جەزبە و عار گەرمی تەواشیح و دڵ ژەن و ئاگر گرتووی جەزبە و عاری ئاهەنگی تاودان بوو لە مزگەوتی مەلا فەندی لە قەلاتێ. دوایی گوڕ و تاوی بریسکاوەی نوورانی ئاگری شەهابەی هەولێرێ و لە مەقامات و مەوالاتی کوچەک کوچەک رێک دەهاتنە گوتن. ئاگری لە دڵی مرۆ بەردەدا بە بەراورد لەگەڵ چاک وەستایی و مەحلانی و مەقام زانی بەهێز و بە توانای شەهابەی هەولێرێ. جارێکیان دوو برا (سەید ئەمین و سەید ئەحمەد) لە موسڵ دێنە مزگەوتی مەلا فەندی بۆ تەواشیح گۆتن و مەقامات. پێش ئەوان بگەنە مزگەوت: مەلا فەندی - شەهابەی لەناو حەسیر لوول دەدا و دەیشارێتەوە و لە کونجێکی دایدەنێ -کە ئەو دوو برایە دەگەنە جێ و دەبێتە گرمە و زرمە و کەف و کۆفی شریقاندن و هەستانی مەقامات و مەوالات، برا لە برای وەردەگرتەوە. ئەو ژوورە دەکەن بە ئاگر لە بەحری مەوالات. لەناکاو سەدای شەهابە شریخەی لێوە دێنێ و جرتەی دێت لە حەسیر دێتە دەرەوە و دەچریکێنێ، ئەو ناوە دەهەژێنێ. ئەو دوو برایە، سەرسام دەبن و دەلێن: "ئەوە چییە یا رەبی ئافاتە-تەتەرە-مەغۆلە یا رەبەلعالەمین!" ئەو دەنگە پوورە هەنگەی یەک تاوی مەجلیسەکەی شلەژاند. لەبەردەمی شەهابە قەلەبالغی ژوورەکە وەک چڕ و چێوی دارستانی چڕ و تێک قژان، هەموو راست بوونەوە. ئاپۆرەی خەلک دەپۆنگێتەوە لەگەڵ هەلکەوتی ناکاودا سەرسام و واقی وڕ دەبن و دەست بە سەلات و تەهلیلە دەکەن و ئاگر لە چاو و دلی خەلکەکە هەلدەستێ و دەگریێن و عەشقەگری جەزبە و قادیراتی شام شکانی دەروونی دەبن.

هەر لەم گروپە دەنگخۆشی وەکو "مەلا نازیم" تەواشیحێکی بە توانا بوو، دەلێن ئەوکاتەی سەلای دەکێشا لە مزگەوتی مەلا فەندی. لە قەلاتێ مەلا فەندی لە باداوان گوێی لە دەنگی دەبوو.

هەروا هەتا لەو تاقمانە ئەو دەنگە نغوردیانە وەکو شێخ فەتاح تەواشیح داری مەقام زان بوو: برای قازی رەشادی هەولێرێ بوو. زانا و گەورەی بەناوبانگی هەولێرێ رەشاد موفتی، شیعری تەواشیحی دەنووسی و دەیدا بەو کۆمەلە مەقامزان و هونەر بە توانایانە. ئەوانیش دەیانکرد بە مەقامات و قۆریاتی چاک و رەچە کاریگەرییەتی تەرزە شێوازەی هەولێرییان. دوابەدوای ئەو شەبەنگە پوورە هەنگانە، وەکو "حاجی فائیق بازرگان و مام وەلی مۆرهەلکەن و مام رەفیق" دیوانی باشی دەگوت. "حەسەن خوچێ" حەیران و قۆریاتی باشی دەگوت، "کەریم سەبرۆکەی کورتاندروو" حەیران و قۆریاتی دەگوت. "محەمەد مەلا کەریم بەنا" لە قەلاتێ سەلای دەکێشا هەتا باداوان گوێیان لە دەنگی دەبوو. "وەستا جەلال

چەغماغچی" لە مزگەوتی شێخ مستەفا سەڵای دەکێشا دەگەڵ "حاجی جەمیل قاپقاپچی" پێکەوە مەقامات و تەواشیحی بە توانایان دەگوت، لە مزگەوتی قەڵاتێ و مزگەوتی "شێخ مستەفا و مەلا عەلی کەبابچی" لە مزگەوتی شێخ مستەفا سەڵای دەکێشا بە عەرەبی و فارسی و کوردی و تورکی. لە رۆژی جەژن ئاکامێکی ئاساییشە. خولاسە بە مەهارەتی جەژنانە دە پازدە گایان دەهێنا لە قەڵاتێ، خەڵک بێ منەت بەبێ شەرم و دوودڵی حازر دەبوون، ئەو گایانەیان دەکوشتەوە و دەیان بەشییەوە، هەزار شەرەفی هەبوو بەسەر سوود و دارایی و دەستکەوتی بێ غایە و غەرەز.

دەگونجێ توێژەری سەروەت و بنەگەی سەروەتی میللی بە گوێرەی زانیاری تەخمین کردن لە رۆشنبیری کۆمەڵگا بێنێتەوە سەر پلە و پایەی هەلومەرجی شوێنەوارێک بە زمانی تەکنەلۆژی و ئابووری و ئایینی و رامیاری، بەم تەرزە تێگەیشتنە، بیگەینێتە ئاستی بەراوردکاری و ساغکردنەوەی بەرچاو و شیکردنەوەی سروشتی رۆشنبیری ئەو کۆمەڵگایە.

وەک گوتم بە تەنیشت شارەوە لەلای باشوورییەوە باغی گڵکەند هەیە، کە بە تاقگە و باغ و دار و بار و باغچەی قشتیلە هەیە، لەلای باکوورەوەش غاباتی چڕ و جوانی بەرامبەر بە نەخۆشخانەی کۆمارییەوە شوێنێکی بە دار و سێبەر و ئاوە. لە هەرەتی کەیف و زەوقی عادەتی رۆژانەی هەولێرێ دەورووژانە ئەو شوێنانە، بەڵام پاشی عەسران ئەهلی خۆش مەشرەبی و گۆرانیبێژان. زۆر جاران ئەو رووداوانە دەبووە هۆی چڕین و تێهەڵکردنی دەنگی بە سۆز و گۆرانی بە تاوی دانیشمەندی چڕ و ئاپۆرە بووی کۆمەڵ کۆمەڵ. خەڵک لە جاری وەهادا حیساب بۆ نەناس و ناسیاو ناکا، جەزبەی چڕین و تاوی قۆریات و مەوالات راکێشی رێ گوزەری غەریبەشی دەکرد.

لە هەولێرییانەوە، دەگێڕنەوە چەند جار مەلیک لە بەغدا هاتۆتە هەولێر بە تایبەتی داوای گۆرانیبێژی بەناوبانگی هەولێریی کردووە، حەیدەر عەبدورەحمان، کە بە (حەیدەرە کەچەڵ) ناسرابوو، لە هەرەتی ئەو کەیف و زەوقەی مەلیک لە دامەن داروبارەکانی گڵکەند، کە لە چاوان و لە شار تۆزێک بزرە. حەیدەری هەرام و بەتوانا دەیدایە بەر بریسک و هۆر و گرمە و زرمەی قۆریات و مەقاماتی پڕشە و نەشئەی دەماغ و سڕی و بێئاگابوون لەخۆ و، بەرەو دنیایێکی دیکەی دەبرد، لێرەدا مەلیک خۆشی شل و کوتی ئەو دەنگە و ئەو مەوالانە دەکرد و ئینجا دەگەڕایەوە بۆ بەغداد.

ئەمە دانیشتنەکانی دەوروبەری شار بوون، شەوانیش بە خەڵوەتی عادەتی رۆژانەی ئەهل و زەوقی نەشئە بەخشی هونەری و ئارەزوومەندی مەجلیسی (ئەگلەنجەیی) لە ماڵان دەکرا.

ئەو شێوازە ئەگلەنجەییە زیاتر تەوەشوحی بە تایبەتمەندییەتی هەولێرێ دەکرد. لەوانە کەڵەمێردی گەورە و دەنگخۆشی بە توانا هەبوون وەکو مشکۆ-حەیدەرە کەچەڵ-شەهابە-پیرداوەدە کوڕ-محەمەد ئەحمەد ئەربیلی... چەندانی دیکە.

مشکۆی هەولێری بە شۆڕەت و ناوی هەولێرییەکی تەواوی پێوە دیار بوو. رەنگی گەنمی و تۆزێک لە باڵا هەوراز بوو، لە زۆر وردە هونەرییەکان شارەزابوو... وەک کە یەکەم جار دیتم و چاوم پێکەوت پڵنگێکی رێک چاپووک بوو، هەروەها ئەو نرخ مەردانەی لە ریزەکانی کۆمەڵ و خەڵکدا هەڵدەکەوون، دەسوێن و دەتوێن و دەبڕێن و جاری وا بەقەد مردنێک ژیانیان لێ تەنگ دەبێ.

مشکۆ عادەت و ئەدەبیاتێک دەیهەنجنی و لێی نەدەبۆوە، ئەویش ئەو ئەگلەنجانە بوو، کە رۆژگار بەسەری دەهێنا لە گەڕەک و ماڵان، زۆرجار تووشی مەشەقەتی و شەڕ و هاودەردی دەبوو، هەر ئەوەبوو مشکۆ نەدەچووە هەندێ گەڕەک و کووچە و ماڵان. لەلایەکی دیکەشەوە ئەو گەڕەکانەی لە مەیدانی ناو دەرکردندا ئەو مشەخەتییەی خوێڕیلانە لە لۆتی و چەقو وەشێنی و شەقاواتیدا ئەو سەردەم باوی بوو یا گەڕەکی شەڕە بەردانێش هەبوو.

لە روونکردنەوەی ئەم تنۆکە باسە شتێک دەگێڕمەوە و بەرەو ئەترۆحەی شەڕە بۆکسانێ و خوێڕیلانەی شەقاواتی دەچم. هەرچەندە دەخلمان بەو سیخە کولەی کۆمەڵ نییە، نەوەکو هەندێک لە پیاوی دڕدۆنگ رکە بگرێ و لێمان بەداوێ وەکا، لەو جۆرە باسانەدا ناڕەزایی بدرکێنێ. کورد دەڵێ:" ئەو رەز و باغەی لەسەر رێیانە دەستی بۆ درێژ دەکرێ". ئێمەش باسەکە هاتە سەر رێ.

چەندین کەسوکاری (لۆتی) و (چەقووەشێن) و (بۆکس

بۆکسانێ)ی ئەو شارەمان ناسیوە، تۆش بەلای خـۆتەوە دەیانبـینی و دەیانناسی، هەندێکیان مەردایەتی و ئازایەتی حەریق بوون. دەنێو کۆمەڵدا دەخلمان بەو چلتووک و پووشەن و پووش برنجی سووکەوە نییە، باسی ئەو شەرەف مەردانە دەکەین، کە لەو مەیدانە کۆشاون و ژیاون، خۆ کفریان نەکرد نەبووبان بە لۆتی و شەقاوە، هەزاران هەزار مەردی مەیدانی شەقاواتی و لۆتیاتی و بۆکس و چەقۆ وەشێنی ریز لە خۆنان و شکۆمەردایەتیان لە بیران ناچنەوە.

**هەندێک بە مەردی هاتە مەیدانەوە**
**بە پووش برنجی سەری نایەوە**
**هەندێک بە پووش برنجی هاتە مەیدانەوە**
**بە مەردی سەری نایەوە**

وەکو ئەوسا شەقاواتی هیچ کامێکیان نەیاندەزانی بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو، کە دوای خۆیان ناو و ناتۆرەیان چۆن دەبێ، وەکو:

عەبۆ لا سووتای: لەسەر کوردایەتی شەهید بوو.

جەماله رەش: لەسەر کوردایەتی و پێشمەرگایەتی شەهید بوو.

سابیر ساروخ: لەسەر کوردایەتی شەهید بوو.

سامۆ سەرکەستوور: لەسەر کوردایەتی و پێشمەرگایەتی شەهید بوو.

دەگێرنەوە لە گۆرانیبێژی هەولێری ناسراو بە پیرداوەدە کۆر، رۆژێکیان زۆر قرخ و موفلیس دەبێ. بەرکی کراسەکەی بەلاش پێوەی لکاوە، تا لە بەرکی خۆی توورە دەبێ و دەڵێ: "ئیشتەم ماڵەوەدان ئەوە جێبە یا بەلای خوایە" جێب واتە گیرفان، بەرک. لە کراسەکەی بەری دایدەدرێ وا رێک دەکەوێ خوای راستان بەدوایدا دێن بۆ ئاهەنگێکی ئەگلەنجەیی لە گەرەکی کوورەچییان، وەی وەی لە کوورەچییان هەر هەموویان چەقۆ و دامیر بۆکس بوون، بەڵام پیرداوەدە کۆر ناچار دەبێ و بێ پارەیە دەگەڵیان دەچێ، ئاهەنگیان بۆ گەرم دەکا و لە دڵیش زۆر دەترسێ، پاش مەقامات و قۆریاتی سەیر دەکا پارەیەکی باش خرپۆتەوە، هەر بەتاو چنگ لێدەدا و لە گیرفانی شەرواڵی دەکا و دەڵێ تەواو من تازە دەرۆم، لە کوورەچییەکانیش پێی دەڵێن بۆ دەرۆی، ئەویش دەڵێ ئێستا چەقۆ و حەربە و دامیر بۆکس لە عاسمانێ گەمە دەکا.

یا تەرزێکی دیکە لە شێوازی (ئاهەنگی سونەتانێ) باوی هەولێرێ بوو، دیمەنێکی گشتی دەوامەداری عادەتی (سونەتانێ) ئەوەبوو، سەری گەیاندە رایەڵکردنی عادەتی منداڵ سونەتکردن لە دوایێ ئاهەنگی سونەتیان بۆ سازدەدا، کە سونەتانێی دوو منداڵی دراوسێکەمان بوو ئەو، دراوسێیەشمان هەولێری رەسەن بوون، دایکیشیان خوشکی حەیدەرە کەچەڵ بوو. حەیدەر عەبدورەحمانی گۆرانیبێژی گەورەی هەولێر بوو. ئەو نزیکییە و خزمایەتییە وای بۆ من رەخساندبوو زۆرینەی زۆری رۆژان بەدوا رۆژان ئەو کۆمەڵە هونەرمەندانە ببینم و ئەو شەوە بۆمن یەکەم جار بوو بەشداری ئەگلەنجەی مشکۆ-هابە-محەمەد ئەربیلی - جەبار ئەحمەد - پیرداوەدە کۆر بم. ئەوسا ئەمن بابولقێ و لە سەرەتاکانی خوێندن و بڕبڕ شتم شی دەکردەوە. بە چاوی سەیر و هونەرییانە تەماشای ئەو مەهارەت ئەگلەنجەییە تایبەتمەندییەی هەولێرم دەکرد، ئەوەندەم بە باشی لەبیرە، کە مشکۆ لەپێش هەمووییانەوە بە قۆریاتی شۆڕبۆوە، دوایی دایەوە بەر حەیران و حەیرانێکی مشتاخ و بەلەزەت، لە ریتم گەلی قوڕگەوە ئاگر دەهاتە دەرێ و هەزار حەشاماتی ئەو ئەگلەنجەیەی دەسووتاند. دوابەدوای ئەوە "نەمام نەمامە و بابچینە سەرەودیس و ئامان سەبری و لێ لێ جەوێ و تۆ مامزی لەپێش رەوێ"، تۆپەڵە پوورە هەنگێک بوو بۆ خۆی، بەزم و رەزمی ئەو ئەگلەنجەیە تا بەرەبەری بەیانی خایاند و گەلێک لە میوان و عەشایر و دەشت و دەوروبەری هەولێرێ تێدا میوان بوو. لە پاشان بەدواوە ئەو ئەگلەنجانە تا دەهات شێوە عادەتی خۆی وەردەگرت، ئەو شێوە تەرزە پۆنگایەوە لەلایەن دەست و قامی گۆرانیبێژانی دیکە و راست و دروستی هێنا. من ئەو دیمەنانەم بە چاکی لەبیرە، واش دەزانم لەو ئەگلەنجانە، کە بۆ ئاهەنگی ژنهێنان و کەیف و زەوقی عادەتی و سونەتانێ و بۆنەی دیکە دەکران.

بەهەمان حاڵ ئەو شێوە دیمەنانە نەخش دارێژی زەین و بیری لە مێژینەن، بۆ ئەوسافی هەولێری و هەولێرییان لەوانە:

قادر زیرەکی کۆچکردوو، رەحمان قوربانی و جەعفەر کوردستانی کۆچکردوو، ئەکرەم غەمبار، ئەوانەش وێنەیان لە ئاوێنەی تەخمینم هەیە.

*



# چۆنیەتی سەرهەڵدانی مقامات لە هەولێر

جەلال خدر

ئەگەر ئاورێک لەمێژووی لەبن نەهاتووی ئەو شارە دێرینە بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کەوا خوێندنی مەولودی پێغەمبەر بۆ یەکەمین جار لەزەمانی حوکمڕانی سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری لە دەوروبەری ساڵی (١١٢٨-١٢٣٣)ی زاینی سەری هەڵدا وەکو میراتیش تاوەکو ئەمڕۆ بۆ ئەو شارە دێرینە ماودتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کەوا جووڵانەوەیەکی هونەری لەخوێندنی مقامات لەم شارەدا هەبووە، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین مقامزان و دەنگخۆش لەشارەکانی، وەکو: (بەغداو بەسراو بوخاراو سەمەرقەندیان) هێناوەو لێرە دەنگیان هەڵێناودو مقاماتیان لەستایشی پێغەمبەری مەزندا چڕاندووە. نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ، کەوا (بەدرەدین ئەربیلی) ناوێک ٧٥٠ ساڵ بەر لەئەمڕۆ کتێبی (ارجوزه الانغام)ی داناوە، کەتێیدا چەندین مقامی سەرەکی دەستنیشان کردووە. من بەش بەحاڵی خۆم دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت، کە ئەو پیاوە ناوی تەواوی -(ئەبو معالی بەدرەدینی کوڕی محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی ئەربیلییە. لەساڵی ١٢٨٧ی زاینی لەشاری هەولێر لەدایک بوودو لەساڵی ١٣٢٨ی زاینی کتابی (ارجوزه الانغام)ی داناوە، کە لە (١٠١) دێڕە شیعر پێکهاتووەو مقامە سەردکییەکانی دەستنیشان کردوودو (مقامی رەست)ی بەیەکەم مقام داناوە، ودکو خۆی دەڵێ:

**واعلم بان الرست اصل الكل**
**عنه تفرعت بحكم العقل**

هەروەها سێ مقامی تری دەستنیشان کردووە، بەمەش ژمارەی مقامە سەردکییەکان دەبنە چوار مقام:

**دانه اول ماتفرعا... عنه ثلاثة فصارت اربعا**
**الرست والعراق ثان تابع... وزوركند واصبهان رابع**

هەروەها ئەم زاتە یەکەمین کەس بوو توانیویەتی لەو چوار مقامە سەردکییە چەندین لقی لێ جیا بکاتەوەو ژمارەی مقامەکان بۆ (١٢) مقام پەرە پێبدات:

١- لە مقامی ڕەست: زنگولە و عشاق.
٢- لە مقامی عێراق: یو سەلیک و مایە.
٣- لە مقامی زورکەند: برژەک و ڕەهاوی.
٤- لە ئەسپەهان: توی و حوسینی
کەبەم شێوەی خوارەوە بۆمانی دەستنیشان کردووە:

**ثم لكل نغمه فرعان...... تفرعت عن اربع ثمان**
**عن اول زنگلا عشاق.... بوسليل والمايه والعراق**
**ثم لثالث يزرك واهوي...... عن اربع نوى ميني**
کروری
**فصارت الاصول اثني عشرا. واضطربوا في الوضع والذي ارى**

هەروەها بەدرەدین ئەربیلی لەم دێڕە شیعرەدا ناوی خۆی هێناوە کە دەڵێ:

**صاحبها محمد نجل علي... ناظمها خطيب الاربيلي**

لە کۆتایشدا دەڵێ:

**وكملت أرجوزة الانغام... والحمد لله علي الامامة..**

ئەمەش خۆی لەخۆیدا مایەی سەرنجڕاکێشانە، چونکە شتێکی کەم نییە ٧٠٠ ساڵ بەرلە ئەمڕۆ شتێکی وا لە شاری هەولێر ڕوویدات. ئەمە و بەدرەدین ئەربیلی لە دەوروبەری ساڵی (١٣٥٤) زایینی کۆچی دوایی کردووە و لە شاری بەغدا بەخاک سپێردراوە. ئەو بنەماڵەیەی کە بەبەردەوامی سەرپەرشتی خوێندنەوەی مەولودی پێغەمبەری کرد، ئەویش خانەوادەی (مەلا ئەبو بەکر ئەفەندی) هەولێری (١٧٧٨-١٨٥٥) کە باپیرەی مەلای گچکەی هەولێرە لەپاشان بۆ نەوەکانیان ماوەتەوە تاوەکو دەگاتە مامۆستا ڕەشاد ئەفەندی ڕەحمەتی.

ئەویش لەو مەیدانەدا درێغی نەکردووە، مەولوودنامەیەکی جوانی بەزمانی کوردی لەساڵی ١٩٥٤ لەستایشی پێغەمبەری مەزندا داناوە. ئەمەو لەلایەکی تریشەوە لەلای هەموو کەسێک ڕوون و ئاشکرایە کەوا مزگەوتی گەورەی قەڵای هەولێر، کە ئەو بنەماڵەیە بۆ ماوەی (٥٠٠) ساڵی ڕەبەق سەرپەرشتیان کردووە، ئەو شوێنەش تەنها جێگای خواپەرستی و خوتبەو نوێژی هەینی و پێنج فەرزەو وەعزدان نەبوود، بەڵکو قوتابخانەیەکی بێ هاوتا لەزانکۆی (ئەزهەرو دیمەشق و بەغداو بەسرا) کەمتر نەبووە. بەسەدەها زاناو مامۆستای ئایینی و مەلای مزگەوت و ئیمام و خەتیبی لە سەرتاسەری کوردستانی پێ گەیاندووە و بنکەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری گەورەی سەردەمی خۆی بووە، هەروەها شوێنی چارەسەرکردنی گیروگرفتی سۆفیگەری و فیقهی تەریقەتی نەقشبەندی و قادری و رفاعی بووە. لەمەیدانی خوێندنی تەرتیل و تەجویدی قورئانی پیرۆزو بانگدان و سەڵا کێشان و خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەردا بێ هاوتا بووەو مەولوودی پێغەمبەریش لەو کاتەدا دەبوایە مەولوود خوێن لەسەر نەغمەی مقاماتی عێراقی بیخوێنێ و شارەزاییەکی تەواوی لەئوسوولی مقاماتدا هەبوایە ئەوجا دەیتوانی بەشداری بکات. ئەو زانیارییانەی کە بەدەستی ئێمە گەیشتوون لەزمانی شێخ هیدایەتی هەولێری، کە لەساڵی ١٨٢٧ی زایینیدا کاتێک، کە مزگەوتی خانەقای هەولێر نوێ کرایەوە. ئەویش لەسەر فەرمانی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، پێشی ئەوەی روو لەوڵاتی شام بکات هاتۆتە شاری هەولێر فەرمانی دەرکردووە، کە مزگەوتی خانەقا نۆژەن بکرێتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لەشاری کەرکوک بەناوبانگترین مقامزانی سەردەمی خۆی مەلا عەبدولڕەحمانی والی (١٧٧٩-١٨٣٠)یان هێناوە بۆ شاری هەولێر لەگەڵ دەیان دەفژەنی ئەو سەردەمە. بەم بۆنەیەوە بەشداری بکات و مقامات لە ستایش و مەدحی پێغەمبەری مەزندا بچڕێ. لەلایەکی تریشەوە کاتێک کە (نەجیب پاشا) والی بەغدا بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش (ڕەسووڵ پاشا) برای پاشای کۆرەی ڕەواندزی لەشاری هەولێر

لەساڵی ١٨٤٩ لەلای مەلا ئەبوبەکرە فەندی (مەلای گچکە) میوان دەبێت لەهەمان کاتیشدا فەرمان دەدات مزگەوتی قەڵای هەولێر نۆژەن بکرێتەوە. لەپاش چاککردنەوەی ئاهەنگێکی گەورەیان لە ستایشی پێغەمبەری مەزندا رازاندۆتەوە بۆ ئەو مەبەستەش مقامزانی بەناوبانگ (رەحمەتوڵلا شەڵتاغی کوردی) (١٧٩١-١٨٧١)یان هێناوە ئاهەنگێکی خۆشی بەدەنگە زولاڵەکەیەوە لەگەڵ چەندین مقاماتی عێراقی چڕاندووە. لێرەدا بەم بۆنەوە شاعیری هەولێری بەناوبانگ (حافزی ئەربیلی) لەم پارچە شیعرەدا باسی هاتنی نەجیب پاشای والی بەغدا دەکات و دەڵێ:

**بحمدالله خدا لطفي له تنوير ايتدي دنيايي**
**ايدوب واسع عباد الله أيچون حاجي مصلايي**
**ابوبكر مدرس اولدي باعث بو مهماته**
**إفاده ايلدي والي عراقه يو معمايي**
**قمر طاق و رواقي قصر كسرادن مصلادر**
**نصيب ايتسن خداروزي جزا فردوس أعلايي**
**سؤال ايتم مؤرخدن بو معبد خانه نن أصلن**
**نجيب پاشا موزين ايلدي بو دار تقوايي**
**جلوب درگاهنة (حافظ) قولتن احسان أميديله**
**سنا محتاجدر رفع ايله باشندن بو سودايي**

لێرەدا پێم خۆش بوو بۆ مێژوو شتێک بگێڕمەوە. ئەوەی لەمەیدانی خوێندنی مقامات لەستایشی پێغەمبەری مەزندا خزمەتێکی گەورەی کردبێ، ئەویش خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەد ئەفەندی موفتی) بوو. ناکرێت یادی ئەو زاتە مەزنە فەرامۆش بکرێت. کە زانایەکی پڕ لەعیلم و منەوەر و پیاوێکی ئاینی و خواپەرست بووە و چەندین قوتابی پێگەیاندووە، لەهەمان کاتدا (موفتی) شاری هەولێر بووەو مەرجەعی فتوا و زانست بووە. ئەو زانایە شارەزایەکی تەواوی لەئوسوولی مقاماتدا هەبووە. سەری باش لێ دەردەچوو. هەر دەنگ خۆشێک لە بەردەمی دەنگی هەڵێنابوایە یەکسەر هەڵیدەسەنگاند. مقامزان و دەنگ خۆش لەهەموو لایەکەوە روویان تێ دەکردو بەترسەوە لەبەرامبەری دەنگیان هەڵدەهێنا. بۆ ئەو مەبەستەش ئێمەش وامان بەباش زانی دەرگای حوجرەی ئەو زاتە مەزنە بخەینە سەر پشت با بزانین ئەو دەنگ خۆشانە کێ بوون لەخزمەتی ئەودا دەنگیان هەڵێناوە و بەناوبانگترین کەسایەتی لەو مەیدانەدا:

**یەکەم:** مامۆستا مەلا عوسمانی مووسڵاوی (١٨٤٢-١٩٢٣) بووە.ئەو بلیمەتە پێشی ئەوەی روو لەشاری ئەستەمبوڵ بکات و بۆ ماوەی دە ساڵ لەخزمەتی سوڵتان عەبدولحەمیددا بمێنێتەوە، هاتۆتە شاری هەولێرو لەلای ئەبوبەکر ئەفەندی (مەلای گچکە) میوان بووە. لەهەمان کاتیشدا دەنگی بۆ وەستا محەمەد ئەفەندی موفتی، هەڵێناوەو چەندین ئوسوولی مقامات و مودشەحات و موناجاتی لەخزمەتی ئەودا خوێندووە ئەوجا ملی رێگای ئەستەمبوڵی گرتۆتە بەر.

**دووەم:** دەنگ خۆشێکی دیکە هەبووە ناوی (مەلا محەمەدی کۆر) (١٨٧٥-١٩٤١) بووە. ئەو دەنگ خۆشە خەڵکی شاری کەرکوک بووە بە بەردەوامی هاتوچووی شاری هەولێری دەکرد، لە حوجرەی موفتی دەنگی هەڵدەهێناو مقامات و قۆریاتی تورکی دەچڕاندو دەنگی زۆر خۆش بووە. شتی زۆری لەسەرە، لە دوایی باسی لێوە دەکەین.

**سێیەم:** دەنگ خۆشێکی تر هەبووە ناوی (عەلی کاکە) بوو. ئەویش خەڵکی شاری سلێمانی بووە. ئەمەش دەهاتە شاری هەولێر بەستەو مقاماتی رەسەنی کوردی دەگوت و دەخوێند بۆ ماوەی مانگ و نیوێک لەهەولێر دەمایەوە لە دیوەخانی (مەلا ئەفەندی) میوان دەبوو، لەحوجرەی محەمەد ئەفەندیش دەنگی هەڵدەهێنا.

سەبارەت بەو دەنگ خۆشە هەندێک زانیاریم لە هونەرمەندی شاری سلێمانی (مەحمود ئەفەندی) (٩٢٠، سلێمانی) وەرگرتووە، دەڵێ:

عەلی کاکە مەقامزان و دەنگ خۆشی سەردەمی خۆی بووە. لەقوتابخانەی روشدیەی عەسکەری لەزەمانی عوسمانی خوێندوویەتی. ئەو هونەرمەندە دەنگی خۆش و روح سوک بووە، جلی کەوای تاقەو عەبای زەردی شان سورمەی دەخستە سەر شانی و لەگەڵ "یارم پۆتینی لە پێ دەکرد" و سعاتی قوردونی بەزنجیری زیوی لەبەرۆکی دەبەست و دەمانچەی بەقایشی هەڵدەگرت و ئوسوولی مقاماتی باش دەزانی، چونکە ماوەیەکی زۆریش لەشاری بەغدا ژیاوەو دۆستایەتی لەگەڵ (گوبانچی و قوندەرچی و عەلی مەردان)دا هەبووە جگە لەوەش (مەوال و بوزیبەش)ی دەزانی و لەمەقاماتی رەسەنی کوردی بێ هاوتا بوو.

**چوارەم**: دەنگ خۆشێکی تر هەبوو ناوی (مەلا محەمەدی مووسڵاوی) بوو. ئەم دەنگ خۆشە قوتابی مەلا عوسمانی مووسڵاوی بووە، لەیەکەم رۆژی مانگی رەمەزانی هەموو ساڵێک دەهاتە شاری هەولێرو لەمزگەوتی قەڵای لەلای (موفتی) میوان دەبوو. و لەیەکەم رۆژی جەژنی رەمەزان دەگەڕایەوە. ئەم مقامزانە دەنگی خۆش بووە لەهەمان کاتیشدا دەستی زۆر کورت بووە، خەڵکی ئەو شارە زەکات و سەرفترەیان داوەتێ.

**پێنجەم:** دەنگ خۆشێکی دیکە هەبووە، ئەویش (مەلا کەریمی ساحێب قەڕان) (١٨٨٥-١٩٣٨) بووە بەئەسڵ خەڵکی شاری سابلاغ بووەو بەقەزاو قەدەر کەوتبووە سلێمانی و پیشەی (ناتری حەمام) بووە، چەندین قەوانی لەسەر حیسابی کۆمپانیای (بایزافۆن و ئیدیۆن) تۆمار کردووە. ئەو دەنگ خۆشە عادەتی وابوو بە بەردەوامی دەهاتە شاری هەولێر، لەدیوەخانی محەمەد ئەفەندی موفتی میوان دەبوو لەهەمان کاتیشدا عاشقی دەنگی شەهابەی هەولێری (١٨٩١-١٩٣٩) بووە، هەموو جارێک لەگەڵ عەلی کاکەی دۆستی دەهاتنە دیوەخانی مەلا ئەفەندی، گوێیان بۆ دەنگە ئاسمانی و زوڵاڵەکەی شەهابەی هونەرمەند مقامزانی شاری هەولێر رادەگرت. بیستوومە دەڵێن جارێکیان محەمەد ئەفەندی موفتی سێ دیناری داوەتە مەلا کەریم لەکاتی گەڕانەوەی لەشاری کەرکوک پارەکەیان لێ دزیوە، ئەویش بەخەم ساردی گەڕاوەتەوە سلێمانی.

**شەشەم:** مقامزان و دەنگ خۆشێکی دیکە هەبووە ئەویش (مەلا تەهای مەلا یاسینی موسڵاوی) کەرکوک بووە، هاتوچووی شاری هەولێری دەکرد. مامۆستای قورباتی تورکی بووە، زۆرجار دەهاتە خزمەتی (محەمەد ئەفەندی موفتی) مەلا تەها چەندین قەوانی تۆمارکراوی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە. سەبارەت بەقەوانەکانی پێم خۆش بوو شتێک لەحەقی ئەو مقامزانە باس بکەم. جارێکیان لەساڵی ١٩٢٥ لەگەڵ مەلا یاسینی باوکی روو لەشاری بەغدا دەکەن، ئەو کاتە مەلا یاسین تووشی نەخۆشی (تیفۆئید) ببوو. ئەویش پارەی لێ دەبڕێ لەپاشان بەبەر دەرگای کۆمپانیای بایزەفون رەت دەبن، مەلا تەهاش دەپرسێ و پێی دەڵێت: ئەمە شوێنی تۆمارکردنی قەوانە ئەوەی دەنگی تۆمار بکات پارەیەکی چاکی دەست دەکەوێ. ئەویش لەبێ پارەیی ناچار دەبێت دەنگی تۆمار بکات و لەماوەی بیست و چوار سەعاتدا (٤٠) قەوان تۆمار دەکات.. وەکو بیستوومە لەدوای مردنی کوڕەکانی لە شارەکاندا دەگەڕان هەر قەوانێکی باوکیان بەدەست بکەوتایە بەپارەیەکی چاک دەیانکڕی و دەیانشکاند.

حەوتەم: دەنگ خۆشێکی تر هەبوو ئەویش سەید ئەحمەدی مووسڵاوی و لەگەڵ جەماعەتەکەی، کە پێکهاتبوون لە: (مەلا ئەمین و مەلا سەلمان و سەید ئیسماعیلی فەحام) ئەوانیش دەهاتنە شاری هەولێر بە

بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری مەزن، بەشدارییان لە مەولود دەکردو میوانی موفتی دەبوون.

هەروەها دەنگ خۆشەکانی شاری هەولێریش وەکو: (سەید مەردان و عەلی کوڕو مەلا نادری سەعاتچی و دەروێش رەمەزانی سولیان و دەروێش مچۆل و مەلا شەریفی مەلا ئیبراهیمی حەنەفی و حاجی عەبدوڵلای دەف ژەن و سەید محیەدین سەید خەنجەرو فەقێ سمایلی پەلکانەو مەلا سالحی دەف ژەن و سەید ئیبراهیمی بەرزنجی و باپخە کوڕو مام رەفیقەی کارەگەمی و هی تریش..)، لەحوجرەی ئەو مامۆستایە دەنگیان هەڵێناوەو مقاماتیان چڕاندووە، بەڵام مشتەری بەردەوامی ئەو حوجرەیە (شەهابەی) هونەرمەندو دەنگ خۆش بووە. چونکە موفتی لەکاتی خۆیدا بەخێوی کردووە. وەکو دەڵێن مەلا محەمەدی کوریی کەرکوک زۆر رقی لە شەهابەی دەنگ خۆ دەبووەوە، چونکە دەیزانی پاشەڕۆژێکی گەشی هەیە. لێرەدا شتێکم بەبیر هاتەوە.. مامۆستا یونس عەبدوڵلا حەداد (کە قوتابی سەید مەردانە) جارێکیان لەسەر زمانی مامۆستا (رەشادئەفەندی رەحمەتی) بۆ من و مەلا نورەدین ئەڵلا وێردی بەقاڵی گێڕایەوە گوتی:

رۆژێکیان مەلا محەمەدی کوڕ لەشاری کەرکوک بەمیوانی هاتبووە خزمەتی (مەلا محەمەد مەلا فەندی موفتی) باوکم لەخزمەت ئەودا دانیشتبوو ژوورەکەش وا رێک کەوتبوو دوو ژوور لەناویەک بوون، بەشی پێشەوە موفتی خۆی لێ دادەنیشت. بەشی دووەمی شەهاب و مام کەریمی قاوەچی تیا بوون. موفتی داوای مقامێکی (مرمی) کرد ئەویش دەڵێ: قوربان ئەگەر شەهاب لێرە نەبێت ئەوا بۆتانی دەخوێنم، شەهابەش خۆی لەیەکێک لەدەلاقەکانی ژوورەکە دەشارێتەوە. کوڕە مقامێکی (مرمی) تەحریر دەکات و دوایی مەیانەو قەرار ئەوجا تەسلیمی دەکات لەناکاو شەهاب لێی دێتە مەیدان و هەمان مەقامی بەهەمان شێوە، بەڵام لەو خۆشتر دەخوێنێ.

ئێمە لەم باسەماندا هەر چەند باسی (مەلا محەمەد ئەفەندی موفتی) بکەین تەواو نابێت، چونکە ئەو بلیمەتە (کە پێشتر باسم کرد) شارەزایەکی تەواوی لە ئوسوولی مقاماتدا هەبووە.

بۆ ئەو مەبەستە لێرەدا تەنها نموونەیەکی بچووک دەهێنمەوە. جارێکیان ئەو مەلا محەمەدە کوڕەی کە پێشتر ناویان هێنا لەماڵی (ئەحمەد عوسمان) یەکەم متەسەرفی شاری هەولێری (کە برای موفتی بوو)، میوان دەبێ، کە شەو دادێت مقامات لەستایشی پێغەمبەری مەزن لە دیوەخانەی ئەو دەچڕێ و بەفورسەتی زانیبوو چونکە ئەو شەوە (سەید مەردان و شەهابە) لەماڵی مەلا ئەفەندی لەقەسری باداوە میوان بوون، کوڕە بۆ خۆی راست و چەپ بەناو دەکەوێ (موفتیش) لەسەربانی ماڵی خۆیان گوێی لەدەنگی بووە، لەشوێنێکدا هەڵەیەکی گەورە لەئاستی مقاماتدا دەکات. موفتی زۆری پێ ناخۆش دەبێ، ئەو شەوە لەسەر ماڵیان بۆ ماوەیەک هاتوچۆ دەکات و خەو ناچێتە چاوی، مامۆستا رەشاد ئەفەندی کوڕی، ئەمەی لێ دەبینێ پێی دەڵێ بۆ وا نارەحەت بووی. ئەویش دەڵێ: (هەر لێم گەڕێ تاوەکو سبەینێ چارەسەری ئەو کوڕەیەی دەکەم) بۆ بەیانی زوو دوای نوێژی بانگی دەکات پێی دەڵێ: (کوڕە ئەمشەو ئاگام لێت بوو بەکەیفی خۆت لەناو بەحری مقامات مەلەوانیت دەکرد و ئاگادارم لە قەلا لە مەقامدا هەڵەیەکی گەورەت کرد نەدەبوایە ئەو مقامە تێک بدەیت).. ئەویش وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: (مامۆستا گیان ئەوانەی ئەو شەو گوێیان بۆ دەنگی من شل کردبوو هیچیان فریان بەسەر مقاماتەوە نەبووە. مقام گوتن و گوێز ژماردن لەلای ئەوان وەک یەک وایە، بۆیە منیش بەکەیفی خۆم راست و چەپ بەناو کەوتبووم. ئەگەر زاتێکی وەکو جەنابت لەو مەجلیسەدا ئامادە بوایە منیش وام نەدەکرد).

# هونەری قۆریات لە هەولێر

دیار

هەر نەتەوەیەک لەگەڵ دروستبوونیدا کۆمەڵێ داب و نەریت و مۆرکی تایبەتی بە خۆیەوە هەڵدەگرێت، هەر ئەوانەش دوای چەندساڵ دەیلستەوە و دەبنە ناسنامەی ئەو گەلە.

هونەر یەکێکە لەو بوارانەی، کە گەلێک لە گەلێکی دیکە جیا دەکاتەوە، گەلان هونەری خۆیان پەرە پێدەدەن و رکابەری گەلانی دیکەی پێ دەکەن.

تورکمانەکانیش هەروەکو هەر گەلێکی دیکەی دێرین، خاوەن چەندان کولتووری مێژوویی خۆیانن، یەکێ لەو کولتوورە پیرۆز و زێرینانەش، کە ساڵەهای ساڵە لەنێو تورکمانەکان باوە، هونەری (قۆریات) گوتنە، نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە هەرکاتێ گوێ بیستی (قۆریات) دەبین روخساری تورکمانە دێرینەکان و مێژووی ئەوان و هەموو دیمەنە جوانەکانی تر دێنەوە بەرچاو، چونکە دەکرێ بڵێین ئەوان خاوەنی ئەو هونەرە فراوانە و بەرزەن، کە لەوانەیە گەلانی دیکەش پەنایان بۆ بردبێت.

بەڵام کەسێک هەقی تەواو بەو هونەرە نادات، تورکمانەکان خۆیان نەبن، کەڵەپیاوانی ئەو بوارەش دیار و بەرچاو بوون، هەمیشە ببوونە قوتابخانەیەک بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ، بۆ ئەوەی ئەو هونەرە (قۆریات) نەوەک هەر بمێنێتەوە بە باڵای بەرزی جارانی خۆی، بەڵکو پەرەی زیاتری پێ بدرێت، لەوانەیە لەسەردەمی ئەمڕۆدا لەگەڵ گۆڕانی جیهان بەرەو جیهانێکی پێشکەوتووتر لە هەموو بوارەکان و لەتەک ئەمانیشدا بواری گۆرانی و مۆسیقا لە تەکنیک و تۆمارکردندا، گۆڕانێک بەسەر گۆرانی و مۆسیقای ئێمەشدا هاتبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەم و هونەرە مێژووییەکان هەروەکو چاوان پارێزراون، بگرە ئەمڕۆ زۆر لە رۆژانی دیکەش چێژی لێ وەردەگیرێت.

چونکە رۆژانێک هەر ئەو بەرهەمانە پێشکەش دەکران، کەچی ئەمڕۆ زۆر لە سیما و روخساری گۆرانی و بەرهەمە هونەرییەکان شێوێندراون بۆیە گوێگرتن لەو بەرهەمە کۆنینانە چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە.

(قۆریات) ئەو هونەرە فراوانەیە کە زۆر لە شارەزا و پسپۆڕانی گۆرانی و مۆسیقا لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەری ئەنجامداوە لە هەموو ڕووە جۆربەجۆرەکانی زۆر لەو قوتابییە هونەردۆستانەی، کە لە بەشی مۆسیقای پەیمانگای هونەرە جوانەکان خەریکی خۆپێگەیاندنن، لە دوا قۆناغی پەیمانگادا و لە ساڵی بەر لە دەرچوونیان، لێکۆڵینەوەی فراوان لەسەر هونەری (قۆریات) دەکەن، بێگومان ئەوەش بایەخێکی تایبەتی هەموو لایەکە بەو هونەرە، ئەو بایەخە فراوانەش رەنگدانەوەی گرنگی هونەرەکەیە، لەوانەیە (قۆریات) نەک هەر لە هەولێر باو بێت، بەڵکو (قۆریات) لە هەموو ئەو شوێنانە باوە، کە گەلی تورکمان رەگی خۆیان تێدا کوتاوە و بەشێکن لە مێژوو و کولتوور و ژیاوی ئەو خاک و وڵاتە.

## کورتەیەکی قۆریات

ئەوانەی ئەوەی پێشڕەوانی هونەری (قۆریات)ن دەڵێن: قۆریات لە کەرکووک سەری هەڵداوە، دوای ئەوە لە (موسڵ) گەشایەوە و پاشان گەیشتە بەغدا و بە نۆتەکانی مۆسیقا زیاتر گەشایەوە، ئینجا هونەرەکە گەیشتۆتە هەولێر، لەوێشەوە بەرەو تەلەعفەر و پاشان بڵاوبوونەوەی بە گەلێ ناوچەی جیاجیا، بەڵام کەرکووک باوەشی دایکایەتی ئەو هونەرەیە. هەر لە ساڵانی (١٩٢٠) گۆرانیبێژە دیارەکانی ئەوسا بەرهەمەکانیان لەسەر (قیرقەوان) تۆمار کرد، یەکێ لەو گۆرانیبێژە دیارانەش، کە رۆڵێکی گەلێ بەرچاو و دیاری هەبوو لەم بوارە (مشکۆ)ی خوالێخۆشبوو بوو، لەگەڵ (عوسمان تەپلی باش و محەمەد جول بوتی و محەمەد جل بۆین)، هەر لەو ساڵانەش مامۆستای مەقاماتی کوردی، خوالێخۆشبوو (عەلی مەردان) لە رادیۆی کوردی بەغدا، هاوکاری ئەو هونەرمەندانەی دەکرد بۆ تۆمارکردنی بەهەرمەکانیان، کە گۆرانی تورکی بوو، بۆیە ئەو کاتە هەر بە هاوکاری مامۆستا (عەلی مەردان) چەندین گۆرانی

تورکی لە رادیۆی کوردی بەغدا تۆمارکراون و بڵاوکرانەوە.

هەروەکو زۆر لەوانە، کە ئێستا ماون دەڵێن: ئەو کاتەی ساڵ ١٩٢٠ بوو مزگەوتێک لە قەڵای هەولێر هەبووە و کابرایەک لە کەرکوکەوە هاتووە لەو مزگەوتە قورئانی فێری خەڵکەکە کردووە، (مشکۆ)ی خوالێخۆشبووش یەکێک بووە لەوانەی، کە لەسەر دەستی (حاجی فائیق بەزاز) و (سەید مەردان) و (نورەدین عەسافلی) و (شەهابەدین) شارەزایی لە مەقامات پەیدا کردووە، ئەو هاورێیە نزیکانە جۆشی یەکتریان دەدا بۆ ئەوەی پەرە بەو هونەرە بەرزە بدەن، (مشکۆ) لە گەلێ بۆنەو ئاهەنگی جۆربەجۆردا بەشداری کردووە، بگرە گەلێ جاریش لە بۆنەی ئایینی بەشداری کردووە لە تەک (حاجی فائق و حاجی جەمیل قاپقاپچی)، گەلێ جار گۆرانییان بە یەکەوە گوتووە.

دەڵێن: ئەو ساڵانەی خەڵکی لە مزگەوتەکان فێری قورئان خوێندن دەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا فێری خەسڵەتەکانی مقاماتی ئەو سورەتە قورئانییانە دەبوون بە هەموو جۆرەکانی مەقام فێر دەبوون، کەچی ئێستا قورئان خوێن زۆرە، بەڵام مەرج نییە هەموو مەقامەکانی بزانێ و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو مەقامە بزانێ، چونکە بۆ نموونە شوێن هەیە بۆ مەقامی گۆرانی، کە دەبێ لە نەهاوەند باز بدرێت بۆ حیجاز، بەمە ئەگەر شارەزایی لەو بوارە نەبێت، ئەوە لە تام و چێژ و تێگەیشتن کەم دەبێتەوە.

(حاجی عەبدوڵڵا) دەفژەن و (مەلا سەباح کەرکوکی) ئەو دوو کەڵە پیاوەن، کە دەکرێ ناویان بهێنین، چونکە ساڵانێک بوو بە هۆی خوێندنەوەی مەولود و ئاهەنگی ئایینی، رۆڵێکی بەرچاویان بینی لە پێشخستنی بواری (قۆریات) لە هونەری گۆرانی و مۆسیقادا.

ئەو ئامێرە مۆسیقییانەی، کە ئەوان لەو بۆنە ئایینیانەدا بەکاریان دەهێنا، بریتی بوو لە تەپڵ و دەف و جۆرەکانی تری ئیقاع.

لەو رۆژانەی قۆریات لە لووتکەی هونەری تورکمانەکاندا بوو لە ساڵانی ١٩٣٠ تا ١٩٤٠ هونەری (قۆریات) و بەستەو گۆرانی تورکمانەکان، بە زۆری لە ئەگلەنجەو ئاهەنگەکانی ماڵاندا دەبیسترا، کەڵەپیاوانی ئەو هونەرە دەچوونە چۆڵاییەکانی شارو سەیرانگاکان و شوێنە ناسراوەکانی وەکو (گردی قاڵنچاغا) لەوێ کۆدەبوونەوە و دەیانکرد بە بەزمی خۆیان لە گۆرانی گوتن و قۆریاتدا، لەو کاتەدا کەڵەپیاوانی ئەو بوارە ڕکەوتنە ڕکابەری یەکتر بە گوتنی قۆریات و گۆرانی جۆراوجۆری تورکمانی، دوای ساڵانێک ئەو هونەرە پەرەی سەند و کەوتە نێو کوڕگەلانی شار و رۆژ لە دوای رۆژیش پەرەی سەند، بۆ یەکەم جاریش لە ساڵانی (پەنجاکان) سەید کەماڵ ئامێری عودی بۆ ئاهەنگسازی هێنایە شار و دەیژەنی لەگەڵ ئەوەی، کە شارەزاییەکی تەواوی لە ژەنینی ئامێرەکەدا نەبوو؛ ئەو ساڵانەش ئاهەنگ لە دیوەخانی پیاوە هەبوودەکانی شار سازدەکرا و بە قۆریات و گۆرانی تورکمانی گەرم و گوڕ دەکرا.

### کەڵە پیاوانی قۆریات و گۆرانی تورکمانی

لە ساڵانی ١٩٥٩ عەبدولڕەحمان قزلای و چەند گۆرانیبێژێکی دیکە دەهاتنە رادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغدا و هەر ئەوانیش کۆمەڵێ مۆسیقاژەنیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا بۆ ئەو ئێزگە و خۆشیان لە بەغدا و کەرکوکەوە دەهاتن و بەرهەمەکانی خۆیان تۆماردەکرد، جگە لەوەش لە ماڵی خوشکی (فوئاد عوسمان) لە گەڕەکی سەیداوە، ئەو ئامێرژەن و گۆرانیبێژانە کۆ دەبوونەوە و ئامێری تۆمارکردنیشیان هەر لەوێ دادەناو بەرهەمەکانیان تۆماردەکرد، ئەوکاتە لە یەکێ لە ژوورەکانی ئەو ماڵە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژەکان کارە هونەرییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکرد، ئەو گۆرانیبێژانەی ئەوساش (محەمەد ئەحمەد و حاجی فائق و یونس خەتات و جەلال چەخماخچی و تەها بەنا) بوون، کە گۆرانییان تۆمارکرد جگە لە چەندان کەڵەپیاوی دیکەش لەو بوارە.

### دوا پەیڤ

ئەوە دڵۆپێک بوو لە دەریایەکی گەورەی هونەری (قۆریات)، چونکە هەرچەندی بنووسی و باسی لێوە بکرێت تەواو نابێت و زیاتر دەهێنێ. هونەر خۆی فراوانە، ئەگەر مولکی گەلێکیش بوو، ئەوە فراوانتر دەبێت، بۆ ئەوەی مێژوو بسەلمێنرێت، ئەو هونەرە خاوەنی خۆی هەیە و ناسنامەی ئەم گەلەی، ئەوە ئەرکی ئەوانەیە کە لە سەردەمەکاندا ژیاون، یاخود ئەوەی ئەوانەی، کە لە سەردەمەکاندا ژیاون و زۆر لە راستییەکانیان لە باو باپیرانەوە بۆ ماوەتەوە، هەقە ئەوان هەوڵی ون نەبوونی ئەو هونەرە گەورەیە بدەن ئەگەر ئەو هونەرەش رووەو نەمان چوو، ئەوە ئەو ئەوە تازەیە گوناهبارە، چونکە پاراستنی ئەرکی ئەمانە، بەڵام بە هەرشێوەیەک بێت ئەو هونەرە و کەڵەپیاوانی هەرگیز ون نابن.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (٤) وەرگیراوە.

# سینەما لە شاری هەولێر

**سەلاح مەزن**



سینەما، یان هونەری حەوتەم، چ وەک هونەر یان پیشەسازی و کالایەکی بازرگانی، وێڕای بایەخی هونەری و کولتووری، ئامرازێکی کاریگەر و پڕ لە جوانی و داهێنەرانەیە، کە کاریگەری دیاری لەسەر ژیانی تاکی هوشیار و نا هۆشیار، هەروەها لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەگشتی دروستکردووە. سینەما لەگەڵ سەرهەڵدانی، شار و شارستانی و پێشوەچوونی زانست، کولتوور و تەکنەلۆژیاوە، گەشاوەتەوە و وەک پێداویستییەکی کولتووری و رۆحی داهێنان و وەرچەرخانی بەخۆوە بینیوە. راستیان گوتووە (هەر نەتەوەیەک رۆمان و شارستانێتی نەبێ، نابێتە خاوەنی سینەما). هەربۆیە لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و شارستانییەتی مرۆڤایەتییەوە، هونەری حەوتەمیش قۆناغ دوای قۆناغ فۆرم و رواڵەتی پێشکەوتووتری لەگەڵ خۆی هێناوە.

هەر لەو رووەوە (تۆماس ئەدیسۆن)ی زانا و داهێنەری پیشەسازی سینەما دەڵێت: (ئەوەی سینەمای چنگ کەوێ، کاریگەرترین ئامرازی کارکردنە سەر خەڵکی چنگ دەکەوێ).

پیشەسازی سینەما وەک پیشاندان، بەرهەمی شۆڕشی پیشەسازی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و داهێنانی زانستییە. لە سەرەتا لە ساڵی ١٨٩٨ لە شاری پاریس و لەلایەن برایانی لومێر دروستکراوە. پاشان پێ بەپێ بەوڵاتانی ئەوروپا، ئەمەریکا و وڵاتانی دیکەی جیهان بڵاوبۆتەوە. بۆ ئەوەی بەرچاو روونییەکمان هەبێت، سەبارەت بە مێژووی پیشاندانی فیلم و دروستکردنی هۆڵەکانی سینەما لە شارەکانی کوردستاندا، لە شاری هەولێریش کە یەکێکە لە شارە کۆنەکانی جیهان، دەکرێ ئاوڕێک لە مێژووی سینەمای تورکیا (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) سینەمای ئێران و عێراق بدەینەوە، چونکە کوردستان لەگەڵێ رووەوە وابەستەگی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کارگێڕی راستەوخۆی بەو وڵاتە داگیرکەرانەوە هەیە. بە تایبەتیش لەدوای شەڕی چاڵدێرانەوە، کەوا هەر پێشکەوتن یان دواکەوتن بەسەر ئەو وڵاتانەدا هاتبێ، کاریگەری و رەنگدانەوەی لەسەر گەلی کوردستانیش هەبووە.

بۆیە جێگای پرسیار و

بەدواداچوونە، لەکاتێکدا سینەما لەو وڵاتانەدا، لە سەرەتای سەدەی رابردوودا، وەک پیشاندان و هۆڵی سینەما هەبووە، کەچی لە شارێکی دێرینی وەک هەولێر کە چ لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، یان لەژێر سایەی داگیرکەری عێراقدا، دەبینین لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا، سینەما وەک پیشاندان و پاشان دروستکردنی هۆڵی سینەما پەیدا بووە. ئەو نابەرابەری و زوڵم لێکردنە، تەنیا بواری سینەمای نەگرتبووەوە، بەڵکو لە گشت بوارەکانی ژیان و لە پارچەکانی دیکەی کوردستاندا پێڕەو کراوە.

بۆ یەکەم جار فیلم لە ئێراندا، لە هاوینی ١٩٠٠ هاتۆتە پیشاندان، لەساڵی ١٩٠٥دا، یەکەمین هۆڵی سینەما لە تاران ئاواکراوە، هەروەها لە ساڵی ١٩٣٤دا، هونەرمەندی بەرەچەڵەک کورد (عەبدولحوسێن سیند) یەکەمین فیلمی دەنگداری لەسەر ژیانی لوڕە کوردەکان بەناوی (کچە لوڕ) بەزمانی فارسی لە ستۆدیۆکانی بۆمبای دەرهێناوە.

بۆ یەکەم جار فیلم لە تورکیادا، لەساڵی ١٨٩٨ پیشاندراوە، لەساڵی ١٩٠٨دا یەکەمین هۆڵی سینەما دروستکراوە، لەشاری حەلەبی سووریاش لەساڵی ١٨٩٨ فیلم پیشاندراوە.

لە عێراقیشدا، بۆ یەکەم جار فیلمێکی سادە و بە ئامێری (سینەما توگراف) لە (دار ئەلشیفا) لەشەوی ٢٦ی گەلاوێژی ١٩٠٩ پیشاندراوە.

بابەتی فیلمەکان (راوی پڵنگ، گەڕان بەدوای یاقوتی رەش و وێنەی شەپۆلی دەریا... تاد..).

پاشان هەر لەو شوێنە لە کەرخ یەکەمین سینەما بەناوی (سینەمای بلوکی) لەهەمان ساڵ دادەمەزرێ، لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوو، کە هێشتا سینەما لە شارەکانی کوردستان بوونی نەبووە. لەشاری بەغدا (٢٠) هۆڵی سینەما هەبووە.

ئەگەرچی سینەمای ئەلحەمرا لە موسل لەساڵی ١٩٣٦ بەبێ مۆڵەت پێدان دامەزرابوو، تا لە ساڵی ١٩٤٧دا، وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی رێگا بەوە دەدات، کە لەشارەکانی دیکەی عێراقدا، مۆڵەت بدرێت بە دامەزراندنی هۆڵی سینەما.

دیارە لە ساڵەکانی سی و چلەکانی سەدەی رابردوو بەدواوە، بەردەوام هۆڵی سینەمای داخراو و هاوین لە بەغدای پایتەخت ئاوا دەکرایەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆری ئەو هۆڵانە بەهۆی سووتان یان وێرانبوون و تێکدانیان لەنێوچوون، ئەوەتانێ لەکۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردوو تەنیا (١٣) هۆڵی سینەما مابۆوە، هەروەها لە شارێکی وەک موسڵ نزیکەی (١٥) هۆڵی سینەما هەبووە، لە شاری هەولێر (٥) سینەما هەبووە، جگە لە سینەمای هاوینی جوندیان و سەفین کە دواتر نەمان، ئەو سینەمایانە لە هەولێر هەبوون: سینەمای سەلاحەدین، سینەمای ئەلحەمراء، سینەمای سیروان، سینەمای هاوینە هەواری سەلاحەدین و جوندیان، هەروەها لەکۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو سینەمای کریستال کرایەوە، بەڵام بەهۆی رەوشی ناڵەباری کوردستان زۆربەی سینەماکان بەرەو کزی و لاوازی بگرە داخستن و وێرانبوون هاتن، لەوانەش داخستنی سینەماکانی هاوینی جوندیان و سەفین، هەروەها سینەماکانی هاوینەهەواری سەلاحەدین و جوندیان و سینەماکانی هاوینی سەلاحەدین و حەمراء، هەروەها لەو ساڵانەی دوایی سینەمای کریستاڵ داخراو سینەمای سەلاحەدین بۆ مەبەستی بازرگانی تەخت کرا!! نەدەبوو بەهیچ شێوەیەک لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارەکان و وەزارەتی رۆشنبیری هەرێم رێگا بەوە بدرێت یەکەمین سینەمای مێژوویی هەولێر (سینەما سەلاحەدین) تەخت بکرێت. لە شاری سلێمانیدا، (٤) هۆڵی سینەما هەبووە، کە بەم شێوەیە بووە:

سینەمای رەشید، سینەمای دڵشاد، سینەمای هەڵەبجە.

لەشاری کەرکوک بزاڤی پیشاندانی فیلم لەرێگای یانەکای فیلم کە بەهاندانی کۆمپانیا نەوتییە بیانییەکان پشتیوانی دەکرا، لە گەشەسەندن دابووە، ئەوەتانێ لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردوودا، (١٠) هۆڵی سینەما لەشاری کەرکوک هەبووە:

سینەمای سەلاحەدین، سینەمای ئەلعەلەمین، سینەمای ئەتڵەس، سینەمای ئەلحەمراء، سینەمای بێجی، سینەمای قەرەتەپە، سینەمای وەتەنی، سینەمای ئەلخەزراء، سینەمای ئەلجمهوریە، سینەمای سندباد.

*** پیشاندانی فیلم لە شاری هەولێردا....**

بەپشت بەستن بە دیکۆمێنتەکانی سەر زارەکی، دیارە لەسەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا، فیلمی کورت و بابەتی سادە لە هەندێ جێگای جیا جیای شاری هەولێر، لەسەر دەستی پیاوانی ئایینی، رووناکبیران، مامۆستایانی قوتابخانە و شارەزایانی کشتوکاڵ، هەروەها نووسینگە و گۆڤار و...تاد... لەگۆڕەپانەکان، گەڕەکەکان، کەنیسەکان، نووسینگەکان، قوتابخانە

و لادێکان فیلم پیشاندراون، وەک: گۆڕەپانی شێخەڵلا، جێگای سینەمای سەلاحەدین، گۆڕەپانی پشت دواناوەندی ئەیوبییەی کچانە، کەنیسەی گەڕەکی عەرەبان، نووسینگە و ماڵەکان...

* ئەو نووسینگە و لایەنانەی خوارەوە ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە. لە ئاشناکردنی چاوی بینەرانی شاری هەولێر، بەجیهانی فیلم و سیحری سینەما لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوو، بەر لە دامەزراندنی هۆڵی سینەمای زستانی (داخراو) و سینەمای هاوینی (کراوە)دا:

* نووسینگەی ئەمەریکی کە دەکەوێتە تەنیشت چاپخانەی مەچکۆ جێگای ئوتوچی (مکوی) کە، خاوەنەکەی ناوی (میللەر) بووە و پیاوێکی ئاینپەروەری مەسیحی بووە، لە تارانی پایەتەختی ئێرانەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی هاتبووە هەولێر، واتە تەبشیری بووە، جگە لە پیشاندانی فیلم پەرتوکی ئینجیل، بڵاوکراوەی ئایینی و گۆڤاری (ئەلمختار)ی بەخۆڕایی دابەش دەکرد، فیلمەکانی لەماڵەوە و هەروەها لە گۆڕەپانی (جێگای سینەمای سەلاحەدین) بۆ بینەران پیشان دەدا، کابرایەکی کوردی یەزیدیش، کە چووبووە سەر ئایینی مەسیحی و ناوی (سادق کۆر- سادق ئەمەریکی) بوو، هاوکار و یاریدەدەری مستەر میللەر بوو.

*** نووسینگەی** (محل تجاري سكوت)

ئەو نووسینگەیەش کە خاوەنەکەی ناوی (عەبدوڵڵا سکوت) بوو، خەڵکی سکوتلەندا بوو، لە تەنیشت چاپخانەی کوردستانی گیوی موکریانی بوو، فیلمەکانی لە گۆڕەپانی سینەمای سەلاحەدین، نزیک شێخەڵلا، جێگای سینەمای ئەلحەمراز لەکاتی شەودا فیلمەکانی بۆ خەڵکی شاری هەولێر پیشاندەدا.

*** فیلمی فێرکردن لە قوتابخانەکاندا**

فیلمی پەروەردەیی و زانستی بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەیاندنی زیاتری قوتابیان لە قوتابخانەکانی ئەوکاتەی هەولێر پیشان دەدران.

*** سینەمای کشتوکاڵی**

ئەو سینەمایە بەشێوەی سینەمای گەڕۆک لە لادێکان و بۆ ڕێنمایی کشتوکاڵی جوتیاران پیشان دەدراو، لە چل و پەنجاکان و دواتریش بەردەوام بوو.

* سینەمای گەڕۆک وەک ئامرازێکی هۆشیارکردنەوەی خەڵک بۆ مەبەستی سیاسی بەکار هێنراوە، بە تایبەتیش دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی عێراق و تەنانەت لە قۆناغی جیا جیادا، ئەو سینەمایە لە گۆڕەپان، باخچە و



گەڕەکانی شار و لادێکان گرنگی پێدراوە.

*** بنیاتنانی هۆڵی سینەما لە هەولێر.**

لەسەر مێژووی ساڵی دروستبوونی یەکەمین هۆڵی سینەما لە شاری هەولێر واتە دامەزراندنی (سینەمای سەلاحەدین) بیروڕای جیا جیا هەبووە، بەڵام دوای دیدار و گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی و بەدواداچوونی خەمخۆران، ئەوە ساغ بۆتەوە کە سینەمای سەلاحەدین وەک یەکەمین سینەمای شاری هەولێر لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی رابردوو هاتۆتە بنیاتنان. ڕووناکبیری کۆچکردوو مامۆستا جەوودەت ئەحمەد ناجی، کە ڕۆشنبیرێکی پێشەنگی بواری سینەما و ئەدەبی ڕۆمان و سیاسەت بوو دەڵێت: سینەمای سەلاحەدین لەساڵی ١٩٤٧ دامەزراوە.

بەڵام کاک ئەنوەر خۆشناو لە دوکانی کاک بلال بەرگدروو گوتی: لەساڵی ١٩٨٢ لە نیویۆرک بووم، لە دوکانی جوولەکەیەک کە خەڵکی وڵاتی مەغریبی عەرەبی بوو، کابرایەکی بەساڵاچووی پێناساندم، کە ناوی (سیون) بوو، (سیون) گوتی: لەساڵی ١٩٤٥دا، هەردوو سینەمای سەلاحەدین لە هەولێر و سیروان لە شاری سلێمانی دامەزراند، سینەمای سەلاحەدین سەرەتا لەساڵی ١٩٤٥ هاوین بووە، پاشان لە پاییزی ١٩٤٦دا، بۆتە زستانی. مامۆستا جەوودەت ئەحمەد ناجی دەیگۆت: لەساڵی ١٩٤٦دا، لە قوتابخانە، گوێم لە گۆرانییەکانی فەرید ئەتردشی دەبوو.

هەروەها مامۆستایان جەوودەت ئەحمەد ناجی، ئەنوەر خۆشناو و بیلال

خەیات لەسەر ئەوە هاوڕابوون، کە یەکەمی فیلمەکان (عەنتر و عەبلە) و (چاپوکلی) پیشان دراوە.

هەروەها لە درێژەی گفتوگۆیەکەمان لەدوکانی (بلال خەیات) لەهاوینی ١٩٩٥ یان ١٩٩٦ بوو، گوتی: (جێگای سینەمای ئەلحەمراء، زەویەکەی لە بنەڕەتدا، موڵکی تەحسین عەلی پاشای دۆغرەمەچی بووە، لەگەڵ کۆمپانیای (شرکە ئیسماعیل شەریف- شرکە ئەلحەمراء ) بەشەریکی رێککەوتن، ئەو کۆمپانیایە لە بەغدا بوو، لەزۆربەی شارەکان سینەمایەکی بەناوی (سینەمای ئەلحەمراء ) دامەزراندبوو. بەتایبەتی دوای ئەوەی کەوا لەساڵی ١٩٤٧ وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی رێگەی دا بەوەی کە جگە لە بەغدا لەشارەکانی دیکەش هۆڵی سینەما مۆڵەتی دامەزراندنیان بدرێتێ، ئەگەرچی (سینەمای ئەلحەمراء ) لەشاری موسڵ ساڵی ١٩٣٦ دامەزرابوو!!

هەر لە دوکانەکەی (بلال خەیات) هەموویان هاوڕابوون لەسەر ئەوەی کە سینەمای ئەلحەمراء لەساڵی ١٩٤٦ وەک سینەمایەکی داخراوی زستانی دامەزراوە، پاشان لەساڵی ١٩٤٧ شاشەی هاوینیشی دامەزراندووە، کە لەلایەن کابرایەکی بەغدایی ناوی (موسا رەعد) بووە، بەڕێوە چووە هەروەها بەڕێزان (عەبدولرەزاق دوغرەمەچی، رەفعەت تووتنچی و کاک هاشم) یەکەمی ئەو کەسانە بوون کە لە ساڵانی ١٩٤٦ و ١٩٤٩ بلیت (بتاقە)یان فرۆشتووە، یەکەم فیلم کە لەو سینەمایە پیشاندراوە، فیلمی (غرام و ئینتقام)ی یوسف وەهبی بووە. جێگای باسە، کەوا چەندان جار لە دوکانەکەی (بلال خەیات) کەوا ژمارەیەکی بەرچاو لە رووناکبیر و سیاسەتمەداری ناسراوی هەولێر لەوێ دادەنیشتن، منیش لەرێگای ئەندازیار زانا مەلا شەریف کە خوشکەزای کاک بلال بوو، بەو دوکانە ئاشنا بووم، کەوا مامۆستایانی نەمر (سالح حەیدەری)، (ناسر یوسف)، (جەوودەت ئەحمەد ناجی) و (حەمید خۆشەوی) یادیان بەخێر، هەروەها بەڕێز (ئەنوەر خۆشناو) سڵاوی لێ بێ، لەو دوکانە بابەتی جیا جیای سیاسی، کولتووری و کۆمەڵایەتی بەگشتی و شاری هەولێر بە تایبەتی باس دەکران لەوانەش بابەتی سینەما، چونکە نەمران (جەوودەت ئەحمەد ناجی و ناسر یوسف) دوو رۆشنبیری شاردزا و زەوق بەرزی سینەما و خوێندنەوەی ئەدەبیات بوون، یادیان بەخێر، هەروەها نەمر (سالح حەیدەری) پیاوێکی پڕ بیرەوەری و هێمن و لەسەرخۆ بوو، کەمتر وا رێکدەکەوت لەگەڵ نەمر (حەمید خۆشەوی) دانیشم. ئەمجار لەرێگای بەدواداچوونم بۆ هەندێ ئاخافتنی رۆژنامەوانی لەبارەی هەمان بابەت لەژمارە ٢٠٤ی رێکەوتی ١٤/١/١٩٩٦ ئاڵای ئازادی هەندێ بەڕێز بەو شێوەی خوارەوە، قسە دەکەن:

- بەڕێز عەبدولرەزاق (بەڕێوەبەری سینەمای سەلاحەدین) لە ساڵی ١٩٩٦: سینەمای سەلاحەدین لەساڵی ١٩٤٧ هاوین بوو، پاشان لەساڵی ١٩٤٩ هۆڵی بۆ دروستکراوە.

-رۆژنامەوان (عومەر فەرهادی): ئەوەی راستی بێت هۆڵەکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٧ کرابوو، خۆم یەکەم جار چوومە سینەما (مەبەست سینەمای سەلاحەدین) لەژیانم لەگەڵ برا گەورەکەم کە لە ٢٩/٤/١٩٤٨ کۆچی دوایی کرد (یادی بەخێر)، لەدرێژەی قسەکانی دەڵێت: فیلمی (مەمنوع ئەلحوب)م دیت، کە لە نواندنی گۆرانیبێژ (محەمەد عەبدولوەهاب) بوو.

هەروەها بەڕێز عەبدولرەزاق دەڵێت:

سەرەتا کابرایێ هەبوو لە موسڵ، سینەمای هەبوو، ناوی (ناجی عەقراوی) بوو، بەڕەچەڵەک جوولەکە بوو، زۆرجار سەرپەرشتی سینەمای دەکرد، پاشان کابرا سقوتی جنسیەی کرد، ئێمەش ئامێرەکەمان لێ کڕییەوە، دوای ئەوە یەکێکی تر کاری بە سینەماکە دەکرد، ئەرمەنی بوو، ناوی (سمیات) بوو، (رەنگە ئەو سمیاتە، هەر ئەو (سیون)ە بێت کە بەڕێز ئەنوەر خۆشناو لەساڵی ١٩٨٢ لە نیویۆرک چاوی پێی کەوتووە- نووسەر).

- هەروەها بەڕێوەبەری سینەمای سیروان دەڵێت: سینەمای سیروان لەساڵی ١٩٦٢ دامەزراوە، یەکەم فیلم (جنگلی) بوو نواندنی (شامی کاپور- فیبجنتی مالا).

- غەفور رەحیم ئەحمەد، پێش سینەمای سەلاحەدین، سینەمای تر نەبووە، بیرم دێت ئەوکات ئینگلیزەکان سینەمای سەفەرییان دەهێناو، هەر جاردێ لە گەڕەکێ، هەندێ قوماشی سپییان لەدیوار دەدا و، فیلمەکەیان لەسەر پیشان دەدا، ئینجا دوای ئەوە سینەمای سەلاحەدین پەیدا بوو.

- هەر لەو بارەیەوە رۆژنامەوان (عومەر فەرهادی) دەڵێت: ئینگلیزەکان جار جارە سینەمای سەفەرییان دەهێنا، فیلمی پروپاگەندەی خۆیان لێ پیشان دەدا. لەبیرمە لە گەڕەکی (تەیراوە) لەپشت قوتابخانەی ئەیوبیە، کە بینایەی لێ دروست نەکرابوو، ئەم جۆرە فیلمانە و فیلمی کارتۆنیان بەخۆڕایی پیشان دەدا.




# سەرەتایەک بۆ سینەما لە هەولێر...

**ئاشتی عەدۆ**

سیحری سینەما و هۆڵەکانی نمایشی فلیم، هەر لە سەرەتاوە جەماوەر و بینەرێکی بەرفراوانی بۆ خۆی راکێشاو هۆڵی سینەماکانی کرد بە شوێنێکی کلتووری و کۆمەڵایەتی، شوێنی فێربوون و دنیا دیتن و کات بەسەر بردن.

شاری هەولێریش وەک هەر شارێکی دیکەی جیهان، بێبەش نەبوو لەم رووەوە. هەرچەندە من لە مێژووی دروستبوونی سینەماکانی هەولێر نازانم، بەڵام لەوانەیە چەند سینەمایەکی شاری هەولێر بگەڕێتەوە بۆ کۆتایی چلەکان یان سەرەتاکانی پەنجایەکان.... هەولێری ئەو سەردەم پڕ بوو لە سینەما.

سینەمای سەفینی هاوینی، جوندیانی هاوینی، سەلاحەدینی هاوینی، سینەمای سیروان و حەمرا و سەلاحەدین و سەرەتای هەشتاکان سینەمای کریستاڵیش زیاد بوو.

کاتی فیلمەکانی سینەما هاوینییەکان، خەڵکانێکی زۆر لە سەربانی ماڵەکانیان تەماشای سینەمای جوندیانیان دەکرد، کە دەکەوتە ئەودیوی سینەمای سیروان.

وەک ئاشکرایە ئەو سەردەم خەڵک تەنها رادیۆی هەبوو بۆ گوێگرتن و کات بەسەربردن... بۆیە فیلمی سینەماکان دوو هەفتەیەک نمایش دەکران. خێزانەکانی شاری هەولێر هەندێ جار دەبوایە سێ رۆژ لەوەو پێش بلیتیان ببڕیبایە بۆ بینینی فیلمێک. خەڵکانێکی زۆری شاری هەولێر دەچوون بۆ سینەما... بۆیە سینەماکان بۆ راکێشانی بینەر بۆ خۆیان پڕوپاگەندە و بانگەشەیان بۆ فیلمەکانی خۆیان بە شێوەیەکی زۆر سینەمایانە دەکرد. دوو کەس

ئەم کارەیان دەکرد، یەکێکیان شریتی فیلمەکەی هەڵدەگرت و ئەویتریان بانگەوازی فیلمەکەی دەکرد، بە شێوەی حەکایەتێکی سەیر و سەمەرە باسی پاڵەوانی فیلمەکەی دەکرد و ناو بازاڕی دەکردە بەشێک لە شانۆی پڕوپاگەندە بۆ فیلمی سینەماکەی خۆی.

لە یادگاری زۆری خەڵکی هەولێر چەند ناوێک هەن، کە ئەم داستانی فیلمانەیان لەناو بازاڕ دەگێڕایەوە... وەک (ئەبو سەباح)ی وێنەگر و رەسوول و مستۆ و چەندانی دیکە.

فیلمەکانی ئەو سەردەمەش زۆربەی عەرەبی و هیندی بوون، دواتریش ئەمریکی و ئیتاڵی بوون... کێ لە بیری نییە فیلمی: دایکی هند، شامی کابوور لە پاریس، گاید، فیلمەکانی سەباح و فەهد بەلان و فەرید ئەترەش و ئەسمەهان و عەبدولوەهاب و عەبدولحەلیم و فەرید شەوقی و.... هەموو فیلمە ئەمریکییەکانی هەرقەل و ماشستی و سپارتاکۆس و رۆستەم و شەمشوون و فیلمە کاوبۆییەکانی رینگۆ و ترنتی و بۆب سپینسەر و جۆلیانۆ جیما و ستیڤ ریڤز و... زۆرانی دیکە.

ئەو هەموو فیلمانە یادگارییەکی زۆریان هەیە لەلای خەڵک و بەشێکن لە مێژووی سینەمای هیندی و رۆژئاوایی... ئەو سەردەم خەڵکی هەولێر بۆ بینینی ئەم فیلمانە بەشداری ژیانی کۆمەڵایەتی شاری هەولێریان دەکرد و لۆژی سینەماکانیان بە خۆیان و بە منداڵەکانیانەوە پڕ دەکردەوە.

نرخی بلیتیش بە گوێرەی دوور و نزیکی کورسییەکانی بوون لە شاشەی سینەماکە، چل بایی و شەستی و حەفتایی و لۆج... تاد.

ئەو دەم پشوودەکیشی لە نیوەی فیلمەکە هەبوو بۆ مەحەللەبی و لەفە خواردن و کۆکا کۆلا خواردنەوە.

لە جەژنەکانیشدا منداڵان دوای جلی تازە و قۆندەرەی تازە هەموو خۆشییەکەیان بینینی فیلمەکان بوو، کە هەر رۆژێ فیلمێک دەگۆڕا و بە چوار کاتی جیاواز نمایش دەکرا. قەڵەباڵغی و خۆشی و چوونە ناو سینەما و زەنگ لێدان و سینەما بەربوون بەشێک بوون لە جەژن، جەژن بەبێ سینەما هەر جەژن نەبوو... دەبوایە یەکەم رۆژیش لە کاتژمێری یەکەم، کە دەی بەیانی بوو کێ بەختی هەبایە یەکەم فیلمی رۆژی جەژنی دەبینی و دوای تەواو بوونی فیلمەکە لە سینەمای سیروان، ملی رێگای سینەمای حەمرای دەگرت بۆ بینینی فیلمێکی دیکە. جەژنە پڕ لە فیلمەکان و پڕ لە گۆرانی حەسەن زیرەک... ئەو رۆژانەی ئەو جەژنانە ئێستا لە یادگاری ئەو نەوەیە، کە ریشی بووە بە ماش و برنج، وەک فیلمێکی سینەمایی بووە بە یادگارییەکی پڕ لە خۆشی تەمەنی منداڵی خۆی، کێ لەفە خۆشەکانی پێش سینەماکانی لە بیر دەچێ. (خاوەنی سینەمای حەمرا... یادی بەخێر)، کە منداڵان هاواریان دەکرد (مەدزە، مەدزە) ئەویش هەزار جوونی دەدا.... گەنجانی ئەوها هەبوون ئەوەندە فیلمی هیندیان دیتبوو فێری زمانی هیندی بووبوون. منداڵانیش لە کۆڵانەکان فیلم فیلمانێیان دەکرد... هەموومان یەک دوو پارچە فیلمی هەرقەل و شامی کابوور و ئاشا پاریخمان هەبوو.



ئەو دەم هەولێر چۆلتر و کۆمەڵایەتیتر و پڕ ژیان بوو، برادەرێک بۆی گێڕامەوە، گوایە لە جەژنەکان ئەو منداڵانەی، کە بلیتی فیلمەکانیان بە دەست نەدەکەوت یان پارەیان نەدەبوو... لە دەوری گەنجێک کۆ دەبوونەوە و گەنجەکەش داستانی فیلمەکەی بۆ دەگێڕانەوە. کێ فیلمی (غەریبێک لە سوید)ی لە یاد نییە، کە فیلمێکی سێکسی بوو، بەڵام خاوەنی سینەما هەندێکی دەبڕی. ئەو کات کەسێکی کورد لە سوید نەبوو، جا کێ دەڵێ کۆچکردنی ئەو هەموو خەڵکەی کە ئێستا لە سویدە سووچی ئەو فیلمە نەبووبێ، بۆ گاڵتە یان پێکەنین. کە من چوومە دەرەوە بەرەو سوید نا، بەڵکو بەرەو ئیتاڵیا، تازە بناغەی سینەمای کریستاڵیان دادەنا. ئێستاش دوای ئەو ماوە دوور و درێژەی ژیانی ئەورووپام و دیتنی سەدان هۆڵی سینەمایی سەیر و پڕ لە مێژوو، بەڵام لەوەتی گەڕاومەتەوە نە سینەمای کریستاڵم بینیوە و نە چووم بۆ سینەماکانی دیکە، سینەماکان ماون... ڕەحمەت لە گۆڕی سەید مستەفا، بەڵام چ مانێک، سینەماکان پیس و پەلۆخ و کۆن و رووخاو و بێ جەماوەر و بێ بینەر و بێ قەڵەباڵغی. منداڵەکانیش لە جەژنەکانیش بێبەش بوون لە سینەما و جەژنە پڕ لە فیلمەکان.

ئێستا سینەماکانمان (سکرین) فیلمی سێکسی پێشان دەدەن و سینەما دوور کەوتۆتەوە لە لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی شاری هەولێر... ئاشکرایە دوای ئەو جەنگانەی کە




بەسەر کوردستان و عێراقدا هاتووە، بازرگانی فیلم ناگاتە هەولێر و عێراق، هەرچەندە تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر بینەرێکی زۆر لە سینەما دوور دەخاتەوە.

بەڵام تەلەفزیۆن قەت ناتوانێ سیحری هۆڵی سینەماکان کەم بکاتەوە، چوون بۆ سینەما لایەنێکی کۆمەڵایەتی گرنگی ژیانی ناو شارە... هەر تەنها فیلم دیتن نییە... جا خۆزگە پارێزگای هەولێر یان وەزارەتی رۆشنبیری بتوانن ئەم گیروگرفتەی نەبوونی فیلم و هۆڵی باشی تازە دابین بکەن بۆ خەڵک. هەولێری ئەورۆش هەر هەولێر نییە، بەڵکو پایتەختی کوردستانە، پایتەختیش پێویستی بەو لایەنە کۆمەڵایەتییە هەیە... دەبوایە هەتا ئێستا هیچ نەبوایە بەڕێوەبەرایەتی سینەما یەکێک لەو هۆڵانەی تازە بکردبایەوە و بیکردبا بە (خانووی فیلم) بۆ نمایشکردنی فیلمی هونەری ئەورووپی و جیهانی و کوردی و فارسی باش، بۆ پەرەپێدانی ئاستی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خەڵکی هەولێر.

ئێستا لە ئەورووپا جۆرێکی تازە پەیدا بووە لە دروستکردنی هۆڵی سینەما، ئەوەش لە یەک شوێندا حەوت یان نۆ هۆڵی سینەما دروست دەکەن و لە یەک کاتدا حەوت فیلم نیشان دەدرێ.... جا بۆ هەولێر بێبەش بێت لەم جۆرە هۆڵانە، کێیە ئەو دەوڵەمەندەی شاری هەولێر، کە بتوانێ حەوت هۆڵی سینەمامان بۆ دروست بکات و خەڵکی هەولێر شاد بکاتەوە بە دنیای سیحری هۆڵی تاریکی ناو سینەماکان و باری کۆمەڵایەتی و شارستانییەتی پایتەخت بەرەو پێش بەرێت.

دەوڵەمەندەکانمان هەندەی سەید مستەفای رەحمەتیشیان پێ ناکرێ!!

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ، ژمارە (٦)، ٢٠٠٥ وەرگیراوە.

# سینەماکانی هەولێر

**شێرزاد قادر**

لە سەرەتای سییەکان، پێش دروستکردنی یەکەمین سینەما لە شاری هەولێر، سینەمای گەڕۆک لە کۆڵانەکانی شاردا فیلمی پڕوپاگەندەیان بە خەڵکی نیشان دەدا و هەندێ جاریش پێش دەست پێکردنی فیلمەکە بە دەهۆڵ و زوڕنا خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە تا زیاتر خەڵک فیلمەکە ببینن بۆ مەبەستی خۆیان، واتە میری ئەوکات و دام و دەزگاکەی و زۆر جاریش بۆ قەزا و ناحیەکان و گوندەکانیش دەچوون.

یەکەمین سینەما لە ساڵی ١٩٤٥ لەلایەن بنەماڵەی یەعقوبییەکان دروست کرا، کە هاوینی بوو و بەفیلمی عەرەبی (یوم سعید) نواندنی (عەبدولوهاب و ئیلهام سەعید) بوو، پاش ساڵێک زستانییەکەشی دروست کرا و تا ئێستاش هەرماوە، بەڵام هاوینەکەی رووخێنرا و سینەمای دووەم سینەمای حەمرا بوو لەساڵی ١٩٤٦ لەلایەن تەحسین عەلی پاشا، کە ئێستا لە ئەستەمبوڵ دەژی، دروست کرا و بە



فیلمی (سلامە) نواندنی (ام کلثوم) و یەحیا شاهین کرایەوە. زستانییەکە یەکەم جار بوو و دوایی هاوینییەکەشی کرایەوە.

لە لایەن ئیسماعیل یەعقوبی سینەمای جوندیان دروست کرا، کە دەکەوێتە بەرامبەری بەریدی ئێستا و بینایەکەی چەند کۆگایەکی تێدایە و تا ناوەندی شێستەکان مابوو و سینەمای سەفین لە شوێنی پەروەردەی هەولێری ئێستا بوو، لە سەرەتای حەفتاکان کرا بە گازینۆ سەفین، کە خاوەنەکەی یوسف سەبزەچی و کەسانی تر بوون، سینەمای جوندیان و سەفین تەنیا هاوینی بوون و، سینەمای سیروانیش لە شەستەکان دروست کراوە، ئەویش زستانییە.

سینەماکانی هەولێر جاران زۆر فیلمی هیندی و عەرەبی دەهاوێشت و رۆژی یەکەمی فیلمەکە بە خۆڕایی بوو، هەر سینەمایەک پڕوپاگەندەی بۆ فیلمەکەی دەکرد، وەک دابەشکردنی پارچە کاغەزی رەنگاو رەنگ و تایبەتی بە فیلمەکە، زۆر جاریش لەگەڵ گێڕانی تابلۆی فیلمەکە دەهۆڵ و زوڕنایان لێ دەدا یان بە دەنگێکی بەرز باسی پاڵەوانی فیلمەکەیان دەکرد و فیلمی یەکەمی سینەمای سیروان فیلمێکی هیندی بوو بەناوی (جنگلی).

لە کتێبی هەولێر بە سەرپەرشتی و رێکخستنی تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر، ١٩٨٥ لاپەڕە ١٦٨-١٦٩ وەرگیراوە.

# فۆتۆی شەمسی لە هەولێر

ئا: سەلام عەدۆ

زۆربەمان ئەوانەی ئێستا تەمەنمان لە پەنجاکاندایە، یادگاری یەکەم وێنەی (شەمسیمان) واتە (هەتاوی) لە یادە، کە لەسەر کورسییەکی بچووک لە بەردەم پەردەیەکی رەش یان سوور یان رەشی پڕ بە خاڵی سپی بەرامبەر ئەو کامێرە سندووقە گەورەیە دادەنیشتین و هەناسەمان لەخۆ ڕادەگرت و دواتریش هەڵدەستاینەوە و سەرنجی دەستی فۆتۆگرافەکەمان دەدا و بەبێ ئەوەی بزانین وێنەگرەکە دەستەکانی لەناو سندووقە دارە سیحراوییەکەدا چی دەکات، نەشمان دەزانی ڕووناکی و تاریکی و ڕۆژە هەوراوییەکان چ دەردەسەرییەک بۆ وێنەگرەکان دروست دەکات. کاتێک لەبەر کەمی ڕووناکی لە ڕۆژە هەوراوییەکاندا نەیاندەتوانی وێنەیەکی ساف و ڕوونمان بۆ بەرجەستە بکەن.لە هەولێر ئەوەی بە بیرمان بێت لە سەرەتای ساڵانی حەفتایەکان لە تەنیشت پارێزگای هەولێر، کۆمەڵێک لەو فۆتۆگرافانە بە خۆیان و سندووق و سەتڵێکی ئاو و پەردەکانیانەوە بازارێکی



قەشەنگیان پێک هێنا بوو، سەرقاڵی وێنەگرتنی شەمسی بوون، بۆ دەرهێنانی ناسنامە و بڕوانامە و کاروباری میری.ئەو سندووقە سحراوییە ستۆدیۆیەکی تەواوی گەڕۆک بوو، کە وێنەگرەکە دەبووایە شارەزاییەکی باشی هەبێت لە ماددە کیمیاوییەکان و حەساسیەتی وردەقە و هاوێنەی کامێرا، بێجگە لە بزێوی و سووک جوولانەوە و خێرایی جەستەی وێنەگرەکە خۆی. بێگومان وێنەی هەتاوی عەکسی فیلمی نییە، بەڵکو هەردوو تاقیکردنەوەکە بە نێگەتیف و پۆزەتیڤەوە لەسەر کاغەز ئەنجام دەدرێت.

*** مێژوویەکی کورتی فۆتۆگراف**

هاتنە ژووردوەی ڕووناکی ڕۆژ لە شوێنێکی بچووکەوە بۆ ناو ژوورێک وای دەکرد ئەو شتانەی دەرەوە بەرجەستە بکات لەسەر دیواری ژوورەکە، یان لەسەر پارچە کاغەزێک، کە ئەوەی لە سەدەی چواری پ. ز (ئەرستۆ) ئاماژەی پێ کردووە. دوای ئەوەی ئیتاڵییەکان ناویان نا (ژووری ڕەش)، چونکە ڕووناکی گواستنەوەی شتەکانی هەیە، بێگومان یاسای سروشتی حوکمڕانی هونەری فۆتۆگراف دەکات. بێجگە لەوەی کە مرۆڤەکانی چاخی بەردینیش، هەڵوەستەیان بۆ ئەو ڕووداوە کردبوو لەناو ئەشکەوتەکانیاندا. کاتێک کە سێبەری شتەکانیان لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان دەبینینەوە، بەهۆی ڕووناکی ڕۆژەوە.

با زۆر دوور نەڕۆین، بەڵام هەنگاوی یەکەم لە مێژوودا دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی کامێرای

(ژووری رەش)، کە ئیتالییەکان لە سەدەی شانزەهەم بەکاریان هێنا بۆ رەسمکردنی تابلۆ مێژووییەکانی ئەو سەردەمە. بێجگە لەوەی هونەرمەند (داڤینچی) ئاماژەی بە کامێرای (ژووری رەش) داوە لە سالّی (١٤٩٠) تاکو سالّی (١٥٥٠) عەدەسەش دۆزرایەوە، بەلاّم یەکەمین فۆتۆگرافی دەگەرێتەوە بۆ سالّی (١٨٢٧) لە لایەن (Niepce) کە ماوەی کردنەوەی عەدەسەکە (٨) کاتژمێر بوو. بێگومان هەر لەگەلّ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق لە سالاّنی (١٩١٧)دا فۆتۆگراف بوو بە پیشە و کاری زۆر لە فۆتۆکارەکان.

جا با بزانین مێژووی فۆتۆی شەمسی لە کوردستان بە تایبەتی لە هەولێر بۆ چ سالاّنێک دەگەرێتەوە، هەر بۆیەش لەگەلّ دوو وێنەگری شەمسی ئەو سەردەمە گفتۆگۆمان کرد:

* وێنەگر (**خدر خۆشناو**) لە دایکبووی گوندی (ئارمەوان) لە ناوچەی خۆشناوەتی لە سالّی (١٩٣٩) لە دایک بووە، دوای ئەوەی خێزانەکەی سالاّنی چلەکان بۆ ئیشکردن روو لە شاری کەرکووک دەکەن، مام خدر منداڵیی خۆی لە کەرکووک دەباتە سەر و دەبێتە ئیشکەرێکی لێهاتوو بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان و یارمەتیدانی باوک و دایک و براکانی.



*** کەی دستت بە کاری وێنەگری کردووە؟**

- لە سەرەتای (١٩٥٨) بە کامێرای سندووق کە (٨) وێنەی دەگرت. دواجار بە کامێرایەک کە دوانزە وێنەی دەگرت، بێگومان بە فیلمی (١٢٠) کارم دەکرد. دوای ئەو سەردەمە لە کەرکووکەوە هاتمە هەولێر و لە رێگای چەند برادەرێکەوە لە بن قەلاّتێ دەستم بە کاری وێنەگرتنی شەمسی کرد، ئەو سەردەم هێشتا دوکانەکانی ژێر قەلاّت تەواو نەببوون، دوای تەواو بوونیان وێنەگرەکان چوونە بەرامبەر قەلاّت، تەنیشت پارێزگا.

*** باشە هەر لەوێ وێنەت دەگرت؟**

- نەخێر من پەیوەندیم لەگەلّ بەندیخانەکان و پارێزگادا هەبوو، زۆرجار سندووقەکەم دەبرد بۆ ناو بەندیخانەکان.

*** بە بروای تۆ کێ یەکەم وێنەگری**



**شەمسی بوو لە هەولێر؟**

- یەکەمین کەس "مامۆستا گیوی موکریانی" بوو، دواتر "حەنا سلێوە"، دواتر "جەوهەر ئەکردم" و "محەمەد عەلی" شاگردی موکریانی بوون، ئەوان وێنەکانیان لە ژوورەوە دەشوشتەوە، نەوەک لەناو سندووقی کامێراکە. ئەوەش کاری دەکردە سەر وێنەکان، چونکە جارجار رووناکییان بەردەکەوت، کە ئەوانە فێری پیشەکە بوون، وازیان لە موکریانی هێنا و کامێرای خۆیان دانا. دواجار (جەوهەر ئەکردم) ستۆدیۆی نجومی کردەوە.

*** ئەو کات مۆڵەتی وێنەگرتن هەبوو؟**

- بەڵێ من لە بەغدا تاقی کرامەوە و مۆڵەتیان پێدام، ئەو مۆڵەتەش لە هەولێر تازە کرایەوە.

*** بێجگە لە وێنەی شەمسی کاری ترت بەو کامێرایە کردووە؟**

- بەڵێ زۆرجار (فۆتۆکۆپیمان) پێ کرد. واتە بۆ ناسنامە و نفوس و



شتی دیکە. من کاری وێنەگریم لە زۆر شارۆچکەکانی کوردستان کردووە، هەر ماوەی لە شوێنێک دەمامەوە. وێنەی زۆر کرێکار و شێت و قەلات و ناو بازارم گرتووە، هەندێ جاریش هەر بۆ یاری کاری دووانی و سێیانیمان لەسەر یەک پۆستکارت دەگرت. وەک یارییەکی هونەری ڕێپێوانەکانی شاری هەولێرم گرتووە، هەر لە ساڵی ١٩٥٨ تاکو ساڵانی ١٩٧٠، لە ساڵی ١٩٦١ لە (شێروان مەزن) یەک مانگ وێنەی پێشمەرگەم دەگرت بە پێنج دینار.

*** باشە ئەو وێنانە چەندیان ماون؟**

- ڕاستییەکەی باوڵێکی پڕ لە فۆتۆم هەبوو، بەڵام هەموویان سووتان و فەوتان، زۆرێکیان لە ساڵانی ١٩٦٣، دواتریش ساڵانی هەشتایەکان لە ترساندا زۆرم فەوتاند، بێجگە لەوەی زۆر جاریش تووشی گیروگرفت دەبووم لەگەڵ مەلا و شێخەکان، دەیانگوت ئەو کارەی تۆ (حەرامە)، جا منیش لە ترسی قسەی خەڵک و حزبی بەعس بۆ پاراستنی پاکی خۆم نەمتوانی ئەو وێنانە بپارێزم. بە بیرم دێت تەنها (شێخ عومەری بالیسانی) کە زۆرجار دەمدیت ئەو دەیگوت وێنەگرتن حەرام نییە، چونکە تۆ نیشی خەڵکی پێ ئەنجام دەدەیت و خۆتی پێ دەژێینی.

*** وتت رەسمی شێتەکانی هەولێرت گرتووە؟**

- بەڵێ، وێنەی زۆربەی شێتەکانم هەبوو، چونکە ڕێزم هەبوو بۆیان، بەڵام ئەو وێنانەش هەر فەوتاون.

*** وێنەگرێکی باش بوویت؟**

- بەڵێ، چونکە ئەوەندەی حەزم دەکرد وێنەکان چاک و ساف و جوان بن ئەوەندە خەمی پارەم نەبوو. وێنەی هەندێ وێنەگر، لەبەر کەمی شارەزای لە شووشتنەوەکە و جۆری گرتنەوەی ماددە کیمیاوییەکان، وێنەکان دوای ماوەیەکی کەم زەرد هەڵدەگەڕان و لێ



دەچوونەوە... هەندێ وێنەگر هەتاکو وێنەیەکیان دەگرت، ئەوان دە وێنەیان دەگرت.

*** رەنگی پەردەکانت چۆن بوون؟**

- کەسک و سوور و رەش، رەش و خاڵداری سپی، بۆ ژنان پەردەیەکی کەسکم بەکار دەهێنا، لەبەر رەشی عەباکانیان، دەبوایە ئاگام لە قژی رەش و سپی هەبوایە.

*** کەی وازت لەو کارە هێناوە؟**

- ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣.

وێنەگر کاک (**عەبدوڵڵا عوسمان**) بێگومان خێزانی کاک عەبدوڵڵا زۆربەیان وێنەگر و هونەرمەندن و بە درێژایی ساڵانێکی زۆر کاری فۆتۆگرافی شەمسی و کاری فۆتۆگرافی ناو ستۆدیۆیان کردووە، ئێستاش ئەیادی کوڕی خاوەن ستۆدیۆی خۆیەتی لە هەولێر.

*** سەرەتای دەست پێکردنت؟**

- لە ساڵی ١٩٦٨-١٩٦٩ لە شارۆچکەی مەخموور دەستم کرد بە کاری فۆتۆگرافی، وەک وێنەگرێکی هەتاوی، پێشتریش وەک ئارەزوومەندێک وێنەی خەڵکم دەگرت.

*** گەر باسێکی لایەنی نیشەکەتان بکەی.**

- بێگومان لایەنی رووناکی و هەتاو و سێبەر گرنگە بۆ دانانی کامێراکە و ستولی مۆدێلەکە. دەبوایە کورسی مۆدێلەکە لەبەر سێبەر بێت هەتا ئەگەر کامێراکەش لەبەر هەتاو بوایە. چەند شوێنەکە سێبەر بوایە وێنەکە قووڵایی زیاتر دەبوو.





پێکهاتەی سندووقەکە لە عەددەسە و چەکمەجەی شووشتنەوە و جێگای تەماشاکردنی وێنەکان و ئەو جۆرکە رەشەی، کە وێنەگرەکە دەستی پێ دەبردە ناو کامێراکە بۆ شووشتنەوە و سکەیەکی جووڵاوەش بۆ گرتنەوەی نێگەتیڤەکە و ستاندێکی داری قایم و سەتڵێ ئاو و چەند پەردەیەک، ئەمانە زۆربەی ئەو کەرستانەن، کە ئەو ستۆدیۆیە گەرۆکە پێک دەهێنن.

*** باشە ناو سندووقە سیحراوییەکە چی تێدا بوو؟**

- لەناو سندووقەکەدا (هەڵگرێکی جووڵاو یان سووڕاو هەبوو. لە شوێنی هەڵگرەکە شووشەیەکی (بوزلی) هەبوو دەچووە ناو قاعیدەکەوە لەسەر شووشەکەش هەڵگرێکی تەنەکە هەبوو بە قەوارەی (چارەکی روبعی) کە دەکاتە قەبارەی وێنەیەکی ناسنامەیی. هەروەها لە لای راست و چەپ هەڵگری کاغەزی فۆتۆیی هەبوو، روبعییەکان لە لایەک و پۆستکارتیش لە لایەک. هەڵگری بوزلەکە و چارەکییەکە بە پانی لەناو سندووقەکە دادەنرا دوای نێت کردنی عەددەسەی کامێراکە و جێگای کامێراکە ئەو هەڵگرە بەرزدەکرایەوە بۆ ئەوەی هاوتەریب بێت لەگەڵ عەددەسەکەی پێش کامێرایەکە. چەند کامێراکە لە مۆدێلەکەوە نزیکتر بوایە وێنەکە سافتر دەبوو.

*** ئەی شووشتنەوەکە؟**

ـ لە تەنیشت کامێراکە چەکمەجەیەک هەبوو. دوو سندووقی بچووکی تەنەکەی تێدا بوو. بۆ هایپۆ و فیکسەر. لە سەرەوەی کامێراش کونێک هەبوو. کە بوزلێکی جامی سووری لەسەر بوو بۆ تەماشاکردنی نێگەتیڤ و پۆزەتیفەکە.

دوای شووشتنەوەی نێگەتیڤەکە لەناو چەکمەجەکە وێنەکەمان دەردەهێنا و دەمانخستە ناو سەتڵێکی ئاوەوە لە دەرەوە لە تەنیشت کامێراکە. بێگومان لە

وەرزی زستاندا هەندێ جار ماددە کیمیاوییەکان دەیان بەست و دەبوونە شەختە.

*** باشە یەک وێنەت دەشووشتەوە؟**

- نەخێر، هەندێ جار چوار پێنج وێنەمان دەگرت و دواتر بە یەکجار هەموو نێگەتیڤەکانمان دەشووشتنەوە. دوای شووشتنەوەی نێگەتیڤەکە، بە هەڵگیرێکی دارەوە هەڵماندەواسی کە لە ژێر عەدەسەی کامێراکە بوو. دووبارە وێنەی نێگەتیڤەکەمان بە هەمان شێوە دەگرتەوە و کارەکە دووبارە دەبۆوە و پۆزەتیڤەکەمان دەدایەوە بە مۆدێلەکە. هەندێ جاریش بۆ چاککردنەوەی سێبەر و قووڵایی دەموچاو و خوریکە و ئەو شتانە دەرمانێکی سوورمان بەکار دەهێنا، بە فلچە لەسەر نێگەتیڤەکەمان دەدا، بۆ زیاتر سافکردنی پۆزەتیڤەکە.

*** بێجگە لە کاری وێنەی هەتاوی، کاری ترت بەو کامێرایە دەکرد؟**

- بەڵێ، زۆر وێنەی ترم پێ دەگرت، وەک وێنەی بووک و زاوا و وێنەی قەڵات و هەروەها زۆربەی شێتەکان و جۆرەها پۆستکارتی منداڵان و وێنەی برادەران و هونەرمەندان.

*** باشە هەتاکو ئێستا ئەو سندووقانە لەبن قەڵات ماون؟**

- بەڵێ، تەنها بۆ دیکۆر، ئێستا هەموویان بە دیجیتاڵ وێنەی ناسنامە دەگرن. بێگومان ئاسانتر و خێراترە، بەڵام کارە هونەرییەکە و کاری



پیشەکە هەر لەناو ئەو سندووقەدایە، نەوەک لە کامێراکانی دیجیتاڵ.

تا ئێرە قسەی ئەم بەڕێزە بوو.

بێگومان فۆتۆی شەمسی گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە، دوای دەرچوونی پۆلارۆیدی چواری و دواجار ئێستا لە ئەوروپا لە هەموو



وێستگەی شەمەندەفەر و میترۆ و گۆڕەپانەکان لەناو شار ژوورێکی ئەلەمنیۆمی یەک مەتری ئۆتۆماتیک هەیە. دەچی دادەنیشی و پارەی پێویست دەخەیتە ناو مەکینەکەوە و مەکینەکەش فلاشی خۆی لێ دەدا و لە ماوەی ٣ خولەکدا چوار وێنەی ناسنامە لە پەنجەرەیەکەوە دوای وشککردنەوە، بۆت فڕێ دەداتە دەرەوە، سەردەمێکی خێرایە و تەکنۆجیاش رۆژ بە رۆژ لە پێشکەوتندایە، کاتێک من لە ئەکادیمیای هونەری، خەریکی خوێندنی فۆتۆ بووم، برادەرێکم لە هۆڵەندا پێی وتم هەتاکو تۆ ئەکادیمیا تەواو دەکەی، هاوێنەیەک پەیدا دەبێت لە ئەمستردامەوە دەتوانێت وێنەی فلۆریدا بگرێت.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٤)ی ئایار ٢٠٠٧ وەرگیراوە.**

# خۆشنووسە ناودارەکانی هەولێر

نەژاد بەرزنجی

**سەرەتایەک**

لە مێژووی سەرهەڵدانی نووسیندا ئەوەمان وەدەست گەییوە، کە ئەم نووسینەی (لە ئەلف و بێ)یەوە بۆمان ماوەتەوە، لە سەرەتاوە لەنووسینی (نەبتی)یەوە وەرگیراوە بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلام، لەرێگای بازرگانی (قورەیش)یەکان لەگەڵ دانیشتووانی (ئەنبات و حیرە).

ناوی ئەو نووسینەش لەژێر ناوی خەتی (ئەنباری) یان خەتی (حیری) بڵاوبۆوە، لەپاشدا چەند ناوێکی دیکەی پێوە لکاوە وەک (مەکی) یان (مەدەنی).

لەدوای هاتنی ئاینی ئیسلام و هاتنە خوارەوەی سورەتی (قەڵەم) نووسین و فێربوونی خەت پەیتا پەیتا بڵاوبۆوە و پەرەی سەندو هەتا ئەو رۆژو ئەو ساتەی ئێستاکەمان، لەپاشدا ئەم نووسینە گەیشتە (کوفە) لە سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسییەکان، هەروەها گەیشتە (بەسرا) و وردە وردە کەوتە ناو شارە گەورەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو (شام و بەیروت و قاهیرە و تاران و ئەستەمبوڵ...تاد). خۆشنووسان لەم شارانە هەریەکەیان لەسەردەمی خۆیانەوە دەستیان کرد بەو هونەرە جوانە، ئەم تابلۆیە نایابانەیان بۆ بەجێ هێشتن کە هەریەکەیان لەوانە لەوپەڕی جوانیدان و جێی پەنجەو هێمای ئەو دەستە رەنگینانە، هەتا هەتایە هەر دەمێنێ و دەبێتە جێی فەخرو شانازی نەتەوەکانیان لە مێژوودا، چونکە خۆشنووسی بەهرەیێکی یەزدانییە جا هەروا نووسین بەقەڵەمی قامیش پەرەی سەند بەدەستی (قطبة المحرر) چوار جۆرە قەڵەمی دانا:-

١- قەڵەمی تۆمار.
٢- قەڵەمی جەلیل.
٣- قەڵەمی سولسەین (ثلثین).
٤- قەڵەمی سولس (ثلث).

لەپاشدا چەند خۆشنووسێکی وەک (ئیبراهیم شەجەری و یوسف)ی برای سەریان هەڵداو لەدوای ئەوانیش خۆشنووسێکی دی هات چەند جۆرە خەتێکی دانا لەژێر قەڵەمی (الاحوال المحرر).

تا خۆشنووسی ناودار (ئەبو عەلی محەممەد کوڕی موقلە) لە (٣٣٨)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە، بە (ئیبن مەقلەی وەزیر) ناوی دەرکردبوو، لەپاش ئەو براکەشی (ئەبو عەبدوڵلای حەسەن) خۆشنووس بوو، بەڵام هەر (ئیبن موقلە) یاساو بنکەکانی خۆشنووسی دارشت لەبۆ گشت پیتەکانی خەتی عەرەبی کە (٢٨) پیتە، ئەم جۆرە خەتە ناو نرا بەخەتی (منسوب) هەر ئەویش بو ناوی قەڵەمی نەسخ-ی ناوە بە (البدیع) و جۆرە خەتێکیشی دانا بەناوی (الدرج).

لە شاری بەغدا جۆرەکانی خەت بەرە بەرە رووی لە جوانکاری کرد،

خۆشنووسەکان دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی جۆرەکانی خەت، وەکو خەتی (سولس و نەسخ و تەوقیع و ئیجازە)، چونکە خەتی ئیجازە جیاوازە لەگەڵ (سولس و نسخ) تێکەڵاوە!!

جا ئەم خۆشنووسانەی ناوداری وەک (ئیبنولبەواب و ئیبن موقلە و یاقوتی موستەعصەمی) سەریان هەڵدا و ناوبانگییان بڵاوبۆوە. لە هەموو شوێنێکی ئیسلامەتی بەر لە پەیدابوونی چاپەمەنی، هەموو نووسینێکی وەک قورئانی پیرۆز و فەرمایشەکانی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت و پەندو ئامۆژگارییەکانی زانایانی مەزن هەر بەدەستخەتی ئەم خۆشنووسە پایە بەرزو دەست رەنگینانە دەنووسرا، پاشماوە جوانەکانیان لەوپەڕی جوانیدایە!

ئەم خەتە جوانانە نەک تەنیا لەنێو وڵاتانی عەرەب بڵاوبۆتەوە، بەڵکو لەنێو وڵاتانی (فارس و تورک و گشت کوردەکانی) ئەم وڵاتانەش، ئەگەرچی چاپەمەنیش بەپیتەکانی خۆشنووسی خۆشنووسیان هەزارەها تابلۆ بڵاودەکاتەوە، بەڵام خەتی دەست شتێکی دیکەیە لەرووی هونەریدا.

هەروەکو گوتوومەو هەر دەشڵێم خۆشنووسی بەهرەییکە لەخواوە دێتە سەر قەڵەم و پەنجەی خۆشنووسان.

**ناوەڕۆکی ئەم باسە!!**

من لەمێژبوو منەی ئەوەم دەکرد کە شتێک بنووسم لەسەر ئەم خۆشنووسە دەست رەنگینە بەڕێزانەی کە خوای گەورە و میهرەبان ئەو بەهرەیەی وێداون، چونکە خۆشنووسی بەفێربوون و مەشقکردن نایەتە ژێر پەنجەی ئەو کەسانەی کە خولیای خۆشنووسی نین. ئەگینا من لەلای چەند کەسێکی وەک خوالێخۆشبوو سەید ئیسماعیلی شنۆیی سەعاتچی و خوالێخۆشبوو مەلا عەبدولرەحمانی مەلا رەسوڵی گراوی، مەشقی دەستخەتەکانیانم دەکرد لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیشم وەک جەواد مەلا سەعید خەلیفە شەمسەدین و خوالێخۆشبوو حوسێن رەشوانی...

ئەم دووانەیان چونکە خولیای ئەم هونەرە جوانە نەبوون قەت فێری خۆشنووسی نەبوون!!!

بەڵام من کە سەیری هەر تابلۆیەکی خۆشنووسانم بکردبا منەی ئەوەم دەکرد، کە لەداهاتوودا خۆم بگەیەنمە ڕیزیان هەتا فێری خۆشنووسی بووم بەش بەحاڵی خۆم، بەڵام کاسبیم بەم هونەرە جوانە نەکرد، تەنانەت چەندەها تابلۆ نەبێت بۆ هاوڕێکانی خۆم نووسیوە، بۆ سەر مێزو سەر دەرگای نووسینگەی (پارێزەرو دکتۆران لە بەغدا و لە شارەبان و لە نەخۆشخانەی سەربازی/عەسکەری تاجی لە بەغدا...تاد).

**خۆشنووسانی کورد و خۆشنووسانی هەرێم!**

ئەگەر باس لەهەموویان بکەم، دەبێتە مەوسوعەیێکی گەورە، بەڵام باس لەچەند خۆشنووسێک دەکەم، کە شاکاری دەستە رەنگینەکانیان لەناو دڵی مێژووی دوێنێ و ئەمڕۆکە شوێنی تایبەتی خۆیان گرتۆتەوە.

زۆر خۆشنووسی کارامە هەڵکەوتوون، کە شوێنی دەستە رەنگینەکانیان لەبواری ئەم هونەرەدا دیارە و بەرێز ناویان دەهێنرێت، لەوانە:

١- حافز عوسمان، مستەفا راقم.

٢- عەزیز روفاعی، حامید ئامەدی.

هاشم محەمەد، حوسنی، سەبری هیلالی، محەمەد ئەمین یومنی، محەمەد تاهیری کوردی مەکی و سەدانی دی...تاد).

سەبارەت بەگەلی کورد- یش هەروەک لەسەرەتای ئەم باسەدا ئاماژەم بۆ کردووە، کورد- یەکێک بوو لەو نەتەوانەی کە ئایینی ئیسلامی وەرگرت، بەدڵنیایی، گەیشتنی ئەم ئایینە پیرۆزە کارێکی گەورەی کردە سەر هەموو لایەنەکانی: ژیانی هەتا ئەو مزگەوتانەی لە کوردستان یان لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست شوێنی پەنجەی ئەم خۆشنووسانەی بەسەرەوەیە وەک نەخش و نیگاری دیوارەکان و گومبەت و منارەکان بەنووسینی ئایەتی قورئانی پیرۆز. لەوانەش خۆشنووسانی کورد بەشدارن!!

لەو قورئانە پیرۆزانەی کە بەدەستخەتیان نووسراون، هەمووی

شاهێدن بۆ ئەو خۆشنووسە بەڕێزانەی کە لەلاپەڕە زێڕینەکانی مێژوو هەمیشە دیارن و قەت بزر نابن!!

زۆرجار خوێنەری کورد پرسیار دەکات- بۆچی ئێمەش وەک نەتەوەکانی دراوسێمان خاوەنی رێبازو یاساو رێچکەیەکی تایبەتی خۆشنووسی نین؟!

من وەک خۆشنووسێکی کورد بەپێی زانیاری و بۆچوونەکانی خۆم دەڵێم: دوو هۆی سەرەکی هەن، کە بوونەتە رێگر لەم بوارەدا.

یەکەمیان- نەبوونی رێنووسێکی دروست و لەباری کوردی، چونکە هەروەک دەزانین ئەو پیتانەی ئێمە بەکاری دەهێنین لە عەرەبییەوە وەرگیراون، بەدەستکارییەکی کەمەوە توانیویانە تارادەیەک جێگەی خۆیان لەو کەم و کورییانەی، کە لەزمانەکەدا هەن (پڕبکەنەوە).

دووەمیان- باری تایبەتی میللەتی کورد و نەبوونی هەل و دەرفەتی باش و تێرو تەسەل تا بتوانێت خاوەنی داهێنانی شێوەی نوێ بێت!! نووسینێک بەپیت و وشە و رستەیەوە، کە تایبەت بێت بەخۆی، ئەگەرچی بەشێک لە هەڵکەوتووانی رۆشنبیری کورد خەریکن نووسینی کوردی بەنووسینی لاتینی بگۆڕن، تاوەکو رۆشنبیرانی رۆژئاوا زیاتر سوود لە داهێنانەکانی گەلی کورد وەرگرن، ئەوەش هەنگاوێکی زۆر باشە بۆ دوارۆژی گەلەکەمان.

لە هەڵبژاردەکانی خۆشنووسانی کورد لەدەرەوەی وڵاتی عێراق- ئەم چەند بەڕێزانەم خستۆتە ناو ئەم باسەم وەک ئەوانەی خوارەوە:

**١. خۆشنووسی ناوداری کورد: حامید ئامەدی.**

ناوی راستەقینەی- حوسام عەزمییە کوڕی زولفەقارە لەساڵی ١٨٩١ز. لە (دیاربەکر) لەدایک بووە لە بنەماڵەیێکی کورد، باپیر- یشی، کە ناوی (ئادەم) بوو، لەکاتی خۆیدا خۆشنووسێکی ناودار بوو.

حامید- خوێندنی منداڵی هەر لە (دیاربەکر) تەواوکردووە، لە سەردەمی خۆی قوتابخانەی روشدیەی لە دیاربەکر تەواو کردووە، لەچەند مامۆستایێکی فێری خۆشنووسی بووە، چونکە خولیای ئەو هونەرە لە کەللەی دابوو، لەم مامۆستایە بەڕێزانە (عەبدولسەلام و ئەحمەد حیلمی و سعید ئەفەندی) فێری ئەم هونەرە جوانە بووە، لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی خوێندنی باڵای پێ تەواو نەکراوە، بەڵام لەوەدزارەتی مەعاریفی ئەو سەردەم بەمامۆستای خەت خۆشی لەقوتابخانان کاری کردووە، لەپاشان لەچاپخانەی (رسومات) دامەزراوە، کە بۆ ماوەی ساڵێک تێیدا ماوەتەوە، لەپاشان چووەتە چاپخانەی مەری عوسمانی ئەوەش لەپاش مردنی خۆشنووس- (محەمەد نە زیف) بوو، تا بچێتە شوێنی ئەم. لەپاشاندا نووسینگەیەک بۆ خۆ دەکاتەوە، یاسای عوسمانی ئەو سەردەم ئەم کارەی قەدەغە دەکات و رەوانەی دادگای دەکات، چونکە کاربەدەستی میری ناتوانێ بەغەیری کارەکەی خۆی کارێکی دی بکات. ئەویش ناچار دەبێت کە ناوی نووسینگەکەی بەم جۆرە هەڵواسێت (خە تات حامید بازی ئەوی) واتە: (خانەی خۆشنووس حامید). لە شەقامی (باب عالی) هەر لەوێشدا مایەوە تا کۆچی دوایی دەکات!!

ئەم خۆشنووسە بەڕێزە بەرهەمێکی زۆری لەپاش خۆی بۆ مێژوو جێ هێشتووە. هەر یەکەیان لەوپەڕی جوانیدان، وەک ئەوانە لەسەر مزگەوتی (قوجە تەپە لە شاری ئەنقەرە) چەند خەتی (طغرا)ی بۆ (رەزا شاە شای ئێرانی نووسیوە، هەروەها بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و شا (فەیسەڵ)ی سعودی.

ئیجازەی خۆشنووسی داوەتە زۆر کەس، لەوانە:

١- حەلیم حەسەن- لە تورکیا.
٢- هاشم بەغدادی- لە بەغدا- عیراق.
٣- یوسف زنون- لە موسڵ- عیراق.
٤- سماع حەلەبی- لە سوریا- عیراق.
٥- خاتوو میناکو- لە یابان- عیراق.
٦- نەجات ئەنوەر لە هەولێر/ کوردستانی عیراق.

ئەم بەڕێزە- لە تەمەنی (٩١ ساڵیدا لەساڵی ١٩٨٢ کۆچی دوایی کرد، لە ئەستەمبوڵ بەخاک سپێردرا. ناوی ئەم خۆشنووسە بەڕێزە هەمیشە قیبلەگای هەموو خۆشنووسانە.

**١. خۆشنووسی ناوداری کورد لە بەغدا (حاجی محەمەد عەلی / سابیر)**

خوالێخۆشبوو (سابیر) ناوی (محەمەد عەلی) بوو ساڵی ١٨٦٣ لەبەغدا لەدایک بووە و خوێندنی منداڵی تەواو کردووە لەپاشان لەچاپخانەی- دارالسلام- کاری کردووە و فێری خۆشنووسی بووە، چونکە خولیای ئەم هونەرە بووە، لە منداڵیدا هەتا دەستی بەهەموو جۆرەکانی خەتێک راهاتووە. نووسینگەکەی لەکۆشکی (سەرنووسەران / رئیس الکتاب) دابوو. زۆر کەس لەسەر دەستی ئەم بەرێزە فێری خۆشنووسی بوون، لەوانە بۆ نموونە:-

١- محەمەد ساڵح خەتات.
٢- هاشم محەمەد بەغدادی.
٣- موحسین خەتات.

لە ژیاندا دوو جاران چووەتە حەج، لەپاشدا چووەتە (قاهیرە)، سەردانی خۆشنووس (عەبدولعەزیز رفاعی) کردووە. من لەساڵی ١٩٤٠ لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی شێخ نیعمەتوڵلا سەردانمان کرد، ئەم تابلۆیە جوانەی بەشێوەی خەتی دیوانی جەلی/ نستەعلیق دەنووسی (مافی زمانک من ترجو مودتە ولا صدیق اذجار الزمان وفی).

بەراستی زۆر دڵگرو جوان بوو، لەپاشدا لەهەموو شوێنێک ئەم تابلۆیە هەڵدەواسرا لە پاشماوەکانی- لەسەر دەرگای چەند مزگەوتێک لەبەغدا- ئایەتی قورئانی پیرۆزی نووسیوە، لەوانە مزگەوتی (سەید سوڵتان عەلی) و مزگەوتی (شێخ عومەری سەهرەوەردی) ئەسمائولڵای خودای بە خەتی (سولس) نووسیوە، لە مزگەوتی (ئەبو حەنیفە) لەبەغدا. دەگێڕنەوە دەڵێن: لە پێشانگایێک لە بەغدا ساڵی ١٩٣١ بەشداری کردووە، ئەوساکە بەغدا بچووک بوو لە (باب الشرجي/ الشرقي) بەغدا تەواو دەبوو، واتە خانوو بەرەکانی.

مەلیک فەیسەڵی یەکەم- دەچێتە پێشانگاکە، چاوی بە تابلۆکانی (سابیر) دەکەوێت ئەم دوو تابلۆیەی خوارەوە ئایەت الکورسی و (العدل اساس الملک)، بەخەتی سولس بۆ خۆ هەڵدەگرێت، لە ساڵی ١٩٤١ لە تەمەنی ٧٨ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.

**٣- خۆشنووس محەمەد تاهیر-ی کوردی مەکی ١٩٠٣- ١٩٨٠**

ناوی تەواوی (محەمەد تاهیر کوردی عبدالقادر کوڕی مەحموود)ە، لە ساڵی ١٩٠٣ز لە شاری (مەکە) لەدایکب ووە، خوێندنی سەرەتایی لە



قوتابخانەی (الفلاح) تەواو کردووە، ساڵی ١٩٢٢ باوکی دەیبات بۆ قاهیرە و دەچێتە (ئەزهەر) بۆ تەواو کردنی خوێندنی.

لەپاشان پەیوەندی بەقوتابخانەی (تحسین الخطوط العربیة)وە دەکات، کە یەکەم ساڵی کردنەوەی بوو لە میسردا، لەو قوتابخانەیە لە مامۆستا (محەمەد ئەفەندی ئیبراهیم)ەوە فێری خەتی (سولس) و (سولسی جەلی) لەگەڵ خەتی (روقعە) بوو، هەروەها خەتی (نوسخ و فارسی و دیوانی) لە مامۆستای بەنێوبانگ (عەبدولعەزیز روفاعی) وەرگرت، لەگەڵ فێربوونی نەخش و نیگار (فن الزخرفة و التذهیب).

ساڵی ١٩٢٥ز لەو قوتابخانەیە (دیپلۆمی پێ بەخشرا)،دوای ئەوە گەڕایەوە، لە (مەکە) کرا بەپسپۆڕی دادگای شەرعی بۆ تێڕوانینی ئەو نووسین و ئیمزا ساختانەی دەهاتنە بەردەم دادگا.

ساڵی ١٩٣٠ز کرا بەمامۆستای خەت لە قوتابخانەی (الفلاح) و چوار ساڵ تێیدا مایەوە، لەو ماوەیەدا توانی نامیلکەیەکی خەتی (روقعە) لە (٧) بەشدا دابنێ و لەچاپی بدات.

ساڵی ١٩٣٤ز دەستی کرد بەدانانی کتێبێک لەبارەی خەتی عەرەبی و ژیاننامەی ئەو خۆشنووسانەی، کە لەکۆنەوە خزمەتی ئەم هونەرەیان کردووە، بۆ ئەم مەبەستە چوو بۆ قاهیرە سێ ساڵێک لەوێ مایەوە، ساڵی ١٩٣٩ز

کتێبەکەی بەناوی (تأريخ الخط العربي و آدابە) چاپ کردو گەڕایەوە بۆ مەکە، هەر لەو ڕۆژانەدا سیپارەیەکی بۆ فێرکردنی خەتی (نەسخ)ی لەدوو بەشدا نووسی و وەزارەتی مەعاریفی سعودی چاپی کردو بڕیاری خوێندنی لە قوتابخانەکاندا دا، ئەم خۆشنووسە لە نووسینی وردا دەستێکی یەکجار باڵای هەبوو، لەوانە سورەتی (الاخلاص)ی لەسەر دەنکە گەنمە شامییەکی (الذرة) بەخەتی (نەسخ)ی نووسیوە، هەروەها لەسەر کرۆکی دەنکی ئەرزی لوبنانی سورەتی (قل أعوذ برب الناس)ی نووسیوە. لەسەر هێلکەیەک سورەتی (یاسین)ی نووسیوە. ساڵی ١٩٣٤ز لەنووسینەوەی قورئانی پیرۆز بۆوە، کە نزیکەی چوار ساڵێک خەریکی نووسینەوەی بوو، ساڵی ١٩٥٠ز چاپ کرا. لەساڵی ١٩٤٦ز سەری لەهەولێر داوە، لەماڵی (عەبدولغەفوور چەلەبی) کە خاڵی بوو ماوەتەوە. کە لە هەولێر بووە، چاوی بە خوالێخۆشبوو (گیوی موکریانی) و (ڕەشاد موفتی) کەوتووە. خوالێخۆشبوو (محەمەد تاهیر- ی کوردی مەکی شافیعی) لەگەڵ ئەوەدا کە خۆشنووسێکی کارامە و بەتوانا بوو، هەروەها لە شیعردا دەستێکی باڵای هەبوو، لەساڵی ١٩٨٠ز کۆچی دوایی کردووە لە شاری مەکە بەخاک سپێردراوە.

باوکی محەمەد تاهیر خەڵکی قەڵاتی هەولێرە لەئاخروئۆخری سەدەی نۆزدەمیندا خۆی و خێزانەکەی دەچن بۆ حەج و هەر لەوێ جێنشین دەبن و ناگەڕێنەوە هەولێر، نەزاندراوە هۆی مانەوەیان لەشاری مەکە لەبەر چی بووە.

خوالێخۆشبوو (محەمەد تاهیر) (٥) کوڕو (٥) کچی لەپاش بەجێ ماون، برایەکیشی لەژیاندایە بەناوی (مەکی).

**٤- خۆشنووسی کورد لە بەغدا (مەلا ئەمین یومنی مۆرهەڵکەن).**

ناوی ڕاستەقینەی (محەمەد ئەمین کوڕی محەمەد مستەفا کوڕی مەولوود کوڕی خەمان)ە، لەساڵی ١٨٦٤ز لەکۆیە لەدایک بووە.

لەدوای خوێندنی منداڵی و چەند کتێبێکی مەلایەتی لە ڕەشبگیری (سەفەربەر) گیراو ڕەوانەی بەرەی شەڕ کراوە، لە سەربازگەکانی باشووری- عێراق- لەپاشان چونکە مەلا بوو، دەیکەنە ئیمام بۆ پێشنوێژ نە سەربازگەکان، لە ١٩١٦ز لەبەغدا جێنیش دەبێت، پاش تەواوکردنی ماوەی سەربازی بەکاری مۆرهەڵکەنی خەریک دەبێت لەپاشان یەک لەخاوەن موڵک و ساماندارەکانی بەغدا بەزەیی پێدا دێتەوە، کە ئەم مرۆڤە مۆرهەڵکەنە بەرێزە لەسەر شۆستەی شەقامدا بژێوی ڕۆژانەی خۆی بەدەست دێنێ، چەند دوکانێکی لە بازاڕی (المصبغة)دا هەبوو، یەکێکیانی دەبەخشێتە (مەلا ئەمین یومنی) لەدەزگای تاپۆدا بەناوی ئەو تۆماری دەکات- جا ئەم بەرێزە خوالێخۆشبووە هەر لەسەرەتای ئەم کارەیدا تا کۆچی دوایی هەر لەم دوکانە بچکۆڵەیەدا بوو.

نووسینی- فارسی نەستەعلیق- ی لەخۆشنووسی ناودار (عیماد حوسنی زەرین خەت) فێربووە، خەتی کوفیش لەخۆشنووسی لوبنانی (مەمدوح) ناوێک فێر بووبوو، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٧٤ز کۆچی دوایی کردووە.

**بەرهەمەکانی لەخۆشنووسیدا:**

١- لە ڕۆژنامەی (الوقائع العراقية) بەخەتی کوفی- خەتی ئەوە.

٢- ڕۆژنامەکانی (اليقين، الارشاد، تنوير الافكار) بەخەتی (ثلث) نووسراون- هی مەلا ئەمین یومنییە.

٣- ناونیشانی دیوانی (سالم) و (شیعری ئەدەبیاتی کوردی- لەسەر شێوەی فارسی بەخەتی ئەوە.

٤- چەند تابلۆیەکی هونەری لە کتێبی (بدائع الخط العربي) و (مصور الخط العربي) و (گەلاوێژ)ی علاء الدين سجادی و لەگەڵ (دیناری عێراقی) سەردەمی (فەیسەڵی یەکەم) ئەمانە گشتیان بەخەتی ئەون.

**٥. خۆشنووسی کورد: (مەلا ئەحمەدی ئەولیائی)**

لە گوندی (بەدەر) لە خوارووی

شاری (پاکژێران) نزیک ئێران-رووسیا لەساڵی ١٨٦٠ز. دا لەدایک بووە.

لەحوجرەدا فێری خوێندن و نووسین دەبێت هەتا ئیجازەی مەلایەتیش وەردەگرێت. لەجیاتی جبەو مێزەر جلی کوردی لەبەر دەکات، بەرەنجی بازووی خۆی دەژیا، بەکاری کشتوکاڵ چاندن و مەرومالآت بەخێوکردن. قورئانی پیرۆزی بەرەوانی لەبەر بوو، قورئانی پیرۆزی بەخەتی (نەسخ) نووسیوە. لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگەریدا گوتوویە:

کە چاوم بەتابلۆیەکی خەتی جوان دەکەوێت هیچ خەمم نامێنێت.

ساڵی ١٩٦٥ لە تەمەنی ١٠٥ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. لە دێیەکەی خۆی بەخاک دەسپێردرێت.

لە شارە دێرینە خۆشەویستەکەشمان هەولێر ئەم خۆشنووسە ناوادارە بەڕێزانە دەخەمە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیزمان- ئەوانەی شارەزاییان بەم بەڕێزانە کەمە، بزانن گەلی کورد ئەم جۆرە رۆڵە بلیمەتانەی پێ گەیاندووە. هەر لە سەرەتاوە تاوەکو ئەمڕۆ نەک تەنانەت لەگۆڕەپانی خۆشنووسیدا، بەڵکو لەهەموو گۆڕەپانەکانی ژیاندا. بەرهەمە جوانەکانیان هێندە بەهادارو دڵگرن بەپاداشتی زێڕو زیو و ئەڵماس ئاڵوێرکراون لەبازاڕی هونەریدا، لەناو شارو لەدەوروبەری شار بڵاوبوونەتەوە، هێندە دڵگرو جوانن هەقیانە شانازی بەم هونەرە جوانەوە بکەن، بەخودی خۆیان بەر لەئەوەی ئێمە شانازی بە بەرهەمەکانیانەوە بکەین.

لە ساڵانی بیستەکان لە قوتابخانەی (أربیل الاولی)مان دەخوێند، یەک لە مامۆستاکانمان بەناوی (مەلا کەریم ئەفەندی) خەڵکی کۆیە بوو، خۆشنووسێکی دەست رەنگین بوو. جارێکیان (بسم الله الرحمن الرحیم)ی لەسەر تەختەرەشە بۆ نووسین، لەوپەڕی جوانیدا بوو، جارێکی دیش ئەم پەندە کوردییەی بۆ نووسین:

(چاکە لەگەڵ ناکەس بەچە مەکە!!) لە رۆژانی.هاوین. لە پشوودانی گەورەی قوتابخانان، باوکم دەیناردمە حوجرەی وانەکانی ئایینی بۆ خوێندن و فێربوونی نووسین لای مامۆستایەک بەناوی (مەلا سمایل سەعاتچی شنۆیی) مەشقی خەتی بۆ دەنووسیم و مامۆستایەکی دیکەش (مەلا عەبدولڕەحمانی مەلا رەسوولی گراوی)، ئەویش هەر مەشقی خۆشنووسی بۆ دەنووسیم. هەروەکو لە سەرەتای ئەم باسەدا ناویانم هێناوە،... ئەوەندەش دەڵێم کە کتێبە ئایینییەکانی رابردوومان زۆربەی زۆریان هەر بەدەستخەتی ئەم مامۆستا بەڕێزانە دەنووسرا، هەتا قورئانی پیرۆز. ئەوانەی ماون لە پاشماوەی نووسینەکانی خۆشنووسە دەست رەنگینەکانی رابردوومانن، لە کتێبخانەکانی مێژوو پارێزراون لەشوێنە دیارەکاندا هەریەکەیان لەوپەڕی جوانیدانە.

لە خۆشنووسەکانی شارە خۆشەویستەکەم هەولێر- یش باس لەم خۆشنووسە بەڕێزانەی خوارەوە دەکەم: هیوادارم کە دەستە رەنگینەکانیان لەگەڵ هونەرە جوانەکانیان هەر لە گەشەدا بێت بۆ خزمەتی هەرێمی کوردستانی- پیرۆزمان.

**خۆشنووس و وێنەکێشی دەستی و مۆرهەڵکەن و مێژووناس و نووسەرو شاعیر حوسێن حوزنی موکریانی نەمر.**

ئەم بلیمەتە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٨ چاوم پێ کەوت لە رەواندزەوە هاتە شاری هەولێر لەگەڵ خێزانی براکەی کە مامۆستا گیوی موکریانییە لە گەڕەکی تەیراوە جێنیش بوون. هێندەی پێ نەچوو لە شاری موسڵ زیندانی کرا، لە سەرەتای چلەکان دووبارە چاوم پێ کەوتەوە و ئاشناییم لەگەڵیدا پەیداکرد، زانیم کە مرۆڤێکی زۆر تێگەیشتووە، شارەزاو هەست بەرزو کورد پەروەرە، ئیتر هەر ئەوەندە بوو، بۆ ماوەیێکی کەم لە هەولێر مایەوە، بەر لە کۆچکردنی دوایی، کە لە ساڵی ١٩٤٧ بوو، رۆژێکیان لە چاپخانەی کوردستان چاوم بەچەند تابلۆی هونەری جوان کەوت وەک وێنەیەکی لەدار هەڵکەندراوی گوڵ و مامزو پڵنگ. بەجۆرێکی زۆر جوانکاری دروستی کردبوو کە لەگەڵ پیتەکانی چاپخانە لەناو مینبەرو چوارچێوەی چاپەمەنی جێی تایبەتی

خۆیان هەبوو، ئەو کتێبانەی کە بەخۆی دایناون لەم جۆرە شکلانەی لەکۆتایی بەشەکانی نووسینەکان دادەنا. زۆر جوان بوو. بەداخەوە ئێستاکە هیچیانم لەبەردەست نییە ئەگەر برازاکانی وابزانم ئاگادارییان هەیە بەم شتە وەک بەڕێز مامۆستا کوردستان و کوردۆ و ئازاد، ئەوانە هەموویان دەزانن، کە من هەمیشە لەگەڵ مامۆستا گیوی خوالێخۆشبووی باوکیان دادەنیشتم لە چاپخانەکەیدا لەپاشان مامۆستا حوزنی دەستبەسەر کرا لە بەغدا هەتا کۆچی دوایی کرد.

**خۆشنووس: شەهابەی دەنگخۆش!**
**١٩٠٩- ١٩٣٧**

لەبیرمە سالآنی سییەکاندا لە قوتابخانەی (أربيل الثانية)ی سەرەتایی، کە بەزمانی عەرەبی لەم قوتابخانەیەدا دەمانخوێند، بۆ جاری یەکەم چاوم بەم خۆشنووسە کەوت، لە سەربانی قوتابخانەکەماندا دانیشتیوو بەخەتێکی (نسخي) زۆر جوان ناوی قوتابخانەکەمانی دەنووسی (مدرسة أربيل الثانية)، لەگەڵ ناوی پۆلەکان و ژووری مامۆستایان و ژووری بەڕێوەبەری قوتابخانەو ئەوانی دی.

قاسم مەلا ئەفەندی- لەگەڵ من لەپۆلی چوار دەمانخوێند چونکە ئەویش تەماشای دەستی ئەم خۆشنووسەی دەکرد و پێی گوتم: ئەم کەسایەتییە دەناسیت؟ گوتم: نەخێر. گوتی: ئەوە شاهابەی دەنگخۆشە، باوکم بەخێوی کردووە بۆ ئەم مەبەستە!! لەسەر منارەی مزگەوتی گەورەی قەڵا ستایشخوانێکی زۆر شارەزایە لە مەقاماتی عێراقی، بەتایبەت ڕۆژانی هەینی بۆ نوێژی نیوەڕۆ و جومعە هەر ئەو دەست بەستایش دەکات، ڕۆژانی دیکەش ئەوانی دی بەشدار دەبن لەگەڵیدا وەک سەید مەردان و مەلا ئەمین، زۆر تابلۆی جوانی نووسیوە بۆ سەرۆکایەتی شارەوانی و دەزگاکانی شار. لەساڵی ١٩٣٧ز کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا سەید مەولوود بێخاڵی، لە کتێبەکەی (هەولێرم وادیوە)دا نووسیویەتی لەساڵی ١٩٠٩ز دا شەهابە لەدایک بووە، بەڵام شەهابە خۆی لەساڵی ١٩٣٣ز دا لە گۆرانییەکیدا بەتورکی وتوویە (عومرم ئەلینی گێچدی) واتە (٥٠) ساڵ لە عومرم چووە!! (العهدة علي الراوي).

**خۆشنووس: محەمەد عوسمان عەزیز ١٩٤٦. ناسراو بە (محەمەد زادە):**

ئەو زانیارییانەم لە خۆی وەرگرتووە، لە سەرەتاوە گوتی: لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری هەولێر لەدایک بووم. هەر لە منداڵییەوە خولیای هونەر بووم، بەتایبەتی هونەری خۆشنووسی و نەخشەسازی، لە دەرچووانی کۆلیژی ئادابم بەشی کوردی. یەکەم جار وەک خۆشنووسێک ساڵی ١٩٦٩ لە ڕۆژنامەی هاوکاری دامەزرام، دوای




چەند نموونەیەک لە خەتەکانی تازە

ڕێککەوتنامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لە ڕۆژنامەی (التآخي) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەک کارمەندێکی خۆشنووس و نەخشەسازی کارم تێیدا کردووە.

بۆ زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستان قاڵبی هونەریم داناوە، لە ڕووی نەخشەسازی و خۆشنووسییەوە بەتایبەتی تایتلەکان بۆ سەدەها بەرگی کتێب و نامیلکەو چاپەمەنییەکانی کوردی نەخشەسازی و خۆشنووسیم کردووە. هەر لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی زۆر باشم هەیە لە بواری چاپ و چاپگەریدا، بەتایبەتی لە (فۆنت)ی ڕۆژنامەگەریدا ئێستاش بەئومێدی دانانی چەند پرۆژەیەکی (فۆنت)ی کوردیم بۆ ئەوەی بیانخەمە ناو بەرنامەکانی- کۆمپیوتەرەوە.

دیارە هەر لە سەرەتای ژیانی

هونەرییەوە زیاتر لایەنگری نوێخوازی بووم، بەتایبەتی لەلایەن (فۆنت).

**خۆشنووس: ئەحمەد عەبدولڕەحمان حەمەد ١٩٥٧**

لە سالّی ١٩٥٧ز لە هەولێر لەدایک بووە.

لە سالّی ١٩٧٨ز ئامادەیی پیشەسازی لە هەولێر تەواو کردووە.

لەسالّی ١٩٧٠ز. وە دەستی بە هونەری خۆشنووسی کرد.

لە چالاکییەکانی قوتابخانەکان بەشداری کردووە و بڕوانامەی ڕێزلێنانی تێیدا وەرگرتووە.

یەکەم نووسینگەی لە گەڕەکی (تەعجیل) داناوە لە ١٩٧٦ز. لە سالّی ١٩٨٢ز لەگەلّ کاک (نەجات ئەنوەر) کاری خۆشنووسی کردووە تا سالّی ١٩٩٥ز.

سالّی ١٩٨٣ز یەکەم پێشانگای خۆشنووسی لەهۆلّی ئەیوبیە کردۆتەوە، سالّی ١٩٨٥ز ئیجازەی خۆشنووسی لەسەر دەستی مامۆستای خۆشنووسی یوسف ذنون وەرگرتووە، کە سێیەمین خۆشنووس بووە لەپاش خۆشنووس (علي الراوي) و خۆشنووس (أیاد حسیني).

سالّی ١٩٨٦ز بەشداری یەکەم پێشبڕکێی جیهانی کردووە بەناوی حامد ئامیدی، خەلاّتی تەقدیریی لە خەتی (نەسخ و سولس) وەرگرتووە.

سالّی ١٩٩٣ز خەلاّتی ڕێزلێنان بۆ جارێکی دیکە لە پێشبڕکێی جیهانی بەناوی (ئیبن البواب) لە خەتی (نەسخ و سولس) وەرگرتووە.

سالّی ١٩٩٥ز لەگەلّ (المتمیزین الذین لهم تأثیر في تطویر الخط في العـراق): واتە، (ئەوانەی لەو سەرکەوتووانەنە، کە دەتوانن خۆشنووسی بەرەو جوانی ببەن لەعێراقدا) لە ڤیستڤالّی سێیەمی بەغدا خەلاّت کراوە.

سالّی ١٩٩٧ز بەشداری پێشبڕکێی چوارەمی جیهانی کردووە، (شێخ حمد الله الاماسی) خەلاّتی یەکەم لە خەتی (سولس) و خەتی (نەسخ) وەرگرتووە.

سالّی ١٩٩٨ز خەلاّتی سەرەکی لە ڤیستڤالّی چوارەمی بەغدا وەرگرت. لە ١/١٢/١٩٩٨ز خەلاّتی یەکەمی ڤیستڤالّی هەولێری وەرگرتووە، بەشداری دەیەها پێشانگای کردووە. لە هەولێرو موسلّ و بەغدا.

(عضو دائم في دائرة الاهتمامات بفن الخط مرکز الابحاث التابعة لمنظمة المؤتمر الاسلامي). واتە ئەندامی هەمیشەیی لە دەزگای پەسەندکردنی هونەری خۆشنووسی بنکەی لێکۆلّینەوەی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی..

لەدوو دەورەدا سەرۆکی کۆمەلّە خۆشنووسەکانی هەرێمی کوردستان بووە.

١- وێنەی فۆتۆگرافی.
٢- چەند تابلۆیەکی خۆشنووسی بەدەستی خۆی.

**خۆشنووس: (محەمەد عوسمان قادر) ١٩٦٥**

ناسراوە بە(سەید محەمەد) پێی گوتم:

لە سالّی ١٩٦٥ز لەدایک بووە، لەشارە دێرینەکەی قەلاّ و منارە چاوی بەو دنیایە هەلّێناوە.

قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لەشارە دێرینەکەی هەولێر تەواو کردووە، سەرەتای دەستپێکردنی بەو هونەرە پیرۆزە دەگەڕێتەوە سالاّنی ناوەندی هەشتاکان، کە بەڕاستی ئەو دوو برا بەڕێزە مامۆستا یوسف و کاک برزو سدیق، زۆر هانیان داوە و پاشانیش مامۆستای بەڕێز کاک ئەحمەد عەبدولڕەحمان بەهەموو شێوەیەک یارمەتی داوە و درێغی نەکرد. کاک ئەحمەد دەلّێ: هەروەک قوتابییەکانی دیکەی، وەک ئیسماعیل فەرەج و جەمال ناسرو کاک وریا و چەندەها قوتابیانی دیکەو ئەوانی ناو شارو دەرەوەی شار، خۆم هەر بەقوتابی قوتابخانەی کاک ئەحمەد زانیوە! هەروەها من لەچەندین پێشبڕکێی دەرەوە و ناوەوە بەشداریم کردووە.

ئەوەتا لە سالّی ١٩٩٦ز لەپێشبڕکێی بەناوی (محەمەد تاهیری کوردی) لە سێ جۆرە خەت بەشداریم کرد، ئەویش خەتی (دیوانی) کە پلەی یەکەمم هێنا و خەتی (نەسخ) و خەتی (روقعە) پلەی دووەمم وەدەست هێنا لە ئاستی کوردستان و هەروەها لە چەندین پێشبڕکێی ناوەوە بەشداریم کردووە بە(فەزلی) خوا ئێستاش کۆلّم نەداوە بەئومێدی خوای میهرەبان هەر

بەردەوام دەبم.

**خـــۆشنووس: عـــەبدولکەریم رەمەزان ١٩٦٣**

نووسینگەکەی بەرامبەر مزگەوتی (شێخی چۆلی)یە، کە تابلۆی کێلی گــۆڕی مــردووان دەنووســێت و یەکــــێکیش بەهەڵـکەندنی نووسینەکانەوە خەریکە..

لە ســاڵی ١٩٦٣ز لە گـەڕەکی (عــەرەب) لە شــاری هەولێـــر لەخـێـزانێکی دەســتکورت و هەژار لەدایک بووە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی پیشەسازی لە هەولێـــر تەواو کـــردووە، لەگـــەڵ بەشـێکی زۆر لەخـۆشنووسـەکـانی هەولێـر کـاری کـردووە، لە سـەرەتاوە لـەســـــاڵی ١٩٧٦ز دەست بەخۆشنووسی دەکات، چونکە خولیای ئەم هونەرە جوانە بووە، نووسینەکانی (هاشم مــحــمــد بەغــداد)ی و (عەباس بەغداد)ی و (یوسف زنون) و (حـامد ئامـەدی) و (داود بکتـاش سـامی ئەفـەندی) تورکـیـا کـاریان تێکردووە و لە هەولێریش (ئەحمەد عــــەبدولڕەحـــــمــان) و (زیاد موهەندیس).

**خۆشنووس: زیاد عەبدولڕەحمان عەبدوڵلا مەلا زادە ١٩٦٨**

لـــــە رۆژی (٢٨/٨/١٩٩١ز) ســەردانی نووســینگەکـەم کـرد، لە بازاڕی گــەڕەکی کــوران، بەرێزیان بەرووێکی زۆر خـۆشـەوە پێـشــوازی کردم و ئەم زانیارییانەی خوارەوەی بۆ نووسیم کە دەڵێت:

ناوی (زیاد عــەبدولڕەحـــمـــان عەبدوڵلا)یە، لەساڵی (١٩٦٨ز) دا لەشـارە دێرینەکـەی هەولێـر لەدایک بووە، لەخێـزانێکی هەژار و ئیـماندار پەروەردە کـراوە و لە عــەشـیــرەتی (مەلازادە)یە لەناو خێزاندا تەنها برا گەورەکـەی (دلشـاد عـەبدولڕەحـمان عەبدوڵلا) دەستی نووسینی شانۆ و شـــیـــعــری هەبووە. منیش هەر لە سەرەتای منداڵییەوە خولیای رەسم و خەت لەکەللەی دابووە، بەڵام لەکاتی منداڵییەوە زیاتر خولیای رەسم بووە، رۆژێکیـان مـامـۆسـتـای وانەی رەسم، وێنەی ئافرەتێکی لەسەر تەختە رەشە بۆ کـێـشــاون-ئافــرەتەکــە تەشی دەرێســت-ئەویش لـەســـــەر پـەڕە قاقـەزێک وێنەکەی بۆی نەخش کرد. مامۆستا هێندەی پێ جوان بوو لەسەر پێشـانگای قـوتابخانەکە هەڵـیـواسی، بەڵام لەقــوناغی ناوەندی خــولیــای خـۆشنووسی زیاتر بوو، چونکە زیاتر خۆی ئارەزووی لەسەر بوو، بەشـداری هەمـوو پێشـانگاکـانی قـوتابخانەی کـردووە کە بۆ قـوتابیـان لە چالاکـیی قـوتابخـانەیی (النشـاط المدرسي)دا دەکـــرا. هەروەها دەوورەیەکی خــەتی کردەوە بۆ قوتابیانی کچان لە قۆناغی ناوەنـدی و دواناوەنـدی لەســـــاڵی ١٩٨٩ لە (لیــژنەی پێــشـــرەوانی شـەهیـد سـامی) تا ئێـســتـاش هەر بەردەوامــە لەخـۆشنووسی. لەلایەنی شانۆ و شیـعر تا ئێسـتاش زیاتر لە (٨) شانۆگەری نووسیوە، شانۆگـەری (دکـتـــۆرێکی لەخـۆ بایی بوو) کـە لەساڵی ١٩٨٦ز پێشکەشیـان کرد.

کە هەر لەو ساڵەش تیپێکی شانۆیی دادەمەزرێنێت بەناوی (تیپی شانۆی هەنگاو)، کـە ئەمـیـشـیـان خـۆی سەرپەرشتی دەکرد.

هەروەها لەگـــەڵ یارمـــەتی برادەران-عــەبدولڕەزاق تەڵعــەت، مـحـمـد رەزا مـحـمـد، ئەیوب جـەوهەر، ئەکـرەم بەهرام، کـە ئەندام بوون لە تیــپــەکــەدا، لەدوایـیــدا شــانۆگـــەری (خنکان) کــە لە ٧/٤/١٩٨٨ پێشکەشیان کردووە.

هەروەها بەشداری ڤـیـسـتـڤـاڵی شـانۆی قـوتابیـان لە هەولێـر کـرا، بەشـداریـیـان کـرد بە شـانۆگـەری (وەســیــەت) ١٩٨٨ز، کــە پلەی دووەمیـان وەدەست هێنا، هەروەها لە شـانۆگـەری (کـارەسـاتی نەبەز)، لەنووســیـنی- مـەهدی عـەباس و- دەرهێنانی خــەتاب کــاروانی. لەم شانۆگـەرییە دەوری (باوک)ی تێدا وەرگـــــرتووە، لە ٣١/١٠/١٩٨٨ پێشـکەش کرا، ئەمـەش لە کـاروانی ژمـــارە (٧١) بڵاو کـــراوەتەوە. لە شـانۆگـەری (سـێـبـەری دڕک) کـە لەسـاڵی ١٩٨٩ز پێشـکەش کـراوە هەمـوو ئەکـتـەرەکـان دیارییـان تێدا وەرگرت، سـاڵی ١٩٨٩ شـانۆگـەری (بەرزی مرۆڤ) پێشکەش دەکەن، لە هۆڵی (ئیبن المستوفي).

**خۆشنووس: لوقمان حوسێن رەسول ١٩٧١**

لە شاری دێرینی هەولێری هۆلاکۆ بەزێن لەساڵی ١٩٧١ لەدایک بووە، خـولیـای خـۆشنووسی دەگـەڕێتـەوە

سـالانی ١٩٨١ و ١٩٨٢، یەکـەم هاندەر لەژیانی خـۆشنووسـیـدا مامۆستای هونەرمەند و خۆشنووس (زیاد عـەبدولڕەحمـان مـەلا زادە)یە پەیوەندییـەکی تەواوی لەگـەڵیـدا هەبووە. لە زۆر شـانۆگـەری قوتابخانەکاندا بەشداری لەگەڵیدا کردووە، جگە لەدەنگدانەوەی هەندێ پارچە هۆنراوەشی لەرۆژنامـە کوردییەکاندا. جگە لەخۆشنووسی لە سەرەتای سالی ١٩٨٥ز دا بووم بە یەکێک لەئەندامانی (تیپی هونەری میللی هەولێر) بەشداری زۆربەی فیستڤالە هونەرییەکانی ناو ولاتم کردووە، ئێستاش یەکێکم لە ئەندامانی نەقابەی هونەرمەندانی هەولێر/ بەشی مۆسیقا.

**خۆشنووس: برزۆ سەدیق ئەحمەد رەسوول هەنارەیی ١٩٦٤**

لەسالی ١٩٦٤ لەدایک بووم، لەدەرچوونی ئامادەیی پیشەسازی میکانیکی هەولێرم، لەسالی ١٩٨٠ دەستم داوەتە خۆشنووسی. لە ١٩٨٢ ئەم نووسینگەیەی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر بۆخۆی کردۆتەوە. نووسینەکانی (هاشم محەمەد بەغدادی) کاری تێکردووە.

لەسالی ١٩٨٤ فێری چاککردنەوەی ئامێرەکانی مۆسیقا بووە وەک ئەوانەی وەتەرین/ عود، گیتار، ساز

**خۆشنووس: سامی خدر عەزیز ١٩٦١**

لەسالی ١٩٦١ لە (تەقتەق) سەر بەقەزای کۆیە لەدایک بووە. لە دەرچوانی ئامادەیی پیشەسازییە لەسالی ١٩٧٩ز هەر بەردەوامە لەسەر مەشقکردنی ئەم هونەرە جوانە بەیارمەتی چەند خۆشنووسێک لە شاری هەولێر وەک: (ئەحمەد عەبدولڕەحمان) لە سالی ١٩٩٢ فێری خۆشنووسی بوو.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

ئەم زانیارییانەی خۆشنووسانی سەرەوە، بەشێکیانم لە- خوالێخۆشبوو مامۆستا گیوی موکریانی پێ گەیشتووە لە شەستەکان بەشێکی دیکەش لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ/ (دار الثقافة و النشر الكوردية). لێرەدا یەک دووێکم بەدەقی خۆی نووسیوەتەوە لەم باسەدا دووبارە بلاوم کردۆتەوە بۆ ئەوەی نووسەرانی ئەورۆکەمان سوودی لێ وەربگرن.

بەشێکیش لە خۆشنووس/ خۆیەوە، وەک بەڕێز (سەید موحسین سەید سەمین) چونکە ئەو کاتە هەردووکمان لە (دار المعلمين الريفية)دا دەمانخوێند، ئەو لەپۆلی چوارەم بوو من لەپۆلی یەکەم بووم، پەیوەندیم لەگەڵ ئەم بەڕێزە پەیدا کرد، چونکە زۆر خولیای خۆشنووسی بووم.

هەروەها چەند بەشێکیانیشم / لە مەلا عەلی شێخ نیعمەتوللا پێ گەییوە لە بەغدا/ دەربارەی (مەلا محەمەد عەلی / سابیر) بەشێکیش/ لە مامۆستای بەڕێز خوالێخۆشبوو شێخ شوکروڵلای کێل هەڵکەنم وەرگرتووە لە بەغدا لەسالی ١٩٤٩ز.

**پەراوێزەکان:**

١-(حافز عوسمان) سالی ١٦٤٢ز لەدایک بووەو لە ١٦٩٨ مردووە.
١- (محەمەد نەزیف) سالی ١٨٤٦ز لەدایک بووە و لە ١٩١٣ مردووە.
٢- (عەزیز روفاعی) سالی ١٨٧٢ز لەدایک بووە و ١٩٣٤ مردووە.
٣- (مەلا علی فەزلی) لەسالی ١٨٩٧ز لەدایک بووە و لە ١٩٤٨ مردووە.
٤- (ناوی/ سەلیم جەزری/ واتە لە جزیرەی بۆتان لەدایک بووە، کەناو نرابوو بە (جزیره أبن عمر)

چونکە دامەزرێنەری ئەمارەتی/ جزیرە بۆتان (عبدالعزیز عمر/ی کوردییە) لەدانیشتووانی- برقعیدە- سەر بەپارێزگای موسڵە (ابو الفدا)ی مێژووناسی ناودار دانی بەو بۆچوونەیەوە ناوە، کە لەکتێبە مێژووییەکەی (٣- ١٣٩) هەروەکو لە ناوەکەیرا دیارە- ئەوەی ئەو ئەمارەتەی دامەزراندووە (ئیبن عومەر) بووە نەک (عمر حسن التغلبی)، هەروەکو چەند مێژوونووسی ئەم سەردەم وایان نووسیوە، ئەوەش لە تەعەسوبێکی رەگەز پەرستییەوە هاتووە، نەک لە مێژووییکی راستەقینەوە، چونکە لە ناوەکەوە دیارە (ئیبن عومەر) نەک (عومەر). ئەو بەڵگەیەش لە حاشییەیەکی ئەم ئەمارەتە داهاتووە (لە شەرەفنامەی- مەلا جەمیل بەندی رۆژبەیانی)یەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٤)ی سالی ٢٠٠١ وەرگیراوە.**



# دامەزراندنی تیپی هونەری میللی هەولێر

**ئازاد سەعید مەولوود**

ئێستا لە هەموو جیهان لە بۆنە یان لە فێستیڤاڵە جیهانییەکان گرنگییەکی زۆر دەدرێ بە هونەری میللی و سەما و هەڵپەڕکێ. ساڵانە چەندەها فێستیڤاڵ ئەنجام دەدرێ، کە تایبەتە بە هونەری میللی و سەما و هەڵپەڕکێ.

گەلی کوردیش وەک هەموو میللەتانی دنیا بێ بەش نییە لەم بوارەدا و ئەسپی خۆشی تاوداوە، بۆیە بەرەو پێشبردن و بەرزڕاگرتنی سەما و هەڵپەڕکێی کوردی ڕەسەن و خاوەن سامانێکی مەزن و دەوڵەمەندی کلتوور و فۆلکلۆری لەبن نەهاتووی هەڵپەڕکێ و گۆرانی و مۆسیقایە، کە ڕەسەنایەتی میللەتەکەمان دەپارێزێ.

لە پێناو بەرزڕاگرتنی هونەری میللی و هەڵپەڕکێی کوردی و ناساندنی سەماو هەڵپەڕکێی کوردی و ناسنامەی نەتەوەییمان، لە ڕێکەوتی ٥/٢/١٩٧٩ لەسەر پێشنیاری چەند هونەرمەندێکی شاری هەولێر، تیپی هونەری میللی هەولێر سەر بە دەزگای گشتی سینەما و شانۆی بەغداد دامەزرا. ئەم هونەرمەندانەش کەسانی وەک: "سەباح عەبدولڕەحمان و سابیر عەبدولڕەحمان" بوون. ئەم تیپە لەپێناو خزمەتکردن و بەرەوپێش بردنی هونەری میللی، سەما و هەڵپەڕکێی فۆلکلۆری ڕەسەنی ناوچەکانی کوردستان دامەزرا. تیپی هونەری میللی هەولێر بەشداری لە زۆربەی ئاهەنگەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵات وەک ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ١٩٨١ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی ١٩٨١ ئەوکات و یەکێتی سۆڤیەتی جاران ١٩٨٢، کۆماری لاتیڤیا ١٩٨٢، نەمسا ١٩٨٢، دوبەی ٢٠٠٥ کردووە.

ئەم تیپە هەتاکو ئێستا لەکاری

هونەری خۆی نەوەستاوە و بەردەوامە لە دروستکردنی تابلۆی قەشەنگی فۆلکلۆری و هەتا ئێستا زیاتر لە ١٥ تابلۆی قەشەنگی جۆراوجۆری هەیە، کە هەموویان زیاتر گوزارشت لە فۆلکلۆری رەسەنی کوردی دەکەن.



*** ناوی ئەندامانی تیپی هونەری میللی هەولێر/ بەشی هەڵپەرکێ**

١- ئازاد سەعید مەولود.
٢- عەبدولعەزیز مەجید مەولود.
٣- سەرکەوت محەمەد حەسەن.
٤- خالید محەمەد عەبدوڵڵا
٥- ئازاد ئیبراهیم عارف
٦- هەڤاڵ حەسەن خۆشناو
٧- شێرزاد عەزیز کەریم
٨- عەبدولحەکیم جەوهەر مەولود
٩- لوقمان عەبدوڵڵا شێخە
١٠- مەهدی جەمیل
١١- ئازاد محەمەدئەمین
١٢- نەوزاد مەجید
١٣- سەید گوڵ حەسەن
١٤- ئەمین تۆما گۆرگیس
١٥- هاشم عەبدوڵڵا محەمەدئەمین
١٦- هیمداد لەشکری عەزیز
١٧- مقداد قادر
١٨- نەجات عومەر سادق
١٩- رەجەب محەمەد ئەمین
٢٠- شەهاب ئەحمەد مستەفا
٢١- فاتح ئەبابەکر
٢٢- تارق کەریم
٢٣- موئەیەد مەحمود
٢٤- عەبدولجەبار جەمیل
٢٥- سیروان محەمەد عەزیز
٢٦- سوبحی ئەحمەد کۆیی
٢٧- لوقمان حوسێن رەسول
٢٨- بارزان حوسێن رەسول
٢٩- نەجمەدین بەدرخان
٣٠- بێجان ئۆغز
٣١- سەرکەوت خدر سەلیم
٣٢- واحید جەودەت شاکر
٣٣- سۆران محەمەد تاهیر
٣٤- ئاری لەتیف حوسێن
٣٥- سەربەست شاکر عوسمان
٣٦- نورەدین کەمال حەمەد
٣٧- دڵشاد ئەنوەر محەمەد
٣٨- رێکان نادر شەریف
٣٩- ئاراز سەعید محەمەد
٤٠- پشتیوان عەزیز لەشکری
٤١- عەبدولقادر غەریب
٤٢- رزگار لەشکری عەزیز
٤٣- ئازاد لەشکری عەزیز
٤٤- موحسین حوسێن رەسول
٤٥- غازی ئەحمەد شینە
٤٦- حەیدەر سوڵتان حەمەدەمین
٤٧- شەماڵ سابیر
٤٨- شێروان سدیق
٤٩- رووناک مەحمود
٥٠- بوشرا ئیبراهیم عارف



٥١- نەسرین ئیبراهیم عارف
٥٢- سەمیرە تۆما
٥٣- فاتیمە عەلی
٥٤- حەنان عەلی
٥٥- فاتیمە مەحمود
٥٦- سلڤانا ولیەم
٥٧- هالە فەرحان
٥٨- گەلاویژ تاهیر
٥٩- سوهام حەسەن حوسێن
٦٠- هاوژین سەردار
٦١- ساز محەمەد سەعید
٦٢- سەوسەن سەعدون یونس
٦٣- جینان عەلی

*** ناوی ئەندامانی بەشی مۆسیقا لە تیپی هونەری میللی هەولێر:**

١- رزگار حەسەن خۆشناو
٢- شێرزاد محەمەد حەسەن
٣- وریا ئەحمەد
٤- جەودەت شاکر
٥- واحید مەرجان
٦- مستەفا رەئووف
٧- موحسین حەسەن
٨- موحسین عەباس
٩- فوئاد محەمەد
١٠- رەنجبەر حەسەن
١١- ئازاد عەزیز
١٢- فازیڵ شاکر
١٣- نەشئەت کۆیی
١٤- رەحیم باڵەبان
١٥- محەمەد باڵەبان
١٦- پشتیوان حەبیب
١٧- دڵشاد شاکر
١٨- زامل بەغدادی
١٩- سیروان عومەر یوسف
٢٠- شاکر رواندزی
٢١- زرار بەکر
٢٢- پایەدار موحسین
٢٣- ئازاد محەمەد
٢٤- شەریف جەرجیس
٢٥- رەشاد ئەکرەم محەمەد
٢٦- مەغدید حەسەن شێخە
٢٧- هێرش رەحمان ئیسماعیل
٢٨- موخلیس حەسەن
٢٩- جەمال عوسمان
٣٠- شێروان سەعدی
٣١- ئازاد بۆرە
٣٢- کامەران جەعفەر سەلیم
٣٣- مستەفا بایز سلێمان
٣٤- سالار حەسەن
٣٥- جەلال شاکر
٣٦- سروود فوئاد
٣٧- سیروان عومەر

*** ناوی گۆرانیبێژەکانی تیپی هونەری میللی هەولێر:**

١- سابیر عەبدولڕەحمان
٢- جەلال سەعید
٣- قادر زیرەک
٤- نیزام شوکر
٥- سەعید گاباری
٦- زیاد ئەسعەد
٧- نەجمەدین ئاوارە
٨- خدر محەمەد (خدر خۆشناو)
٩- شەماڵ جەلال سەعید
١٠- تەحسین قادر
١١- موئەیەد مەحمود

*** ناوی ئەو راهێنەرانەی کە لە تیپی هونەری میللی هەولێر کاریان کردووە، لە سەرەتای دروستبوونی تیپ:**

١- سلێمان محەمەد-یەکەم راهێنەری تیپ و دروستکەری تیپ
٢- رەشیدیان- خەبیری سۆڤیەتی ئەرمەنی
٣- مەعروف موحسین- راهێنەر
٤- قادر کوردی- راهێنەر

تێبینی:
لە سەرەتای دروستبوونی تیپی هونەری میللی هەولێر، زۆرجار گۆڕانکاری لە هەندێ پۆستی ئیداری ئەو تیپە کراوە، لە رێکەوتی ١٩٧٩/٢/٥ تا ساڵی ٢٠٠٨ لێپرسراوەکانی تیپەکە ئەمانە بوون:

١- سابیر عەبدولڕەحمان
٢- سەفوەت جەراح
٣- شێرزاد محەمەد حەسەن
٤- فوئاد ئەحمەد سلێمان
٥- ئیسماعیل عەلی
٦- سەلاح شوکر
٧- بورهان خۆشناو
٨- شێرزاد محەمەد حەسەن
٩- سەرکەوت محەمەد حەسەن.

*** ئەم ناوانەی خوارەوە کاری ئیداریان وەرگرتووە لەو ماوەیەدا:**

١- ئەنوەر عەزیز
٢- ئیسماعیل عەلی
٣- حەمە سەعید
٤- تاریق خەیات
٥- ئەیوب محەمەد

# شانۆی هەولێر

موحسین محەمەد



هونەری شانۆی کوردی لە شاری هەولێر بەشێکی گرنگ و سەرەکییە لە مێژووی شانۆی کوردی، مێژووی ئەم هونەرە وەکو مێژووی نەتەوەکانی دیکە لە دوو بەش پێکدێ، مێژووی شانۆی کۆن و مێژووی شانۆی نوێ. ئەم دوو مێژووە، دوو سەردەمی جیاوازن و هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا نییە، ئەم دوو سەردەمە هونەرییە تەنیا لە پێناسە زانستییەکەدا، بۆ ئەم هونەرە یەک دەگرنەوە. لەشاری هەولێردا ئەم دوو سەردەمە، بناغەیەکی بتەوی هونەری هەیە، کە بەڵگەی زیندوون بۆ سەلماندنی مێژووی هونەری شانۆ لەم شارەدا.

مێژووی شانۆی کۆن، ڕەگ و ڕواڵەت و درامای ڕەوان دەگرێتەوە، کە لە هەناوی سرووتەکانی نەتەوەدا لەدایک بووە، ئەم سرووتانە نەریتی باوی میللەتی کورد بووە، نەتەوە سەردەم لە دوای سەردەم وەکو تێکستی زیندوو لەسەر سینگی ڕۆڵەکانی نووسراونەتەوە، پشتاو پشت ئەزبەریان کردووە و بە ڕەوانی لە سرووتەکاندا نمایشیان کردۆتەوە.

لە شاری هەولێردا سرووتەکان زۆر زیندوو بوونە، هەمیشە وەکو نەریتێک لاسایی کراونەتەوە. هەولێر پتر شارێکی کشتوکاڵی بووە و بەچەندین دەشتی بەپیت دەورە دراوە، وەکو: دەشتەکانی زرارەتی، بەڕانەتی، شەمامک، کەندێناوە، کە بەگوندەکانی کەناری ناسراون و کۆچی جووتیارانی گوندەکانی کەنار شاری هەولێریان بووژاندۆتەوە و ڕۆڵێکی مەزنیان بینیوە، لەبەر ئەمە، شارەکە سرووتەکانی نەتەوەی بەزیندوویی لە باوەش گرتووە، لەگەڵ

پەیدابوونی قوتابخانە، هونەری شانۆ لەم شارە لەدایک بووە، نزیکەی نیو سەدە ئەم دوو مێژووە بەیەکەوە رەوتی هونەری شارەکەیان دیار دەکرد.

لە سرووتە کشتوکاڵییەکاندا، هەولێرییەکان لە ناو جەرگەی شارەکەدا وەکو نەریتی باو لاساییان کردۆتەوە، وەکو کۆسەبەبە، ساوارکوتان، لە سرووتی مردن و لە دایکبووندا، هۆزەبانە بەدی دەکرێ.

کۆتەڵ کە درامایەکی رەوان بووە لە سرووتی جەنازەییدا، لەناو هۆزی جافەکاندا باو بووە. لە کاتی بێ ئیشیدا، درامای رەوانی گوێدرێژۆ ئاشەوان، کەری بەقاڵان لە هەولێرو دەوروبەری نمایش کراوە.

مێژووی کۆنی ئەم هونەرە بە سێ جۆر سەری هەڵداوە، رەگی درامی، رواڵەتی درامی، درامای رەوان، کە لەم جۆری سێیەمەدا، هەموو خاسیەتەکانی هونەری شانۆیی تیادا پەیدا دەبێ، وەکو چیرۆک، کەسایەتی، دواندن، ململانێ، جلوبەرگ و ئێکسسوارو تەنانەت مکیاجیش. لەم سێ جۆرەدا، بنەما هونەرییەکانی شانۆ ونە، وەکو نووسەر، دەرهێنەر، ئەکتەر، ئەوانەی ئەو نمایشە دەکەن خەڵکن، کارەکەیان بەرەوانی ئەزبەرەو پشتاوپشت ئەو نەریتە هونەرییەیان لەباوک و باپیرانەوە بۆماوەتەوە.



ئەگەر کورد لە سەردەمێکی زوو کیانی سیاسی هەبووایە، بێگومان رەگ و رواڵەت و درامای رەوان لە ناو ئەو سرووتانەدا گەشەی دەکرد و لەگەڵ هونەری شانۆی نوێدا ئاوێتە دەبوو، چەندین نووسەرو دەرهێنەرو ئەکتەری بەتوانامان دەبوو، کە پەیوەندی راستەقینەیان بە کلتووری نەتەوەکەیان دەبوو، ئەم دوو قۆناغە لەیەک دابڕاو نەدەبوون.

مێژووی شانۆی نوێ لە هەولێر پەیوەندییەکی راستەقینەی بە شانۆی ئەوروپی هەیە، لە رێگەی ئەو نەتەوانەی کە دراوسێ و داگیرکەری کوردستان بووینە. لە ساڵی ١٩٢١ مەدرەسەی ئەربیل ئولا لیژنەی فەن و تەمسیل دادەمەزرێنێ، یەکەمین شانۆگەری بە ناوی سەلاحەدینی ئەیوبی لە نووسینی نەجیب حەداد، کە لە بنەڕەتدا لە شانۆگەرییەکی والتەر سکۆت وەرگیراوە. بە زمانی عەرەبی ئامادە دەکرێ و پێشکەش دەکرێ. لە ساڵی ١٩٢٩ قوتابیانی سانەویەی هەولێر شانۆگەری وێنەتی پێشکەش دەکەن.

لە ساڵی ١٩٣٠ بۆ جاری دووەم



شانۆگەری سەلاحەدینی ئەیوبی لە دەرهێنانی مامۆستا عەبدول مەجید حەسەن نمایشکراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٣ ـ ١٩٣٤ شانۆگەری سەلاحەدینی ئەیوبی بۆ جاری سێیەم نمایش دەکرێتەوە. لە ساڵی ١٩٣٦ شانۆگەری شەڕی قادسیە لە وەرگێران و دەرهێنانی زەکی ئەحمەد هەناری پێشکەش دەکرێ. لە ساڵی ١٩٣٨ شانۆگەری ئۆتێللۆ نووسینی ولیەم شکسپیر و وەرگێران و دەرهێنانی دانیال عوزێر قەساب نمایشکراوە. لە ساڵی ١٩٣٩ بۆ جاری چوارەم دانیال عوزێر قەساب پێشکەشی کردووە. لە چلەکانی سەدەی رابردوو وەکو تێبینی دەکرێ تەنیا دوو شانۆگەری نمایشکراوە شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر، نووسین و دەرهێنانی عەلی مزەفەر لەساڵی ١٩٤٦ نمایشکراوە، شانۆگەری پاشای کلۆ ئامادەکردن و دەرهێنانی رەشید عەبدولقادر لە قوتابخانەی ئەربیل ئولای هەولێر لە هەمان ساڵ نمایشکراوە. لە پەنجایەکان جووڵانەوەی شانۆیی لە



سەرتاسەری کوردستان گەشەی کرد، لە شاری هەولێر ئەم شانۆگەریانە نمایشکران. شانۆگەریّ ( ست دراهم) نووسینی یوسف عانی، شانۆگەری (انا امک یا شاکر ) نووسینی یوسف عانی، شانۆگەری هارونە رەشید نووسین و دەرهێنانی جواد رەسول ناجی. شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر و چەندین شانۆگەری تر. هونەرمەند سەفوەت جەراح دەچێتە پەیمانگەی

هونەرە جوانەکانی بەغدا بەشی شانۆ تەواو دەکا. شانۆ لە هەولێر بەرەو کاری هونەری پیشەیی دەڕوا. لە شەستەکان هونەرمەندان تەلعەت سامان و فەرهاد شەریف دەچنە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا، هونەرمەند سەباح عەبدورەحمان پەیمانگەی هونەرە جوانەکان تەواو دەکا. لە ساڵانی حەفتایەکان و لەژێر کاریگەری رێککەوتنامەی ١١ی ئاداری مێژوویی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول و حکومەتی بەغدا ، بوارەکانی رۆشنبیری کوردی گەشەی مەزنی بەخۆیەوە بینی، هونەری شانۆ لە هەولێر لەسایەی ئەو ئازادییەدا گەشەی زۆر مەزنی بەخۆیە وەبینی.

تیپی هونەری هەولێر لە ساڵی ١٩٧١ دامەزرا، کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی لقی هەولێر لە ساڵی ١٩٧٢ دامەزرا، تیپی شانۆی لادێیی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی هەولێر لە ١٩٧٣



دامەزرا، تیپی هونەری نوێ لە ساڵی ١٩٧٤ دامەزرا، هەموو ئەو تیپانە رۆڵی گرنگ و مەزنیان هەبووە لە شانۆی شارەکە. لە دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە نێوان حکومەت و شۆڕش بە هۆی پەشیمانبوونەوەی حکومەت لە بەڵێنەکانی، ئەو تیپانە کەوتنە بەر هەڕەشەی سانسۆری حکومەت، لیژنەی سانسۆری دەقەکان لە ساڵی ١٩٧٥ دانرا، تیپی هونەری نوێ داخرا، دواجار تیپی شانۆی لادێ خرایە سەر رۆشنبیری جەماوەری، ئامانجەکان و بەرنامەی تیپەکە لە ساڵی ١٩٨١ کۆتایی هات. هونەری شانۆ لەم شارە پتر بەرەو ستایلی هونەری رۆیی. لە حەفتایەکان دەستەی سێیەم روو لە بەغدا دەکەن بۆ خوێندنی هونەری، هونەرمەندان سەعدون یونس و فەتاح خەتاب و پەیمان بەگۆک، ساڵح برێخت پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدایان تەواو کرد، سەمیرە عەبدۆک و وەلید مەعروف ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانیان لە ١٩٨٠ تەواو کرد.



لە شاری هەولێر بەگشتی سێ هۆڵ شانۆکانی لە باوەش گرتووە، هۆڵی گەل لە سەرەتای شەستەکان دروست کراوە، لە هەشتایەکان نۆژەن کرایەوە، هۆڵی رۆشنبیری لە دوادوای حەفتایەکان لە سەر نەخشەی شانۆی جیهانی دروست کراوە، هۆڵی میدیا لە سەرەتای هەشتایەکان تەواو بووە، ئەوەی سێیەم کەمتر شانۆیی تیادا نمایش دەکرێ. لە شاری هەولێر جگە لە دەرهێنەرانی کورد، هەردوو

هونەرمەندی بەرەگەز تورکمان، تەحسین شەعبان و هاشم زەینەل چەندین شانۆگەرییان پێشکەش کردووە. ئافرەت لە شاری هەولێر لە ساڵانی حەفتاوە بوێرانە هاتوونەتە سەر شانۆ، پێشتر پیاو دەوری ئافرەتی بینیوە. شەوقیە شەوکەت و ئاشتی عوسمان و رێواس جاف و ئازادە جەلال و سەمیرە عەبدۆک لە حەفتایەکان هاتوونەتە سەر شانۆ.

لە هەشتایەکان، ئاواز مەحموود، رۆژهەڵات مەحموود و شلێر ئەحمەد و چەندین ئافرەتی تر هاتوونەتە سەر شانۆ، لەبواری نووسینی شانۆییدا، شانۆکارانی هەولێر بۆخۆیان دەقیان نووسیوە و بۆ شانۆ دەقیان لە چیرۆک یان شانۆی جیهانی ئامادە کردووە، تەلعەت سامان لەقۆناغی خوێندنی ئەکادیمییەوە دەقی نووسیوەو ئامادەی کردووە. نووسەر حەمەکەریم هەورامی دەقی شانۆیی نووسیوەو دەقەکانی نمایشکراون.

شانۆگەری فاڵچی یەکێکە لە دەقەکانی ئەو نووسەرە، کە لە ساڵی ١٩٧١ لە هەولێر نمایشکراوە، بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکراوە. رەخنەی شانۆیی لە هەولێر لە ساڵانی حەفتا پەیدابووە، محەمەد تەیمور بەکوردی و عەرەبی رەخنەی لە سەر بەرهەمەکانی هەولێر لە گۆڤارو رۆژنامەکان بڵاوکردۆتەوە، حەیدەر عەبدولرەحمان لە حەفتایەکانەوە رەخنەی لەسەر شانۆگەرییەکانی هەولێر نووسیوە.

سەباح هورمز بەزمانی عەرەبی رەخنەی نووسیوە، موحسین محەمەد لە هەشتایەکان رەخنەی نووسیوەو بۆیەکەمین جار رەخنەی لە بواری







ڕۆژنامەگەری هێناوەتە دەردەوەو سێ ژمارەی لە زنجیرەی ڕەخنەی شانۆیی لەچاپداوەو بڵاوی کردۆتەوە.

لە بواری نووسینەوەی مێژووی شانۆی کوردی بەگشتی مێژووی شانۆی شاری هەولێر، محەممەد تەیمور لێکۆڵینەوەو بیروبۆچوونی خۆی هەبووە، هاوشان لەگەڵ مەغدید حاجی نووسەر پەردیان بە ئەرشیفی شانۆی ئەم شارە داوە تیپی نەتەوایەتی لەساڵی ١٩٨٠ دامەزراوە، کە سەر بە دەزگای سینەماو شانۆی بەغدا بووە ئەو تیپە کاری هونەری پیشەیی کردووە، هونەرمەندانی ئەو تیپە فەرمانبەری حکومەت بوون. لە ساڵی ١٩٨٠ کە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی دامەزرا قوتابیان ڕوویان لەم پەیمانگایە کرد، هەروەها ژمارەیەک لە قوتابیان ڕوویان لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی موسڵ کرد. لە هەشتایەکان یەکەمین دیداری شانۆیی و ڤیستیڤاڵی شانۆیی لە هەولێر سازکراوە، شانۆی منداڵان لە شاری هەولێر لە حەفتایەکان سەری هەڵدا و لە هەشتایەکان گەشەی کرد. شاری هەولێر بینەری شانۆیی هەبووەو خەڵک ئامادە بووینە بۆماوەی دە ڕۆژ بێنە هۆڵەکان و پلیت ببڕن، هەرلەبەر ئەم هۆیەش بووە شانۆکارانی سلێمانی هەوڵیانداوە بەرهەمەکانیان بێنن بۆ ئەم شارە ئەو شانۆگەریانەی کە لە سلێمانی هاتوونەتە هەولێر، هاوارێکی تاساو و مانگی ئاوابووی جەلیل زەنگەنە، تەنەکەی ئەحمەد سالار، گەشتەکەی حەسەنی کامەران ڕەوف و چەندین شانۆگەریی تر.

لە ساڵی ١٩٩١ ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان دژی حکومەتی دیکتاتۆری بەغدا بەرپابوو، لە سایەی ئەو ڕاپەڕینەدا لە ساڵی ١٩٩٢ پەرلەمان و حکومەتی کوردستان دامەزرا، سانسۆر لە کوردستان نەما، شانۆ پێی نایە قۆناغی ئازادی، پەیمانگەی هونەرە جوانەکان دامەزرا. بەڕێوەبەرایەتی شانۆو سینەما دامەزرا پاشان بوو بە دوو بەڕێوەبەرایەتی سەربەخۆ. چەندین فێستیڤاڵی شانۆیی سازکرا، گۆڤاری شانۆیی و هونەری پەیدابوون. ساڵانە چەندین قوتابی لە بەشی شانۆی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان خوێندن تەواو دەکەن، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەم شارەدا، ڕێککەوتننامەی شانۆیی لە نێوان وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ڕێگەی شانۆی هەولێر لەگەڵ شانۆی ئەندەر ڕۆهەری ئەڵمانی واژۆ دەکرێ و هەر لەو ساڵە وەفدێک سەردانی ئەو شانۆیە دەکا لە ئەڵمانیا.



# کچانی هەولێرو هونەری شانۆ

مەغدید حاجی



هونەری شانۆ هەمیشە لە هەموو شوێنێکدا دەورێکی کاریگەری لە هوشیارکردنەوەی بینەراندا هەبووە. راستە شانۆ دەوری قوتابخانەی گەلی بینیوە، ئەگەرچی لە سنوورێکی دیاریکراودا، چونکە ئەم هونەرە زیاتر لە کۆمەڵگەی شارستانی گەشە دەکات و جەماوەری تایبەتی خۆی پەیدا دەکات و دەورو کاریگەری لەسەر میللەتدا زیاتر دەبێت. بۆیە لە کۆمەڵگای کوردەواری دەتوانین بڵێین خاوەن ئەزموون و بزووتنەوەیەکی شانۆیین و ئەم بزووتنەوەیەش زیاتر لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا چالاکی چۆنیەتی بەخۆوە بینیوە.

ئەگەر نمایشی شانۆیی تەعبیر لە ژیان بکات بێگومان دەبێ هەردوو توخمی نێرو مێ دەورو بوونیان لە نمایشدا هەبێت، بەڵام بەهۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دواکەوتووی کۆمەڵگای کوردەواری تاکو ساڵانی حەفتاکان زۆر بە کەمی ئافرەت بەشداری لە شانۆدا دەکرد، بۆیە ئەو ئافرەت و کچە هونەردۆستانەی لە رۆژگاری ئەوسادا هاتوونەتە سەر شانۆو، نمایشیان کردووە مایەی رێزلێنان و یادکردنەوەن و پێویستە ناویان بە ئاوی زێڕ لە مێژووی رووناکبیری گەلەکەماندا تۆمار بکرێت.

هەر لەم روانگەیەوە، بە پێویستم زانی لە میانەی ئەم وتارەمدا یادی ئەو کچە قارەمانانە بکەمەوە، کە لە حەفتاکان و هەشتاکاندا لە شاری هەولێر دەوریان لە بزووتنەوەی شانۆی

کوردیدا بینیوە.

## کچانی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کورد لقی هەولێر:

دوا بە دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی مەڵبەندی گشتی سلێمانی لە ١٩٦٩/١٢/٣١دا بە ساڵ و نیوێک، ژمارەیەک لە ئەدیب و هونەرمەندانی هەولێر بە ئیمزای ئەدیبی نەمر محەمەد مەولود (مەم) داوایەکیان پێشکەش کردو لە ئەنجامدا لە ١٩٧٢/١/٥ دەرگای کۆمەڵە لە هەولێر کرایەوە.

لە ماوەی حەفتاکان و هەشتاکاندا زیاتر لە (٣٠) ئافرەت و کچە کوردی هەولێری شانۆ دۆست و هونەرمەند بەشداریان لە کارە درامییەکاندا کردووە. حەفتاکانیش تاکو ناوەڕاستی هەشتاکان بە قۆناغی زێرینی چالاکی کۆمەڵە و بەشداربوونی ئافرەت لە چالاکییەکانی دادەنرێت.

خوشکە شەوقیە شەوکەت یەکەم کچە ئەکتەری بە جەرگی کۆمەڵە بوو، کە لە ساڵی (١٩٧٢)دا دەوری لە تەمسیلی تەلەفزیۆنی (گوێزان) بینی، دواتریش لە (بۆرە پیاو) و (خاڵۆی رێبوار) و بەرهەمی دیکە سەرکەوتووانە دەوری بینیوە.

دوا بەدوای شەوقیە خان تاکو ساڵی (١٩٧٨) کۆمەڵە بێ ئەندامی ئافرەت مایەوە.

دواتر لە کۆتایی حەفتاکان و لە هەشتاکاندا ئەم ئافرەتە هۆشیارو چالاکانەی خوارەوە بەشدارییان لە کارە شانۆییەکانی کۆمەڵەو بەرهەمی تەلەفزیۆنی کردووە:

(ژیان فەتحوڵڵا، ئازادە جەلال، زەینەب محەمەد، وەسفیە محەمەد، نەسرین محەمەد، لەیلا عەبدولکەریم، لەیلا محەمەد، نیزال محەمەد، نیزال رەحمان، نەوال رەحمان، سەمیرە سلێوە، ساجدە سلێوە، فەیرۆز عەبدولمەسیح، سەمیرە عەبدولقادر، حەیات سلێمان، سوهەیلە رەمەزان، ژیان عەلی، رۆژهەڵات مەحموود، ناسیحە شەریف، ئاواز مەحموود، جیهان ئەحمەد، پەخشان حوسێن، شەرمین جەوودەت، شلێر ئەحمەد، دڵپاک تاهیر).

## کچانی تیپی شانۆی لادێ:

ئەم تیپە سەر بە دەزگای سەرۆکایەتی کشتوکاڵی هەولێر بووەو لە ١٩٧٣/٣/٢٧دا دامەزراوە.

لە دواییدا تیپەکە دراوەتە پاڵ دەزگای رۆشنبیری جووتیاران ناوەکەشی بووە بە (تیپی شانۆی لادێی ناوچەی ئۆتۆنۆمی) ژمارەیەک کچە کوردی هەولێر سەرکەوتووانە دەوریان تیا دیوە، وەکو: (قانعە رەشید، ئازادە جەلال، سمسم ئەنودر، سوهام محەمەد، سامیە جەلال، برنادیت) شایانی باسە، کە تیپی شانۆی لادێ بە شانۆگەری (ژانی گەڕانەوە) نووسینی عەبدوڵڵا ئەحمەد و دەرهێنانی سەعدوون یونس لە ساڵی ١٩٧٨دا بەشداری لە دووەم ڤیستیڤاڵی شانۆی لادێ لە بەغدا کردووەو تیایدا سوهام محەمەد و ئەنودر شێخانی خەڵاتی باشترین ئەکتەری ڤیستیڤاڵەکەیان



وەرگرتووە.

### هەڵوەستەیەک بەلای تیپی هونەرە نوێیەکانی کورد:

ئەم تیپە لە ساڵی ١٩٧٤ لە شاری هەولێر دامەزراوە و لە ماوەی پێنج ساڵی تەمەنیدا دەورێکی کاریگەری لە رەوتی هونەری کوردیدا بینیوەو بەرهەمە شانۆییەکانی ئەم تیپە (خوازبێنی)، (کاوەی ئاسنگەر)، (مەم و زین)، (شەوچرا) و (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) هەرگیز لە بیر ناکرێن. کچە ئەکتەرە بە تواناکانی ئەم تیپە: (ئاشتی عەبدولکەریم، چیمەن کاوێس، رێواس جاف، شادیە محەمەد، بەلقیس عەبدوڵڵاو سامیە محەمەد).

### شانۆی کرێکاران و کچە ئازادەکان:

دوا بەدوای دامەزراندنی تیپی هونەری یەکێتی نەقابەکانی کرێکارانی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٤دا ئەم ئافرەتە بەرێزانە تێیدا ئەندام بوون و بەشدارییان لە کارە شانۆییەکانیدا کردووە: (لەیلا مەحموود، گوڵبەهار مەحموود، ژیان کەمال، پەخشان کەمال، نیزال محەمەد، نەوال محەمەد).

دواتر لە هەشتاکان (تیپی پێشڕەوی شانۆی کرێکاران لە هەولێر) دامەزراوەو ژمارەی ئەندامە ئافرەتەکانی ئەم تیپە



گەیشتۆتە نۆ کەس، کە ئەم کچە هوشیارانە بوون: (ناسیحە عومەر شەریف، ئەحلام حوسێن، حەربیە عومەر، نەرمین حوسێن، بەدیعە محەمەد، بەهار عەلی، نەوال محەمەد، ژیان عەلی، بوشرا جەبار).

هەروەها ئەم تیپە بە شانۆگەری (خەبات) بەشداری لە یەکەم ڤیستیڤالی شانۆی کرێکاران لە عیراقدا کردووەو پلەی دووەمی ڤیستیڤالەکەی وەدەست هێناوەو تیایدا هەردوو کچە هونەرمەند ناسیحە عومەر شەریف و نەرمین حوسێن، وەکو باشترین ئافرەتی ئەکتەر خەڵاتکراون.

ئازادە جەلال، خاوەن توانا و داهێنانی راستەقینە بوو، ئازادە خان کچە ئەکتەرێکی داهێنەر بوو لەم بەرهەمانە زۆر سەرکەوتووانە دەوری بینیوە: ( زەنگی تەلەفۆن، نەخوێندەواری، لافاو، وێنەیەک لە رابردوو، پیشانگا، ئەو پیاوەی بوو بە سەگ، بووکی بەفر، لێو بە بارەکان).

بەرێز عەبدوڵڵا پشدەری سەرۆکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لە ساڵی ١٩٨٥دا لە بارەی ئازادە خانەوە فەرموویەتی: "بەراستی ئەگەر ئازادە جەلال کچە کورد نەبوایە بە زیندوویی پەیکەری بۆ دروست دەکرا. چونکە بەراستی ئەم خوشکە نازدارە دەزانێ شانۆ چییەو شانۆگەری بۆچی پێشکەش دەکرێت و زانیاری تەواوی لە هونەری شانۆ بە دەست هێناوە".

شایانی یادکردنەوەیە کە بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتی کەمی دەستکەوتنی ئەکتەری ئافرەت لە شانۆی کوردیدا یان بۆ نواندن لە رادیۆو تەلەفزیۆندا هەندێ لە هونەرمەندە دڵسۆزو لەخۆبوردووەکانمان بە تایبەتی برا

دەرهێنەرەکان لە خۆیانەوە دەستیان پێکردووە، ژن، کچ، خوشک، یا خزم و ناسیاوی تریان هێناوەتە سەر شانۆ یا بۆ رادیۆو تەلەفزیۆن بردوویانن و ئەرکی تەمسیلکردنیان پێ سپاردوون، بەمەش ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بووبێ گیروگرفتی دەست نەکەوتنی ئافرەتی ئەکتەریان چارەسەر کردووە.

لە شاری هەولێریش ئەم برا هونەرمەندە بەرێزانە ئەم دەورە جوامێرانەیان بینیوە: (سەعدوون یونس، رەسمی جەلال، سوبحی کۆیی، جەلال بەیار، هوشیار سەید ئەحمەد، سەباح عەبدولڕەحمان، زایەر عەبدوڵڵا، شێرزاد پۆلیس، فەیسەل محەمەد ساڵح، نازم دڵبەند، شەهید جەوهەر باپیر، عەبدوڵڵا پشدەری، ئیبراهیم حەکیم و...).

شایانی باسە کە ژمارەیەک لەو خوشکانەی لە رێگەی ئەم بەرێزانەی سەرەوە هاتوونەتە سەر شانۆ ئەکتەری چاک و سەرکەوتوویان لێدەرچووەو خزمەتێکی زۆری بزووتنەوەی شانۆی کوردییان کردووە، وەکو: (ئازادە جەلال، سەمیرە عەبدۆک، جیهان ئەحمەد، شلێر کۆیی، شیرین سابیر)..

لەکۆتاییدا ناوی ئەو کچ و ئافرەتە قارەمانانەی سەر تەختەکانی شانۆ دەخەمە روو، کە لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابوردوودا سەربەرزانە نمایشیان کردووەو بەشدارییان لە بزووتنەوەی شانۆی کوردیدا کردووە: (ئازادە جەلال، ئاواز مەحموود، ئاوات عاسی، ئەحلام حوسێن، ئەختەر مستەفا، ئەمەل حەسەن، ئەدیبە عەزیز، بەدیعە محەمەد، بەهار عەلی، باهرە محەمەد قادر، برنا ئیلیا شەمعون، بەلقیس عەبدوڵڵا، بەدریە محەمەد، بێخاڵ یووسف حەکیم، پەروین عەبدولحەمید، پەروین محەمەد، پەیمان قادر، پەری حوسێن، جولیانا یوسف، جیهان عەبدولحەمید، جیهان ئەحمەد، چیمەن کاوێس، خالیسە عاکف، خالیدە شەیدا، خالیدە ساڵح، خوناو جەمال، دڵپاک تاهیر، درەخشان محەمەد کەریم، رووناک محەمەد ساڵح، رووناک محەمەد، رێواس جاف، رۆژهەڵات مەحموود، دڵپاک محەمەد، زەینەب محەمەد، ژیان عەلی، ژیان فەتحوڵڵا، ژیان محەمەد، سەمیرە سلێود، ساجدە سلێود، سەمیرە عەبدولقادر، شاکار هوشیار، سامیە محەمەد، سهام محەمەد، سمسم ئەنوەر، سامیە جەلال، سوهەیلە رەمەزان، سەمیرە عەبدولکەریم، سەوسەن سەعدوون، سەوسەن عەبدولڕەحمان، سەرگوڵ عەزیز، سوهەیلە محەمەد، سەمیرە عەبدولستار، سمیە محەمەد، سوعاد عەمانۆئیل، شیرین عەبدوڵڵا، شادیە محەمەد، شەوقیە شەوکەت، شەوقیە محەمەد، شلێر کۆیی، شلێر محەمەد ئەمین، شەرمین ئەحمەد، شەرمین جەودەت، شیرین سابیر، سەبریە سەرتیپ، غوربەت حەسەن، فەوزیە شەهاب، فەریدە فەتحوڵڵا، فرمێسک موئەیەد، قانعە رەشید، قەدریە عەباس، قانعە محەمەد عەلی، کەژاڵ یووسف، کۆچەر جەلال، گەلاوێژ سەید موسا، گوڵهاد مەحموود، گەلاوێژ تاهیر، لەیلا مەحموود، لەیلا عەبدولکەریم، لەیلا سەعدوون، ماجدە خەلیل، مۆژدە جەلال، نەسرین عەلاف، نەسرین خدر مەرجان، نازەنین محەمەد ساڵح، نەرمین حوسنی، ناسحە عومەر شەریف، نیزال محەمەد، نەوال محەمەد، نەسرین جەلال، نەسرین محەمەد، نەزیرە حاجی عەزیز، نیزال رەحمان، نادیە جەوهەر باپیر، هێڤی حەسەن، وەسیفە محەمەد).

سەرچاوە:

ئافرەت لە شانۆی کوردیدا، مەغدید حاجی، چاپخانەی ئەلجاحز- بەغدا ١٩٨٩.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (٢١)ی نیسانی ٢٠٠٥ وەرگیراوە.

# حەیدەر بەقاڵ لە دیدی عزەدین فەیزییەوە

سمکۆ

نووسەر و پەروەردەکاری ناوداری شاری هەولێر، مامۆستای خوا لێخۆشبوو عیزەدین فەیزی یەکێک بووە لە شایەت عەیانەکانی سەردەمی خۆی و لە نزیکەوەش ئاوێتەی ژیانی هونەرمەند و رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە بووە، یەکێک لەوانە هونەرمەندی گەورەی شاری هەولێر (حەیدەر عەبدولرەحمان- ناسراو بە حەیدەر بەقاڵ)، کە هاودەم و هاودۆستێکی نزیکی مامۆستا عیزەدین بووە...

عیزەدین فەیزی بە خۆی و بەو هەگبە پڕ لە یادگارییەوە دەبێت لە چلەی ماتەمینی ئەو دۆستە ئەزیزە چی بڵێت و چی پێشکەش بکات.

ئێمە رەک یادەوەرییەکی هەردوو کەسایەتی ناسراوی ئەم شارە دەقی وتە بە نرخەکەی مامۆستا عیزەدین فەیزی بڵاو دەکەینەوە:

* بەڕێزان... دوێنێ ئەو برادەرانەی، کە عومریان لەگەڵ حەیدەری خۆشەویستی هەموو لایەک بەسەر بردووە، لەسەر ئەو رایەدا بوون، کە لە بابەت دوا ماڵئاوایی کردنی خوالێخۆشبوو چەند قسەیەک بکەم، پێم گوتن من بەو دڵە پڕ لە ئاە و چاوە پڕ فرمێسکانەوە چۆن بتوانم قسە بکەم، چ قسەیەک هەڵبژێرم کە لەم زاتە بوەشێتەوە و چۆن بتوانم باسی ئەو سیفەتە جوانانەی بکەم و بیانژمێرم کە هیچ تەواو نابن.

گوتم وا ٣٥ ساڵ زیاترە ئێمە تاقمێک برادەرین و کاک حەیدەریش هەردەم گوڵی مەجلیسمان بووە و تا ئێستا دڵی یەکێکمانی لێ نەشکاوە، زۆر پیاوانە وەفای خۆی لە کاتی



پێویستدا بەرامبەر بە هەموومان بەجێ گەیاندووە، گوتم: ئەگەر چی پێویست بە گوتن ناکات هەموو ئاگادارین و دەیناسین، کە لە هەموو بارو زرووفێکدا نەفسێکی زۆر گەورەی هەبووە، مەردانە ژیاوە، ملی بۆ کەس کەچ نەکردووە، لە بیروباوەڕی خۆی لای نەداوە و زۆر هەڵوێستی مەردانەی بۆ خزمەتی میللەتەکەی پیشان داوە، دەنگە خۆشەکەی، کە بولبولی نازداری شارەکەمان بوو، هەردەم هەموو کوردێک و تورکمانێکی خستبووە جۆش و خرۆشەوە، هەتا برا عەرەبەکانیش، کە لە گۆرانییە خۆشەکانی نەدەگەیشتن، تەنیا بەیەک جار دیتن عەودالی دەبوون و هەوڵی ناسینیان دەدا و برادەرایەتیان لەگەڵدا دەبەست، ئێستاش روو دەکەمە کاک موحسن (برای هونەرمەند)، ئەوە بزانن کە حەیدەر هەر لە ئێوە نەچووە، بەڵکو دەمارێکی پڕ خوێن بوو لە دڵی هەموو برادەران و ئەوانەی لێرەدا ئامادەن، پچڕاو خەسارەتێکی گەورە بوو

بۆ هەموو لایەکمان، هونەرمەندێکی وا بەرز و رووخۆش و دڵپاک، کەوا بزانم جێگەی پڕ نابێتەوە بەڵام دڵنیام، کە رۆژێک دێت لە هەولێردا پەیکەرێکی بۆ دەکرێ، رۆژێک دێت شەقامێکی بەناو دەکرێ، رۆژێک دێت قوتابخانەیەکی بەناو دەبرێت. حەیدەر کاکی هەموو هەولێر، حەیدەر موڵکی هەموو کوردستانە، نەک هەر کوردستانی عیراق، بەڵکو کوردستان بە گشتی، لەبەر ئەوە دەڵێم کاک حەیدەر ئەگەرچی بە لەش بمرێت، لەگەڵ دەستی ئەجەلی نووسراو لەگەڵ دەستی مردن چ ناکرێت، ئەمەش رێگای هەموومانە، بەڵام گیانی پاکی و یادە پیرۆزەکانی و قسە خۆش و بەنرخەکانی و دەنگ و قوڕگە زێڕینەکەی، ئەمانە لە دڵی هەمووماندا زین-دووە و هەر دەمێنێ و جێگای شانازییە بۆ هەموومان لە دواییشدا پرسە و تەعزیەمان ئاراستەی هەموو خزم و کەس و کاری و برادەران دەکەین کە سەبووری هەموو لایەک بداتەوە و قەبری پڕ لەنووربێ و لە رەحمەتی خۆی بێ بەشی ناکات و هەموو لایەکیش گەردنی ئازاد بکەن.

* * *

هەر بەو مەبەستەوە هونەرمەند یونس خەتات وەک هاورێیەکی دڵسۆزی ئەو تاکە قۆریاتەی پێشکەش کرد.

**گیم قالیر**
**دونیا بیتەر گیم قالیر**
**خودام بیزی یا رادیب**
**بیر (حیدر)**
**اندان معده گیم قالیر..**

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری بارش، ژمارە (٤) وەرگیراوە.

# یەکەم تۆمارگە لە هەولێر

محیەددین قادر

تۆمارگەی عەبدوللەتیف یەکێکە لە تۆمارگە دێرینەکانی کوردستان و لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە بەردەوام تاکو ئەمڕۆ لە لایەن خوالێخۆشبوو عەبدوللەتیف چەقماقچی لە شاری هەولێر دانراوە و ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی لە گۆرانی کوردی و تورکمانی و عەرەبی لێ هاتۆتە کایەوە، لە نزیکەوە چاومان بە (حیکمەت)ی کوڕی کەوت، کە ئێستاکە ئەم تۆمارگەیە بەڕێوە دەبات و لێمان پرسی:

*** عەبدوللەتیف چەقماقچی کێیە؟**

- کوڕی حاجی تۆفیق ئاسنگەرە، لە ساڵی ١٩٢٧ لە شاری هەولێر، چاوی بە دنیا هەڵێناوە و لە تەمەنی لاوێتیدا حەز و ئارەزووی لەگەڵ دەنگی هونەرمەندان هەبووە، لەوانە:



(مشکۆ، حەیدەر بەقاڵ، محەمەد عارف، حەسەن جەزراوی، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، رەسول گەردی)، لەگەڵ ئەمەشدا ئەمانە کە نزیک بوون لێی و هامۆشۆیان دەکرد لە تۆمارگەکەی، گۆرانی بۆیان تۆمار دەکرد، پیشەکەی خۆی زۆر خۆش ویستووە و تاکو دوا ماڵئاوایی لە ١٨/ ٣/ ١٩٨٦ بە کارەساتی ئۆتۆمبیل گیانی بە خاک سپارد لەسەر تۆمارگا هەر بەردەوام بوو.

*** تۆمارگەی عەبدوللەتیف چۆن دامەزرا؟**

- لە سەرەتادا باوکی رەحمەتیم دوکانی کارەبایی و پایسکیلی هەبوو، دوای ئەوەی زۆر ئارەزووی لە دەنگی گۆرانی و مقامات و حەیران بوو، بۆیە ئەمەیان کارێکی کردە سەر ئەوەی دوکانەکەی بگۆڕێت و بیکات بە تۆمارگای دەنگی هونەرمەندان. بەم شێوەیە لە ساڵی ١٩٥٤ ئەو تۆمارگەی ئێستای دەیبینین دامەزرا.

*** جاران قەوان هەبوو، ماوەی هەر قەوانێک چەند بوو؟**

- قەوان هەبوو (٦-١٠) دەقیقە، یان (١٥-٢٠) دەقیقە، بە گوێرەی گۆرانییەکە، قەوان سێ جۆرە پێی هەبوو، سەبارەت بە خێرایی قەوانەکە. لە هەولێر لە چایخانەی عەبو، چایخانەی مەچکۆ، چایخانەی مام مشیر

چایچی، چایخانەی حاجی مستیل قەوان لێ دەدرا و خەڵکی گوێیان لێ دەگرت.

*** جاران تۆمارکردنی کاسێت چۆن بوو؟**

- سەرەتا قەوان بوو، پاشان تەسجیلی گەورە و شریتی خڕ (بەکرە) دەرچوو، کە ئێستا لە تۆمارگەکەماندا هەیە، قەوان لە ماددەیەکی قیری دروست دەکرا.

*** لە تۆمارگاکەتاندا چەند شریتی خڕ (بەکرە) هەیە؟**

- (٣٠٠٠) شریتی خڕمان هەیە، بەکرەی سەعاتی هەیە، سەعات و نیوی هەیە، دوو سەعاتی هەیە، (٦) سەعات هەیە، (٨) سەعاتی هەیە.

*** ئەگەر ئەو بەکرانە بخرێنە سەر کاسێتی سەعاتی، چەند کاسێتی لێ دەردەچێ؟**

- نزیکەی (٢٠) هەزار کاسێتی سەعاتی لێ دەردەچێ.

*** ئەو بەکرە و کاسێتانە بە چەند زمان گۆرانی تێدایە؟**

- بە زمانەکانی: کوردی- تورکمانی- عەرەبی- ئاشووری- ئینگلیزی- هیندی- هەروەها مۆسیقای جیهانی و شانۆگەری و حیکایەت و قورئان و مەولود و ئەو جۆرە شتانەی بە خۆوە گرتووە.

*** کاسێتە تورکییەکان بە دەنگی کێن؟**

- مشکۆ، نوری مەلا نادر، حەیدەر بەقاڵ، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، حاجی فایەقی بازرگان، حاجی جەمیل، جەلال حەردان، یونس خەتات، یونس مەحموود، حەسەن خوچێ، مام سەمەد کوورەچی، شاکر حەمە فارس، حەمید کوورەچی، وەستا تەها، سەید ئیسماعیل، کە بە تورکمانی مەولودی دەخوێندەوە و گۆرانیشی دەگوت، جەمیل سایەق، یەشار کوڕی مشکۆی، سالم فەتاح.

*** چەند کاسێتی تورکمانیت هەیە؟**

- زیاتر لە (١٠٠٠) کاسێت گۆرانی تورکمانیم هەیە.

*** ئەوانەی داوای گۆرانی تورکمانی دەکەن کێن؟**

- لە هەولێر و کەرکووک و تورکیاوە خەڵکی دێن داوای گۆرانی تورکمانی دەکەن، چونکە هەندێک گۆرانی تورکمانیم هەیە لە شوێنی دیکە دەست ناکەون.

*** جاران نرخی کاسێت چەند بوو؟**

- کاتی خۆی تۆمارکردن هەرزان بوو، بەکرەمان بە شریت و تۆمارکردنەوە بە (٣) دینار دەفرۆشت، لە شەستەکانەوە شریتی بچووک (کاسێت) دەرچوو بە کاسێتەوە بە دینارێک بوو، بەڵام ئێستا نرخی شریتی بەکرە (٥٠-٦٠) دینارە، کاسێتی گچکەش بە تۆمارکردنەوە (١٥-٢٠) دینارە.

*** کەی نرخی کاسێت بەرز بووەوە؟**

- ساڵی ١٩٩٣-١٩٩٤ نرخی کاسێتێک بە تۆمارکردنەوە گەیشتە (١٠٠) دینار.

*** هەندێک کەس گلەیی ئەوە دەکەن، کە نرخی تۆمارکردن لە تۆمارگەکەتان گرانترە؟**

- هەندێک حەیران و لاوکمان هەیە لە شوێنی دیکە نییە، تۆمارگاکانی سەعاتی بە (٥) دینار تۆمار دەکەن، بەڵام من بە (١٠) دیناری تۆمار دەکەم، دۆزینەوەی گۆرانیش لە بەکرەدا ماندووبوونی دەوێ، پاشان من سەعاتی بە (٣) دەقیقە تۆمار ناکەم، بەڵکو بە نیو سەعات تۆماری دەکەم.

■

# تۆمارگای چەخماخچی

## (تۆمار و ئەرشیفێکی فۆلکلۆری)

بایز عەباس

زۆر رۆڵەی بە وەفا و دڵسۆز لە ئامێزی گەرمی پیرە قەڵاتی هەولێر لە دایک بوون، کاتێک چاویان هەڵهێناوە دەنگی دەف و کۆڕی گەرمی زیکری دەروێشانی تەکیەی (شێخ شەریف) و سۆزی ئاوازی مەقامە رەسەنەکانی (سەید مەردان) و (شەهابە هەولێری) و (حاجی عەبدوڵڵای دەفژەن)یان لە منارەی مزگەوتی (مەلا فەندی) لە گوێ زرینگاوەتەوە و بەو مەقامە رەسەنانە گۆش کراون. ئەو پیاوانە کاتێک گەورە بوون بە کار و پیشەی دەستڕەنگینی خۆیان خزمەتی گەل و وڵات و کۆمەڵگای کوردەوارییان کردووە. عاشق و خەمخۆری کۆکردنەوە و تۆمارکردنی لاوک و حەیرانی رەسەنی باب و باپیران بوونە. ئەو مرۆڤە دڵسۆزانە لە دوای مردنیش دوکانەکەیان بووە بە ئەرشیفێکی گەورە و بە نرخ بۆ کوردستان.

یەکێک لەو مرۆڤە گەورە و دڵسۆزانەی شاری هەولێر خوالێخۆشبوو (عەبدوللەتیف تۆفیق چەخماخچی)یە، ئەو پیاوە دەست رەنگین و بە سەلیقە بووە لە تۆمارکردنی لاوک و بەستە و حەیرانی کوردی. خوالێخۆشبوو لە ساڵی ١٩٢٧ لە گەڕەکی تەکیە لەسەر قەڵاتی هەولێر لە دایک بووە. چۆتە قوتابخانە تا پۆلی سێی ناوەندی خوێندووە. لە ساڵی ١٩٥٤ یەکەمین کەس بووە لە دامێنی قەڵاتی هەولێر بەرامبەر مزگەوتی (حاجی قادر) دوکانی تۆمارکردنی گۆرانی داناوە. زۆر خەمخۆری پاراستن و تۆمارکردنی لاوک و حەیرانی کوردی بووە. بۆ کۆکردنەوەی قەوان و شریتی بەکرەی گەورە. لە ساڵی ١٩٥٤ سەردانی لای چەخماخچییەکانی بەغدا و موسڵ و باشووری عێراقی کردووە. لەلای ئەوان قەوان و شریتی گەورەی دەست دەکەوت و پاشان دەیهێناوە بۆ شاری هەولێر. لە دوکانی خۆی لەبن قەڵاتی هەولێر شریتی بەکرەی گەورەی بە تەسجیلی گرۆندیک بە یەک دینار بۆ خەڵکی تۆمار دەکرد، چونکە ئەو کات وەکو ئێستا کاسێتی بچووکی تەسجیل نەبووە. ئەو پیاوە بۆ تۆمارکردنی دەنگی لاوکبێژانی کورد لە ساڵی ١٩٦٣ روو دەکاتە بەغدا تەسجیلێکی بەکرەی (گرۆندیک) t.k ٤٦ مایکرەفۆنی هەبووە بە کارەبا ئیشی کردووە و بە (١٨٠) دیناری کڕیوە. هێنایەوە بۆ هەولێر بە هۆی ئەو تەسجیلە لەسەر

شریتی بەکرەی گەورە دەنگی زۆر لاوکبێژ و حەیرانبێژی کوردی تۆمار کردووە و پاراستوویەتی لە فەوتان و بزربوون قوتاری کردوونە. بۆ ئەم هونەرمەندانە لاوک و حەیرانی تۆمار کردووە:

محەمەد عارف جەزراوی، عیسا بەرواری، حەسەن جەزراوی، خەلیل ئاکرەیی، حەسەن سیساوەیی، حەسەن حەیران، عوسمان حەیران، رەسوێ گەردی، تاهیر تۆفیق، محەمەد گۆران، مستەفا حەسەن خەزنەیی، مستەفا خۆشاوی، مشکۆ هەولێری، جەعفەر کوردستانی، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، یونس مەحموود، نوورەدین سەعاتچی، حەمید کوورەچی، شاکر حەمە فارس.

لە ساڵی ١٩٦٩ لە شاری هەولێر بە تەسجیلی گرۆندیک لەسەر شریتی بەکرە لاوکی بۆ محەمەد عارف جەزراوی تۆمار کردووە. لە شاری سلێمانی گۆرانی بۆ مشکۆ هەولێری- مەحموود فەندی- ئیبراهیم سەعید تۆمار کردووە. لە شۆڕشی مەزنی ئەیلوول لە هیران و نازەنین لە ئاهەنگی پێشمەرگان گۆرانی بۆ محەمەد ئەحمەد ئەربیلی تۆمار کردووە. لە پاش بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لە ماڵی خۆی لە گەڕەکی تەیراوە لاوکی کورد و کوردستانی بۆ محەمەد عارف جەزراوی تۆمار کردووە.

دەگێڕنەوە دەڵێن خوالێخۆشبوو (عەبدوللەتیف چەخماخچی) ئەوەندە شەیدا و عاشقی لاوک و حەیران بووە، بۆیە بە سواری گوێدرێژ دەچووە گوندەکان. سەردانی لاوکبێژانی دەکرد، (٥) شەو لە دەشت دەمایەوە لاوک و حەیرانی بۆ هونەرمەندان تۆمار دەکرد و بە پارەش یارمەتی دەدان. زۆربەی رادیۆکان سوودیان لە ئەرشیفی ئەم تۆمارگەیە وەرگرتووە. وەکو رادیۆی بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا-کاسێتی هونەرمەندە کۆنەکانی کوردیان بۆ t.v و سەتەلایت و رادیۆی هەرێم و ئازادی و رادیۆی گوڵان تۆمار کردووە. ئێستاش تەمەنی تۆمارگای (عەبدوللەتیف چەخماخچی) لە شاری هەولێر بووە بە (٥٢) ساڵ. ئەرشیف و شریتی ئەو تۆمارگایە لە (٤٠٠٠) چوار هەزار بەکرە زیاترە. هەندێک شریتی بەکرە هەیە کاتەکەی (٢٠) سەعاتە، بەکرەی هەیە (١٨) سەعاتە، بەکرەی هەیە (٦) سەعاتە. پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە نیو سەدە لە رۆژانی سەختی و تاڵی و تفتی و شیرینی. زیاتر لە نیو سەدەیە لە دامێنی پیرە قەڵاتی هەولێرییان بەکرەی ریکۆردەری گرۆندیکی تۆمارگای تۆز لێنیشتووی بێ نازی (عەبدوللەتیف چەخماخچی) لە نێوان منارەی چۆلی و پەیکەری گیوی موکریانی لەگەڵ ترپەی دڵی دایکانی چاو بە فرمێسکی پێشمەرگە ئیعدام کراو و. لەگەڵ ژیانی بە ئازاری کرێکارە دەست قڵیشاوەکانی، خانووە قوڕینەکانی هەولێر هێدی هێدی دەسووڕێتەوە و لاوکی رەسەنی کاوێس ئاغا و مریەم خان و عەزیز ئاغا و لاوکی شەری شاخۆلانی پێشمەرگەکانی شەهیدانی کوردستان (خەلیل ئەمین زراری و سەید فەتحی)مان بە گوێدا دەچرپێنێ. بۆ دواجار ئەو پیاوە (عەبدوللەتیف چەخماخچی) بۆ چارەسەری نەخۆشی روودەکاتە شاری بەغدا، بە کارەساتی ئۆتۆمبێل لە لای مەفرەقی تەلەفزیۆنی کەرکووک لە ١٨/ ٣/ ١٩٨٦ لە تەمەنی (٥٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. لە دوکانێکی بچکۆلانە لەبن قادرمە لە بەرامبەر دەرگای قەڵای هەولێر ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی لاوک و حەیرانی بێ نازی بۆ بەجێ هێشتووین.

سەرچاوە:
ئەرشیفی نووسەر.
ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١٥)ی، ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.



# هونەری جوانسازی لە قەڵای هەولێر

**دکتۆر مزەفەر عەلی ئەلجابری**
**کۆلیجی ئەندازە- زانکۆی بەغدا**

**پوختەی بابەت**

قەڵاتی هەولێر کۆنترین (شار)ە، تا ئەمڕۆکە بەردەوام دانیشتوانی تێدا ماوە، لە نووسینەکانی سۆمەریدا نزیکەی (٢٠٠٠ پ.ز) باسکراوە. لە سەردەمی بابلی و ئاشووریدا بەناوی (ئەربائیلو) واتە چوار خواوەند یان شاری (چوار خواوەند) باسکراوە، وەک بنکەی پەرستنی بتی عشتار بووە.

چەندان نەتەوەی جیاواز فەرمانڕەوایی ئەم قەڵایەی شاریان کردووە، وەک سۆمەری و ئاشوورییەکان، رۆمان و ساسانییەکانیش فەرمانڕەواییان کردوون.

لە سەردەمی ئەتابەکییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی (سێزدەی زایینی) گەشەی سەندووە.

**پەیوەندی قەڵات بەهێڵکاری شاری هەولێر**

دوای ئەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئاوەدانی لە دەرەوەی قەڵات بەرەو ناوچەکانی دەوروبەری قەڵات فرەوان بوو، شاری هەولێری پێکهێنا پایتەختی ئێستای کوردستانی عێراق، شارێکی گەورەیە، بەڵام قەڵات بووەتە بنکەی هەیکەلی بیناسازی لە نەخشەسازی شاردا.

شەقامەکانی لە دەورەی قەڵات دەخولێنەوە بەم جۆرە رێگای دەرەوەی قەڵات پێک دێت.

هەر لەو کاتەوە زۆر لە دانیشتوانی کۆنی قەڵاتماڵەکانیان جێهێشت بۆ ئەوەی لەشاری هەولێردا

بژین.

هێشتا ژمارەیەکی زۆری خەڵکی تێدا دەژین، ژمارەیان بە سێ هەزار کەس دەخەمڵێنرێت (بەپێی نەخشەسازی بنچینەیی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٧دا).

زۆر هۆکار هەن بۆ فرەوان بوونی بیناسازی لە دەرەوەی قەڵات دەکرێ، بەم شێوەیەی خوارەوەی کورت کەینەوە:

١- زێدەبوونی ژمارەی دانیشتوان و سنووورداری رووبەری قەڵات کە جێی ئەم زێدەبوونەی نەدەبوو.

٢- نەبوونی نۆژەنکردنەوەی خانوو بینایەکانی قەڵات و کزی ئاستی خزمەتکردنیان.

٣- باش بوونی باری ئاسایش و سەقامگیری، ئەوەش یاریدەی بڵاوبوونەوەی خەڵک دەدات لە دەشتی دەوروبەری قەڵات.

**هەیکەلی بیناسازی قەڵات:**

قەڵات نزیکەی ٣٥ مەتر لەسەر ئاستی زەوی بەرزە. پەیوەندداران رای جیاوازیان هەیە لەسەر پێکهاتنی، ئایا سروشتییە یان ئاکامی تۆپەڵ بوونی پات پاتی جێنشینی پێکهاتووە، بەڵام ئەم بەرزییە وای کردووە قەڵایەکی دژوار بێت دژی ئابڵۆقەدان و لەناوچوون.

هەندێ شوێنی کۆنی دیواری دەرەوەی قەڵات نۆژەن کراودتەوە (بەشی سەرەوە) بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکان و پانۆرامای قەوارە بنیاتیی و گونجانی پێکهاتەی



تاکەکانی. دواتر دەرگای سەروو و رۆژهەڵاتی دروست کرانەوە لە تەک تەنکێشەکانیان بۆ سەرنجراکێشان بۆ گرنگییەکەی وەک ئاماژەیەک بە سیمبۆل بوونی. دواتر چەندان ئاوایی بۆ بازاڕ سازکرا لەگەڵ رەوتی هاتوچۆدا لە تەوەری سەرەکی شار بۆ ئاسانکاری بازرگانی و گەشت و ژیوەری و پەیوەستی بەقەڵات.

**یەکەم: پێشەکی**

مێژووی شارێک لە شارەکان لە شەو و رۆژێک دروست نابێت، بەڵکو لەرێگای بەدوایەکدا. هاتنی رووداوەکان و ئاوەدانکردنەوەو رۆژگارو رۆشنبیری دروست دەبێت، کە دەبێتە هۆی پێکهێنانی شارستانی و مێژووی شارەکە. ئەو ئەوەی ئەم کلتوورە شارستانییەی بۆ دەمێنێتەوە، پێویستە بیپارێزێت و بەچاکی و بەباشترین حاڵ رایگرێت و بیداتە دەست ئەوەی دوای خۆی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەرگرێ و شانازی بەشارستانییەتەکەی و رابردووە درەوشاوەکەی بکات.

زۆر لە شوێنەوار ناسان و بیناسازان، ئەوانەی کاری چاکسازی و نۆژەنکردنەوەو چاکردنەوەی خانووە کلتوورییەکانیان لەئەستۆ گرتووە، رووبەرووی زۆر رەخنە هاتوونەتەوە، گوایە دەستدرێژییان کردۆتە سەر سامانی رۆشنبیری کە نابێت لەئاستێکی زۆر بچووک نەبێت، نابێت دەستی لێ بدرێت.

ئایا چۆن دەکرێ چاکسازی کلتووری بیناسازی بکرێت و بەرچاو بخرێت، لەهەمان کات خۆت لە رەخنەو لێپرسینەوە بپارێزیت لەنێوان دۆستانی کلتوور و ئەویندارانی.

لەگەڵ لەبەرچاو گرتنی بیروڕای نەخشەدانەران بۆ شار، ئەوانەی ئامانجیان نوێکردنەوەی شارەو سوود وەرگرتنە لە هۆکارە هاوچەرخەکان و خزمەت و زانستی نوێ گەیاندن، ئەم شارە ئەم هاوکێشەیە هەموو رۆژێک دەورووژێنرێت.

وادیارە باشترین ڕێگا چارە بەپێزییە لە هەڵسوکەوتکردن بەپێی توانا.. چارەی ئامادە پێشنیار نەکردن و پەوردەکارییەوە بۆ هەموو حاڵەتەکان.

بیروڕا ئاڵوگۆڕکردن و گفتوگۆکردن لەنێوان هەموو ئەو لایەنانەی پەیوەندارن بەکاروباری کلتوورو شوێنەوارو بیناسازی و رۆشنبیران بەگشتی.. و بێ دەست گرتن بەرایەکی دیاریکراوی پێش وەختە یان وشکە باوەڕی، ئەوەیان چاکترین ڕێگایە بۆ گەیشتنە ئامانج.

پشت بەستن بەئاڵوگۆڕکردنی شارەزایی و راوێژکردن و گەڕانەوە بۆ ئەزموونی پێشووی دەوڵەتانی دیکە لەم بوارەداو پێشچاوخستنی ئاکامی کارە هاوشێوەکان و رەخنە لێگرتن و راستکردنەوەیان دەشێ ببێتە شێوازێکی سوودمەند بۆ ئەزموونەکانی دواتر. ئاوەدانی (قەڵای هەولێر) نموونەیێکی گەورەیە بۆ گرنگی مێژوویی و جوانی بیناسازی کە هەیەتی.

ئاشوورییەکان قەڵاتیان وەک پەرستگایەک بۆ خوداوەندە پیرۆزەکەیان هەڵبژارد کە ناوی عشتار بوو. قەڵات بوو بەشوێنێک کە (پادشایان و پیاوانی ئایینی) روویان تێ دەکرد. سەردانیان دەکرد بۆ نزاو تکاکردن لە خوداکانیان بۆ سەرکەوتن لە جەنگەکانیاندا، دابینکردنی ئاویش کە رەگی ژیانە، گرنگی قەڵای زیاتر کرد، سەنحاریب پادشا پرۆژە بەناوبانگەکەی لەمێژووی ئاودێری ناوچەکەی ئەنجامداو پشت بەست بەکشتوکاڵ و پیشە جیاجیاکان لەتەک بازرگانی توانی خۆکارییەک و بەردەوامی ئابووری دابین بکات. لە هەمان کات جێگە بەرزەکەی وایکرد ببێتە قەڵاتێکی سەخت و دژوار دژی ئابڵوقەدان و لەناوبردن.

ناو شاری هەولێر کەوتە ژێر زۆر فشار و ناچار بوو بەهۆی نەمانی ئادگاری بیناسازی و شارستانی. فەرەوانکردنی شەقامەکان و رووخاندنی خانووە کۆنەکان، و رووخانی هەندێکی دیکە لەبەر کۆن بوون و چاک نەکردنەوەی، ناوچەکە زۆر خانووی گرنگی لەدەست داوە. قەڵات جیاکرایەوە لە چاکسازی بازاڕی کۆن و گەڕەکەکانی دەوروبەری. بنیاتنانی باڵەخانە لەناو بازاڕو دەوروبەری قەڵات، کەوا نەخشەسازی خراپ و بێ هیچ پێوەرێک و تایبەتمەندییەکی کە لەو ژینگەیەدا هەیە، ئەوەشیان لەبەر نەبوونی یاسا و ڕێنمایی لەبار بۆ ئاراستەکردنی ئەم پرۆسەیە ئەوەش کاری کردۆتە سەر کەشی بیناسازی تایبەتی قەڵات.

**دووەم: پێوەرەکانی پاراستنی قەڵات:**

**٢-١ بنەما گشتییەکان:**

بۆ باسکردنی نۆژەنکردنەوەی قەڵاتی هەولێر، پێویستە چەند بنەمایەکی گشتی دابندرێن و، پابەندبین پێیانەوە. دواتر دەچینە وردەکاری ئەو بنەمایانەو گفتوگۆ لەسەرکردنیان کە دواتر پلان دادەنرێت بۆ جێبەجێکردنی رێکهێنەکانی بیناکردن.

بەم شێوەی خوارەوە:

أ- بایەخدان بە شکۆیی ئامادەگی بێهاوتای قەڵات و زاڵبوونی بەسەر شوێنەکە. واتە دووبارە نەخشەکێشانەوەی دیواری دەرەوەی (بەدەنی باڵای قەڵات) لە رووی پتەوی و گونجان لە پێکهاتەکانی (پڕکردنەوەی



کـەلێنەکـان و پانۆرامـای قەوارەکانی بنیاتنان).

ب- ئاشکرایە خاڵی ڕێبەری بۆچوونە ژوورو هاتنەدەرو لایەنە کارگوزارییەکان (چوونە ژووری پیادەو ئۆتۆمبێل) و لەبەرچاوگرتنی پێوەری مرۆیی و راگواستنی پلە پلە.

ج- پێویستە راستگۆیی لە نەخشەدانانەدا رەچاو بکرێت لە گواستنەوە لە چۆڵایی گشتی (شەقامی دەوروبەری قەلات) بۆ تایبەت (قەلات) لە رێگای دەروازەی بەرایی کە لەبنچینەدا لەلایەن قەوارەو شێوەوە وا دروست کراوە بۆ ئەوەی پێشوازی لە هاتوچۆکەران بکات و بیانگوازێتەوە بۆ ئەوەی هەست بەنامۆیی بکەن، بەڵکو پێویستە هەست بە سەرسورمان و دۆزینەوەی نوێ بکەن لە بەرزبوونەوە بۆ قەلات. هەروەها لە بچووک (دەروازەی بازاڕ) گواستنەوە بۆ (گەورەتر) سێ دەروازە سەرەکییەکە بەپێی قەوارەیان لەسەر بنچینەی جیاکردنەوەیان هەر لە دوورەوەو بەگۆشەنیگای جیا جیاوە.

د- بنیاتی نوێ کە دەخرێتە سەر کۆنەکە، پێویستە پێکهاتە کلتوورییەکە لە کۆن و نوێ لەگەڵ یەک بگونجێت.

هـ- جەختکردنەوە لەسەر پلەبەندی چۆڵایی ئاوەدانی کە لە تەیمانەی بیناسازی قەلاتدا بەکاردێت، لە رووی بایەخ و قەوارەو دابینکردنی بۆشایی حەسانەوە لەنێوان قەوارەو چۆڵاییەکاندا.

و- تۆپۆگرافیای شوێن و گرنگی ئامادەگی سروشتی لە پێکهاتە سەربارەکان. هاوڕێکی هێڵە گشتییەکانی نەخشەسازی پێشنیارکراو لەگەڵ هێڵە کۆنکرێتییەکانی جێگەکە.



## ٢-٢ وردەکاری نەخشەسازیی بیناسازی پێشنیارکراو بۆ نۆژەنکردنەوە و نوێکردنەوە:

بۆ باسکردنی وردەکاری سەبارەت نوێکردنەوەو نۆژەنکردنەوە، پێویستە باسی هەندێ پێکهاتەی بیناسازی لە پەیکەری قەلا بکرێت.

أ- تەیمانەی بیناسازی لە دیواری قەلا بێهێزی خانوو و بنیاتەکانی پێوە دیارە، لە ئاکامی نەبوونی نۆژەنکردنەوەو پشتگوێ خستنی، هەندێ لەم خانووانە دەڕووخێن، کە دەبێتە هۆی تێکشکانی تەیمانەکە بەگشتی و چەندان کەلێنی تێدا دەرکەوتووە کەوا رێکی دیوارەکەی شێواندووە.

لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەین چەندان روو دیواری هاوئاهەنگ لەگەڵ تەنیشتەکان دابندرێت و ئەوەندەی قەوارەی خانووەکان بێت و بەجیا دابندرێت، نەک بە لەیەک پەیوەستکردنی کۆمەڵە روودیوارێک وەک ئێستا لەگۆڕێدایە. کە وا دەکات ئەم روودیوارانە قەوارەی خانووەکانی پشت دیوارەکە دەرنەخەن.

ب- گرنگی دەرگاو دەوروبەری لە رووی ئەرکەوە جیاوازن. دەرگای سەرەکی لە حەفتاکاندا دروستکراوەو لە پرۆسەیەکی فراوان نۆژەنکردنەوەدا بوو بەهۆی گۆڕانێکی گەورە لە ناوچەکەدا، پاش ئەوەی ناوچەیەکی بازرگانی تەواوی قەلات بوو.

لەبەر ئەوەی دەرگاکە گەوی پەیوەستی نێوان قەلاو بازاڕی کۆن بوو فشاری بازرگانی وای کرد،

خانووبەرەی دیکە لەخوار دەرگاکەو لە تەنیشت چەپی دروست بکرێت. کەوا کاری کردۆتە سەر شێوەی گشتی دەرگاکەو جوانییەکەی و سیمبوّل بوونی وەک ئادگارێکی سەرەکی قەڵات.

دەرگای ئەحمەدی بۆ ئۆتۆمبێلان تەرخان کراوە، خانووە کەلاوەکانی تەنیشتەکانی رووخێندراون بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێل و پیادە بتوانن هاتوچۆ بکەن. دەکرێ سوود لەدەرگاکە وەربگرین وەک پرۆژەیەکی گەشت و گوزاری کە دەروانێتە گشت شاری هەولێر و دەوروبەری.

دەرگای (کوچک قاپی) یان دەرگای بچووک لەئاکامی بوونی رارەوێک لەنێوان دوو خانوو دروست بوو. شوێنی ئەم دەرگایە لاوەکییە بەگوێرەی دەرگاکانی دیکە، پێشنیار دەکەین بەشێوەیەک نەبێت زاڵ بێت بەسەر رووگەی و دەوروبەری.

ج- لەگەڵ ئەو رایەدام کەوا دەڵێت پێویستە خوار قەلات چۆڵ بکرێت تەنیا دیوارێکی پشتگر کە رێگە بگرێت لە داخورانی خۆڵ و تەنها شۆستەو شەقام هەبێت لە خوار قەلات. ئەم رێگا چارەیە ئامادەگی قەڵات بەرچاو دەخات و بینەر لەنزیکەوەی دەبینێت کە شکۆمەندی و شانازی تێدایە.

## سێیەم: چەندان سیاسەتی گشتی بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە

چۆن دەکرێ چەندان سیاسەت دەستنیشان بکرێت، کەوا سەرکەوتنی پرۆژەی پاراستنی کلتووری بیناسازی و دەستنیشانکردنی لەمپەرەکان و رێگای رەتبوون لەم لەمپەرانە لە ئەستۆ بگرێت.

گرنگترین شتێ کە پێویستە پێوە پابەند بین، ئەوەیە کە گونجاندنێکی قەوارەیی هەبێت لە شێوەو رێکهێنەکان لەنێوان پێکهاتەی پرۆژەکەو تەیانەی بیناسازی دەوروبەری.

سەرەرای ئەوەش یەکێک لە هۆیەکانی سەرکەوتنی پرۆژەکە پێویستی بەتێگەیشتنی کەرتێکی فرەوانی کۆمەڵگە هەیە لە بایەخ و گرنگییەکەی. سەرەرای رێکهێنە یاسایی و مافی دەست تێوەردان لە خاوەندارییەتی گشتی. دواتر دیاریکردنی پارەی پێویست.

راسپاردەکانی یەکەم کۆنگرەی پاراستنی شوێنەوارو کلتووری بیناسازی لە ئەسینا لە ساڵی ١٩٣١ کە بوو (پەیماننامەی ئەسینا) لە (یەکەم برگەی)دا کە نیشانە بیناسازییە مێژووییەکان نەک هەر کارە بیناسازییە گەورەکان و بنیاتە زەبەلاحەکان، بەڵکو کارە کۆنە هەرە خاکییەکان دەگرێتەوە، کە ئاماژەی رۆشنبیری گەورەی تێدایە بەدرێژایی رۆژگاردا.

برگەی (شەشەم) لە پەیماننامەکە هێما بۆ هەموو شوێنێک دەکات کەوا رووداوی مێژوویی تێدا رووبدات، پێویستە بپارێزرێت. بازرگانانی خانوو و بەرەو بەڵێنکاران هیواخوازن گرنگی ئەم خانووە کۆنانە کەم بکەنەوەو بینایەی نوێی پرداهاتی بازرگانی تێدا بنیات بنێت.

پرۆسەی پاراستنی کلتووری بیناسازی و چاککردنی و ئاوەدانکردنەوەی پێویستی بەهەوڵ و کۆششی هەموو رۆشنبیرو شوێنەوار ناسان و بیناسازان و سیاسەتمەداران و دابینکردنی پشتگیری حکومەت هەیە بۆ ئەوەی شێوەو سەرچاوەی پارەدان دابین بکرێت.

چاککردنەوەی خانووی کلتووری واتای وا نییە کەوا تەنیا ئەو بینایە مەبەستە بەڵکو دەوروبەر و هاوسێکانیش مەبەستە لەگەڵ تەیاکانی دەوروبەری خانووەکە، هەروەها پاراستنی زەوی و ژینگەی سروشتی بەشێکە لە پێکهاتەی بیناسازی گشتیدا.

سەرەرای ئەوەش دابینکردنی پێداویستی ژیان و خزمەتگوزاری هاوچەرخ بۆ ناوچە کلتوورییە مێژووییەکان، شیانی بەکارهێنانی ئەم ناوچانە دابین دەکات و نیشتەجێکردنی ئەوانەی دەتوانن بەردەوام بیپارێزن و دروست بەکاری بێنن.

دیارە لایەنی گەشت و گوزار هۆکارێکی ئابووری سەربارە بۆ بەردەوامی چاکسازی و کارو پاراستنی بینا کلتوورییەکان. بەمەرجێک بەلێکۆڵینەوەو بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو بێت بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی دارمان و کارکردنە سەر ئەم خانووانە.

# پەیکەرو دیواربەندی لە هەولێر

فەرەیدون سامان

کۆمەڵگای شار لە هەر وڵاتێکدا لە جیهان بەوە پێناسە دەکرێ، کە خاوەنی کۆمەڵێک خەسڵەتی شارستانی و بیناسازییە، جا چ کۆن و چ نوێ (دێرین و هاوچەرخ)، گەرەکە ئەم شارە هەڵگری ئەو جۆرە پێناسە ژیارییە بێت، بۆ ئەوەی بنەماکانی دروستبوونی شارستانیەتی تێدا بەدی بکرێت.

یەکێک لەو خەسڵەتانەش بە زەرووەرت هەبوونی چەندین کاری هونەری وەک بوونی پەیکەر (کاری پەیکەرسازی و پەیکەرتاشی) و دیوار بەندییە لەناو گۆڕەپان و پارک و بەردەم تەلارو دەروازەکانی شاردا و دانانیان لە شوێنە گرنگ و ستراتیژییەکانە، وەک ناوچەی مێژوویی و شوێنەوارییەکان، هەروەها ئەو شوێنانەی سیمبولی خەبات و قوربانیدانی هاووڵاتیانی ئەو شارەن، سەرەڕای سیمبولی چەند و کلتووری ئەو هونەرمەندو ئەدیب و رۆژنامەنووسانەیە، کە لە سەردەمی بەخشندەیی ئەدەب و هونەر و رۆژنامەگەری خۆیاندا توانیبیان بە داهێنانەکانیان خزمەت بە شارو وڵاتەکەیان بکەن.



دیارە هۆکاریش زۆرن، کە لە زۆربەی بەشەکانی کوردستان، بەتایبەتیش باشووری کوردستان، لەوانەش لە شارێکی دێرین و گەورە و ئاپۆرای وەک هەولێری پایتەخت کەمتر ئەم دیاردە شارستانییە بەدی دەکرێت، هەرچەندە لە ساڵانی رابردوو لێرەو لەوێ چەند دانە پەیکەرێک و دیواربەندییەک لە شوێنی جیاوازو نەگونجاودا داخراون،

بەڵام ئەم کارە هونەرییانە سەرباری کەم و کووڕی هونەری و نەشیاوی لە قەوارە و مادەو کەرستەکان و ساکارییان، لە هەمان کاتیشدا ناتوانن ببن بە سمبولی بەرخودانی رۆڵەکانی ئەو شارەی، کە لە مێژووی کۆن و نوێیدا لە خەباتێکی نیشتمانی و رۆشنبیری بێوچان و قوربانیدانیان بووە. هەرچەند مایەی خۆشحاڵی و سەرفرازییە، کە چەند پەیکەرێک و دیواربەندو مینۆمێنت بەم دواییە لە لایەن هونەرمەندانی کوردو بیانییەوە دروستکراون و دانراون، وەک پەیکەری (مەستوورەی ئەردەڵان) کاری هونەرمەندی پەیکەرسازی شاری سنە هادی زیائودینی لە ناو پارکی هەولێر، هەروەها پەیکەری شاعیری ناوداری عیراقی محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری، بەو دواییەش مینۆمێنتی شەهیدانی یەکی شوبات. جگە لە هەبوونی چەندین پەیکەری وەک ئیبن مستەوفی کاری هونەرمەندی پەیکەرساز زاهیر سەدیق و پەیکەری عزەدین فەیزی کاری هونەرمەندی پەیکەرساز دارا حەمە سەعی و چەندین پەیکەری دیکەی وەک شەهید خەیروڵڵا عەبدولکەریم، وێڕای هەبوونی ئەو نیگارو وێنانەی، کە لەسەر رووبەری دیوارەکانی پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران و پارێزگای هەولێر و شوێنی دیکە هەن، بۆ نموونە: لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکان پەیکەرەکەی شێخی نەمر (مەلیک مەحموود بەرزنجی) لەلایەن دوو پەیکەرسازی شاری هەولێر دروست کرا. تەنانەت نەک هەر رەخنەگرانی بواری شێوەکاری و پەیکەرسازی، بەڵکو رێبوارو بینەرانی سادەش بە ئاشکرا هەست بەوە دەکەن ئەم پەیکەرە قەوارەی هونەری و ئاساییە، کە چەند بچووکە و شوێنەکەش چەند نەگونجاوە لە کاتێکدا دەبووا بە قەوارەیەکی گەورەو شوێنی گونجاویش بەردەم گۆڕەپانەکەی ئەنجوومەنی وەزیران بووایە، کە وەک رەمزی یەکەم دەسەڵاتداری حکومەتی باشووری کوردستان لە سەدەی رابردوودا، هەروەها دەکرا پەیکەرەکەی شەهید خەیروڵڵا لەبەردەم تەلاری وەزارەتی پێشمەرگە دابندرابووا یان پەیکەرەکەی مامۆستا عزەدین فەیزی لەلایەن تەلاری وەزارەتی پەروەردە دابندرایە وەک سیمبولی مامۆستایەکی پەروەردەکارو فێرخواز، کە لە رۆژگاری سەختی خۆیدا چەندین نەوەی لە پسپۆڕان و دکتۆر و ئەندازیارو مامۆستایان پێگەیاند، هەروەها پاش ئازادکردنی پەیکەرەکەی شەهید موسا عەنتەر دەکرێ ئەم پەیکەرە بخرێتە بەردەم کۆڕی زانیاری کوردستان یان سەندیکای رۆژنامەنووسان. چونکە شەهید موسا عەنتەر وێڕای ئەوەی کە پارێزەرێکی ناسراو بوو لە داکۆکیکردن لە مافی بەشخوراوی گەلەکەیدا، لە هەمان ئاستیشدا نووسەرو رۆژنامەوانێکی بێ هاوتا بوو. بەوجۆرە دەکرێ لە داهاتووشدا هەر کەسایەتییەکی کورد، کە رەمزی نەتەوەیی و رۆشنبیری و زانستی گەلەکەیانن، یان هەر هاووڵاتییەکی دڵسۆزی ئەم شارە، کە لە بوارێکدا خزمەتێکی گەورەی پێشکەش کردبێ، بیر لەوە بکرێتەوە، کە پەیکەرێکی بۆ دروست بکەن، بەڵام لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دابنرێت، دواتر خۆ دەکرێ وەزارەتی رۆشنبیری وەک پرۆژەیەک پرۆتۆکۆلێک لەگەڵ ژمارەیەک پەیکەرسازو پەیکەرتاشی کورد و بیانی بکات (هەروەک چۆن لەگەڵ فوئاد عەلی پەیکەرسازو پەیکەرسازێکی ئیتالی کراوە، کە مینۆمێنتی پێشمەرگەی وێن بکەن...) ئاواش پەیوەندی بە هونەرمەندانی دیکەو کۆمپانیای بیانی دیکە بکەن بۆ ئەنجامدانی چەندین کاری هونەری دیکە، سەرەنجام ببێتە مایەی شانازی و سەرفرازی شارەکەمان، بەتایبەتی و کوردستانیش بەگشتی. بەم شێوەیەش رووی ئەوەیان دەبێ کاتێ شاندێکی هونەری یان رۆشنبیری یان هەر رێبوارێک کاتێ لە دەرەوە بە سەردان دێتە کوردستان بە چاوی خۆی ببینێ، کە شارەکەمان سیمای هونەری و شارستانی هەیەو رەمزەکانیش ئەوانەن، کە پەیکەریان بۆ دروستکراوە. بە تایبەتیش لەم چەند ساڵەی دوایی کە لە چەندین بۆنەی جیاوازدا فیستیڤاڵ و کۆنفراسی ئەدەبی و هونەری ساز دەکرێن، بە سەدان میوانی کوردو بیانی سەردانی شارەکەمان دەکەن، بە چاوی خۆشیان ئەوە دەبینن، کە شارەکەمان بێ خاوەن نییە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە ١٣ ساڵی دووەم ٢٠٠٦ وەرگیراوە.

# مێژووی هونەری کاریکاتێر لە شاری هەولێر

**هەندرێن ئەسعەد خۆشناو**

### کورتەیەکی مێژوویی

ئاشکرایە کە هەردەم وێنە بایەخ و گرنگی خۆی هەبووە لە تێگەیشتن و تێگەیاندنی مرۆڤ، وێنە پێش نووسین پەیدابووە و هەبووە، مرۆڤ بۆ یاداشتکردنی بیرو هزری خۆی بەکاری هێناوە و، بۆ تۆمارکردنی سەربوردەی خۆی لەسەر دیوارەکانی ئەشکەوت و دواییش خانوو و شارەکان و دیوارەبەندەکان وێنەی بەکارهێناوە، لە ئەرشیفکردنی رووداوە مێژوویی و شارستانیەکانیش وێنە رۆڵێکی دیار وگرنگ و بەرچاوی هەبووە و دەبێ، بۆیە ئێستا وێنە رۆڵێکی گرنگتر و پێشکەوتووتر دەبینێ لە بواری مەعریفی و زانستی و شارستانی و پەروەردەیی و رۆشنبیری و هونەری و رۆژنامەگەریشدا، لە بواری رۆژنامەگەریدا ئەوەی کە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ بە پلەی یەکەم وێنە دێ و بە پلەی دووەمیش ناوونیشانە دیار و سەرنجراکێشەکان، بێجگە لەوەی کە وێنە رۆڵێکی جوانکاریی بێ هاوتا دەبینێ لە رۆژنامە و بڵاوکراوەکاندا، دەقەکان جوانتر و پڕماناتر و بەپێزتر دەکات و مەودایەکی قووڵیشی پێدەبەخشێ.

کوردیش لە دوای گەلانی تردەوە بەهۆی چەندین هۆکاری بابەتی و خودیی بووە بە خاوەن رۆژنامەگەری خۆی، یەکەم رۆژنامەی خۆشی لە ساڵی ١٨٩٨ بڵاوکردۆتەوە لەسەر دەستی میقداد مەدحەت بەدرخان لە شاری قاهیرە، بەڵام بەداخەوە یەکەم رۆژنامەمان کە رۆژنامەی (کوردستان)ـە بە درێژایی ماوەی دەرچوونی لە قاهیرە و لەندەن و فۆلکستۆن و ژنێف بەبێ وێنە دەرچووە، دواییش رۆژنامەی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) کە لە ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەنبۆڵ دەرچووە، لە ساڵی ١٩٠٩ رۆژنامەی (شەرق قە کوردستان) لە ئەستەنبۆڵ و رۆژنامەی (پەیمان) لە دیاربەکر- ئامەد دەرچوون، هیچ وێنەیەکیان تێدا بڵاو نەکراوەتەوە، دوای ئەوان گۆڤاری (رۆژ کرد- رۆژی کورد) لە ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەنبۆڵ لەلایەن کۆمەڵەی (هیڤیا کورد) تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچووە، یەکەمین گۆڤاری کوردییە وێنەی بڵاوکردبێتەوە. لە هەر ژمارەیەک یەک وێنە، دوای ئەویش بە چەندین ساڵ بۆ نموونە (رۆژی کوردستان) لە ساڵی ١٩٢٢ لە سلێمانی و (بانگی کوردستان) هەر بەبێ وێنە دەرچوون.

لە هەولێریش کتێبی (غنچە بهارستان)ی حوسێن حوزنی موکریانی کە لە ١٩٢٥ بڵاوبۆتەوە، زیاتر لە (٢٠) تابلۆی تێدابووە کە ناوبراو بۆخۆی کێشاویەتی، بەمەش دەبێتە یەکەم نووسەری کوردی هاوچەرخ کە کتێبی خۆی بە گرافیک و نیگار رازاندبێتەوە، ئەمەش سەرهەڵدانی هونەری گرافیکە لە کوردستان و هەولێر بەتایبەتی.

دەکرێ گۆڤاری (رۆناهی – Ronahi) کە لە ساڵی ١٩٤٢ لە شام دەرچووە بە یەکەمین گۆڤاری وێنەداری کوردی دابنێین لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردیدا، چونکە تا ساڵانی دوای شۆرشی ١٤ یۆلیۆی ١٩٥٨ هیچ گۆڤار و رۆژنامەیەک ئەوەندەی گۆڤاری (رۆناهی) بایەخی بە بڵاوکردنەوەی وێنە نەداوە، هەرچەندە هەندێکیان وێنە و وێنەی بەدەست کێشراوی بڵاو دەکردەوە.

سەبارەت بەکاریکاتێریشەوە لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٢٧ هونەرمەند مەحمود شەوقی باوکی ئازاد شەوقی، کاریکاتێر و نیگاری کێشاوە لە سلێمانی.

لە هەولێریش (لێژنەی فەن و تەمسیل) بووە (لێژنەی فنون جمیلە) کە پێکهاتبوون لە دانیال قەساب، منیر و

ناحوم عوزێر قەسابی براکانی، سەلاحەدین مستەفا محامی، رەشید عەبدولقادر رەشید، جەواد رەسوڵ ناجی، فوئاد رەسوڵ ناجی، عەبدوڵلا حوسێن کەسرە. ئەم لێژنەیە لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند، لە ساڵی ۱۹۳۲-۱۹۳۳ لە سانەوییەی هەولێر ژووریکیان بۆخۆیان تەرخان کرد و یەکەم (ستۆدیۆ رەسم) یان بۆخۆیان لە شاری هەولێر دامەزراند. دانیال قەساب لە ساڵی ۱۹۳٤ لە هەولێر یەکەم گەلەری نیگارکێشی خۆی دەکاتەوە کە دەبێتە دووەم گەلەری لە هەولێر، لە ساڵی ۱۹٤۱ دانیال قەساب پەیوەندی بە (أصدقاء الفن) دەکات لە بەغدا و بەشداری کردووە لە یەکەم پێشانگەی هاوبەشی ئەو پێوەندە کە بریتی بوو لە (۸٤) تابلۆی رۆنی و (۱٦) تابلۆی ئاوی و (۳) تابلۆی پاستێل و (٥) سکێچ و (۱٥) پارچە پەیکەرتاشین و (۱۷) کاریکاتێر.

هەروەها شەمسەدین عەبدولقادر ناسراو بە (حەسەن فەلاح) (۱۹۱۰ سلێمانی - ۱۹۷٦ بەغدا) کە بەیەکێک لە یەکەمین هونەرمەندە شێوەکارەکانی کوردستانی عیراق دەژمێردرێ، لە ساڵی ۱۹٤۱ لە کاتی شەرەکەی رەشید عالی گەیلانیدا، لە بەغدا لە گۆڤاری کاریکاتێری (حبزبوز) کاری کردووە (کە بەرپرسی گۆڤارەکە نوری سابت بووە کە ئەویش کورد بووە) بە کاریکاتێر وێنەی (عەبدول ئیلاهی - وصی) و (نوری سەعید - سەرۆک وەزیران) کێشاوە. هەروەها لە گۆڤاری کاریکاتێری (الکشکول) کە بەرپرسەکەی حمادی الضاهی بوو، داوای لێدەکرد کە وێنەی کاریکاتێری هیتلەر و نوری سەعیدی بۆ بکات.

هەروەها هونەرمەند ئەنوەر سینو تووڤی (۱۹۲۷ بامەرنی - ۱۹۹٤ بەغدا) کە خەڵکی گوندی توڤیە لە کوردستانی تورکیاوە هاتوونە کوردستانی عیراق، ئەگەر یەکەمین هونەرمەندی کوردی کاریکاتێریستیش نەبێ، ئەوا یەکێک بووە لە یەکەمین ئەو نیگارکێشانەی کە کاریکاتێریان دروست کردووە و بڵاوکردۆتەوە، و هونەری کاریکاتێر لای ئەو ناوەڕۆکێکی رەخنەگرانە و زمانێکی کۆمەڵایەتییانەی هەیە لە بەرگێکی جوانی دەربڕینخوازدا.

**مێژووی وێنەی کاریکاتێری لە رۆژنامەگەریی کوردیدا**

دیارە کە مێژووی وێنەی کاریکاتێری بە درێژایی مێژووی پەیدابوونی نیگارکێشانەوەیە کە لە پێش نووسینەوە هەبووە و شێوازی نووسینی تەنزئامێز و گاڵتەجاری رەخنەیی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مێژوویەکی دێرینی هەیە، تەنانەت ئەرستۆ لە کتێبی (پیوتیکا) ئاماژەی بۆ کردووە، لە سەردەمی یۆنانی و رۆمانیدا سەرنجی راکێشاون، ئەرستۆ پێیوایە تەنز و کۆمیدیاش هەروەکو تراژیدیا رۆڵێکی گرنگ لە پاکبوونەوەی دەروونی مرۆڤدا دەگێڕێ، کە ناوی ناوە (Cathersis)، وشەی کاریکاتێریش لە کاریکاتۆراوە هاتووە کە وشەیەکی ئیتاڵییە و بە مانای وێنەی کێشراو بە زێدەڕۆییەوە یان وێنەی گاڵتەئامێزییەوە دێ. ئەگەر کاریکاتێر سادەترین هۆی دەربڕینی رۆژنامەنووسی بێ بەڵام بەهێزترینیانە. تەنانەت کاریکاتێرێک بەقەد چەندین لاپەڕەی نووسین توانای دەربڕینی هەیە. لە دەستنیشانکردنی ئەرک و پەیامی تەنز و کۆمیدیاش لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، لەپاڵ دیاریکردنی چەوتی و دیاردە دزێو و ناهەموارییەکاندا، لە رووی دەروونیشەوە ئاسوودەیی و خۆشی دەبەخشێ.

یەکەم کاریکاتێر لە رۆژنامەگەری کوردی لە گۆڤاری (رۆناهی - Ronahi) لە ساڵی ۱۹٤۲ کە لە شام دەرچووە بڵاوکراوەتەوە، کاریکاتێرەکەش لە رۆژنامەیەکی بیانییەوە وەرگیراوە هەروەک زۆربەی ئەو وێنانەی کە تێیدا بڵاوکراوەتەوە.

پێ دەچێ تا سەرەتاکانی حەفتاکان کاریکاتێر لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاو نەکرابێتەوە، لەگەڵ هەبوونی چەندین گۆڤاری عەرەبی و تورکی و فارسی تایبەت بە هونەری کاریکاتێر لە عیراق و ناوچەکەدا. بە تایبەتی کە هەندێ لە بەرپرسی ئەو گۆڤارە کاریکاتێریانە کورد بوون وەک (نوری سابت) بەرپرسی گۆڤاری (حەبەزبوز)ی کاریکاتێری کە بە زمانی عەرەبی لە عیراق یەکەم ژمارەی لە ۱۹۳۱/۹/۲۹ بڵاوکراوەتەوە، کە حەسەن فەلاح لە ساڵی ۱۹٤۱ کاریکاتێری تێدا بڵاو کردۆتەوە وەک لەپێشەوە ئاماژەمان پێداوە. جێگەی سەرنجە کە ئەم رۆژنامە و گۆڤارە عەرەبیانە نەبوونەتە هۆی ئەوەی، کە رۆژنامەوانە کوردەکان بیر لە پرۆژەیەکی وا بکەنەوە، وەکو پێویستییەکی ئەو رۆژگارە ئەم ئەرکە بخەنە سەرشانی خۆیان.

تا دوای راپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ی خەڵکی کوردستان، گۆڤاری تایبەت بە هونەری کاریکاتێری کوردی

دەرنەچووە، یەکەمین بڵاوکراوەی گاڵتەجاڕیی تەنزئامێز لە کوردستان دەرچووبێ بڵاوکراوەی (فشقی تایمز) بوو، یەکەمین ژمارەی لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ لەلایەن چەند خوێندکارێکەوە لەزانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر دەرچووە، یەکەم گۆڤاری کاریکاتێریی کوردی لە شاری سلێمانی دەرچوو لە مانگی ٢ / ١٩٩٧ بە ناوی (سیخورمە)، دوای پێنج مانگیش یەکەم گۆڤاری کاریکاتێری لە شاری هەولێر دەرچوو لە مانگی ٧ / ١٩٩٧ بە ناوی (مەلا مەشهور). لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تریش مەگەر تاک و تەرا نەبێ، دەنا ئەو بایەخ و گرنگییە شایستەیەی ئەو هونەرەی پێنەدراوە، زۆرجاریش بۆ زیاتر بەهێزکردنی بابەتێکی نووسراو بەکاردێ، یان لەسەر داوای بەرپرسی ڕۆژنامەکە یان بەرپرسی لاپەڕەکە کاریکاتێرێک دەکرێ بۆ ئەو بابەتەی کە ئەو بەرپرسە گەرەکییەتی بۆ مەبەستێک لە ناخی یەعقوبەوە!. ئەمە لە کاتێکدا کە لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دەرەوە کاریکاتێر لەگەڵ گرنگترین نووسینی ڕۆژنامەکە کە سەروتارە بەیەک چاو سەیر دەکرێ، لە شوێنێکی شایستە و لە لاپەڕەی یەکەمدا بڵاودەکرێتەوە، کەچی لای ئێمە زۆرجار کاریکاتێر تەنها بۆ پڕکردنەوەی شوێنێک لە لاپەڕەیەک بەکاردێ کە کارمەندانی ئەو بڵاوکراوەیە بابەتی نووسراویان نەبووە بۆ پڕکردنەوەی ئەو شوێنە بەتاڵە!. پەیوەندییەکی ئەوتۆش لە نێوان بەرپرسی نووسین و نووسەری ڕۆژنامە و هونەرمەندی کاریکاتێریست هەستی پێناکرێ کە تەواوکەری یەکترین و دەبێ هەبێ.

### ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی شاری هەولێر و هونەری کاریکاتێر

شاری هەولێر یەکێکە لە شارە هەرەکۆنەکانی جیهان، بە گوتەی مێژوونووسان و شوێنەوارناسان کۆنترین شاری دنیایە کە ئاوەدانی لێ ماوەتەوە و ژیانی تێدا بەردەوامە، بێگومان شارێکی وا کۆن دەبێ خاوەن کولتوور و ڕۆشنبیری و هونەری ڕەسەن و دێرینیش بێ، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئامێری چاپ بە ڕۆژهەڵاتدا لە ڕێگەی ئەرمەنی و مەسیحیەکانەوە و دواتر هێنانی ئەو ئامێرانە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بۆ کوردستان، دواتر هێنانی چاپخانە لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانییەوە بۆ ڕەواندز و دواتر بۆ هەولێر، سەرەتای بزاڤێکی ڕۆژنامەوانی لە هەولێر دەست پێدەکات، بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (زاری کرمانجی ١٩٢٦-١٩٣٢) لە ڕەواندز، گۆڤاری (ڕووناکی ٢٤/١٠/١٩٣٥ - ١٦/٥/١٩٣٦) لە هەولێر، هەفتەنامەی (گۆڤار - ١٩٤٣)، ڕۆژنامەی (ئازادی - ١٩٤٤)، ڕۆژنامەی (هەتاو - ١٩٤٨)، گۆڤاری (یەکێتی تێکۆشین) کە بە نهێنی لەلایەن پارتە سیاسییەکانەوە دەردەچوو، گۆڤاری (هەتاو ١٩٥٤-١٩٦٠)، گۆڤاری (هەولێر - مایس ١٩٧٠) لە هەولێر بڵاوکراونەتەوە. بە داخەوە ئەم گۆڤار و هەفتەنامە و ڕۆژنامانە لەلایەنی بڵاوکردنەوەی وێنە و کاریکاتێر لاواز بوون و سوودیان لە وێنە وەرنەگرتووە و بڵاویان نەکردۆتەوە.

پێدەچێ کە محەممەد مەولود مەم (١٩٢٦-١٩٨٧) کە سەرۆکی نووسینی گۆڤاری (هەولێر ١٩٧٠) بووە، وەکو ڕۆشنبیرێک و خوێنەرێکی ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبییەکان، ئاگای هەبووە لە گۆڤارە کاریکاتێرییە عەرەبییەکان کە لە عیراق دەردەچوون، بە تایبەتی گۆڤاری کاریکاتێریی (الفکاهە ١٩٦٣-١٩٧١) و شێوە تەنزئامێزەکانی مارف بەرزنجی و خوێندوویەتیەوە، ئەوەی شایانی سەرنجە بابەتەکانی خاڵۆی ڕێبوار (مەم) تەنها بە زمانێکی میللی و تەنزئامێز نەنووسراون، بەڵکو وەکو کۆمەڵێ شێوەی کاریکاتێری نووسراون. بۆ نموونە لە یەکێ لە گۆشەکانی بە ناونیشانی (بانگێک لە بەڕێوەبەری پۆلیس) نووسیویەتی و دەڵێ: بەڕێوەبەری پۆلیس بانگی هەموو ئەوانە دەکات، لە دانیشتوانی شار کە تا ئێستا نەیانکردووە بە خوو لە چەقی جادەکان بڕۆن و جووڵانەوەی هاتوچۆ بشڵەژێنن، بۆ ئەوەی خەڵاتیان بکات، بڕوایشی بە قسەی هەموو ئەوانە هەیە کە بۆ خەڵات وەرگرتن موراجەعەت ئەکەن و پێویستیش بە شاهێد هێنان ناکات!. ئەم شێوازە نووسینە لە لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەوانیدا دەچێتە خانەی ساتیری کۆمەڵایەتییەوە، کە لە وێنەیەکی کاریکاتۆری زێدەڕۆییدا خۆ دەنوێنێ.

### بڵاوکراوە و گۆڤاری کاریکاتێری کە لە شاری هەولێرەوە دەرچوون

#### ١- بڵاوکراوەی فشقی تایمز:

یەکەمین بڵاوکراوەی گاڵتەجاڕیی تەنزئامێزە نەک لە

هەولێر بەڵکو لە کوردستان، ئەم بلاوکراوەیە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ ژمارە (سفر)ی بە تیراژی (٤٠) دانەی (٨) لاپەڕەیی لە زانکۆی سەلاحەدینی شاری هەولێر لەلایەن چوار خوێندکارەوە دەرچووە. بلاوکراوەیەکی هەمەڕەنگ بوو، زیاتر گرنگی بە توێژی خوێندکارانی زانکۆ دەدا، کاتی دەرچوونی بلاوکراوەکە دیارنەبوو، هەر کاتێک ئارەزوویان لێبا ژمارەیەکیان دەردەکرد، ژمارەی لاپەڕەکانیشی دیارنەبوو، تیراژەکەی بەردەوام لە زیادبووندابوو، دوا ژمارەی تیراژەکەی گەیشتە (٤٠٠) دانە. فشقی تایز تەنیا (٢٨) ژمارەی لێدەرچوو. بەهۆی لێکدابرانی دەستەی نووسەرانی و نەبوونی پاڵپشتی ماددی وایکرد بلاوکراوەکە نەتوانێ بەردەوام بێ.

**٢- گۆڤاری مەلا مەشهور:**

یەکەمین گۆڤاری تایبەتە بە کاریکاتێر و ڕەخنە و پێکەنین کە لە هەولێر دەردەچوو، ژمارە (١) لە مانگی ٧ /١٩٩٧ لە هەولێر دەرچووە. تا ساڵی ٢٠٠٣ (٤٥) ژمارەی لێدەرچووە، گۆڤارێکی (١٦) لاپەڕەیی بە تیراژی (١٠٠٠) دانە بوو، گۆڤارێکی مانگانەی سەربەخۆ بوو، سەر بە هیچ لایەن و حزبێکەوە نەبوو، بەڵام کۆمەکی دارایی دەکرا لەلایەن ئەو بەرپرس و کەسانەی کە باوەڕیان بە دیموکراسی و ڕەخنە هەبوو، گۆڤارێکی بوێر بوو، دیاردە دزێوە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی خستۆتەڕوو، توانجی لە کاربەدەست و بەرپرسانی حزبی و ئیداری داوە. بەدرێژایی تەمەنی گۆڤارەکە، توانیوبەتی دوو پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێریی بۆ کاریکاتێریستانی گۆڤارەکە لە شاری هەولێر بکاتەوە یەکەمیان لە ساڵی ٢٠٠٠ و دووەمیان لە ساڵی ٢٠٠٣، ستافی گۆڤارەکە پێکهاتبوو لە خاوەن ئیمتیاز: عەبدولڕەحمان پاشا، سەرنووسەر: حەیدەر قادر، سکرتێری نووسین: عەلۆ سندی بە هاوکاری جەلال زەنگابادی. کاریکاتێریستەکان: سەردار کێستەیی، کامەران خۆشناو، لوئەی کۆیی، جەمیل محەمەد، گرفتار کاکەیی، هەندرێن خۆشناو، عەلی دەروێش (بەمۆ)، سەلاح محەمەد عەلی و دیار ئاکرەیی بوون. ستافەکەشی ناوە ناوە گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، و لە ژمارە (٤٢) لە ٢٠٠١/٥ کامەران خۆشناو بووە بە بەڕێوەبەری نووسین، لە ژمارە(٤٣) ەوەش لە ٢٠٠٢/١٢ بووە بە سەرنووسەر، لە ژمارە دواییەکانیش تەنها لوئەی کۆیی و هەندرێن خۆشناو و عەلی دەروێش وەک کاریکاتێریست بەردەوام بوون.

**٢- گۆڤاری (دەهۆڵ تایز):**

گۆڤارێکی تەنزئامێزی کۆمەلایەتی - کاریکاتێریە، ژمارە (١) لە ١٥/ ١٢ /١٩٩٩ لە هەولێر دەرچوو، تا مانگی ٧ / ٢ ٢٠٠٢ (٣٢) ژمارەی لێدەرچووە. گۆڤارێکی مانگانەی (٢٠) لاپەڕەیی بوو، ستافی گۆڤارەکەش پێکهاتبوو لە خاوەن ئیمتیاز: خالید ئەحمەد خدر (میران)، و سەرنووسەر: د. شاپان ( رزگار نوری شاوەیس)، و کاریکاتێریست: عەلی دەروێش (بەمۆ)

لە زۆربەی ژمارەکانیدا گرنگیەکی تەواوی بەلایەنی کاریکاتێر و وێنەی فۆتۆیی دەدا، چەند گۆشەیەکی بەردەوامی هەبوو کە تیایدا ڕەخنە لە کەسانی یاساشکێن و چەند دەزگایەکی حکومی دەگرت، زۆر بە کەمی بەلای دیاردە سیاسییەکاندا دەچوو. ئەم گۆڤارە لەلایەن مەکتەبی ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بەڕێوەدەچوو و دارایی دەکرا.

**٣- ڕۆڤاری (گەپ):**

ڕۆڤارێکی کاریکاتێریە ژمارە (١) لە ٢٠٠٤/١٠/١ لە هەولێر دەرچووە، مانگێ دووجار دەردەچێ، تا ئێستاش بەردەوامە، ڕۆڤارێکی (١٢) لاپەڕەییە، دەستەواژەی ڕۆڤاریش لە تێکهەڵکێشی نێوان وشەی ڕۆژنامە و وشەی گۆڤارەوە هاتووە، ستافی ڕۆڤارەکەش پێکهاتبوو لە سەرنووسەر: ئازا حەسیب قەرەداغی، جێگری سەرنووسەر (هونەری): محەمەد قادر-سەردەم، جێگری سەرنووسەر (نووسین): ئیسماعیل بەرزنجی، سکرتێری نووسین: بەرهەم عەلی، کاریکاتێریستان: عەلی دەروێش، سەردار کێستەیی، کامەران خۆشناو، لوئەی کۆیی، هەندرێن خۆشناو، سەلاح محەمەد عەلی، هەروەها کاریکاتێریستی عێراقی خزیر حمێریش بەشداربوو. دواییش ستافەکە بە بەردەوام گۆڕانکاری تێداکراوە، ئەم ڕۆژڤارە لەلایەن مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بەڕێوەدەچێ و دارایی دەکرێ.

**٤- گۆڤاری تەنزوێنە:**

ژمارە (١) لە ٢١ / ٣ / ٢٠٠٦ لە هەولێر دەرچوو، تا ئێستا (٨) ژمارەی لێدەرچووە، گۆڤارێکی مانگانەیە بەڵام لەبەر گرفتی داراییەوە نەتوانراوە مانگانە

بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دەرچێ، گۆڤارێکی (١٦) لاپەڕەییە، سەربەخۆیە و بەشێوەیەکی نارێک لەلایەن کۆمەڵەی کاریکاتێریستانی کوردستانەوە کۆمەکی دارایی کراوە، ستافەکەی پێکهاتووە لە خاوەن ئیمتیاز: کامەران خۆشناو، بەڕێوەبەری نووسین: هەندرێن ئەسعەد خۆشناو، کاریکاتێریستان: عەلی دەروێش، لوئەی کۆیی، سەلاح محەمەد عەلی، دیار ئاکرەیی بوون.

## ڕیزبەندی کاریکاتێریستانی شاری هەولێر بەپێی تەمەنیان

## دارا محەمەد عەلی



لەدایکبووی: ١٩٥٠ - هەولێر

پلەی خوێندن: دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان - بەغدا ساڵی ١٩٧٤.

ئەندامی ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستانە.

ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.

ئەندامی کۆمەڵەی شێوەکارانی عیراقە.

بەشداری کردووە لە دامەزراندنی پ.هـ.ج لە هەولێر، گەلەری زامـوا لە سلێمانی، گەلەری ئەربێللا لە هەولێر، بنکەی کاری دەستی لە هەولێر.

ئێستاش سەرپەرشتیاری پسپۆری پەروەردەی هونەرییە لە وەزارەتی پەروەردە.

سیانزە پێشانگەی تایبەتی شێوەکاری خۆی کردۆتەوە لە ساڵانی ٧١-٧٣-٧٧-٧٩-٨١-٨٤-٨٧-٩١-٩٤-١٩٩٨-٢٠٠٤-٢٠٠٥

بەشداری کردووە لە زیاتر لە (٥٠) پێشانگەی هاوبەشی شێوەکاری لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان، وەکو بەغدا، ئەردەن، پۆلۆنیا، ئەلمانیا، ژاپۆن، کۆریای باشوور، ئێران، ئەمریکا.

یەکەم کاریکاتێری خۆی لە هەفتەنامەی (هاوکاری) لە ژمارە (٢٧٤) لە ٤ / ٧ / ١٩٧٥ دا بڵاوکردۆتەوە. دواتریش لە هەفتەنامەی (کاروانی وەرزش) لە ساڵی ١٩٨٥دوە چەندین کاریکاتێری بڵاوکردۆتەوە.

هەر لە حەفتاکانەوە خولیای هونەری منداڵان بووە، لە گۆڤاری (ئەستێرە) کە لە بەغدا دەردەچوو لە ساڵی ١٩٧٥ نیگاری بڵاوکردۆتەوە، لە گۆڤاری (هەنگ)یش هەر لە سەرەتای دەرچوونیەوە و لە گۆڤاری (پەپوولەکە) و لە گۆڤاری (پەرستان) نیگاری بۆ منداڵان بڵاوکردۆتەوە. بەڕێوەبەری هونەری گۆڤاری (ئاسۆی منداڵان) بووە کە لە وەزارەتی پەروەردەی هەرێمەوە دەردەچوو.

لە ساڵی ٢٠٠٤ بەشداری کردووە لە نیگارکێشانی وێنەکانی کتێبەکانی پەروەردەی مەدەنی، لە ساڵی ٢٠٠٦ بەشداری کردووە لە نیگارکێشانی وێنەکانی کتێبی خوێندنەوەی سریانی بۆ وەزارەتی پەروەردە.

لە بوارەکانی هونەری کاریکاتێر، دیکۆری شانۆیی، هونەری مۆتیف، خۆشنووسی نوێ کاری کردووە.

(کەونە گوند هەر لە یادمی) پەرتووکی یەکەمی هونەرمەندە کە لە ساڵی ٢٠٠٤ چاپی کردووە.

(دیوانی مۆتیف) پەرتووکی دووەمی هونەرمەندە کە لە ساڵی ٢٠٠٧ چاپی کردووە.

یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند دارا محەمەد عەلی کە لە ١ / ٩ / ١٩٧٨ کێشاویەتی.



## سەلاح محەمەد عەلی



لەدایکبووی: ١٩٥١ هەولێر.

یەکەم کاریکاتێری خۆی لە هەفتەنامەی (هاوکاری) ساڵی ١٩٩٠ بڵاوکردۆتەوە.

بەشداری لە چوار پێشانگەی کاریکاتێری هاوبەش کردووە لە ساڵانی ٧٧- ٧٨- ٨٥ - ١٩٨٧ لە رۆژی هونەر لە هەولێر.

(٩) پێشانگەی کاریکاتێری تایبەتی خۆی کردۆتەوە لە هەولێر لە ساڵانی ١٩٩٠ - ٢٠٠٣.

بەشداری کردووە لە پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری لە یادی ١٠٢ ساڵەی رۆژی رۆژنامەگەری کوردی بە هاوکاری دەزگای بەدرخان لە ساڵی ٢٠٠٦.

لە زۆربەی رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان کاریکاتێری بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لەو هەفتەنامە و گۆڤارانەی بەر لە راپەرینیش وەکو ( پاشکۆی عێراق، هاوکاری، کاروانی وەرزش، تەندروستی و کۆمەڵ، رەنگین، کاروانی منداڵان) کە سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری عێراق بوون کاریکاتێری بڵاوکردۆتەوە.

* هونەرمەند لەرووی درامی و شانۆییشەوە کاری کردووە و لەبیۆگرافیای شانۆکاران ئاماژە بە کارەکانی کراوە.



یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند سەلاح محەمەد عەلی کە لە ژمارە (٤)ی گۆڤاری تەنزوێنە لە ٢٠٠٦/٩/ بڵاوکرایەوە.

## ئەدیبە سمایل مامە



لە دایکبووی: ١٩٦٦ - هەولێر

لە ٢٠ / ٣ / ١٩٩٢ بە کارەساتێکی دڵتەزێنی ئاگردوە کۆچی دوایی کرد.

ئەدیبە سمایل مامە کە بە یەکەم کچ دەژمێردرێ لە باشووری کوردستاندا کە دەستی داوەتە قەڵەم لە بواری هونەری کاریکاتێر.

یەکەم بەرهەمی کاریکاتێریی لە ١٩٨٧ لە هەفتەنامەی کاروانی وەرزش بڵاوکردۆتەوە.

لە ١٩٩١ یش یەکەم پێشانگەی کاریکاتێری تایبەتی لە هەولێر کردۆتەوە.

. بەشداری لە پێشانگاکانی سەندیکای هونەرمەندان کردووە لە بۆنەکانی رۆژی هونەر لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٩دا.

بەردەوامیش بوو لە بڵاوکردنەوەی تابلۆ کاریکاتێریەکانی لە رۆژنامەکانی هاوکاری و پاشکۆی عێراق و رەنگین و تەندروستی و کۆمەڵ و گۆڤاری منداڵان.

هەروەها لە دوای راپەرینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ ئەدیبە سمایل مامە بەردەوام بوو لەسەر ئەم رێچکە هونەرییە و لە رۆژنامەکانی کوردستانیش بەرهەمەکانی بڵاودەکردەوە. لە خێزانێکی هەژار لەگەڵ ئەوەی دوای مردنی دایک و باوکی، ئەرکی هەردووکیانی خستبووە ئەستۆی خۆی بەرامبەر بە خوشک و براکانی، بۆیە وازی لە خوێندن هێنا بە رۆژ چووە خوێندنی شەوانە، تا بتوانێ کاربکات و خوێندنیشی تەواو بکات، لە چاپخانەی رۆشنبیریی بەشی مۆنتاژ بووە کارمەند، ئەو کچە هەست ناسکە زۆر خولیای هونەر بوو، بۆیە هەوڵی ئەوەی دا کە ئەکادیمیانە شارەزای بنەماکانی هونەر بێ، ویستی لە ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان لە بەغدا وەربگیرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی نەبووە بەعسی ئەو ئاواتەی نەهاتەدی، لە پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی وەرگیرا، بەڵام لەبەر گرانی ئەرکی سەرشانی ئەدیبە نەیتوانی درێژە بەخوێندن

بدات. ئەم هەموو کارەسات و نەهامەتیانەی کە هاتبوونە بەردەم ئەدیبە، وای لێکرد کە دەست بداتە قەڵەم و فڵچە بۆ نەخشاندنی چەندین تابلۆی هونەری بۆ دەربڕینی ئەو ئێش و ئازارانەی کە لەناخیدا قەتیس ببوو، دوایی هەستی کرد کە تەنها بەهونەری کاریکاتێر دەتوانێ بەجوانترین شێوە ئەو ئێش و ئازارانە دەربڕێ و هەوڵی گۆڕینی ئەو واقیعە تاڵە بدات کە خۆی و خێزان و گەلەکەشی تێیکەوتبوو.



یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند ئەدیبە سمایل مامە کە لە ژمارە (١) گۆڤاری تەنزوێنە لە مارس/٢٠٠٦ بڵاوکرایەوە.

## لوئەی مەتی دەرمان کۆیی



لە دایکبووی: ١٩٦٦ - هەولێر.

پلەی خوێندن: دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاری پەترۆڵە.

یەکەم کاریکاتێری خۆی لە گۆڤاری (ئەلف با)ی عیراقی لە هەشتاکان بڵاوکردۆتەوە.

یەکەم کاریکاتێریستی شاری هەولێر بووە کە وێنەی نوری مالیکی سەرۆک وەزیرانی عیراق بکێشێ و یەکەم کاریکاتێریست بووە کە رەخنە لە رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کوردستان بگرێ. بە کاریکاتێر رەخنەی لە گەندەڵی ئەو رێکخراوە جێبەجێکارانەی بڕیاری ٩٨٦ گرتووە.

یەکەم پێشانگەی تایبەتی کاریکاتێری لە بەغدا ساڵی ١٩٨٤/ بەشی چالاکی قوتابخانەکان.

دووەم پێشانگەی تایبەتی کاریکاتێری لە بەغدا ساڵی ١٩٨٥/ هۆڵی سەندیکای ئەندازیاران.

سێ پێشانگەی تایبەتی کاریکاتێری لە هەولێر کردۆتەوە لە ساڵانی ٩١ - ٩٢ - ١٩٩٤.

بەشداری کردووە لە هەردوو پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری گۆڤاری مەلامەشهور لە هەولێر لە ساڵانی ١٩٩٨ و ٢٠٠٣.

بەشداری کردووە لە یەکەم پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری (کۆمەڵەی کاریکاتێریستانی کوردستان) لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٥.

بەڕێوەبەری هونەری و کاریکاتێریست بووە لە گۆڤاری مەلا مەشهور، بەڕێوەبەری بەشی سایت و ئینتەرنێت و کاریکاتێریست بووە لە گۆڤاری تەنزوێنە.

ئەندامی کارای سەندیکای ئەندازیارانی کوردستانە.

ئەندامی کارای کۆمەڵەی کاریکاتێریستانی کوردستانە.

کاریکاتێریستە لە گۆڤاری (تەنزوێنە)ی تایبەت بە رەخنە و کاریکاتێر.



یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند لوئەی کۆیی کە لە ساڵی ٢٠٠٦ کێشاویەتی.

## هەندرێن ئەسعەد ئەحمەد خۆشناو



لەدایکبووی: ١٩٦٩ - هەولێر.

پلەی خوێندن: دەرچووی کۆلێژی زانستی زانکۆی سەلاحەدین.

یەکەم کاریکاتێریستی شاری هەولێرە کە بەشێوەیەکی رێکوپێک سوودی لە کۆمپیوتەر

وەرگرتبێ لە وێنەکێشانی کاریکاتێردا. یەکەم کاریکاتێریستی شاری هەولێرە کە وێنەی سەدامی دیکتاتۆری عیراقی بە کاریکاتێر کێشابێ.

یەکەم کاریکاتێری خۆی لە ڕۆژنامە کوردییەکان لە ژمارە (١٣٧) ی ڕۆژنامەی ( ئاڵای ئازادی) لە ١٩٩٤/٩/٤ بڵاوکردۆتەوە.

بەشداری کردووە لە (٦) پێشانگەی هاوبەشی شێوەکاری لە ساڵانی ٨٦-٨٧-٨٨-٨٩-٩٠-١٩٩٢ لە هەولێر.

یەکەم پێشانگەی تایبەتی کاریکاتێری کردۆتەوە لە هەولێر ساڵی ١٩٨٦.

بەشداری کردووە لە (٥) پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری لە ساڵانی ٨٧-٨٨-٨٩-٩٠-١٩٩٢ لە هەولێر.

بەشداری کردووە لە پێشانگەی دووەمی هاوبەشی کاریکاتێری (گۆڤاری مەلا مەشهور) لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٣.

بەشداری کردووە لە یەکەم پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری (کۆمەڵەی کاریکاتێریستانی کوردستان) لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٥.

بەشداری کردووە لە پێشانگەی هاوبەشی کاریکاتێری لە ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردی بە هاوکاری دەزگای بەدرخان لە ٢٠٠٦ و خەڵاتی ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردی وەرگرتووە.

بەشداری کردووە لە سێ پێشانگەی هاوبەشی فۆتۆگرافی (کۆمەڵەی وێنەگرانی کوردستان) لە کەرکوک-٢٠٠٥ و هەولێر-٢٠٠٥ و بەغدا-٢٠٠٦.

لە ساڵی ١٩٩٨ - ٢٠٠٣ لە گۆڤاری (مەلا مەشهور) کاریکاتێریست و نووسەر بووە. لە ساڵی ٢٠٠١ - ٢٠٠٤ لە گۆڤاری (پەلکە زێڕینە) نیگارکێش و نووسەر بووە. لە ساڵی ٢٠٠٢ - ٢٠٠٤ لە مانگنامەی (سەروەریی یاسا) کاریکاتێریست و نووسەر بووە.

لە ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ لە هەفتەنامەی (دەنگی میللەت) کاریکاتێریست و نووسەر بووە. لە ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ لە ڕۆژنامەی (گەپ) کاریکاتێریست بووە. لە ساڵی ٢٠٠٥ تاوەکو ئێستا لە گۆڤاری (ئاسۆی منداڵان) نیگارکێشە. لە ساڵی ٢٠٠٥ تاوەکو ئێستا لە هەفتەنامەی (میدیا) کاریکاتێریستە. لە بڵاوکراوەی (کاریکارتۆن) کە مانگنامەی (بەدرخان) دەری دەکات کاریکاتێریست و نووسەرە.

لە گۆڤاری (تەنزوێنە) بەڕێوەبەری نووسینە. لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان کاریکاتێر و نیگار و مۆتیڤ و نیگاری تایبەت بە منداڵان و نووسین و بابەتی وەرگێڕاو بە بەردەوامی بڵاودەکاتەوە.

ئەندامی کارای فیدراسیۆنی ڕۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتییە.

ئەندامی کارای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.

ئەندامی کارای ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستانە.

ئەندامی کارای کۆمەڵەی وێنەگرانی کوردستانە.

ئەندامی کارای کۆمەڵەی کاریکاتێریستانی کوردستانە.



یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند هەندرێن خۆشناو کە لە ژمارە(١٣٧) ی ڕۆژنامەی (ئاڵای ئازادی) لە ١٩٩٤/٩/٤ بڵاوکرایەوە.

## کامەران عبدالکریم عەلی خۆشناو



لەدایکبووی: ١٩٧٠ هەولێر

پلەی خوێندن: دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین- ١٩٩٢.

سەرۆکی ئەندازیارانە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.

خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری (تەنزوێنە)یە کە تایبەتە بە ڕەخنە و کاریکاتێر.

سەرنووسەری گۆڤاری (ئەندازیار)ە کە سەندیکای

ئەندازیارانی کوردستان دەری دەکات.

سەرنووسەری گۆڤاری (مەلا مەشهور) بووە کە تایبەت بوو بە رەخنە و کاریکاتێر.

چەندین نیگاری تایبەت بەبواری منداڵان. وتار لەمەڕ مێژوو و ئەدەب و سیاسەت لەرۆژنامە و گۆڤارە کوردستانی و عێراقییەکان بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بلاوکردۆتەوە. چەندین کاریکاتێری لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بلاوکردۆتەوە لە ١٩٩٢-.٢٠٠٦.

بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی کورتە چیرۆک لەسەر ئاستی عێراق / ١٩٨٤.

تیپی شانۆی کۆلیژی ئەندازیاری دامەزراندووە لەگەڵ کۆمەڵێک لە قوتابیانی کۆلیژ، دوای راپەڕین دووبارە تیپی شانۆی کۆلیژی ئەندازیاری لەگەڵ کۆمەڵێک لە قوتابیانی کۆلیژ دامەزراندووە، شانۆگەری (مردووە زیندووەکان) لە ساڵی ١٩٩١ نووسیوە و دەرهێناوە. تیپی شانۆی دەرچووان لەگەڵ کۆمەڵێک لە دەرچووانی کۆلیژەکان دامەزراندووە، و شانۆگەری (دوا سکاڵا) لە ١٩٩٢ نووسیوە و دەرهێناوە، کە لەسەر تەختی شانۆی (هۆڵی گەل) لە هەولێر نمایش کرا.

(٨) پێشانگای تایبەتی و هاوبەشی کاریکاتێری کردۆتەوە لە ساڵانی ٩٤-٩٥-٩٦-٩٧-٩٨-١٩٩٩ لە هەولێر.

بەشداری کردووە لە پێشانگای کاریکاتێری یەکەم و دووەمی گۆڤاری مەلا مەشهور ١٩٩٨ و ٢٠٠٣ لە هەولێر.

بەشداری کردووە لە یەکەم پێشانگای هاوبەشی کۆمەڵەی کاریکاتێرستانی کوردستان - هەولێر ٢٠٠٥.

نووسین و ئامادەکردنی بەرنامەی دووربین لە تەلەڤزیۆنی کوردستان - هەولێر ٢٠٠٢.

ئارمی یانەی وەرزشی برووسک - هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٤ دروست کردووە.

بەشداری کردووە لە نەخشەسازی و کارە هونەری و ئەندازیارییەکانی کۆتەڵی شەهیدانی یەکی شوبات - هەولێر ٢٠٠٤- ٢٠٠٦.

شانۆگەری (وڵات شیرنترە)ی نووسیوە کە تایبەت بوو بە منداڵان - هەولێر ٢٠٠٥.

ئەندامی کارای سەندیکای ئەندازیارانی کوردستانە.

ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنوویسانی کوردستانە.

ئەندامی کارای کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردیە.

سکرتێری کۆمەڵەی کاریکاتێرستانی کوردستانە.




یەکێ لە کاریکاتێرەکانی هونەرمەند کامەران خۆشناو کە لە ژمارە (١)ی گۆڤاری تەنزوێنە لە مارسی / ٢٠٠٦ بلاوکرایەوە.

سەرچاوەکان:

١- کتێبی (رۆژنامەگەریی کوردی، چەند سەرەقەڵەمێک لە بارەی تەکنیک و هونەرەکانی)، دانەر: نەژاد عەزیز سورمێ.
٢- کتێبی (چەند بابەتێکی رۆژنامەوانی)، دانەر: محەمەد سەعید کوردە.
٣- گۆڤاری (رۆژنامەنووس) ژمارە ١ ساڵی ٢٠٠٤، بابەتی دڵشاد سابیر کەریم.
٤- گۆڤاری (رۆژنامەنووس) ژمارە ٧ ساڵی ٢٠٠٦، بابەتی د. هیمداد حوسێن.
٥- گۆڤاری (رۆژنامەڤانی) ژمارە ٦-٧ ساڵی ٢٠٠٢، بابەتی د. ئەمیر شێت چەلەبی.
٦- گۆڤاری (رۆژنامەڤانی) ژمارە ٨ ساڵی ٢٠٠٢، بابەتی فەرەیدون سامان.
٧- کتێبی (مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا)، دانەر: فەرهاد پیرباڵ.

# شێخ محەمەد تاهیری کوردی

**دکتۆر عەدولوەهاب ئەبو سلێمان**
**بەپێنووسی نووسەری سعودیە/مامۆستا محەمەد عەلی مەغریبی[١]**

**ژیانی**
**شێخ محەمەد تاهیری کوردی**

لە ساڵی ١٣٢١ی کۆچی لە مەکەی پیرۆز لە دایک بووە و لە قوتابخانەی (فەلاح) لە مەکە خوێندوویەتی، هەر لەوێشەوە دەرچووە لە ساڵی ١٣٣٩ی کۆچی و لەگەڵ باوکی (شێخ عەبدولقادری کوردی) سەفەری کردووە بۆ قاهیرە و چۆتە ئەزهەری پیرۆزەوە. شێخ تاهیر سەبارەت بە مێژووی ژیانی خۆی نووسیویەتی، کە لەوێدا خەریک بووە بە خوێندنی زانستە ئایینی و عەرەبییەکانەوە، هەروەها خەتە عەرەبییەکانیشی بە هەموو جۆرەکانییەوە خوێندووە لەگەڵ ڕەسم و زەخرەفە. پاش ئەوەی چۆتە قوتابخانەی فێرکردنی خەتە عەرەبییەکان. لە کاتێکیشدا کە لە قاهیرە گەڕایەوە بە فێرکردنی خەتی عەرەبییەوە خەریک بوو لە



قوتابخانەکاندا، بۆیە بە (خۆشنووس) ناسرا.

نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە مەکەی پیرۆزدا بە خەتی شێخ محەمەد تاهیر

لە کۆتایی پەنجاکان یان سەرەتای شەستەکاندا شێخ تاهیری کوردی چوو بۆ نووسینگەی خوالێخۆشبوو (شێخ محەمەد سرور حبان) لە تائیفدا داوای چاوپێکەوتنی لە شێخ محەمەد سروری کرد بۆ کاری پێویست، مامۆستا محەمەد عەلی مەغریبی نووسیویەتی دەڵێ، کە شێخ محەمەد سرور ئامادە بوو، شێخ محەمەد تاهیرم پێ ناساند و پێم ڕاگەیاند، کە بلیمەتە لە دەستنووسیدا.

شێخ محەمەد تاهیر بە شێخ محەمەد سروری وت: من بڕیارم داوە، کە قورئانی پیرۆز بە خەتی خۆم بنووسمەوە، دەشمەوێ کە ئەو دەستنووسەی خۆم کە تەواو بوو ببەخشم بە بەڕێز شا عەبدولعەزیز.

شێخ محەمەد سرور وتی: ئەمە بیروڕایەکی چاکە، بەڵام من بۆچوونێکی ترم هەیە لەبارەیەوە پێتی دەڵێم، تۆ ئەگەر ئەو دەستنووسەی خۆت ببەخشی بە شا عەبدولعەزیز پاش تەواوکردنی ئەوە پاداشتێکی باشت پێ دەبەخشێ، بەڵام ئەم دەستنووسەی قورئانی پیرۆز لای خۆی

دەمێنیتەوە لە گەنجینەکەیدا تا ماوەیەکی زۆر درێژ. لێرەش بەم زووانە دەزگایەک دامەزراوە بۆ کاروباری چاپ و بلاوکردنەوە، جا بۆچی لە گەڵ ئەم دەزگایەرێک ناکەوی، کە ئەم دەستنووسەی قورئانت لێ بکڕنەوە، کە دەینووسینەوە تا وەکو چاپی بکەن و لەناو خەڵکیشدا بلاوی بکەنەوە؟

من و شێخ تاهیری خوالێخۆشبوو رەزامەندی خۆمان نیشاندا بەم بیروبۆچوونە و بەڵێنی پێدام لە ماڵی خۆم پاش رۆژ ئاوا بوون یەکتر ببینین و کۆببینەوە.

من و هاوڕێی خوالێخۆشبووی عەبدوڵلا باحەمدین چاپخانەی دەزگای عەرەبیمان بۆ چاپ و بلاوکردنەوە بە کەلوپەلەکانەوە لە کاغەز و هەموو شتێکەوە کڕیبۆوە، پاش ئەوەی کە تووشی خەسارەت بوو بۆ چەند مانگێک، لێکدانەوەی خۆمان لە بارەی چاپکردنی ئەم دەستنووسە لەگەڵ خوالێخۆشبوو عەبدوڵلا باحەمدین کردو رەزامەوندی خۆی نیشاندا و لە سەر ئەوە پێکهاتین، کە چاپکردنی ئەم دەستنووسەی قورئانی پیرۆز دەبێتە سەرەتا بۆ کارێکی گەورە، چونکە ئەمە یەکەم دەستنووس دەبێ بۆ قورئانی پیرۆز لە مەکەی پیرۆزدا، لەو شوێنەی کە یەکەم جار قورئانی پیرۆزی لێ دابەزی، بۆیە هەر لەوێ چاپ دەکرێ و لەوێ بلاویش دەکرێتەوە.

شێخ تاهیر پاش رۆژئاوابوون ئامادە بوو لە لام و لەبارەی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە نێوان خۆمان رێک کەوتین، تاکە کێشەش لە نێوانماندا ئەوە بوو، کە ئەو ماوەی نووسینەوەی بۆ دوو ساڵ دیاری کرد. منیش بە پەلە بووم و دەمویست لە یەک ساڵدا تەواوی بکات، کاتێک شێخ تاهیری خوالێخۆشبوو زانی، کە من سوورم لەسەر ئەمە پێی وتم، کە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز شتێکی گەورەیە و پێویستی بە وردەکارییەکی زۆر هەیە، منیش ناتوانم بنووسم تا لە بارێکی دەروونی زۆر باش نەبم، من رەنگە چەند رۆژ و هەفتەیەک بەسەریەکەوە بینووسمەوە، بەڵام بە هۆی بارێکی نالەبارەوە چەند رۆژ و هەفتەیەکی دیکە نەتوانم هیچ بنووسم، بۆیە لێمگەڕێ با بە گوێرەی سەلیقەو ئارەزووی خۆم کاربکەم، ئەوەشت لە یاد نەچێ کە خەتخۆشی کارێکی هونەرییە، وەک وێنەکێشان و شیعر، هونەرمەندیش ناتوانێ هونەرەکەی خۆی بە جێ بگەیەنێت ئەگەر بارێکی دەروونی گونجاوی بۆ نەڕەخسێ، منیش هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە ئەو بیروڕایانەی مامۆستا تاهیر هەمووی ڕاستن بۆیە، ڕازی بووم لە سەریان.

لە دواییدا شێخ تاهیر داوای کاغەز و پێنووسی تایبەتی کرد، لەو کاتەشدا زەمان زەمانی شەڕو شۆڕ بوو، بەڵام خوای گەورە بۆمانی ئاسان کرد، کە هەموو پێویستییەکانی لە مەکەی پیرۆزەوە بدۆزینەوە.

کارەکە دەستی پێکرد و پێکهاتین لە سەر ئەوەی، کە دەستنووسەکەی قورئانی پیرۆز بەڕەسمی عوسمانی بێت، چەند مانگێک بەسەر چوو، منیش هەر چەندە شێخ تاهیرم دەبینی لێم دەپرسی کە ئایا بەکوێ گەیشتووە؟ وەلامی دەدایەوە کە لە کارەکەی بەردەوامە، جارێکیان هەندێ پەڕی نووسراوی بۆم هێنا، کە سەرەتاکانی قورئانی تێدا نووسرابوو و پێی نیشاندام و پاش چەند هەفتەیەکی تریش چەند پەڕێکی تری هێنا، کە هەمان نووسینەکانی پێشتری تێدابوو، بەڵام بە خەتێکی باشتر نووسرابوون و پێی وتم: ئەمە جیاوازییە لە نێوان زەوقی خۆشنووسی، کە لە بارێکی دەروونی باش بێ یان خراپ کاتێک دەنووسێت.

بەم جۆرە شێخ تاهیر لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز پاش نزیکەی سێ ساڵ تەواو بوو، پێش تەواو بوونیشی داوامان لە

حکومەت کرد، کە لیژنەیەک پێک بهێنێت بۆ بەسەرداچوون و چاککردنەوەی دەستنووسەکەی شێخ تاهیری خوالێخۆشبوو، حکومەتیش لیژنەیەکی گەورەی پێکهێنا بۆ ئەم مەبەستە، لیژنەکەش پێکهاتبوو لە شێخ عەبدوالظاهر ابوالسمح ئیمامی (المسجد الحرام) لەو کاتەدا و شێخ سالح حەیازی شێخی قورئان خوێنەکان لە مەکەی پیرۆزدا و هەردوو خوالێخۆشبووان سەید محەمەد شەگا و سەید ئیبراهیم نوری لە وەزارەتی مەعاریف، لیژنەکەش دەستی بە کاری خۆی کرد، تاکە کەسیش لەو لیژنەیەدا، کە بایەخێکی زۆری دا و خۆی بە تەواوی تەرخان کرد بۆ بەسەرداچوونەوە و چاکردنەوە و ئەرکێکی زۆری کێشا، خوالێخۆشبوو سەید ئیبراهیم نوری بوو لە وەزارەتی مەعاریف، کاتێکیش کە داوامان لێی کرد، کە پاداشتی بکەینەوە بەرامبەر ئەو ئەرکەی کێشای رازی نەبوو، ئێمەش کردمان بە شەریکی خۆمان بە رێژەیەکی دیاریکراو لە دەزگاکەمان، کە تایبەت بوو بۆ چاپکردنی قورئانی پیرۆز و بلاوکردنەوەی لە مەکەی پیرۆز و ناومان نا بە (دەزگای قورئانی مەکەی پیرۆز)، کە تا ئێستاش ئە دەزگایە ئەو ناوە هەلدەگرێ.

**شێخ تاهیر کوردیی خۆشنووس**

لە بەر ئەوەی باسی خۆشنووسی شێخ تاهیری کوردی دەکەین دەبێت ئاماژە بە لایەنێکی دیکە لە کەسایەتی ئەو پیاوە ناودارە بکەین، شێخ تاهیر لە ئەزهەری پیرۆز خوێندوویەتی لە پاشان چۆتە قوتابخانەی فێرکردنی خەتخۆشییەوە و لە ژێر دەستی گەورە خۆشنووسانی ئەو قوتابخانەیە فێرکراوە تا بە تەواوی بە هەموو جۆرە خەتەکانەوە فێری خۆشنووسی بووە، زۆر کتێبی چاپکراوی لە بارەی خەتخۆشییەوە هەبووە کە لە قوتابخانەکاندا لەو سەدەمەدا بۆ فێرکردنی خۆشنووسی دەخوێندرا، شێخ تاهیر گەیشتە ئاستێکی وا لە خەتزانی، کە دەیتوانی هەندێ لە سورەتە کورتەکان وەک سورەتی (اخلاص) لە سەر دەنکە برنج بنووسێ و شێخ محەمەد نورجعجوم، کە هاورێی شێخ تاهیر بوو تا ئێستاش دەنکە برنجێکی لای خۆی هەلگرتووە، کە شێخ تاهیر لە سەری نووسیبوو، تەمەنی ئەو دەنکە برنجەش لە (٤٠) سال زیاترە.

خوالێخۆشبوو شێخ تاهیر چەندەها نیگاری هونەری هەیە، کە لە کتێبی (مێژووی مەکە و مالی پیرۆزی خوا) دا وێنەی کێشاون. ئەمەش هەندێ لە نووسراوەکانی شێخ تاهیرن دەربارەی هونەری خۆشنووسی، کە لە سەرچاوەکانی کتێبی (ئەدەبیاتی چای و قاوە) دا هاتووە:

١- مێژوو و ئەدەبی خەتی عەرەبی.
٢- ئەندازەی قوتابخانەیی-شێخ تاهیر وتوویەتی، کە ئەمە لە قوتابخانەکانی مەکەدا دەخوێندرا.
٣- توێژینەوەیەک لە بەرگریکردن لە نووسینی عەرەبی.
٤- نووسراوی مەکە بۆ فێربوونی خەتی روقعە (کە لە حەوت بەش پێکدێت).
٥- گالتە و گەپەکان کە لە کاتی خۆشنووسی نووسینەوەدا دەکرێ.
٦- کۆمەلەی مەکە بۆ فێربوونی نەسخ (لە یەک بەش پێکدێت).
٧- نیگارە هونەرییە وانەکان کە وێنەی کەعبەی پیرۆزی تێدایە بە بالاخانە ناوبانگەکانیەوە.
٨- چەند نیگارێکی خەتەکانی عەرەبی.
٩- (نقحة الحرمين) بۆ فێربوونی نەسخ.

کاتێک کە سەرنجی ئەم ناوانە بدەین دەزانین کە شێخ تاهیری کوردی لە خۆشنووسیدا زانا بوو.

**شێخ تاهیر کوردیی نووسەر**

لێرەشدا باسی لایەنێکی دیکە لە لایەنە هەمە جۆرەکانی کەسایەتی شێخ تاهیر دەکەین، ئەم پیاوە بلیمەتە زۆر نووسراوی نووسیوەتەوە، لە کتێبی (ئەدەبیاتی چای و قاوە)دا، ناوی (٢٢) بیست و دوو کتێبی چاپکراوی هێناوە جگە لە دەستنووسەکانی، لە گرنگترینیشیان (تەفسیری شاهانە)یە، کە لە چوار بەرگ پێکهاتووە و چەندان کتێبی تریش، ئەمەش ناوی چەند نووسراوێکی چاپکراوی تری شێخ تاهیرە:

١- مێژووی قورئان و سەیروسەمەرەی ڕەسم و حیکمەتەکانی.
٢- ڕێنماییەکانی چوون بۆ حەج و عومرە.
٣- مەزاری ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت.
٤- هەڵبەستێک بۆ سیفەتەکانی ناوبانگترین بالاخانەکانی کەعبەی پیرۆز.
٥- توحفەی بەندەکان بۆ مافەکانی ژن و مێرد و باوک و منداڵ.
٦- نزاکانی عەرەفە.
٧- باسێکی کورت لە سەر مێژووی مەکەی قوتبی.
٨- بەردەکەی مەزاری ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت.
٩- مێژووی مەکە و ماڵی پیرۆزی خوای گەورە.
١٠- نەوەی پاک و پیرۆز.
١١- نزا هەڵبژێردراوەکان.
١٢- نرخ پێدانی هاوەڵان بۆ جێماوەکانی پێغەمبەر (د.خ).
١٣- ئەدەبیاتی چای و قاوە.

شێخ تاهیری کوردی باسی ئەوەی کردووە، کە نووسراوەکانی چل و دوو نووسراو بوون، نیوەیان چاپکراون، دەتوانین ئەو نووسراوانەش بە گوێرەی ناوەکانیان بکەین بە چەند بەشێک، کە ئەمانەن:

أ- کتێبە مێژووییەکان کە بە سەر بەشەکانی دیکە زاڵ بوون.
ب- کتێبە ئایینییەکان
ج- کتێبە هونەرییەکان، کە بەستراوە بە خەت و هونەرەکانییەوە
د- کتێبە ئەدەبییەکان

**تاهیر کوردیی مێژوو نووس**

کاتێک کە سەیری ناوی کتێبەکانی شێخ تاهیر دەکەین دەبینین کە کتێبە مێژووییەکانی لە بەشەکانی دیکەی زاڵترن، لە وانەشە هەر ئەم هۆیە وای کردبێت، کە کتێبی ئایینی بنووسێت، بەڵام بەداخەوە یەکێک لە گرنگترین کتێبە ئایینییەکانی، کە (تەفسیری شاهانە)یە ڕووناکی بەخۆیەوە نەبینی، بۆیە ناتوانین ئەم لایەنە لە کەسایەتی نووسەر بە تێرو تەسەلی باس بکەین و تەنها ئاماژەی بۆ دەکەین.

هەروەها کتێبی (مێژووی مەکە و ماڵی پیرۆزی خوای گەورە) یەکێکە لە گرنگترین کتێبە مێژووییەکانی شێخ تاهیر، کە لە (٤) بەش پێکهاتووە و هەر بەشێکیش پێکهاتووە لە (٣٠٠) لاپەڕەی گەورە، کە دەکاتە دوو هەندەی کتێبە گەورەکان، ئەم کتێبەش زۆر وێنەی جۆراوجۆری تێدایە، هەروەها چەندەها زانیاری لە سەر بابەتی جۆراوجۆر لەم کتێبەدا هاتووە و بۆ پتەوکردنی بیروڕاکانیشی پشتی بە سەرچاوەی مێژوونووسانی پێش خۆی بەستووەو ناوهێنانی خاوەنەکانیان و ئاماژەکردن بە ناوی سەرچاوەکان لە هەر شوێنێکدا بە کاریان هێنابێت.

سەرچاوە:

١- ئەم وەرگێڕانە بۆ ژیانی شێخ محەمەد تاهیری کوردی لە کتێبی (اعلام الحجاز) دا هاتووە، جدة، دار العلم بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، ساڵی ١٤٠٤ ک / ١٩٨٤ م / ج ٢ / ل٣١٥

# ئەمین یومنی
# ١٨٦٩-١٩٧٤

**کەریم شارەزا**

خۆشنووس و مۆرهەڵکەنی ناوداری کوردستان محەمەد ئەمین کوڕی محەمەد مستەفا کوڕی مەولوود. ناسراو بە (ئەمین یومنی)، لەساڵی ١٨٦٩ لەشاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە. باوکی وەستایەکی شیرگەرو چەخماخساز بووە و لە سەردەمی باپیرییەوە لە خۆشناوەتییەوە بنەماڵەکەیان هاتوونەتە شاری کۆیەو لێی نیشتەجێ بوون

محەمەد ئەمین لەتەمەنی ٧ ساڵیدا قورئانی لەلای مەلا محەمەد ناوێکی کۆیی خوێندووە و سەرەتای خوێندەواری لەحوجرەی مزگەوتەکانی ئەو شارە فێربووە، سەوادی کراوەتەوە و حەزی بەخەت خۆشی کردووە و هونەری خۆشنووسی لەسەر دەستی "مەلا عەبدورەحمانی دیبۆکری" فێربووە و ئیتر خولیای هەڵکۆڵینی خەت و نەخش لەسەر کاغەز و لەسەر کانزا و تەختە و بەرد بووە.

هەتا هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٤دا لەکۆیە ژیاوە، بەڵام دوای ئەو مێژووە بەبەر ردش بگیرییەکەی حکومەتی عوسمانی کەوتووەو کراوە بەسەربازو نێردراوە بۆ بەرەکانی جەنگ. بەڵام چونکە خوێندەوارێکی هۆشیار بووەو قورئانی خەتم کردووە، بۆیە کراوە بەوەکیلی ئیمام تابووری عەسکەری لەشاری قورنەی نزیک شاری بەسرا، دوایی سوپاکەیان کشاوەتەوە بۆ عەمارە. لەسەرەتای ساڵی ١٩١٦ دەگوازرێتەوە بۆ ئۆردوگای بەغدا، ئەویش دوای دەوامی سەربازگە چووە لەسەر شەقامی موستەنسیرییەی شاری بەغدا کاری مۆرهەڵکەنی کردووە، کە ئەوساکە پیشەیەکی هونەری بەنرخی وەکو زێڕینگەریی بووە. بەڵام کە هێزەکانی سوپای عوسمانی لە ١٠ی ئاداری ١٩١٧دا بەرامبەر هێزەکانی بەریتانیا لەبەغدا کشانەوە بەرەو باکوورو سوپای جەنەراڵ مۆدی ئینگلیز لەڕۆژی ١١/٣/١٩١٧دا بەغدای گرت. محەمەد ئەمینی مۆرهەڵکەن لەبەغدا مایەوەو لەبازاڕی مەسبەغە دوکانێکی بۆ مۆرهەڵکەندن و خۆشنووسی کردەوە. یەکەم جار گرنگییەکی زۆری دا بەخەتی فارسی تاکو بووە شارەزایەکی بێ هاوتا لەو جۆرە خەتەدا. لەدواییدا کەوتە ژێر کاریگەری خۆشنووسی بەناوبانگی تورکی عوسمانی (یومنی) و بەچاکی لاسایی دەکردەوە تاکو خەڵک ناویان نا یومنی کوردی و لەشاری بەغدا بە (محەمەد ئەمین یومنی) ناسراو لەناو کوردیش بەمەلا ئەمینی مۆرهەڵکەن دەناسرا.

لە سەردەمی حوکمی مەلیک فەیسەڵی یەکەم لەعێراق، بەئیرادەی مەلەکی کرا بەنووسەری ڕەسمی ئیرادە مەلەکییەکانی ئەو مەلیکە. لەساڵی ١٩٣٥یش واتە دوای کۆچی دوایی مەلیک فەیسەڵ بەدوو ساڵ سەردانێکی

وڵاتی سووریەی کردو لەو وڵاتە پەیوەندیی بە (مەمدووح)ی خۆشنووسەوە کردو شێوە خەتی کووفی لێوە فێربوو و لەوێوەش چووە لوبنان لە هونەرمەند (نەسیب ئەلمەکارم)ی خۆشنووسیی نەخشسازیی هونەری (مۆرهەڵکەندن لەسەر لاستیک) فێربووەو یەکەم کەس بووە ئەم پیشەیەی هێناوەتە عێراق و بڵاوی کردۆتەوە.

ماوەیەک مامۆستا ئەمین یومنی کراوە بەخۆشنووس و نەخشەساز لە (بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕووپێوکردن) (مدیریة المساحة العامة)، بەڵام زۆر لەسەر ئەو کارو فرمانەی نەماوەتەوەو چووەتەوە سەر دوکانەکەی خۆی و ئەمجارە دادگاکانی عێراق بۆ ساغکردنەوەی خەتی ساختەو گومان لێکراو پەنایان بۆ بردووە بەو ناوەی لەو بوارەدا شارەزاییەکی زۆری بووە.

مامۆستا ئەمین یومنی ناونیشانی گەلێک ڕۆژنامەو گۆڤاری عێراقی: کوردی و عەرەبی بەخەتە خۆشەکەی نووسیوە، لەوانە یەکەم ژمارەی (الوقائع العراقیة) بەدەستی ئەو سەردێڕ و ناونیشانەکانی نووسراون و لە شوێنێکی ئەو ڕۆژنامە ڕەسمییەی حکومەتی عێراقدا نووسراوە ناونیشانەکان بەدەستی (خۆشنووس و مۆرهەڵکەن و کلێشە داڕێژ محەمەد ئەمین یومنی) نووسراون. جگە لەمەش ناونیشانی (گەلاوێژ) و (دەنگی گێتی تازە) و سەردێڕی گەلێک ڕۆژنامەی عەرەبی وەک (الیقظة) و (الکرخ) و (الارشاد) و (النهضة العراقیة) بەدەستی ئەم زاتە نووسراون.

لە سەردەمی مەلیک غازی نووسینەکانی سەر پارەی عێراق بەدەست و پەنجەکانی ئەو داڕێژراون و مۆری ئیمزای مەلیک غازی دەسکردی ئەون. جارێکیان یەکێک لەپیاوانی دەرباری مەلیک دێ بۆ وەرگرتنەوەی مۆرەکەی مەلیک غازی، ئەویش نایداتێ، کە غازی ئەمە دەزانێ لەدوای دەنێرێ و پۆلیس دەیبەنە بەردەم مەلیک و پێی دەڵێ: بۆ مۆرەکەت بە قاسیدەکەمدا نەنارد؟ ئەویش پێی دەڵێ: "خاوەن شکۆ لەوە دەترسام بەناوی ئێوەوە نامەو فەرمانی پێ مۆر بکەن، بۆیە بۆم نەناردی ئێستا بۆ خۆم بۆم هێناوی". کە مەلیک گوێی لەو وەڵامە بەجێیە دەبێ زۆر ڕێزی لێ دەنێ و خەڵاتی دەکات.

مامۆستا مەلا ئەمین یومنی، ناونیشانی گەلێک کتێبی کوردی لە ساڵانی بیستەکان و سییەکانی سەدەی رابردوودا نووسیوە، لەوانە کتێبی (ڕەوشت و خوو) لەساڵی ١٩٢٧ و دیوانی (نالی) چاپی کوردی و مەریوانی لە ١٩٣١ و دیوانی سالیم لە ١٩٣٣دا.

مامۆستا ئەمین یومنی جگە لەهونەری مۆرهەڵکەندن و خۆشنووسی لەسەر کاغەزو کانزاو تەختەدار و بەردی مەڕمەڕ، دەستی شیعریشی بووە. غەزەل و چوارینی پتەوی داناوەو کوڕو کچەکانی بەجوانی پەروەردە کردووەو هەموویان زمانی زگماکی خۆیان پاراستووەو لەهونەری خۆشنووسیدا وەکو باوکیان هونەرمەندن، (٤) کوڕی لەپاش بەجێماوە (عەبدوڕەحمان) خاوەن کارگەی مۆری ڕەشیدەو (عەبدوڕەزاق) دکتۆرای هەیە لەکشتوکاڵ و (عەبدولئیلا) ئەندازیارە و (حەسیب) ژمێریارێکی مەعلانە. کچەکانیشی بەدیعەو ئەدیبە هەردووکیان پزیشکن، هەمووشیان خۆشنووسن.

مامۆستا مەلا ئەمین یومنی لەتەمەنی ١٠٥ ساڵیدا لەڕۆژی ٢٧ی ڕەمەزانی ١٣٩٤ی کۆچی بەرامبەر بە ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ی زایینی لەبەغدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی لەسەر وەسیەتی خۆی براوەتەوە کۆیەو لەوێ نێژراوە.

سەرچاوە:

١- گۆڤاری بەیان- ژمارە (٢١) ساڵی ١٩٧٥- بابەتێکی کەمال غەمبار بەناونیشانی (ئەمینی خۆش نووس).
٢- کتێبی دیاریی کوردستان ١٩٢٥-١٩٢٦، کۆکردنەوەی ڕەفیق ساڵح- لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمین- سلێمانی ٢٠٠١.

# عەبدولواحید حاجی ئاغا مستەفا
# ١٨٩٨- ١٩٧٥

**کەریم شارەزا**

ئەفسەری مۆسیقازانی پێشەنگ، رائید عەبدولواحیدی کوڕی حاجی ئاغا مستەفا، لەساڵی ١٨٩٨دا لەگەڕەکی قەلاتی شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە. لەتەمەنی شەش ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندنی حوجرە لەلای مەلا عەلی باداوەیی، ئیمام و مودەریسی مزگەوتی منارەی کۆیە. دوای فێربوونی قورئانی پیرۆزو خوێندنەوەو نووسین، لە ساڵی ١٩٠٦دا لە سەردەمی حوکمی عوسمانی چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی شارەکەی خۆی و لەساڵی ١٩١٢دا گەیشتووەتە پۆلی شەشەمی سەرەتایی، جگە لەمامۆستایەکی خەڵکی کەرکووک، قەشەیەکی عەنکاوەیی کە ناوی (پولس عوجمایا) بووەو بە (قەشە سوورە) ناسرابوو دەرسی پێ گوتوون و قوتابییەکان سوودێکی زۆریان لێ وەرگرتووەو لەدوای دەوامی قوتابخانەش عەبدولواحید چووەتە ماڵی ئەو قەشەیە تاکو فێری زمانی یۆنانی بێت، وابوو بنچینەیەکی باش لەو زمانە بیانییەی لەلا فێر بووە.

عەبدولواحید لەساڵی ١٩١٢دا خوێندنی قۆناغی سەرەتایی تەواو دەکات و باوکی دەیباتە مووسڵ و لە روشیدیەی ناو دەنووسێ، دوای ٣ ساڵ لە ١٩١٥دا خوێندنەکەی تەواو دەکات و روو دەکاتە ئەستەمبوڵ و لە خوێندنگای عەسکەری دەخوێنێ لەئەنجامدا دەردەچێ و بەپلەی مولازمی دووەم لە سوپای عوسمانی دادەمەزرێ. رەوانەی بەرەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی دەکرێ. لە یەکێک لەشەڕە قورسەکان بەسەختی بریندار دەبێ و بۆ چارەکردنی رەوانەی نەخۆشخانەی عەسکەری لە ئەستەمبوڵ دەکرێ. دوای ساڕێژ بوونی برینەکەی دەبینێ تیپێکی مۆسیقا لەو نەخۆشخانەیەدا هەیەو رۆژانە ئاوازی بەسۆز بۆ نەخۆشەکان لێدەدەن. ئەویش ئارەزووی دەچێتە سەر مۆسیقاو ئاوازەکانی، وردە وردە لە تیپەکە نزیک دەبێتەوەو خۆی فێری چەند ئامێرێکی مۆسیقا دەکات.

کاتێک دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگ شکست دێنێ، عەبدولواحید دەگەڕێتەوە کوردستان. لەگەڵ دانانی ئەمیر فەیسەڵی کوڕی حوسێنیش بە مەلیکی عێراق، لە ١٩٢١/٨/٢٣دا دەچێتە بەغداو دەکرێت بەئەفسەر لە فەوجی (مووسای کازم) بەپلەی مولازمی یەکەم دوای ساڵێک دەگوێزرێتەوە بۆ ئۆردوگای مووسڵ و تیپێکی مۆسیقا دادەنێ. دەستەیەک سەربازو دەرەجەداران فێری ژەنینی مارشی عەسکەری و سەلامی مەلەکی دەکات.

عەبدولواحیدی مۆسیقازان لەساڵی ١٩٢٤دا دەگوێزرێتەوە بۆ سەربازگەی سلێمانی و پایەی بەرز دەکرێتەوە بۆ پلەی رەئیس (نەقیب) و تیپێکی مۆسیقا دادەمەزرێنێ. دەشچێتە لای بەرێوەبەری پەروەردەی سلێمانی، کە ئەوسا مستەفا مەزهەر بووە، پێی دەڵێ ئەگەر رێگەم بدەی تیپێکی مۆسیقای قوتابخانەکان دادەنێم و قوتابییەکان فێری مۆسیقا دەکەم، ئەویش بەسوپاسەوە داواکەی قەبوڵ دەکات. ئینجا ئامێری مۆسیقای پێ دەکرێ و دەستەیەک لەقوتابیانی سلێمانی فێری مۆسیقا دەکات، یەک لەوانە شەهید شاکر فەتاح دەبێ. ئەم مامۆستا مۆسیقازانە لەسەر ئاوازی مۆسیقاکەی گەلێک سروودی نیشتمانی کوردی، فێری قوتابییەکانی کردووە، لەوانە:

١- سروودی کابرا مەڕوانە ماڵ و خانەیی وێرانی من: لە شیعری ئەسیری.
٢- ئەی وەتەن چەن خۆشەویستی: لە شیعری زێودر.
٣- وەتەن بەجەننەت ناگۆڕینەوە: لە شیعری رەفیق حیلمی.

بەم جۆرە ئەم مۆسیقازانەی کورد گیانی مۆسیقاو ئاوازی کوردی لەناو میللەتدا بلاوکردەوەو دوای ئەو هەموو خزمەتەی هونەری کوردی، حکومەتی عێراق دووری خستەوە بۆ ئۆردوگای دیوانیە، بەلام پلەی رائیدی پێداو ماوەیەکی زۆر لەو شوێنە مایەوە تاکو لەساڵی ١٩٥٤دا خانەنشین کراو تاساڵی ١٩٦٩ لەشاری دیوانیە مایەوە ئینجا ماڵەکەی هێنایەوە کوردستان و لەشاری سلێمانی نیشتەجێ بووەوە تاکو لەرۆژی ١٩٧٥/٣/١٦دا لەتەمەنی ٧٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کردو هەر لەو شارە هونەر پەروەرەی سلێمانی نێژرا.

# مەلا ئەسعەدی کۆیی
# ١٨٩٠-١٩٥٨

کەریم شارەزا

مەقامبێژی ناوداری کورد، مەلا ئەسعەدی کۆیی کوڕی مەلا قادر کوڕی تەها سابلاغی لە ساڵی ١٨٩٠دا لە شاری کۆیە، لەگەڕەکی بایزاغا چاوی بەدنیا هەڵێناوە. تەها سابلاغی باپیری لەشاری مەهابادەوە رووی کردۆتە شاری کۆیەو مەلا قادری باوکی لەم شارەدا لەدایک بووەو چۆتە بەر خوێندنی مەلایەتی، کە ئیجازەی وەرگرتووە، بووەتە مەلای پێش نوێژی مزگەوتی مەحمووئاغا لەو شارەدا. دوو کوڕی بووە (مەلا ئەسعەد) و (مەلا سەعید).

مەلا ئەسعەد لە خوێندنی مەلایەتیدا زۆر تێهەڵدەچێ، دەگاتە پلەی موستەعیدی، بەڵام لەناو خەڵکەکە هەر بەمەلا ناوی دەبرێ. کە لەهەرەتی لاویدا دەبێ، دەکەوێتە داوی عەشقی کچێکی شۆخ و نازدار بەناوی (ئامین)ی کچی (نەجم ئۆمباشی) کەرکووکی، کە لە ماڵەکەیاندا لەگەڵیاندا کرێچی بوون. بەهرەی هونەری گۆرانی و مەقامی کوردی لەسەرچاوەی دیدە مەستەکانی (ئامین)ی ناسک و نازدارەوە سەر هەڵدەدات. هەر چەندە دوای گەلێک پەلپ و بیانوو و تەگەرەی سەخت (ئامین)ی پێ دەدرێ، بەڵام زۆر ناخایەنێ (ئامین) بەسەر منداڵەوە دەچێ و دنیایەک خەم و خەفەتی جەرگبڕ بۆ مەلا ئەسعەدی کۆست کەوتوو، بەجێ دێڵێ. ئەم کارەساتە دڵتەزێنە کارێکی تەواو دەکاتە سەر هەست و هۆشی مەلا ئەسعەد تاکۆتایی ژیانی ئەو خەم و خەفەتەی بەسەرەوە دەمێنێ.

لە سەرەتادا مەلا ئەسعەد بەستەو گۆرانی لەئاهەنگی ئیجازەدانی مەلایان لە شارەکەی کۆیە دەگوت، بۆ فێربوونی هونەری مەقامیش چووەتە لای مەقامناسی گەورەی کورد (حاجی محەمەدی عەلە)، کە بە (حاجییە گەورە) ناسراو بوو. دوای ئەویش ئەو هونەرەی لەشێخ نەجمەددینی بەرزنجی کۆیی و رەفیق چارچاو و سمایلەخڕە بەچاکی فێربووە و شارەزاییەکی باشی لەو هونەرەدا پەیداکردووە.

مەلا ئەسعەد دوای ئەو کۆستە گەورەیەی کە بەمردنی (ئامین)ی هاوسەری خۆشەویستی لێی کەوت، سەری خۆی هەڵدەگرێ و شاری کۆیە جێ دێڵێ و روو دەکاتە کوردستانی ئێران و دەچێتە شاری (سەردەشت). لای مەلا سەعیدی شاعیری برای کە نازناوی شیعریی (رەعدی) بووەو ناو بەناویش سەردانی شاری بەهان و باتی (مەهاباد)یشی کردووە و لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی لەگەڵ مەلاو فەقێیانی ئەو شارە و ئامادەبوونی لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیان و بەیەک گەیشتنی لەگەڵ مەقامزانەکانی ئەو مەڵبەندە، هونەری مەقامی کوردی باشتر فێردەبێ و کەمێکیش دەکەوێتە بەر کاریگەریی مەقامی فارسییەوە.پاش ماوەیەک غوربەتی، بۆ شارەکەی کۆیەی زاینگەی خۆی دەگەڕێتەوەو لەرێگادا چاوی بەئافرەتێکی جوانی خەڵکی گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی دەکەوێ،

کەئەویش ناوی (ئامین) دەبێ. مەلا ئەسعەدیش بەیادی یەکەم دڵداریی لەگەڵ (ئامین)ی کەرکووکیدا، دەیخوازی و دەیهێنێتە کۆیە و تاکو دوا هەناسەی ژیانی لەبەهاریساڵی ١٩٥٨ لەگەڵیدا دەژی، ئینجا کۆچی دوایی دەکات و هیچ رۆڵەیەکی لەپاش بەجێ نامێنێ.

مەلا ئەسعەد مەقامبێژێکی دەنگ تیژو باریک بوو. دەقی شیعری مەقام و بەستەکانی هەموویان شیعری هاوکێش و سەرواداری شاعیرە کلاسیکییەکانی کوردو فارس بوون. دەقی شیعری شاعیرە مەزنەکانی وەک سەعدی و حافزی شیرازی و حاجی بەکرئاغای حەویزی ناودار بە (قاصد) و نالی و سالیم و مستەفا بەگی کوردی و حاجی قادری کۆیی و ئەختەرو وەفایی و تایەر بەگی جاف و صافی و بێخودو هی دیکەی دەکردە کەرەستەی مەقامەکانی. مەقامی کوردی رەسەنی گوتووە و ئەو مەقامانەی کە لەفارسیشەوە وەریگرتوون، تام و چێژی کوردی پێداون، وەکو مەقامی (هەمە چین چین شکەن شکەن)ی گوتووە و لەم شارەی بڵاوکردۆتەوە، بەجۆرێکی وای دەگوت خەڵکەکە وای دەزانی مەقامێکی کوردییە. لەمەقامی کوردیش گەلێک گۆرانی وەک (لەبەر نازی چاو بازان)ی وەفایی و (مەتلەعی صبوحی سەعادەت)ی تاهیر بەگی جاف و (لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من)ی بێخود و مەقامی (دەخیلت بم لە عوششاقت مەرەنجە)ی ئەمین ئاغای حەویزی ناسراو بەئەختەری شاعیری کورد و ئەمەش دەقی شیعرەکەیەتی:

**دەخیلت بم لە عوششاقت مەرەنجە**
**دڵ و دینم فیدای ئەم لارو لەنجە**

**لە دەوری عارزت کاکۆڵی پر چین**
**دەڵێی ماری سیای ئێشکچی گەنجە.**

**لە گورجستان و چین وەک تۆم نەدیوە**
**لە ماچین پشکنیم تا مولکی گەنجە!**

**مەلا ئەسعەدی کۆیی و ئەحەی ناسری سلێمانی:**

جارێکیان ئەحەی ناسری مەقامزانی ناوداری ناوچەی سلێمانی، هاتۆتە شاری کۆیە، لەکۆڕێکی فراواندا مەقامی هەمەجۆری کوردی گوتووە و خەڵکەکەی مەست و مەدهۆش کردووەو ئەویش زۆر حەزی بەو رێزلێنان و گرنگی پێدانەی کردووەو وایزانیوە کە لەو شارەی کۆیە کەس نییە وەکو خۆی مەقامی رەسەنی کوردی بڵێ. مەلا ئەسعەد لەو کۆڕە دەبێ و لەپەنایەک دادەنیشێ و خۆی بۆ ئەحەی ناسر وادەر نەخستووە کەمەقامزانە، کاتێک کە خاڵە ئەحەی ناسر، لەگۆرانی گوتن ماندوو دەبێ، مەلا ئەسعەد دێتە پێش و چەند مەقامێکی رەسەنی کوردی بەجوانترین شێوە دەچرێ. بەشداربووانی کۆڕەکە سەرسام دەکات، بەتایبەتی ئەحەی ناسر، چونکە نەیدەزانی مەقامزان و مەقامبێژی وا وەستاو دەنگ خۆش لەکۆیە هەیەو پێی دەڵێ: تۆ مادامەکی دەنگت ئەوەندە خۆشە و ئاگاداری هونەری مەقامی، بۆ خۆت لەمن ئاشکرا نەکردووە. لەوساوە دەبنە دۆستی گیانیی یەکتری.

کاتێک لەساڵانی سییەکانی سەدەی رابوردوودا، کاوێس ئاغای لاوکبێژ، دێتە کۆیە و عەبدولئەحەد جەرجیس لە مووسڵەوە لەگەڵ خۆی دێنێ و لە چایخانەی سەعدی ئاغای ئەسعەدی حاجی محێدین، زنجیرەیەک لاوکی رەسەنی کوردی لەسەر ئاوازی قانوونەکەی عەبدولئەحەد جەرجیس پێشکەش دەکات، مەلا ئەسعەدیش لەسەر ئاوازی قانوونی ئەو هونەرمەندە، چەند مەقامێکی کوردی وەک (فیدات بم)ی ئەمین ئاغای حەویزی و (لەسەر شەو و رۆژی داناوە)ی حاجی قادری کۆیی و (حەریفی ئاگری دووریم)ی وەفایی لەپاڵ لاوکەکانی کاوێس ئاغا دەچرێ و خەڵکەکە سەرسام دەکات.



# صلیوه یەلده صلیوه
# سێوە
# ١٨٩١-١٩٦٣

**کەریم شارەزا**

میللەتی کورد لەسەردتای بوونییەوە تاکو ئەمڕۆ خاوەنی ئاوازو گۆرانی نەتەوەیی خۆی بوو و ئەو هونەرە جوانەشی هەر ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵەکەی و دەنگدانەوەی ئاوازی سروشتی نێو جەرگەی خاکەکەی بووە، هەر لەهاژەی بەفراوانی کوێستان و خوڕەی تاڤگەی قەدپاڵی کێوە بەرزەکانی و شڵپەی شەپۆلی جۆگەو رووبارە ساردو سازگارەکانی و لەرووی سرودەی بەیان و شنەی شەماڵەوە بگرە، تادەگاتە قاسپەی کەوی سەر ردوەزەی چیا بەرزەکان و چریکەی بولبولی نێو باغ و رەزان، تا تێکەڵ دەبن بەترپەی پێی کچی نەشمیلان و ئاوازی لەنجەی شۆخ و شەنگ و خورپەی دڵی ئاشقان و ناڵە و گریەی دڵدارە دڵسووتاوەکان.

ئەمانە هەموویان بوون بەچاوگ و هەوێنی ئاوازی گۆرانیی کوردی و هەستێکی ناسک و جۆشێکی گەرم و گوڕیان خستۆتە نێو دڵ و دەروونی سەرجەم رۆڵەی کورد بەگشتی و دەستەی خۆشخوان و گۆرانیبێژە هونەرمەندەکانی بەتایبەتی. دەستەی گۆرانیبێژە بەهرەدارەکان لەرێگای هەست ناسکیان و توانستی هونەرییانەوە، توانیویانە ئاوازی خۆش و دلکێش بخولقێنن و بەدەنگی زوڵاڵیان مێشکی گوێگرەکانیان مەست بکەن و مەقامی رەسەنی کوردی بچڕن و پشتاوپشت ئەو هونەرە رەسەنەمان بۆ بەجێبهێڵن و بەپێی دەورو قۆناغ لووس و لێکتری بکەن، تا لەگەڵ چێژو ئارەزووی خەڵکەکەدا بگونجێن. یەکێک لەو مەقامبێژە هونەرمەندانەی کورد، کە جێ پەنجەی لە پەرەپێدانی مەقامی کوردیدا دیار بوود، سێودی مەقامبێژە هونەرمەندی کوردە.

**سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کورد:**

سێوەی مەقامبێژ، ناوی تەواوی (صلیوە)ی کوڕی (یەلدە) کوڕی (صلیوە) بووە، لەشاری کۆیە مەسیحییەکان بە (صلیوە) دەڵێن (سێوە). ئەم زاتە، لەساڵی ١٨٩١دا لەگەڕەکی بەفریقەندی کۆیە و لەماڵێکی کووچەی مەسیحییەکانی ئەو شارەدا لەدایکبووە. لەساڵی ١٩٢٠دا بۆ یەکەم جار لەلای قەشە حەننا خوێندوویەتی و لەساڵەکانی ١٩٠٣ و ١٩٠٤یشدا دەرسی زمانی سریانی و بنچینەکانی ئایینی مەسیحی لەلای (قەشە گۆرگیسی ردبەن) خوێندووە ولەساڵی ١٩٠٥دا بۆ ماوەی دوو ساڵ

لەلای (قەشە پۆلس عوجمایا)ی ناسراو بە (قەشە سوورە)، خوێندنەکەی تەواو کردووە، لەبەر زیرەکی و زەین روونی بەماوەی پێنج ساڵ بەچاکی فێری زمانی سریانی و سەرەتایەک لەزمانی یۆنانی و فەرەنسی بووە لەخوێندنەکەیدا گەیشتۆتە پلەی (شەماشە) و لەو لاشەوە بەیارمەتی هەندێ لەدۆستە خوێندەوارەکانی بەباشی فێری خوێندنەوەو نووسینی کوردی و عەرەبی بووە.

لەتافی لاویدا ئاشقی (واری)ی کچی یووسف ناوێک دەبێ و بەعەشقی ئەو کچە نازدارە هونەری مەقام و بەستەی کوردی لەلا دەخولقێ ئاوازی مەقامی رەسەنی کوردی لە حەنیل و پووتێ و عەبەی چایەچی و رەفیق چارچاو، فێر دەبێ. بەعەشقی (واری)ی دۆستی ناسک و نازداری، پەرە بەئاوازەکانی ئەو مەقامانە دەدا، بەتایبەتی کە (واری)ی بەنسیب نابێ، ئەو مەقام و گۆرانییانەی پەردەیەکی خەماوییان بەسەردا هەڵدەکێشرێ، بەتایبەتی دوای مردنی (واری)، کە بەنابەدڵی درایە خزمێکی خۆی و زۆری نەبرد بەنەخۆشی سیل سەری نایەوە.

سێوە بەتەواوی بووە میراتگری مەقامزانەکانی کۆیە، بەڵام کتومت هەمان رێبازی ئەوانی نەگرت، بەڵکو خۆی بووە خاوەن رێبازێکی هونەری مەقامی رەسەنی کوردی. دەنگێکی خۆش و لەباری هەبوو، هەستێکی مۆسیقی ناسکی لەلا خولقابوو، بەهەوڵدانێکی کەم توانی خۆی بکاتە ئاشنای مۆسیقای رۆژهەڵاتی. لەکاتی گۆرانی گوتندا دەیزانی لەکوێ دەست پێ بکات و لەکوێش بوەستێ. بەندو ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوەیەکی سازگاری کوردەوارییەوە هەڵقوڵابوون. بەزۆری لەگیروگرفتەکانی لاوان و ئەڤین و راستگۆیی و وەفاداری و سروشتی خاکی کوردستانەوە دەدوێن. بە رەگێکی قایم و قووڵ بەناو بوون و ویژدانی میللەتدا چوونەتە خوارەوە، لەزۆر شوێندا لەبازنەی کات و رۆژگار دەچنە دەرەوە تاکو بۆ هەموو دەورو سەردەمێکی مرۆڤی کورد دەست بدەن، بۆیە مەقامەکانی سێوە بەگۆرانیی رەسەنی کوردی دەدرێنە قەڵەم.

هەرچەندە ئەو مەقامانەیشی بە دەقی ئەدەبی و ئاوازەکانیانەوە، رەگ و شادەمارەکانی دەچنەوە سەر مەقامەکانی سەدەی نۆزدەم، بۆ سەردەمی ئەمین ئاغای حەویزی ناودار بە (ئەختەر)ی شاعیرو مەقامناس و (مەریین) و (نەشئەتی رەشید ئاغا)، کە مامۆستای مەقامی رەسەنی کوردی بوون، بەڵام ئەم راستییە ئەوە ناگەیەنێ، کە مەقامەکانی سێوە بەئاوازو دەقەوە کتومت هەمان مەقامی ئەو سەردەمەی پێشوو بووبن و هیچ گۆرانکارییەکیان بەسەردا نەهاتبێ.

چونکە هەروەکو ئاشکرایە ئەدەب و هونەرو رووناکبیری ئاوێنەی باڵانمای ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەلانن و بەپێی قۆناغ و گۆرانی باری ژیان، ئەوانیش دەگۆڕێن و گەشە دەکەن. لەسەرێکی تریشەوە سێوە خۆی مەقامبێژێکی هونەرمەندی بەدەسەڵات بوو، توانای داهێنانی ئاوازی نوێ و تازەکردنەوەی ئاوازی کۆنی هەبوو، بەزیادکردنی شتی تازەو لابردنی نەغمەی کۆنی سواو و نەگونجاو لەگەڵ بابەتی مەقامەکەدا. بۆیە لەکاتی گۆرانی گوتندا، هەمیشە زاڵ بوو بەسەر ئاوازی مەقامەکانیدا و بەتوانای هونەری خۆی دەسکاریی تێدا دەکردن، بەبێ ئەوەی لەسنووری گشتی و بنەما سەرەکییەکانی ئەو مەقامانە دەربچێت.

**گەشتێک بەناو بەندی مەقامەکانی سێوە:**

سێوەی هونەرمەند بەدەیان مەقامی رەسەنی کوردی و بەستەی پڕ جۆش و خرۆشی گوتووە. لەهەمووشیاندا بەچاکی سەرکەوتووە و بەکامی دڵ بەناو باخ و گوڵزاری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و شیعری کلاسیکی میللەتەکەیدا گەڕاوە، چەپکێک گوڵی بۆنخۆش و ئاوداری چنیوەو کردوونی بەچمکێک مەقام و وەک دیارییەک پێشکێشی گوێگرانی کوردی کردووە. ئێستاش گەشتێک بەناو دەقی بەندی مەقامە رەسەنەکانیدا دەکەین، کە لەساڵی ١٩٥٢دا پێنج لەو مەقامانەی لەئێستگەی رادیۆی کوردیی بەغدا تۆمارکردووە، کە ئەمانەی خوارەوەن (مەقامی عەجەم: سەحەر) و (حیجاز: گورێ) و (بەیات: عایشە گور) و

(حیجاز: بوهار) لەگەڵ مەقامی (کراسی شەنگ مێردەم)دا لێرەدا لەهەر یەکەیان کۆپلەیەک بەنموونە دێنینەوە:

**١- مەقامی عەجەم - سەحەر:**

گۆرانییەکی رەسەنی کوردییە، لەسەر ئاوازی عەجەم دەگوترێ، مەقامێکی شارستانییەو لەژیانی پڕ هات و باتی ناو شارو بازرگانیی سەردەمی کۆنی کوردەوارییەوە دەدوێ. دانەری دەقەکەی ئاگاداری کەلەپووری ئیسلام و سایکۆلۆژییەتی نەتەوەی کورد بووە، تابلۆی شیعری جوان و وێنەی هونەریی ناسکی تێدا کێشاون:

**ئەوەل سەحەرە**

**سەحەر سەدای منی غەریبە ماری**
**وەزی هەر گێژم**
**ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن**
**ئەمن بەبێ برین خوێنێ دەرێژم**
**گەلی برادەرینە ئەمن هەرچەندی دەکەم**
**لەوێ کۆنە دنیایێ**
**قاسیدەکی بەمتمانیم بەدەست ناکەوێ**
**بینێرمە کن بەژنی باریک و دووچاوی بەرەک**
**راستی دری خۆمی لەبۆ بیێژم**
**وەیلێ سەحەرە!**

**٢- مەقامی حیجاز**

**گورێ:**

**ئەرێ گورێ گورە جوانێ**
**سینگ سپیێ مەمک فنجانێ**
**داک حدوودێ باب شاسەیوانێ.**
**خوا کەی گورێ**
**ئەگەر جەللادان لەمن دەگرن چار گۆشەی مەیدانێ**
**چەرخەچی شا میسریان دەردێنن لە کالانێ!**
**تو عەشقی خودای بەوی رۆژی جومعەیە**
**شەمووی بەسەر دادێ**
**ئەوان گرتیان بەردەوە لە بەندیخانێ!!**

**٣- مەقامی بەیات**

**عایشە گور:**

**ئای ئای ئای ئای**
**ئەگەر سەرێ من دەیێشی**
**دری عایشێی بابان وێران ناسەکنی**
**لەبەر هەرامە زوگرتی**
**هەر کەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی**
**ئەوەتانی قایەو قایەلانی خۆی**
**داوێتەوە چۆم و چۆمارو سۆرە کرتی!**

لەکۆپلەی دووەمیشدا وەسفی سوارە چووکەلانەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:

**عایشە گور دەرێ هەر کەسانەکی**
**سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی**
**ئەوەتانی سواری جوانە ماینەکی**
**بۆری ئەسعەد بەگی کەوێتە**
**لەلایەکی دەرۆن جووتەکی تولەو**
**لەوی دیکەشی جووتە تاژی مل بەقەرێتە!!**

**٤-مەقامی حیجاز**

**بوهار:**

**ئەمن ئەوا بوهارەکم گەیوەتێ**
**گەلی برادەرینە**
**خواکەی سەرێ من دەیێشێ**
**دری منی غەریبە ماری دەترسی**
**ئەگەر سەرێ من دەبرا بیبێتن بەقوربانی**
**ئەوێ قورینگێ گەردن گۆزر**
**کەوەتانی هەموو بوهارو پایزان**
**شاپەرێ خۆی شۆڕ دەکاتەوە**
**بەسەر گوڵ و گوڵاوی کاولە سندووسی!!**

ئاوازی ئەم مەقامەی بوهار لە هەموو مەقامەکانی دیکەی غەماویترە.

**٥- مەقامی کراسی**

**شەنگ مێرەم:**

ئەم مەقامە سەبارەت بەناوهێنانی تفەنگی شەشخان، کە ئەوساکە چاکترین تفەنگ بووە لە هەموو دەقەکانی دیکەی مەقامەکانی سێوە نوێترە، زادەی ئاوو هەوایەکی شارستانێتی و هات و باتی بازرگانی سەدەی نۆزدەمە، بابزانین تەتەرو دایکی شەنگ مێرەم چ گفتوگۆیەک دەکەن:

**تەتەر دێ و رادەبری**
**داکی شەنگێم دەرێ: "تەتەر مارت وێران بی**
**قیمەتی ئەو کراسەی لەبۆ من برێ"**
**تەتەر دەرێ: "قیمەتی ئەو کراسەم ئەوەتانە**
**بەپێنج سەد بەردیلی بەر بەرانە!**
**بەپێنج سەد ماینی کەحیلانە!**
**بەپێنج سەد تفەنگی شەشخانە!**
**بەپێنج سەد هۆقە روونی تەیرانە!!"**
**داکی شەنگێم دەرێ:**
**"تەتەر مارت وێران بی**
**ئەگەر شەنگێ ئەو کراسەی**
**لەبەر بکات و بچێتە شایی و گۆوەندو سەیرانە**
**خەرکی بیبینێ داخوا دەرێن**
**چتۆ کچەتیمە رەزەوانە!!"**

**مەقامەکانی سێوە لە تەرازووی رەسەنایەتیدا:**

بەکەمێک سەرنجدانی دەقی بەندو بەیتەکانی مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندو هەڵسەنگاندنیان لە رووی ئەدەبی و هونەرییەوە، ئەم راستییانەمان بۆ دەردەکەوێ:

١- بابەتەکانی هەموویان لە کۆمەڵگای کوردەوە هەڵقوڵاون و بۆ کورد گوتراون. پڕن لە وشەی ناسکی خۆشەویستی و ئەڤین و دڵپاکی و ئازایەتی و سوارچاکی و وەفاداری و مەردایەتی و خۆبەختکردن.

٢- مەقامەکانی بەدەقی ئەدەبی و ئاوازەوە، لەناو ئاو و هەوایەکی سازگاری کوردستانەوە خوڵقاون، تۆمارو سیمفۆنیایەکی رووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵی کوردەوارین و بەپێی قۆناغی ژیانی خەڵکەکە خوڵقاون.

٣- شاعیری میللی و فۆلکلۆری بەیت و بەندەکانی لە دەربڕینی ڕەوانبێژیدا، بۆ دەرخستنی جوانیی ئافرەت، تا کارمامزی مل بەقەرێتەو قورینگی گەردن بەرزو سەقەری باڵەبان و کەوی وڵاتەکەی خۆی هەبووبێ، بەگیانەوەری دوورە وڵاتی وەک زەرافەو کەنگەرو تاوسی نەچواندووە.

٤- شاعیری دەقەکانی گۆرانی و مەقامەکانی لەپێداهەڵدانی هەر شتێک جوانترین و زیندووترین چەشن و ئەندامی هەڵبژاردووە. لە دەربڕینی جوانیی ئافرەتدا، کەوتووەتە وەسفکردنی ئەو ئەندامانەی، دەبنە پێوانەی جوانی و شۆخ و شەنگی مێینە لەبەرچاوی نێرینەی جوانی پەرستدا، هەر لە بەژن و باڵای بەرزو سنگی سپی و مەمکی فنجانی و گەردنی زەردو چاوی بەڵەکەوە بگرە، تاکو دەگاتە برژانگ و بڕۆی رەش و چاوی وەک چاوی سەقەری باڵەبان و دوگمەی سینەو مەمکان و قۆڵ و باونجی کچی شەنگ و شۆخی کورد.

٥- دانەری ئەو دەقانە وەستایانە سوودیان لە گەلێک جۆرە کەلەپووری ئایینی و نەتەوایەتی کورد وەرگرتووە، بەو کارەشیان جۆرە قووڵبوونەوەیەکیان بە بابەتەکانیان داوە. هەروەک لەدەقی بەندەکانی (سەحەر) و (گورێ) و (کراسی شەنگ مێرەم)دا بەکارهاتوون و رەسەنایەتییەکی پتەویان بەمەقامەکە داوە.

لەکۆتاییدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەو راستییەش بکەم، کە سێوەی هونەرمەند ژیانێکی پڕ لە ناگوزووری و نەبوونی بەسەر بردووە، بەڵام نەفس بەرزییەکەی ماوەی نەداوە دەست لەبەر کەس پان بکاتەوەو بە سەربڵندی ژیاوە، تاکو لەرۆژی ١٩٦٣/١٢/٩دا لە کۆیە کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی هەرمۆتە بەئامادەبوونی هونەرمەندو هونەر دۆستانی شارەکە بەخاک سپێردراوە.

# کاوێس ئاغا

ناوی (کاک وەیس)ە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی جەمیلی کوڕی کانەبی (کانۆ)یە، لە خێڵی هەرکیە و لە تیرەی (ماڵەبی)یە.

لە ساڵی (١٨٨٩ز)دا کاوێس ئاغا لە کوێستانی چارچەلی هەرکیاندا لەدایک دەبێت.

هەر لە منداڵییەوە پەروەردەی ئاووهەوای خۆش و سازگاری کوێستانە دڵرفێنەکانی کوردستان بووە، وەک (تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ)، دەشتەبێڵ، دەشتی براندیز، چارچەلی هەرکیان، هەوار خاتوون، هەوار مامز، مێرگەمیر، مێرگەزەر) کە ئەمانەش بەهەشتێکی سەر رووی زەمینن.

کاوێس بە دەنگی شالوور و قاسپەی کەوی دەم کەویە بەفرەکان گوێی کراوەتەوە و سۆز و هەست و ئەڤینی بزڤتییە لەگەڵ باعەباعی بەرخۆڵە و شمشاڵی کاکەی شوان و ئاواز و گۆرانی شەنگەبێرییان، کە ئەمانە تێکەڵ بە کەژ و کێوە سەرکەشەکانی کوردستان دەبوون و دەنگیان دەدایەوە و دەبوون بە جوانترین سیمفۆنیا.

لە پایزێکی درەنگدا کاوێس ئاغا لەگەڵ خێڵەکەیدا کوێستانەکانیان جێ دەهێشت و بەرەو گەرمێن دەهاتن تا دەگەیشتنە پاوانەکانیان لە دەوروبەری ناوچەی پیرمام و دەشتی زرارەتی و لە گوندەکانی (هەرشەم، قەفەریان، قەپەکیان، دێرێ، کودەریان، هەبابان، گەرو دەلالان) جێنشین دەبوون بۆ لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵاتیان لە زستاندا.

کاوێس پاش مردنی لەیلێی دایکی دەچێتە لای (ئەحمەد خانی هەرکی). جا کاوێس ئاغا لەبەر ئازایی و زیرەکی و راپەڕاندنی ئیشوکاردا، بوو بە شوانی ئەحمەد خانی هەرکی، بەدەم شوانییەوە بۆ دڵخۆشکردن و دامرکاندنەوەی ژان و ئازار و کەف و کوڵی ناو دڵ و دەروون. لاوک دەکات بە هۆگری خۆی تا خەم و دەرد و پەژارە و داخی دڵی پێ دابمرکێنێت، دوای شوانی لەبەر جوامێری و نیشان شکێنی دەبێتە چەک هەڵگری ئەحمەد خانی هەرکی.

کاوێس ئاغا تا ساڵی (١٩١٥ز) لەگەڵ خێڵەکەیدا کوێستان و گەرمیانی کردووە، لە پاشان خۆی و پوورزاکەی دەرویش فاتیمە لەگەڵ تاهیر ئاغای هەرکی دێنە شاری رواندز لە ماڵی حاجی نەورۆز ئەفەندی میوان دەبن، چونکە ماڵی حاجی نەورۆز ئەفەندی ماڵێکی خانەدان بوون هەروەها پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان سەرۆکەکانی هەرکی و حاجی نەورۆز ئەفەندی هەبووە، سەرۆکەکانی هەرکیان کە بەرەو کوێستان بچووبانە سەردانی ماڵی حاجی نەورۆزیان دەکرد، هەروا لە گەڕانەوەشیاندا بۆ گەرمێن هەر لە ماڵی ئەو مێوان دەبوون.

کە شەو داهات تاهیر ئاغا داوای لە کاوێس ئاغا کرد لاوکیان بۆ بڵێ، کاوێسیش تا درەنگی شەو دەستی بە لاوک گوتن دەکرد، لە ئەنجامدا حاجی نەورۆز شەیدای دەنگ و ئاوازی کاوێس ئاغا

دەبێت، ئەم دەنگ و سەدایە کارێکی وا لە حاجی نەورۆز دەکات، کە داوا لە تاهیر ئاغا بکات، کە کاوێس رازی بکات و لای خۆی بیهێڵێتەوە. تاهیر ئاغا بە کاوێس و دەروێش فاتیمە دەسەلمێنێ کە لای حاجی نەورۆز بمێننەوە، جا کاوێس رەزامەندی خۆی پیشان دەدا و لەگەڵ دەروێش فاتیمە لە ماڵی حاجی نەورۆز دەمێننەوە. بەم جۆرە کاوێس ئاغا واز لە ژیانی کۆچەرایەتی دێنێ.

کاوێس ئەو ماوەیەی لە رواندز بووە زۆر هاتوچۆی دیوەخانی (نوری باویل ئاغا)ی کردووە، چونکە نوری باویل ئاغا و محەمەد حاجی نەورۆز دوو دۆستی زۆر خۆشەویستی یەکتر بوونە، بەم بۆنەیەوە پەیوەندی و خۆشەویستی لەنێوان کاوێس و نوری باویل ئاغای رواندزی پەیدابووە و دەنگ و ئاوازی کاری کردۆتە سەر نوری باویل ئاغا و شەوان کۆڕی دیوەخانی بە لاوکەکانی جۆش داوە، هەر بۆیەش بە دڵ و گیان یارمەتی کاوێس ئاغای داوە.

کە جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد عرووسەکانی قەیسەری هێرشیان بۆ سەر شاری رواندز هێنا و شاری رواندزیان ئابڵوقە داو دانیشتوانی شار رووبەرووی هێرشی عرووسەکانی قەیسەری بوونەوە، بەڵام لە دواییدا بە تایبەت لە ١٣ی مانگی مایسی ساڵی ١٩١٦ شاری رواندزیان داگیرکرد و سووتاندیان.

جا ئەوانەی رزگاریان بوو شاریان بەجێهێشت و دابەشی سەر ئەو ناوچانە بوون کە لە جەنگ و هێرشی عرووسەکانی قەیسەری دوور بوون. ماڵی حاجی نەورۆز لەگەڵ کاوێس ئاغا و پوورزاکەی دەروێش فاتیمە رواندز بەجێدێڵن و دێنە شەقڵاوە.

میری عوسمانی فەرمان دەردەکات حاجی نەورۆز دەکاتە بەرێوەبەری ناحیەی شەقڵاوە. ئەویش کاوێس ئاغا دەکاتە لێپرسراوی ئازووقەی عوسمانی لەگەڵ حەسەن عەبدولقادری یاری و مەجید لوول ئەحمەد. جەندرمەی عوسمانی بەزۆری دانەوێڵە و کەلوپەلی پێویستیان لە خەڵکی شەقڵاوە و دێهاتەکانی دەوروبەری دەستاند، وەک گشت ناوچەکانی تری کوردستان، ماڵ بە ماڵیان دەپشکنی و هەر جۆرە دانەوێڵەیەکیان بەرچاو بکەوتایە لێیان دەستاندن و لە دێی دیانەکانی شەقڵاوە عەمباریان دەکرد، بەمجۆرە کاوێس ئاغا بووە مووچەخۆری میری عوسمانی تا شەڕی یەکەمی جیهان کۆتایی هات.

کاوێس نەخوێندەوار بوو، بەڵام حاجی نەورۆز فێری کرد کە لە کاتی وەرگرتنی ئازووقە و کەلوپەلدا چۆن ئیمزا بکات.

جەندرمەی عوسمانی شەوان دەرگای دێرەیان لەسەر کاوێس و هاورێیەکانی دادەخست نەوەک ئازووقە بدەنە هەژار و لێقەوماوان. کاوێس هەستی بە ئازاری چەوساوە و بێ دەرەتان و لێقەوماوان دەکرد، لەگەڵ ئازارەکانیان دەژیا، بۆیە رێگایەکی تایبەتی دۆزییەوە بۆ یارمەتیدانیان، هەروەکو (وێردوێ جووتیار) سەبارەت بەم رێگایە گوتی: کە شەو دادەهات بە نهێنی خۆمان دەگەیاندە بەر دەرگای دێر بۆ ئەوەی کاوێس و هاورێیەکانی (ئارد، برنج، گەنم، جۆ، ساوار، نیسک، نۆک، ماش)مان بدەنێ، ئەویش لەکونی دەرگای دێرەکەوە بەهۆی (پشتێنێکەوە) کە سەرێکی بەدەست کاوێسەوە بوو، سەرەکەی تریان خرابووە ناو هەمبانەیەکەوە. لە ژوورەوە کاوێس ئازووقەی روو دەکردە ناو کونی پشتێنەکە لە دەرەوە یەکسەر دەچووە نێو هەمبانەکەوە، بەم جۆرە ئازووقەیان لە ئەمباری جەندرمەکانی عوسمانی دەردەهێنا.

پاش کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم و دەرچوونی (عرووسەکانی قەیسەری) لە شاری رواندز، پەیتا پەیتا خەڵکەکە بەرەو شارە خامۆشەکەیان گەڕانەوە، بەڵام کاوێس و پوورزاکەی بۆ رواندز نەگەڕانەوە، بەڵکو لە شەقڵاوە نیشتەجێ بوون. پاش ئەوەی کاوێس ئاغا واز لە مووچەخۆری میری عوسمانی دێنێ، دەبێتە دۆست و هاونشینی سلێمان بەگی کوڕی بابیز بەگی

شەقڵاوە. سلێمان بەگیش زۆر خۆشی دەویست، بۆیە هەر لە خەڵکی شەقڵاوە ژنێکی بۆ هێنا، کە ناوی (هەمینەی مەحموود شەریف) بوو، کە لە ٢٢ی شوباتی ساڵی ١٨٩٢ لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شەقڵاوەدا نێژراوە.

خێزانی کاوێس چل و شەش ساڵ پاش کاوێس ئاغا ژیاوە، بەڵام دەروێش فاتیمە لە گوندی (سپی گرە) شوو دەکات کوڕێکی دەبێت، کە ناوی (عەبدولکەریم)ە و لەشەقڵاوەشدا نیشتەجێیە، هەروا دەروێش فاتیمە دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆشی هەبووە، هەردەم لە پرسە و مەولود خوێندنەوە بە دەفە (ستایشی ئایینی) گوتووە و کوڕی دانیشتوانی خستۆتە جۆش. کاوێس هەمیشە لەگەڵ سلێمان بەگدا لە دیوەخانە گەڕان و هاتوچۆدا بووە، بۆ سەردانی دەشتی هەریر زۆرجار بە سواری ئەسپ لەگەڵ یەکتردا بەرەو دەشتی هەریر دەستی دەکرد بە گوتنی لاوک و حەیران، دۆڵە کەپکەکانی دەهێنایە دەنگ و سەدا، هەروا بە هەمان شێوە دەگەڕانەوە، زۆرجار کە سلێمان بەگ دەچووە سەردانی سەرۆک خێڵ و برا گەورەکان، کاوێس وەک هەڤاڵ و هۆگرێکی گیانی بە گیانی لەگەڵیدا بووە، چونکە سلێمان بەگ سەردەمی لاوی پیاوێکی دڵتەڕ بووە، هەروا شەیدای لاوک و حەیران بووە بە تایبەت دەنگ و ئاوازی کاوێس ئاغا. کاوێس زۆربەی ژیانی لە دیوەخانەکانی بە ئاواز و دەنگە زوڵاڵەکەی جۆشداوە، کاوێس ناوە ناوە گەرمیان و کوێستانی کردووە بۆ سەردانی خێڵەکەی بۆ ئەم چاوپێکەوتنانەش گەلێ جار ئەحمەد سمایل بەگی شەقڵاوەی لەگەڵ خۆی بردووە، چونکە زۆر دۆستی کاوێس بووە.

جارێکیان کاوێس ئاغا نیازی سەردانی هەرکییەکانی ناوچەی کۆیەی هەبووە، بەڵام لەم سەردانە پەشیمان دەبێتەوە، بڕیاری سەردانی هەرکییەکانی ناوچەی پیرمام دەدات و دەکەوێتە ڕێ لەگەڵ خوالێخۆشبوو ئەحمەدی سمایل بەگ، لە گوندی (میر ئاخور) و (هەرشەم) و ناو زۆرمەکانی ناوچەکە میوان دەبێت، محەمەدی کوڕی کاوێس دەڵێ: (باوکم لەو دیدەنییە نەخۆش دەکەوێت بە ئەحمەدی سمایل بەگ دەڵێ: تۆ بگەڕێوە شەقڵاوە من دەمێنمەوە تاکو چاک دەبمەوە. ئەحمەد بەگ دەگەڕێتەوە شەقڵاوە. کاوێسی باوکم نەخۆشییەکەی زیاتر بەسەری زاڵ دەبێت و گیانی پاکی کپ دەبێ و لەرۆژی چوارشەممەی ساڵی (١٩٣٦ز)دا تەرمەکەی لە گۆڕستانی هەرشەم دەنێژرێت.

هەروەکو باس دەکرێت و دەگێڕنەوە کاوێس ئاغا پێش مردنی داوای بەفر دەکات، لەو کاتەشدا بەفر دەبارێت و هەندێ بەفری بۆ دێنن کە بیخوات، دوای بەفر خواردن، گیانی پاکی دەردەچێت.

### کاوێس ئاغای لاڵەپتە

کاوێس لەکاتی گفتوگۆدا وشەکانی زۆر بە زەحمەت لە دەمی دەهاتە دەرەوە، پچڕ پچڕ بە نیوەچڵی دەری بڕیون، کەچی لەکاتی لاوک و بەستە و حەیران گوتندا زۆر ڕەوان و زمان پاراو بووە، هەرگیز زمانی نەگیراوە و ڕانەوەستاوە.

کاوێس کە مردووە، ڕیشی دان و ماش بووە و پیاوێکی ناوشان پان و بەژن درێژ بوو، چاوی چەپی تانەیەکی سپی بچووکی لەسەر بووە، بە زۆری بەرگی خۆشناوەتی پۆشیوە، جار بەجاریش جلوبەرگی هۆزەکەی پۆشیوە کە شاڵ و شەپکی پێ دەگوترێت.

### هۆی لاڵبوونی کاوێس ئاغا

محەمەدی کوڕی کاوێس دەڵێ: (باوکم دەیگێڕایەوە و دەیگوت: لە سەردەمی لاویدا زستانێک ماڵمان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان مایەوە و بەرەو گەرمێن نەهاتین، ڕۆژێک باراشمان نەمابوو، دایکم پێی گوتم: کوڕم ئامادە بە بۆ ئاش، منیش ئەسپەکەم بار کرد و چوومە گوندێکی تر، کە ئاشی لێ بوو، لە پاش ئەوەی گەنمەکەم لە ئاش کرد و هاڕیم گەڕامەوە، لە ڕێگادا خۆم و ئەسپەکەم کەوتینە ژێر ڕنووە بەفرێک ئیتر بێ هۆش کەوتم، کە هاتمەوە هۆش خۆم سەیرم کرد

ئەسپەکەم لە دوور راوەستاوە، منیش لە رنووە بەفرەکە رزگارم بووە، وا دیار بوو رەنووە بەفرەکە بە تەواوی لوولی نەدابووین، بەرەو ماڵ گەرامەوە، بەڵام ئەم کارەساتە سامناکە بووە هۆی لاڵبوون و زمان گیرانم لە کاتی گفتوگۆکردندا).

## کاوێس ئاغای هونەرمەند و بوێر

کاوێس ئاغای بلیمەت و بەهرەوەر، هونەرمەندێکی شیاو و لێهاتوو و دڵتەڕ بوو، لاوک و بەستەکانی بە شێوەی دیالێکتیکی کرمانجی ژووروو دارشتوون. بەرهەمی کاوێس شێوازێکی میللی و فۆلکلۆری گرتۆتە خۆ، وشەی جوان و بەپێزو رەوانی بۆ داناون، کاوێس ئاغا تەنیا لاوکبێژ نەبووە، بەڵکو لە حەیران و بەستە گوتنیشدا دەستێکی باڵای هەبووە.

کاوێس هەرچەندە نەخوێندەوار بوو، بەڵام کارامە و لێهاتوو بوو، توانیویەتی رووداوە گرنگەکانی مێژووی گەلی کوردمان لە شێوەی داستانی شیعریدا، وەک سامانێکی نەتەوایەتی کورد، شانازی پێوە بکرێت و دابڕێژرێت، کە بریتین لە لاوک و بەستە و حەیرانە بە سۆزەکانی کە ئەم لایەنە گرنگانەی گرتۆتەوە: (رامیاری و نەتەوایەتی، کۆمەڵایەتی، شەڕوشۆڕ، سوارچاکی، ئەڤینداری، ئازایەتی و قارەمانیەتی. سەرۆک خێل و پیاو ماقوولانی کورد و رۆڵە ئازاو نەبەردەکانی گۆرانییەکانی کاوێس رەنگدانەوەی ژیانی کۆچەرایەتی و کۆمەڵگای کوردەواری ئەو سەردەمەمان بۆ دەردەخات لە پاڵ چەوساندنەوەی میللەتی کورد لە لایەن عەجەمەکان و عوسمانییەکان و کەمالیستەکان، کە کاری لەو هونەرمەندە کردبوو هەستی میللی و نەتەوەیی ئەم نەمرەی خستبووە جووڵە و جۆش و ئەڤینی خاک و نیشتمان).

ئەو سترانانە نرخێکی یەکجار زۆریان هەیە، گەر بێت و لە بنج و بنەوانیان بکۆڵینەوە لاپەڕەیەکی شاردراوەی مێژووی نەتەوەی کوردمان بۆ روون دەبێتەوە، کە مێژوونووسەکان دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن و بیکەنە سەرچاوەی نووسینەکانیان، بێگومان گۆرانی فۆلکلۆری کوردی بە تایبەتی لاوک وەک ئاوێنەیەک باس لە رووداو و گۆرانی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵی کوردەواری دەکات.

دەنگ و ئاواز و هەستی ناسک و هونەر و بەهرەی کاوێس لەناو سازو ئاوازی کوردیدا مۆرکێکی تایبەتی و رەسەنایەتییەکی تەواوی کوردی پێوە دیارە و خۆی چەسپاندووە، چونکە لەنێو جەرگەی کۆمەڵگای کوردەوارییەوە هەڵقولاوە، هەر ئەو دەنگ و ئاوازانەشن کە لە شەقەی باڵ دەدەن لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەرز دەبنەوە. کاوێس گوێیەکی مۆسیقایی و هەستێکی شاعیرانەی هەبووە و خاسیەت و رێبازی تایبەتی و شێوەی کەسایەتی خۆی لەناو هەموو گۆرانیبێژانی کورد وەک ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ئاسمانی لاوک و حەیران و بەستەدا درەوشاوەتەوە. ئەو لاوک و بەستەو حەیرانانەی کاوێس گوتوویەتی گۆرانیبێژانی تری کوردیش هەمان رووداو و کارەساتیان بە لاوک و حەیران و بەستە گوتووە، وەک: (حەمەد ئاغا مەندۆ، عەزیز ئاغای قەوان، محەمەد جوجەری، شەریفە شەرۆی هەرکی، عەلۆ پالانی، یوسف ئاغای کەورگۆسکی، جەمیل ئاغای دارەتوو ونس ئاغای زەنگەنان.. هتد).

بەڵام هەر یەکەیان سەداو کارتێکردنیان لە بارەی ئاواز و دارشتندا، کەسایەتی خۆیان تیا بەدی دەکرێت و لەناو کۆمەڵدا جۆرە تایبەتمەندێکی خۆی هەبووە، چونکە هەر هونەرمەندێ بە دەنگە زولاڵەکەی دەناسرێتەوە، لەم بوارەدا هەریەکە خاوەن رێبازێکی تایبەتی بوون.

## کاوێس ئاغا و تۆمارکردنی گۆرانییەکانی

لە ساڵی (١٩٣٠ز)دا کاوێس ئارەزووی تۆمارکردنی گۆرانییەکانی دەکات، بۆیە لە لایەن دۆست و هاورێیەکانی باسی چوونە بەغدا دەکات. تا لە کۆمپانییەکاندا بەرهەمەکانی لە لاوک و حەیران و بەستە، تۆمار

بکات، بەڵام هاوڕێیەکانی وەک: عەلی فلەیح، سەعید قەساب، پیرداود، یان پیرەی زڕدۆشاوی لە جیاتی هاندانی پێی دەڵێن: کە نەچێتە بەغدا، چونکە لە تاقیکردنەوەی گفتوگۆدا سەرناکەوێ بەهۆی لاڵی و تێگیران، بەڵام کاوێس بڕیار دەدا و لەگەڵ هونەرمەندانی هەولێر، وەک: حەمەد ئاغا مەندۆ، عەزیز ئاغای قەوان، عەلی پاڵانی دەچنە شاری موسڵ بۆ لای لێپرسراوی کۆمپانیای بێزافۆن و کۆمپانیای ئۆدیۆن، هەروا لەوێش هونەرمەندانی ناوچەی بادینان و ژەنگار بۆ هەمان مەبەست ئامادە ببوون، وەک (عەلی خەنجەر ژەنگاری، گولی خانی ژەنگاری، منجێ خان ژەنگاری...و هتد). لێپرسراوی هەردوو کۆمپانیای (بێزافۆن و ئۆدۆن) ڕۆژی ئامادەبوونیان بۆ دادەنێن.

ئەو هونەرمەندانەی هەولێر لە ڕۆژی تەرخانکراودا دەچن بۆ موسڵ و شەو لەوێ دەمێننەوە و لەگەڵ هونەرمەندانی بادینان و ژەنگاردا بەیەک دەگەن بۆ بەیانی قەمارەو لۆرییەک ئامادەکران بۆ ئەوەی هونەرمەندان بەرەو بەغدا ببات.

جا کاوێس ئاغا، حەمەد ئاغا مەندۆ، عەلی خەنجەر ژەنگاری، گولێ خان ژەنگاری، منجی خان ژەنگاری بە ئۆتۆمبێل بەرەو بەغدا دەکەونە ڕێ، ئەوەی شایانی باسە شوفێری ئۆتۆمبێلەکە خەڵکی هەولێر بووە و ناوی (ئەحمەد کەپووە)، هەروا هونەرمەندانی دی بە لۆری بەرەو بەغدا دەکەونە ڕێ، کاوێس ئاغا لە کۆمپانیای بیزافۆن لە چاوپێکەوتن و تاقیکردنەوە و گفتوگۆدا سەرناکەوێ و پێی دەڵێن تۆ لاڵی و دەنگت بۆ تۆمارکردن ناشێ، ئەویش بە دڵێکی شکاو لە کۆمپانیاکە دەردەچێت و لە چایخانەیەکی نزیککۆمپانیاکەدا دادەنیشێت و دەست دەباتە بناگوێی و لاوکی (گەنج خەلیل) دەڵێ هەروەک کەوی قەد پاڵ شاخەکان دەنگە زوڵاڵەکەی بەرز دەکاتەوە و ئەو ناوە دێنێتە جۆش، خەڵک لێی کۆدەبنەوە و لە کۆمپانیاکە گوێیان لە دەنگە بە سۆزەکەی دەبێت و دێن بۆ لای و داوای لێبووردنی لێ دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا دووبارە دەیبەنە کۆمپانیایەکە و یەکەم قەوانی بۆ تۆمار دەکەن، کە لاوکی (گەنج خەلیل) بووە. هەر لەو قەوانەشدا دەڵێ (لە چاوی عەلی فلەیح)!!

لە کۆمپانیاکە پارەیەکی باشی دەدەنێ و بە (عەبای بە کورک) خەڵاتی دەکەن.

بەم جۆرە کاوێس دەست بە تۆمارکردنی گۆرانییەکانی دەکات لە کۆمپانیاکاندا. کاوێس ئاغا لەم کۆمپانیانەدا گۆرانییەکانی خۆی تۆمار کردووە:

١- کۆمپانیای (بیزافۆن) بۆ تۆمارکردن.

٢- کۆمپانیای (نەعیم) بۆ تۆمارکردن.

٣- کۆمپانیای (نایف) بۆ تۆمارکردن.

لە کاتی تۆمارکردنی قەواندا (ئەسکەندەر ساز) سازی بۆ لێداوە.

### گەشتەکانی کاوێس ئاغا

کاوێس ئاغا لە تەمەنیدا زۆر گەشتی ئەنجامداوە بۆ (سلێمانی، ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ناوچەی بیتوێن، ناوچەی بادینان، باکووری کوردستان، شاری کۆیە..).

### کاوێس ئاغا لەنێوان حەیران و بەستە و لاوکی ئەڤینداری و نەتەوایەتی و شەڕوشۆڕ و سوارچاکی

جێی ئاماژەیە کاوێس ئاغا لە لاوکی نەتەوایەتیدا دەورێکی باڵای هەبووە و بۆ ئەوەش چەندین لاوکی هەبووە، وەک: (لاوکی شێخ مەحمودی نەمر، لاوکی سمایل ئاغای شکاک (سمکۆ)، لاوکی شۆڕشی بارزانی دووەم (١٩٣١- ١٩٣٢ مەلیکۆ)، لاوکی میر پەنجۆ، لاوکی بابێ عەبدولکەریم و نایف، لاوکێ کەلێ کاشخانێ، لاوکی تورک و یۆنان، لاوکی دەخالۆ، لاوکی بابێ سلێ...).

لەگەڵ ئەوەشدا کاوێس ئاغا لە لاوکەکانیدا لاوکی شەڕوشۆڕ و سوارچاکی بەدی کراوە و هەبووە، وەک: (لاوکی خێلیدێ ڕەزگۆ، لاوکی عەبدولمەجید، لاوکی سەعدونێ نحۆ، لاوکێ ئاودەلێ

عیسێ (کۆچەرێ)، لاوکێ فەیزۆ، لاوکی لۆ لۆ سوارۆ ل من دێ بایەکا د گەل بارانێ، لاوکی لۆ لۆ سوارۆ ب خراپی سەرجەلێ داکەتم، لاوکی عەلی سەد جاران ب من عەلی، لاوکی حەسەنێ والیکی..).

جگە لەو لاوکانەش لاوکی ئەڤیندارى لای کاوێس ئاغا گرنگی خۆی هەبووە و چەندین لاوکی ئەڤینداری هەیە وەک: (لاوکی پەیاوۆ، لاوکی دەهەرێ، لاوکی عەرەبێ، لاوکی دیلبەر، لاوکی لاوکۆ، لاوکی یار گوندۆ، لاوکی دۆتمام، لاوکی بێریوانێ، لاوکی دەلال، لاوکی نەزانێ، لاوکی زالمێ، لاوکی یارێ، لاوکی بیلمەز، لاوکی گەورێ، لاوکی ئەسمەر، لاوکی سەودالی، لاوکی مێوانۆ، لاوکی سەگڤانۆ، لاوکی جەوێ، لاوکی سمۆقێ، لاوکی گەنج خەلیل.

بەستەش بەشێکی تر بووە لە کارە هونەرییەکانی کاوێس ئاغا، کاوێس ئاغا چەند بەستەیەکی تۆمارکراویشی هەیە، وەک: (بەستەی نارێ، بەستەی کاروانە، بەستەی مامر مامر، بەستەی گۆزەلی...).

جگە لە هەموو ئەمانە حەیران لە کارەکانی کاوێس ئاغا بەدی دەکرێ و چەندین حەیرانی تۆمارکراوی هەیە کە خۆی دەبینێتەوە لە: (حەیرانی ئەمن دەرێم سەردەمەکی، حەیرانی ئەمن دەرێم سواران، حەیرانی لە سپیلکێ سەرخانێ، حەیرانی ئەوجا ئەمن دەرێم، حەیرانی وا من دەرێم ئەسمەرێ، حەیرانی وا من چبکەمێ لە دۆری خۆشاوی، حەیرانی وا من چبکەمێ شل و ملێ، حەیرانی وامن دەرێم نادری).

## دەنگی کاوێس ئاغا لە زانستی دەنگدا

**ئامانج غازی**

لە ئاداو هونەرییەتی دەنگی (کاوێس ئاغا)ی هونەرمەند کۆمەڵێک خاسیەتی هونەری دەکەونە بەر دیدە و گوێچکەمان، چونکە گوتن و ئادای لاوکی بێ رەزم و کێشی مۆسیقا (Adlib) هەر لە سەرەتاوە پێویستی بە چینە دەنگێکی تیژ هەیە تا بتوانێ مەرام و خۆزگەکانی حاڵەتی درامی لاوکەکە بدا بەدەستەوە، ئەگەر چینە دەنگی تێکڕای ئادەمیزاد بۆ ١٢ گروپ دابەش بکرێ (دەنگی پیاوان و دەنگی ئافرەتان و دەنگی منداڵان)، ئەوا دەنگی پیاوان بۆ سەر ٣ بەشی سەرەکی دابەش دەبێ: (دەنگی باریتۆن و دەنگی تینۆر ١-٢، میانەی دەنگی (کاوێس ئاغا) دەگاتە ١٣ دەنگی تەواو لە زۆربەی لاوکەکاندا ٦-٧ دەنگی پڕ تۆنی مۆسیقای بەزاندووە و دەتوانین بەپێی پێوەری دەنگەکان دەنگی کاوێس ئاغا بە تینۆری یەک لە قەڵەم بدەین و لەنێوان هەردوو تۆنی (سی- دۆ) توانیویەتی گەورەترین بەسەرهات و کارەساتی درامی بخاتە باوەشی مۆسیقا و ئادا لە هەردوو لاوکی (شێخ مەحمود و گەنج خەلیل) بە تەواوی ئەم لایەنە دەکەوێتە بەرچاو. خاڵێکی تری هونەری ئەم هونەرمەندە خۆڕسکە لە ئاداکردنی (رستە شیعر و پەخشانەکاندا) تەجویدی هونەری و درێژکردنەوەی پیتەکانی (ئا- ۆ-ێ) زۆر بە هونەرییەوە ئادا دەکرێن لە مرۆڤێک کاتێ کە گفتوگۆ و قسەی کردووە کەم کەس لێی حاڵی بووە، چونکە زمانی لە ئاست هەندێ پیت و رستەی ئاساییدا دەگیرا، کەچی لە نەغمەخوانیدا بولبول ئاسا لە جوانی و عشق و ئازایەتی و مەردایەتی سوارچاکی دەدوا، لەگەڵ ئەم یەکلاکردنەوەی دەنگ و رەنگی کاوێس ئاغا پێویستە جارێکی دیکە ئاماژە بە خاڵە گرنگەکە بکەین، کە دەبێ لاوک و حەیران و قەتار و ئەڵلاوەیسی و سیاچەمانە و هۆرەو ئای ئای و نیوەشەو بە نۆتەی مۆسیقا بنووسرێتەوە تا زنجیرەی رەسەنایەتی نەوە بە نەوە بەیەکتر ببەستێتەوە و هەمیشە مۆرک و ناسنامە و گۆرانی یەکێک بن لە خاڵە هەرە گرنگەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵ و کۆمەڵگا.

*** مەسعودی مەلا هەمزە بە دەستکارییەوە لە کتێبی کاوێس ئاغا، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی جەلال مەلاحەسەن خۆشناو وەرگیراوەو ئامادەی کردووە.**

# هاشم زەینەڵ هونەرمەندێکی تورکمان

موحسین محەمەد

هونەرمەند "هاشم زەینەڵ" لە شەستەکان پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە، هاشم بەڕەگەز تورکمانە لەگەڵ ئەوەی زمانی کوردی بەباشی نەدەزانی، ساڵانێکی زۆر خزمەتی شانۆی کوردی کردووە و لە شاری هەولێر ناوودەنگی خۆی هەبووە، دۆست و برادەری بەشی زۆری شانۆکارانی هەولێر بوون.

لەمێژووی هزر و ئەدەب و هونەری میللەتانی رۆژهەلات، ژمارەیەکی دیار لە رۆشنبیرانی کورد خزمەتی ئەدەب و هونەری فارس، تورک، عەرەبیان کردووە، ئەوەش دیاردەیەک نییە بەتەنیا لەناو میللەتانی رۆژهەلات باوبێ، بەڵکو ئەم دیاردەیە لەناو میللەتانی ئەوروپی زۆر باوە، نموونەش یەکجار زۆرە. "سامۆئیل پیکیت" بەڕەگەز ئیرلەندییەو بەیەکێک لە رابەرانی شانۆی پێشڕەوی فەرەنسی دادەنرێت، "ئادامۆن" بەڕەگەز رووسە، کۆڵەگەیەکە لە شانۆی پێشڕەوی فەرەنسی. "یۆجین یۆنیسکۆی" رۆمانییە پایەکی دیکەی سێکوچکەی شانۆی پێشڕەوی فەرەنسییە.

کورد لەبەر رەوشە سیاسییەکەی رەنگە پتر لەمیللەتانی دی خزمەتی ئەدەب و هونەری نەتەوەکانی دی کردبێ، "محێدین زەنگەنە" کوردە، خزمەتێکی زۆری شانۆی عەرەبی عێراقی کردووە، "میر سەیفەدین کرماشانی" کورد بووە، شانۆی لە ئێران داهێناوە. "یەشار کەمال"، کوردە ئەمڕۆکە یەکێکە لە رابەرانی ئەدەبی نوێی تورکی. "بلند حەیدەری" کوردە و بەیەکێک لە نوێخوازەکانی شیعری عەرەبی دانراوە." سەلیم بەرەکات " کوردە لە ئەدەبی نوێی عەرەبیدا ناوبانگی خۆی هەیە. لەبەرامبەر ئەم گەورە رۆشنبیرانە ژمارەیەک لە ئەدیب و هونەرمەندی میللەتانی دەرودراوسێی کورد خزمەتی دۆزی کوردیان کردووە، "ئیسماعیل بێشکچی" نووسەرێکی تورکە، ئەمڕۆکە لە کوردستان ناوبانگی خۆی هەیە، خزمەتی زۆری کێشەی کوردی کردووە و چەندان ساڵ زیندانی کراوە، "عەباسی کیارۆستەمی" و "سەمیرە مەخمەلباف" دوو هونەرمەندی ناسراوی جهانی سینەمای ئێرانین، لە جیهاندا ناوبانگیان هەیە، بەهونەرەکەیان خزمەتی مرۆڤی کوردیان کردووە.

ئەدەب و هونەر هەر لەسەردەمە هەرە ژوورەکان، بەر لەوەی پەیامی نیشتمانی و نەتەوەیی هەبێت، پەیامێکی مرۆڤایەتی بووە. میللەتان بەخێری پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای گەیاندن زۆر لەیەک نزیک بوونەتەوە، لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت بیروڕا دەگۆڕنەوە و بەرهەمەکانیان نمایش دەکەن. هەموو شوێنێک بووە بە بازاڕ و گەورەترین بازاڕیش سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێتە. هاشم زەینەڵ وەکو هونەرمەندێکی شانۆیی سی ساڵ زیاترە لەو زمانە گەیشتوە. ئەو زۆر چاک دەزانێ تورکمانەکان بواری کاری هونەری و ئەدەبییان نەدەدرایێ، بۆیە بەلایەوە، زۆر ئاسایی بوو خزمەتی شانۆی کوردی بکات. ئەگەرچی هاشم لە کەرکوک ژیاوە و بەتەواوی ئاگایی لەو پلانە بوو، کە دژی کورد و تورکمان دانرابوو، رەنگە هاشم بەچاوی خۆی کارەساتەکانی بینبێ، بەڵام وەک من سەرنجم داوەتە کارەکان، هەڵسوکەوتی لە شاری هەولێر، هەستی رق و کینە بەدی نەدەکرا. دەتوانین بڵێین هاشم هاوسۆزی لەگەڵ کورد و کێشەکەی هەبووە.

یەکەمین بەرهەمی شانۆگەریی «ئاوارە»، بوو، لە نووسینی: مامۆستا حەمەکەریم هەورامی، لەساڵی ١٩٧٤ نمایش کرا. ئاوارە بابەتەکەی سیاسی بوو، ئەگەر هاشم زەینەڵ بڕوای بە دۆزی کورد نەبوایە، لام وایە خۆی لەو جۆرە بەرهەمانە نەدەدا. شانۆی منداڵان. لەلای زۆر میللەتان وەکو پرۆگرامێکی پەروەردەیی تەماشا دەکرێت، هاشم بایەخی بەشانۆی منداڵان داوە و کاری بۆ کردووە نموونەشیان بۆ ئەمە شانۆگەریی تەرازەە کە بەشێوەیەکی زۆر جوان و رێک نمایش کرا. ئەم هونەرمەندە لەزۆربەی تیپە هونەرییەکانی هەولێر کاری کردووە. سەرەتا لە ئامۆژگای مامۆستایان بوو، پاشان لەچالاکی قوتابخانەکان، پاشان چۆتە هەردوو تیپی هونەری هەولێر و تیپی نەتەوایەتی و دواجاریش لەتیپی شانۆی رۆشنبیری "جەماوەری ئادابا" دوا بەرهەمی شانۆیی خۆی وەک دەرهێنەر نمایش دەکات.

ژیانی هاشم زەینەڵ لەرووی هونەری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە زۆر شتی تێدایە، رەنگە کاتێکی زۆری بوێ بۆ ئەوەی بتوانین بەتەواوی لەژیانی ئەم هونەرمەندە بدوێین. ئەوەی لای من گرنگە، بۆ ئێستا لایەنە هونەرییەکەیەتی، هاشم بڕوای بەشانۆی واقیعی هەبوو لەپێناویشیدا کاری دەکرد، زۆر رێزی شانۆی دەگرت. جارێکیان سەلام کۆیی هونەرمەند بۆی گێڕامەوە وتی: پرۆڤەی شانۆگەریی ئادابەمان هەبوو لەهۆڵی رۆشنبیری جەماوەر، هاشم دەرهێنەر بوو، بەرێکەوت رۆژێکیان هاشم درەنگ هاتە پرۆڤە، منیش پێم وت کاک هاشم تۆ دەرهێنەری و لەپرۆڤە دواکەوتی، راست نییە بێیتە ژوورە هاشم سەری چەماندەوە و داوای لێبووردنی کردو لەهۆڵەکە چووە دەرەوە و پاشان کارەکە بەشێوەیەکی ئاسایی بەرێوە چوو. لەو ساڵانەی کە هاشم لە هەولێر بوو، شانۆ نرخ و مانای تایبەتی خۆی هەبوو، کێبڕکێ هەبوو، هەندێک چاندرابوو، هەندێک راست و رەوابوو، هاشم رێگەی خۆی هەبوو بۆ ژیانی هونەری، پەیوەندی ئاسایی بوو لەگەڵ زۆربەی هونەرمەندەکانی شاری هەولێر.

هاشم لەو ماوەی لە هەولێر بوو، نەیتوانی بەباشی فێری زمانی کوردی بێت، ئەو هەمیشە بەتورکی یان بەعەرەبی یان بەتێکەڵە قسەی دەکرد، زۆر کەم بەکوردیٔ قسەی دەکرد، کە قسەشی دەکرد جارجارە تێکەڵی زمانی عەرەبی دەکرد. هاشم زۆر جار جانتای دبلۆماسی هەڵدەگرت، شیک بوو، کە لەگەڵ یەکێک قسەی کردبا زۆر باش گوێی رادەگرت و بایەخی بەقسەکانی بەرامبەری دەدا، بەدەنگی بەرز دەئاخفت.

**ئەرشیفی هاشم زەینەل لە هەولێر**

١- شانۆگەری «ئادابا» نووسینی: مەعد جبوری، وەرگێڕانی: شێرکۆ حەویزی، بەرهەمی ئامۆژگای مامۆستایانی هەولێر ساڵی ١٩٧٣.

٢- شانۆگەری «ئاوارە» نووسینی: حەمەکەریم هەورامی، بەرهەمی ئامۆژگای مامۆستایانی هەولێر ساڵی ١٩٧٤.

٣- شانۆگەری «پەشیمانی» نووسینی: نازم دڵبەند بەرهەمی ئامۆژگای مامۆستایانی هەولێر، ساڵی ١٩٧٤.

٤- شانۆگەری « نەخۆشی لەبیرچوونەوە» نووسینی: ماکس رینییە، وەرگێڕانی: شێرکۆ بێکەس بەرهەمی تیپی هونەری هەولێر، لەساڵی ١٩٧٥ نمایش کرا.

٥- شانۆگەری «کێ بەرپرسیارە» نووسینی: هۆشیار سەید ئەحمەد، بەرهەمی تیپی هونەری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٦ نمایش کراوە.

٦- شانۆگەریی «سێ چاو» نووسینی: هاشم زەینەل، وەرگێڕانی: سەعدون یونس، بەرهەمی چالاکی قوتابخانەکان لە ساڵی ١٩٧٦ نمایش کراوە.

٧- شانۆگەریی «نەخۆشی لەبیرچوونەوە» نووسینی: ماکس رینییە، وەرگێڕانی: شێرکۆ بێکەس، تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨.

٨- شانۆگەری «ودلی دێوانەو......»، نووسینی: شێرزاد عەبدولڕەحمان، بەرهەمی تیپی نەتەوایەتی، لە ساڵی ١٩٨١ نمایش کراوە.

٩- شانۆگەری «ئادابا»، نووسینی: ، مەعد جبوری، وەرگێڕانی: شێرکۆ حەویزی، بەرهەمی تیپی شانۆی رۆشنبیری، لە ساڵی ١٩٨٣ نمایش کراوە.

هاشم زەینەڵ لەو ماوەیەی لە هەولێر دەژیا، فەرمانبەر بوو لەچالاکی قوتابخانەکان، توانی «٩» بەرهەم بۆ شانۆ دەربهێنێ، زۆربەی کارەکان جوانی و رێکوپێکی پێوە دیار بوو. هاشم گەڕایەوە کەرکووک و تاوەکو ئێستا بێدەنگە، جا نازانین جارێکی دی دەگەڕێتەوە بۆ شانۆی کوردی یان بە یەکجاری ماڵئاوایکرد.

# حەمەد ئاغا مەندۆی لاوکبێژ
# ١٩٥٩-١٩٠٠

جبرائیل میکائیل هەرکی

"حەمەد کوڕی مەندۆ کوڕی ئۆمەر" لە ساڵی ١٩٠٠ لە گوندی حەسارۆک لە دایک بووە. مەندۆی باوکی لەگەڵ خێڵی بلباس بە کۆچەری ژیانی بەسەربردووە لە سەردەمی میری عوسمانیدا ناوچەی پشدەر بەجێ دێڵن و روو دەکەنە گوندی حەسارۆک و لە هەمان گوند حەمەد ئاغا لە دایک دەبێت، پاش لەدایکبوونی حەمەد، مەندۆی باوکی بار دەکات بۆ گوندی مێرخوزار لە هەمان گوند مەندۆش کۆچی دوایی دەکات، پاش مردنی مەندۆ هەمینی خێزانی مەندۆ لەگەڵ "نائیلە"ی کچی و حەمەدی کوڕی دێنە شاری هەولێر. نائیلەی خوشکی حەمەد مەندۆ، دەستێکی باڵای هەبووە لە دەرمانسازی کوردەواری، لەم رێگایەوە توانیویەتی گوزەرانی خێزانەکەی دابین بکات. خوالێخۆشبوو "مامۆستا جەلال مەلا حەسەن خۆشناو" لە کتێبی لاوکدا رووداوێکی سەیرمان بۆ باس دەکات: رۆژێک نائیلە خان بۆ کاری پزیشکی دەچێتە قەڵات، لە هەمان کاتدا ماڵێ منداڵیان دەبێت، کە چاویان بە نائیلەی رەش ئەسمەر دەکەوێ وا دەزانن شەوەیە، لە کۆڵانێکی تەسکدا نائیلە دەستگیر دەکرێت و سووژن و دەرزی لەبەر سوخمە و کەواکەی رادەکەن و بە گوریسێکی باش دەیبەستنەوە، شەو و رۆژێک نائیلە خان زیندانی دەکرێت، بۆ بەیانی لە چایخانەی عەلی فلەیح لەگەڵ حەمەد ئاغا مەندۆ و دانیشتووانی چایخانە بەسەر دەکەون بۆ قەڵات تاکو شەوە ببینن، لە رێگادا حەمەد ئاغا بە عەلی فلەیح دەڵێت: هەبێ و نەبێ ئەم شەوەیە نائیلەی خوشکمە، چونکە شەو نەگەڕاوەتەوە. کە دەگەنە ماڵەکە حەمەد ئاغا سەیری نائیلەی خوشکی دەکات و بە ماڵەکە دەڵێت: ئەمە نائیلەی خوشکمە و شەوە نییە. پاش ماندوو بوونێکی زۆر، ماڵەکە نائیلە خان ئازاد دەکەن.

حەمەد ئاغا مەندۆ، هەر لە تەمەنی منداڵیدا خولیای گۆرانی کوردی دەبێت، بە تایبەتی لاوک. شەو و رۆژ بیری دەکردەوە چۆن فێری لاوک دەبێت، لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا حەمەد ئاغا مەندۆ لە خوارووی قەڵات گوێبیستی حەیران دەبێت، باش سەرنج دەدا و بۆی روون دەبێتەوە، دەنگەکە لە شانەشینی عەلی پاشا لە قەڵات دێت، بەسەر قەڵات دەکەوێ و خۆی دەگەیەنێتە دیوەخانی عەلی پاشا، پرسیار دەکات ئەم حەیرانبێژە کێیە؟ پێی دەڵێن فەقێ سمایلی پەلکانەیە و هەردوو چاوی کوێرن. حەمەد ئاغا پەیوەندی لەگەڵ فەقێ سمایلدا پەیدا دەکات و دەبێتە دۆست و رێنیشاندەری. سێ مانگ بە شەونخوونی و ماندووبوون و خزمەتکردنی دەباتەسەر بۆ فێربوونی لاوک، لە سەردانێکی فەقێ سمایل بۆ گوندی دووسەرە لەگەڵ حەمەد ئاغا مەندۆ لە دیوەخانی حەوێز ئاغا میوان دەبن، پاش عەسرێکی درەنگ حەسۆ و حەمۆی بۆتانی دێنە هەمان گوند و هەمان دیوەخان. فەقێ سمایل بە حەمەد ئاغا مەندۆ دەڵێت: با برۆین تازە جێگامان لێرە نەما، چونکە کەسێک نەبووە لە لاوک چڕیندا شان لە شانی

حەسۆ و حەمۆ و کاوێس ئاغا بدات، بەڵام حەوێز ئاغا ڕێگایان نادات. هەرلەوێ حەمەد ئاغا پەیوەندی بە حەسۆ و حەمۆ دەمێنێتەوە، بۆ فێربوونی لاوک حەوت ساڵ حەمەد ئاغا مەندۆ لەگەڵیان دەبێت، دوای مردنی لاوکبێژ حەسۆ بۆتانی حەمەد ئاغا، حەمۆ بۆتانی لەگەڵ خۆی دێنێتە هەولێر. لەو ماوەیەدا حەمەد ئاغا مەندۆ توانیویەتی ببێتە لاوکبێژێکی بە توانا و لاوکەکانی وەک هەوراز و نشێوی چیاکانی کوردستان خۆدەنوێێن، لە وەرزی بەهاردا لاوکەکان دەمانبەنە دەشتی کۆیە و بناری دێدەوان بۆ ژێر سێبەری رەشماڵی چیغ لە بەری ڕەوەندی مەنتکان، لاوک و سەدای حەمەد ئاغا مەندۆ لەگەڵ دڵ و دەروونی مرۆڤ زۆر باش دەگونجێن و دەمانبەنەوە بۆ نێو ئاخ و ئۆفی جاران لەگەڵ مێگەلە بەرخی ڕەوەندان و هاتوچۆی شەنگە بێریان و گوێ بدەینە شمشاڵی سەرە شوان و جار بە جاریش لەگەڵ لاوکی دەروێشی عەبدی دیوەخانی عەلی پاشا لە قەڵاتی پیرە هەولێرێ لە شەواندا و بە زۆریش چایخانەی عەلی فلەیح دێتەوە یاد و بەرچاوان. ئاوێتە بوون لەگەڵ دەنگی هونەرمەندانی سەرەتای سەدەی بیستەم هیچ جارێک لە ژیانی باو باپیران دانابڕێن وەکو دەنگ و سەدای کاوێس ئاغای بلبلی کوردستان هایی هایە بریندارەکەی عەزیز ئاغا و ئاه و ناڵینی مریەم خان و حەیرانە خۆشەکانی فەقێ سمایل و هەناسە دوور و درێژەکەی حەمەد ئاغا مەندۆ وادەکەن مرۆڤی ماندوو بحەسێتەوە.

حەمەد ئاغا مەندۆ لەگەڵ لاوکبێژانی سەردەمی خۆی لە کۆمپانیای بەیزافۆن لاوکەکانی تۆمار دەکات، حەمەد ئاغا چوار لاوک تۆمار دەکات:

١- لاوکی دەروێشی عەبدی.
٢- لاوکی دەلێل.
٣- لاوکی وەرە خانم.
٤- لاوکی هەر چار کوڕێ یوسف پاشا.

ئەم چوار لاوکە هەست و گیانی مرۆڤی هونەر دۆست دێننە هەژان، حەمەد ئاغا مەندۆ لە زۆربەی دیوەخانەکانی کوردستان بە گشتی و دەشتی هەولێر بە تایبەتی لاوکی چڕیوە و بانگهێشت کراوە، وەک:

١- دیوەخانی ئاغای ئەحمەد پاشا لە گوندی قورشاغلو
٢- دیوەخانی ئەحمەد پاشا لە گوندی دۆڵە بەکرە
٣- دیوەخانی عەزیز پاشا لە گوندی عالّلا
٤- دیوەخانی حەوێز ئاغا لە گوندی دووسەرە
٥- دیوەخانی ئەحمەد حەمەدەمین ئاغا لە گوندی دووگردکان
٦- حەسەن ئاغا کەندێناوە
٧- دیوەخانی هادی ئاغا لە گوندی سەربەشاخ
٨- دیوەخانی کوێخا مستەفا شەریف شوانی لە گوندی ڕەختاوە
٩- دیوەخانی حاجی فازیل ئاغا گەردی لە گوندی جەژنیکانی گەورە
١٠- سەلیم حاجی ئاغا خەیلانی لە گوندی ئازەران، دەشتی هەریر
١١- دیوەخانی خدر ئاغا سورچی لە گوندی کەلەکێن
١٢- عەباس مامەند ئاغا لە گوندی سەرکەپکان
١٣- دیوەخانی سوار ئاغا لە گوندی سەرخمە
١٤- دیوەخانی حەوێز ئاغا لە شاری کۆیە
١٥- دیوەخانی سەعدی ئاغا لە شاری کۆیە
١٦- دیوەخانی جەمیل ئاغا لە گوندی بەحرکە
١٧- دیوەخانی مەجید ئاغا گەردی لە گوندی دێرێ
١٨- دیوەخانی مەحمود ئاغا شێخ بزێنی لە گوندی کەورگۆسک
١٩- دیوەخانی فەرحان ئاغا زراری لە گوندی خالوان
٢٠- دیوەخانی فەتاح ئاغای هەرکی لە گوندی میر ئاخوڕ
٢١- دیوەخانی نوری خورشید ئاغای هەرکی لە گوندی گەرودەلالان
٢٢- نیعمەت ئاغای هەرکی لە گوندی هەرشەم
٢٣- دیوەخانی میرانی قادر بەگ لە شاری شەقڵاوە
٢٤- دیوەخانی سلێمان بەگ لە شاری شەقڵاوە
٢٥- دیوەخانی میرانی ساڵح بەگ لە شاری شەقڵاوە
٢٦- دیوەخانی نوری باویل ئاغا لە شاری ڕەواندز

لە گەڵێ دیوەخانەکانی دیکە بەردەوام حەمەد ئاغا مەندۆ بۆ دەشتی بیتوێن و پشدەر هاتوچۆی کردووە. ئەم لاوکبێژە زۆر بە تاسەوە لاوکی چڕیوە، کاریگەرییەکی وای

لە گوێگر کردووە لە ناخی دڵەوە ئاخی بۆ هەڵکێشێت. لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا حەمەد ئاغا مەندۆ دەبێتە دەروێشی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما. حەمەد ئاغا مەندۆ لە پایزی ۱۹۵۹ دا لە شاری هەولێر لە نەخۆشخانەی کۆماری دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت، لە گۆڕستانی (چراغ) تەرمەکەی دەنێژرێت. حەمەد ئاغا مەندۆ چوار کوڕی لە دوای خۆی بەجێ دێڵێ و قەوانەکانی لەلای کوڕەکانی پارێزراون. دەقی لاوکەکان دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیز بۆ ئاشنابوون لەگەڵ ژیان و لاوکەکانی ئەم کەڵە هونەرمەندە.

**دەروێشێ عەبدی**

لێ لێ لێ لێ لێ هەی لێلێ ئەلێ خودێ من مالەکی زۆر لتە ناڤی

بەلێ من مالەکە زۆر لتە ناڤی. ئەوەل دین و ئیمان جەلە بەکی

دەڤێ، تەولەکە ئەسپان، ماینەکە ب بەز. تاژیەکی بکوژ، تفەنگەکە

لێدەر، کونەکی رەشی عەرەبی، مێکوتەکا داری ڤی، بە ناڤێ بەلێ وی کۆنی ژتەرا بەمە سەرێ چیایێ قەرەج داغێ کەلێ ئەمرووەدێ بەرێ کۆنی بدەمە نیسێ نسارێ پشتێ کۆنی دەمە تیرێژەکە رۆژی هەتاڤێ

عەودلێ دگۆ وەکە دەروێشی عەبدی دەلالێ دلێ من شەرێ گیسان و عەدوونان بەرەو ماڵ بوو. ئەزی ئێ ئێ ئێ هەرمە مالی دەروێشی عەبدی سینگێ خۆ کەمە سێنی مەمکێ خۆ کەمە فنجانی قاوێ. بەلێ رانی خۆ دائمە سەر رانی دەروێشی عەبدی ئەزی بدەمە

رامۆسانی ل رووی راستی ل روویێ چەپی ل شەرما بێتە

ئیستقبال و سەلاوێ

لۆیلۆ لۆیلۆ لۆیلۆ دەلێلێو یویویوخ

لێلێ لێلێ لێلێ بەلێ هاوینە دلێ من دێرا نا خودێ دڤێ قومەکا

ئاڤێ ژ ناڤا فرێتۆ وەزێ هەرمە عێمودی دەقۆریا عێمودی

دەقۆریا گەلەک خۆشە جزیری بۆتان ئەستوندەکا نیوێ وەلاتۆ

وەزێ تەرکا دەروێشێ عەبدی دەلالێ دلێ خۆ ناکەم حەتا

میر تەمەر پاشایی ملێ بابێ من رەبەنێ سەرێ من دێرانی داوێتە

برە شیرێ دجەلێتۆ

دەلۆیلۆ لێلۆ لۆیلۆ لۆیلۆ

**دەلێلێ**

لێلێ لێ لێ لێ هەی لێ لێ لێ دەلێیلێ یوخ

لێلێ مالێ مەدانی دەشتا سروچێ ل هەوارێ گەنگە چینێ

چاخێ عەسرێ مال مە دانا برا ڤێ بەرێ برەکێ سوارا پێشەکێ

مالان محەلێ هێوارێ دەهێنۆ بلەزینە. منێ زەینێ خۆ داێ

نالانێ مە وەرگرتینە

جل و بەرگێ وان شەمالینە بەلێ جل و بەرگێ وان شەمالینە

هێواری سێ زەریان ل دەرێ کۆنێ سەکنینە

جۆرابێ یێ وان عێمودینە. بەلێ سەر دەلنگێ وان قوتنی

قوماشێ خامەکی تەوریزینە

کراسی بەری وان کتانێ هەمەدانینە شولێ بەغدا دینە

کەمەری پشتێ وان چیکۆیێ عەرەبینە کەفەر مامزێ دەوێ گەلینە

سینگ و مەمکێ وان بەفرێ یەک شەوینە گەزی گەردەنێ

وان بووینە شووشێ بلورینە لێوی وان بووینە قەیتانێ فەردنگینە. دەلێلم واخ

بەلێ کەپێ وان چەلاکینە چاوێ وان رەشن بوینە چاوێ غەزالێ گا کیوینە

پوێ سەرێ وان رەشن قەترانینە شالێ سەری وان کەسرەوانێ

سۆرن دەورێ وان بریشینە هەرسێ زەربان مقابلی سواران
ل پێشیکا کۆنی سەکنینە بەلێ یەک و دەست داینە کولیکا
ئارموشێ حەلەبی هاوێتینە سەر تەشیەکا موشێ دباش
ب قیمەت دا ئانینە دەلیلم واخ
بەلێ وەگەر یاری من لناو زەریان و ئەسمەران و تۆرینان
ناس نەکەن بەلێ تاسی سەرێ وان زیوینە. تاسێ سەرێ
بارێ من گەلەک زێرینە یویویوخ

**هەرچار کوڕی یوسف پاشا**

وەلا جانۆ وەلا جانۆ وەلا جانۆ
ناچمە باژێرا موشێ باژێرەکا خرو خالی ئەزێ ببم خولام و خزمەتکارێ
هەرچار کوڕێ یوسف پاشا ب شلوارێ دمەر قۆپانینە
ولاخێ دبن واندا سەگلاوینە قاپ رەشێ دامەن تارینە لەوەندییێ
وان سێ بست خوار زەنگۆیێ رکێبێ سەگلاوینە
گورجی خانمێ گاز دکا خانم خاتوونێ بریا نێ مە بریانە کەزیێ مەچار
خانمان بریبانە بۆ هەرچار کوڕێ یوسف پاشا
وەلا جانۆ وەلا جانۆ
بەلێ دەستێ وان دارێ کەلەمچێ دان سوارێ کەلەکان و گەمیان کرن
ل پشتێ بورجا بەلەک بەحرێ مەزن تێ پەڕاندن بەرێ وان دانە
چیایێ ئەستەمبۆلێ
وەلا جانۆ وەلا جانۆ
منی نەدیبایە هەرچار کوڕێ یوسف پاشا بەوی حالی بەوی شولێ
بوی تەرزی دلۆ دنایێ میرا من دنایێ فەلەکێ مە خاینە
ئیمدادنی مەنایێ وەلا جانۆ

**وەرە خانم**

وەرە خانم ب عەرەبی گازکەم تەعال خانم ب کوردی
گازکەم وەرە خانم ب فارسی گازکەم بیا خانم بیا خانم
ب تورکی گازکەم گێلسن گێلسن قەرشاغمە دورسن
بسکێ خانمێ نەبوونە گولال و بەیبوون و سوسن خانم پاروی چاخی
ل مالا بابێ خودا قیت بووی قۆزاخ بوویی تەربووی تەرلان
بووی ئەو سالەکە مێرێ خۆت کرییە خانم خانم وەرە خانم
وەرە خانم لاوکێ من دانیشت سەر بەدەنێ دیار بەکرێ ئەزی رابم
جغارەکێ لۆ دەستی خانمێ ل توتنا جەوزێ دولدرمێش کەم خانم
خانم پاروی چاخێ ل مالا بابێ خودا قیت بووی قۆزاخ بووی تەربووی تەرلان بووی
ئەو سالەکە مێرێ خۆت کردییە خانم
بەلێ خانم باریکە چاوەکت هەر ل من خانم خانم خانم یویویوخ
وەرە خانم وەرە خانم بەرێ مالا ب کزنە پشتێ مالا ب کزنە
زەندێ خانمێ پڕ کارەبا و دلم جان و بازنە. وەرە خانم تو حەفت
مال و میرا بکەی باریکە چاوەکت بەلێ هەر لە منە خانم وەرە خانم
وەرە خانم قەزاو بەلا یاندم خانم وەرە

سەرچاوەکان
١- کتێبی لاوک، جەلال حەسەن خۆشناو.
٢- حاجی ئەسعەد شاهین هەرکی.
٣- حاجی عەرەب مامایس هەرکی لاوکبێژ.
٤- حاجی پیرۆ هەرکی لاوکبێژ.
٥- کاسێتی تۆمارکراوی لاوکبێژ حەمەد ئاغا مەندۆ.
* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ١٤، ٢٠٠٥ بلاوکراوەتەوە.

# حاجی عەبدوڵڵای دەفژەن
# (١٩٠٢-١٩٦٣)

**جەلال خدر**

لەم سەرەتای هەزارەی سێیەمە، لە وڵاتە ئارام و پێشکەوتووەکان، خەڵک هەریەکە و بە جۆرێک بیر لە گەشت و گوزار و سەفەر دەکاتەوە، زاناکان ئێستا بیر لەوە دەکەنەوە کە گەشتی سەر مانگ و ئەستێرە و هەسارەکان درێژە پێبدەن، هەندێکیش بیر لەوە دەکەنەوە سەفەر بۆ بن دەریاکان و زەریاکان بکەن و هەر دوولا بە دوای نهێنی و زانستی تازەدا دەگەڕێن،

مرۆڤێکی سادە و ساویلکە و خێرلەخۆنەدیوی وەکو ئێمە مانانیش دەبێ چی بڵێت و بیر لە چی بکاتەوە و گەشتوگوزار بۆ کام لا بکات (لەکاتی نووسینەوەی ئەو چەند دێڕانەو دوای سڕینەوەی فرمێسکی چاو) منیش پڕ بەدڵ بیرم لەوە دەکردەوە، کەوا گەشتێکی سەرپێیی بە ناو کووچەو کۆڵانەکانی ئەو پیرە هەولێرەدا بکەم. خانووە کۆنەکانی قەڵاتێ و گەڕەکی خانەقاو کۆڵانی بەلووعەو گۆمەپیس و تەعجیل و سەعدووناوە بەسەر بکەمەوەو یادگارە خۆشەکانی سەردەمی منداڵی بۆ ماوەی چل ساڵێک بگەڕێنمە



دواوە و تەمەنای ئەو ڕۆژە بکەم، کە ئەو سەردەمە زێڕینە وەکو شریتێکی سینەمایی دووبارە بگەڕێتە دواوە بەکراسێکی سنگ واڵا و شەڕواڵێکی سپی قەمەندۆر، کە لەلای "مام یاسینی خەمچی" لە ناو کەونە مەنجەڵی خەمدا ڕەنگی مۆری هەڵگرتبێ و یان عەمبارە سۆتەکەی "مام فەقێ مرادم" لەبەر کردبێ و بەسەری کوت و پێخواس لەگەڵ لێخوڕینی عارەبانەی ڕەو ڕەوەی داری

"مام حاجی" و "ئومێدی نەجار".. یان گرە گری هاژوانی لۆرییە سفەیفەکەی "مام ئەسوودی چەخماخچی"، کە بۆمانی دروست دەکرد..

کوڕینە: چەند خۆشە بۆ گەشتێکی سەردەمی منداڵی (سەردەمی بەرائەت) بەناو قوڕو چڵپاوی کۆڵانەکانی گەڕەکی تەعجیل و سەعدووناوە خول بخۆین و ڕۆژانەش چوار عانە خەرج بکەین و.. بگرە هەر لە سیفۆن و لەگلەگ و شەعرولبەنات و بەرماغلی و پەندرلی پیتۆ و فاتەڕەشە"و عەسیر بخۆین و خۆشمان بەمەلیک فەیسەڵی گچکە بزانین و لەکاتی هاتنی (مام سەید زەکی) بەخۆی و جەنتای دەستی بۆ خەتەنە کردن یان (مام خدر وادی) بەخۆی و شورنقای دەستی دەرزی لێدان و کوتان... هەر یەکە بەلایەکدا تێی بتەقێنین و ڕابکەین و کەسیش نەبێتە برای کەس. ژیانی سەردەمی منداڵی ئەوەندە خۆشە کە تام و چێژی هەتا هەتایێ نە لەبیرمان دەچێتەوە نەجارێکی تریش دەیبینینەوە و لێرەدا شتێکم بەبیر هاتەوە.. هەر لە

سەردەمی منداڵییەوە پێم خۆش بوو لەبارەی مەقامزان و مەولوود خوێنێکی ئەو شارەتان بۆ باس بکەم، کە بەچاوی خۆم بینیم و بەگوێی خۆم گوێم لەدەنگی ناسک و زوڵاڵەکەی بوو، کە بەڕاستی جێگای سەرسوڕمان بوو. وەک بلبلی بەهار دەیچریکاند و شیعرە بەسۆزەکانی (کاکی هیرانی و وەفایی) وەک بڵێسەی ئاگر لەهەناوی هەڵدەقوڵاو لەستایشی پێغەمبەری مەزن و موناجات و مەقامات و قۆریات-دا لەو سەردەمەی من باسی دەکەم، بێ هاوتا بوو و خەڵکی بەتەواوی سەرسام دەکرد- کاتێک کە دەفی لێدەدا وات دەزانی زیاتر لە دە کەسن دەف لێ دەدەن قوڕ قوڕاگەیەکی پاک و خاوێن لە قەرارو جەواب هیچ عەیبی نەبوو.. کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی وەک یەک دەخوێند، هەرچەندەش باسی ئەو بلیمەتە بکەم تەواو نابێ.

شەوێک لە شەوەکانی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٦٣) لە گەڕەکی سەعدوناوە و کۆڵانی کوورەچییان مەولوودێ دەخوێنرا خەڵکێکی زۆر لە سەربانی ماڵێک دانیشتبوون و گوێیان بۆ مەولوودییەکە شل کردبوو بەتەواویش لەبیرم نەماوە لەماڵی (حاجی شەهابی کوورەچی یان ماڵی مام عەزەددین کوورەچی) یان ماڵێکی تر بوو. ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوێکی بە کەواو سەڵتەو جەمەدانییەکی قیتی لەسەری خۆی نابوو (تەمەنیشی لە شێست ساڵی ڕەتی دابوو، چەفییە زەردە حاجییانەکەی لەناو قەدی ئاڵاندبوو لەبەر چاوی من نەختێک لاوازی باڵا بەرز دیار بوو، کە هاتە ناو مەجلیسەکە دوای سڵاوکردن جەماعەتەکەش هەموویان لەبەری هەڵسانەوە. ئەویش لە ناوەڕاستی کۆڕەکە چوارمەشقی لێی دانیشت، هەندێکیان بەخێرهاتنیان لێ کرد (مام سەمەدی کوورەچی) هونەرمەندو دەنگخۆش لە سووچێکەوە دانیشتبوو هاواری کرد "حاجی عەبۆ خۆش گالدو". قەنداوێکی شیرینیان لە بەردەمی داناو ئەویش چەند فرێکی لێداو لەپاشان دەفەکەی بەدەستەوە گرت و دەستی پێ کرد، ئەمما چۆن دەست پێکردنێک. لەپەنای دەفەکەوە دەنگێکی ناسک و خۆش وەکو بای نەسیم بەبنا گوێمدا هات و بەدەم خوێندنی مەقامات دەستی پێ کردو گوتی "جانی مەی.. ئەی دەدەی داد ئەمە نەمان.. جانی مەی" و بۆی هەڵسا ئەوشەوە دنیای خرۆشاندو ئەو خەڵکە حازر بووەی بەجارێ مەست و سەرسام کردبوو، ناوە ناوەش جەماعەتەکەی کە لەگەڵیدا بوون، وەکو، سەید ئیسماعیل و پاپخە کۆر و مام موتتەلیب و مام یەحیای حەمامچی و تنقشە و سۆفی حەمک و خێڵە و دەروێش ئەحمەد و هی تریش بۆیان دەگێڕایەوە. کاتێک سەری دەهێنایە خوارەوە ئەوەندە نەدەما لووتی لەزەوی بدات، کە سەریشی بەرز دەکردەوە بەمەقامی (دەشتی فارسی) و (بەیات) و (مەسنەوی) و (شوور) و (موحەیەر) تێی هەڵدەکرد. وەک زایەڵە و زەنگ دەنگی لێوە دەهات (دەنگی لە شێوەی دەنگی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی دەکرد)، بەڵام لە هی ئەو خۆشترو بەتامتر بوو. تا شەوێکی درەنگ مەولوودییەکە بەردەوام بوو. خۆشییەکەی لەوەدا بوو ئەوەی دادەنیشت هەڵنەدەستایەوە. ئەمە شەوێک بوو لەشەوەکانی ئەو دەنگخۆشە بلیمەتە. مەگەر هەر خواش بەخۆی بزانێ لە شەوەکانی تردا چیی کردووە. لەدواتر زانیم ئەمە "حاجی عەبدوڵڵای دەفژەنە".

زۆری پێ نەچوو لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانی پیرۆزی ئەو ساڵەی، کە باسم کرد، موسڵمانان جەژنانە و دەست لەملانێ و گەردەن ئازادی و لێبووردن لەیەکتری دەکەن ئەو بلیمەتەش لەجیاتی جەژنانە و گەردەن ئازادی دەست لەملی مردن دەکا و بەهەموو ئاه و کەسەرێکەوە بەغەریبی و کەسادی و ماڵوێرانی بارو بارگەی خۆی دەخاتە سەر ملی و خواحافیزی لەخزم و دۆست و کەس و کاری دەکاو بەزگی برسییەتی سەر دەنێتەوە.

### ژیاننامەی حاجی عەبدوڵڵا

حاجی عەبدوڵڵای مەقامزان و دەفژەنی کوڕی خەلیفە یوونسی نانەوای کوڕی دەروێش قادری خۆشناوە. ساڵی (١٩٠٢) لەگەڕەکی عارەبان، کۆڵانی کلیسە لە شاری هەولێر لەدایک بووە. دایکیشی ناوی زولێخەی کچی مام قادری کاروانچی-ی کوڕی وەستا حوسەینی شنۆییە، کە دەکاتە خوشکی (عەلی کۆری) مەقامزان و مەولوود خوێنی بەناوبانگ.

وەکو دەگێڕنەوە، خەلیفە یوونسی

باوکی حاجی عەبدوڵلا چەندین ژنی هێناوە، چونکە بەئیشی نانەوایی خەریک بووە، بۆ ئەو مەبەستەش لەهەر ماڵێک تەندوورێکی نانی دروست کردووە و نەوەی گەلێک زۆر بووە و.. لەخاتوو زولەیخای ژنی ئەم منداڵانەی لێکەوتووە:

١- مەلا قادر... ئەم کوڕەی بەگەنجی کۆچی دوایی کرد و نەوەی نییە.

٢- مەلا ساڵح.. ئەمەش دەنگی زۆر خۆش و دەفژەنێکی چاک بووە، ساڵی (١٩٤٤) چۆتە شاری نەجەف و لەوێ نیشتەجێ بووە، هەر لەوێش بەخاک سپێردراوە، تاقە کچێکی لەپاش خۆی بەجێ هێشتووە، لە بەرگی سێیەمی کتێبی (مەقام ناس و دەنگخۆشەکانی شاری هەولێر) بەتێروتەسەلی ژیاننامەی ئەو دەنگخۆشەمان نووسیوەتەوە.

٣- دەرویش ئەحمەد: ئەمەش لەگەڵ حاجی عەبدوڵلای دەفژەنی برای بەشداریی لە مەولوودی پێغەمبەر دەکرد. دوو کوڕی لەدوای خۆی جێ هێشتووە کە (مەحموود و جومعە).

٤- حاجی عەبدوڵلای دەفژەن.. ئەمەش دوو کوڕی لەپاش خۆی جێ هێشتووە (سالارو محەمەد).

٥- مام موتتەلیب.. ئەمەش بەشداریی لە مەولوودی پێغەمبەر دەکرد، دەفی لێدەدا سێ کوڕی لێ بەجێماوە، (ئیبراهیم و خەلیل و جەلیل).

حاجی عەبدوڵلا لە منداڵییەوە دەخرێتە بەر خوێندنی قورئانی پیرۆز و لەلای مامۆستا مەلا محەمەدی دێرەبرۆشەیی دەست بەخوێندن دەکات. لەدوای خوێندنی جزء عەممەو تەبارەک و لەپاشان ڕوو لەمزگەوتی شێخی چۆلی دەکاو لەلای مامۆستا مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا محەمەد ئەمینی بێتواتەیی دەخوێنێ. و هەروەها کتێبی نەحوو سەرفیش لەلای مامۆستا ئەلیاس ئەفەندی تەواودەکات. لەپاشان واز لەخوێندن دەهێنێ و دەست بەئیشی نانەوایی دەکات..

ساڵی (١٩٢٣) کاتێک عەلیی کوڕی خاڵی حاجی عەبدوڵلا جەماعەتێک پێک دەهێنێ بۆ خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر لەو شارەدا، چەند کەسێکی دەنگخۆش و دەفژەن لەخۆی کۆدەکاتەوە، وەکو: دەرویش مچۆڵ و مەلا نادری بۆستانچی و دەرویش ڕەمەزانی سولەیمان و سەید محێدینی سەید خەنجەر و مەلا ساڵح و حاجی عەبدوڵلا و سەید ئیبراهیمی بەرزنجی و کەسانی تریش. لەبەر ئەوەی حاجی عەبدوڵلا دەنگی خۆش بووە لەو مەیدانەدا ناوبانگ دەردەکات. لە هەمان کاتیشدا عەلی کۆر بایەخێکی تەواوی پێ دەدات، چونکە دەیزانی پاشەڕۆژێکی باشی هەیە.

حاجی عەبدوڵلا ساڵی (١٩٣١) دەبێتە پۆلیس و چەندین ناوچەی کوردستان، وەکو شەقلاوەو ڕەواندز و مێرگەسۆرو دیانە گەڕاوە و دوا قۆناغیش ناحیەی هەریر بووە. ساڵی (١٩٣٦) لە پۆلیسی فەسڵ دەکرێ. سەبارەت بەفەسڵ کردنەکەش شێخ عەبدولکەریمی موختاری گەڕەکی عارەبان بۆی گێڕامەوە گوتی: "شەوێک لە شەوان حاجی عەبدوڵلا بەشداریی لە مەولوود دەکاو ئاگای لەخۆی نامێنێ جەماعەتێک تفەنگەکەی لێ دەدزن و بۆی دەردەچن و مام حاجی تووشی گرتن و تەحقیقکاری دەبێ.

عەلی کۆری خاڵیشی پەنا بۆ مەلا ئەفەندی (مەلا گچکە) دەبا، ئەویش کێشەکەی بۆ چارەسەر دەکاو لەئەنجامدا شەش مانگ دەگیرێ لەپاشان لەپۆلیسی فەسڵ دەکرێ و دەگەڕێتەوە هەولێر.

ساڵی (١٩٣٨) کاتێک کە عەلی کۆر کۆچی دوایی دەکا، جەماعەتەکەی دەبنە دوو بەش بەشێکیان لەگەڵ حاجی عەبدوڵلا دەکەون، وەکو: (موتتەلیب و پاپخەکۆرو دەرویش ئەحمەدو هی تریش)، جەماعەتەکەی دیکە پێکهاتبوون لە(مەلا نادری بێستانچی و دەرویش مچۆڵ و سۆفی حەمک و سەید ئیبراهیمی بەرزنجی و هی تریش).

مامۆستا جەوەدت ئەحمەد ناجی سەبارەت بەشداری کردنی حاجی عەبدوڵلای دەفژەن لەڕاپەڕینی ڕەشید عالی گەیلانی ساڵی (١٩٤١) بۆی گێڕامەوە گوتی: لەدووکانی سەید عەباسی جگەرە فرۆشی خزمم دانیشتبووم ڕاپەڕینی ڕەشید عالی تازە دەستی پێکردبوو و لەهەمان کاتیشدا خەڵکی هەولێر دوو بەش بوون. بەشێکیان پشتگیریی ئەڵمانیای نازی دەکرد، بەشەکەی تری پشتگیریی مەلیک فەیسەڵ بوون. بەچاوی خۆم بینیم حاجی

عەبدوڵلا لەو ڕاپەڕینەدا بەشداریی کردبوو، لەناوەڕاستی ڕێگادا پەڕۆیەکی سوری لەقوڵی ڕاستەی پێچابوو، خەڵکی ڕێک دەخست بۆ بەرەنگاربوون لەدژی ئینگلیز.

حاجی عەبدوڵلا لەماوەی ژیانی تاوەکو مردنی دوو ژنی هێناوە، تاوەکو ئێستاش بۆمان روون نەبۆتەوە ژنی یەکەمی لەچ ساڵێک هێناوە، کە ناوی (دروسن خان) بووە، لەم ژنەی دوو کچی لەپاش بەجێماوە، بەڵام ژنی دووەمی کە ناوی (ئامینەخانی کچی دەروێش عەزیزی بێشەیی) بووە، لەدەوروبەری ساڵی (١٩٤٧)دا هێناویەتی.

سەبارەت بەژنی دووەمی (شێخ جونەیدی کوڕی شێخ مستەفای کاکی هیرانی) بۆی گێڕامەوە گوتی: "حاجی عەبۆ"، دەروێش و موریدی باوکم بوو. ماوەیەکی زۆریش لەخزمەتی ئەودا شان بەشانی "دیوانە خدر و دەروێش مستەفای هیرانی" مەولوودی پێغەمبەری دەخوێند، شیعرە بەسۆزەکانی (کاکی) بەسۆزەوە دەچڕی و پایەیەکی تایبەتی هەبوو لە بارەی ژنی دووەمی پێم خۆشبوو شتێکت بۆ بگێڕمەوە.

ساڵی (١٩٤٧) حاجی عەبۆ بەمیوانی هاتە لای (شێخ عەلی)، کە برا گەورەو پۆست نشینی باوکم بوو، داوای لێ کرد غەزەلێکی بەو دەنگە ناسک و زوڵاڵەوە بۆ بخوێنێ. ئەویش خۆی مات کردو دەنگی لێوە نەهات. کاکیشم پرسیاری لێ کرد ئەویش گوتی: تاوەکو ئامینەی کچی دەروێش عەزیزم بۆ نەخوازی دەنگم لێوە نایەت، ئەویش ناچار بوو بەدوای دەروێش عەزیزی نارد، ئەویش خوا قبووڵ ناکات دڵی کاکی نەشکاند و کچەکەی خۆی پێشکەش کرد. حاجی عەبدوڵلا لەو ژنەی دوو کوڕو دوو کچی لەپاش خۆی جێ هێشتووە". شێخ جونەید بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی گوتی.. جارێکیان لەگەڵ مەلا کاکەو حاجی عەبدوڵلا چووینە مزگەوتی شێخ ئەڵلا بۆ نوێژی عەسر. پاش تەواوبوونی نوێژەکە مامۆستا مەلا عەلی گچکەی (ئیمام و خەتیبی) مزگەوت گوتی: "هەر کەسێک لەڕێگایەکدا بەردێک لاببات لەڕۆژی قیامەت خوا پاداشتی دەداتەوە بۆی بەخێر دەنووسرێ". لەپاشان هاتینە دەرەوە لەنزیک سینەمای حەمرا بەردێکی گەورە لەسەر ڕێگاکەدا بوو، حاجی عەبدوڵلا قسەکانی مامۆستا مەلا عەلی لەمێشکدا بوو گوتی واچاکە ئەو بەردە فڕێ بدەم خوا پاداشتم دەداتەوە.. کاتێک ویستی بەردە زلەکە بەرز بکاتەوە لەناکاو لاقی هەڵخلیسکاو پشتاو پشت کەوتە خوارەوەو لاقی لە جێ چوو، بۆ ماوەی سێ ڕۆژیش لەماڵەوە کەوت و دەیگوت: "من جارێکی تر ئەو نەوعە خێرانە ناکەم"

ساڵی (١٩٦١) ماڵی ئاغای واحید بەگی (خوارزامان) لەگەڕەکی تەعجیل بوو زۆر شەو وارێک دەکەوت من و کاکە مەلاو شێخ غەوسە لەماڵیان میوان دەبووین. لەهەمان کاتیشدا بەدوای حاجی عەبدوڵلاماندا دەناردو کۆڕ وبەزمی مەقامات گەرم دەبوو، کاکە مەلا دیوانی کاکی لەلا بوو، هەموو جارێک پێنج شیعری کاکی هەڵدەبژارد و ئەویش بەدەف لێدان بەدەم خوێندنی مەقامات بۆی هەڵدەستا هەر شەوێکیشی (یەک) دیناری وەردەگرت. دیوانی باوکی بەتەواوی لەبەر کردبوو.

مامۆستا ڕەشاد ئەفەندی موفتی گێڕایەوە گوتی: "حاجی عەبدوڵلا بەڕاستی دەنگی زۆر خۆش بوو، بەبەردەوامی هاتوچۆی مزگەوتی قەڵای دەکرد، مەولوودی پێغەمبەری دەخوێند، لەکاتی خوێدا لە عەلی کوڕی خالی فێر ببوو. لەلای کاکی هیرانیدا ڕێزی تایبەتی خۆی هەبووە، شیعرە بەسۆزەکانی "کاکی"ی زۆر بەجوانی دەخوێند. هەموو ساڵێک کە مانگی ڕەمەزان دادەهات شەوانە حاجی عەبدوڵلا بەخۆی و دەفەکەی لەلامان میوان دەبوو. بەتایبەتی دوای نوێژی تەراویح، داوام لێ دەکرد شیعرو قەسیدە لە ستایشی پێغەمبەری مەزن بخوێنێ. ئەویش دەفەکەی بەدەستەوە دەگرت و دەستی پێ دەکرد. مووچەی شەوانەشی یەک چارەگە دینار بوو، کاتێک کە پارەکەی دەخستە گیرفانی دەیگوت: "ڕزقی ئەمشەوە خوا دای و پارەی یەک مریشکی ڕەشمان وەرگرت خوا کەریمە بۆ بەیانی" لەلایەکی تریشەوە مامۆستا عوسمانی ڕەشاد ئەفەندی بۆی گێڕامەوە گوتی: (حاجی عەبدوڵلا ئەو مەولوودنامانەی باوکی بەو دەنگە ناسک و زوڵاڵەیەوە دەچڕاند و بۆ باوکی لەسەر کاسێت تۆمار کردووە، تاوەکو ئێستاش لە ئەرشیفەکەماندا پارێزراوە").

لەسەر زمانی مامۆستا مەلا مەسعوودی بێبەشی شاعیر و مەقامزان و دەنگخۆشی شاری هەولێر دەگێڕینەوە دەڵێ: "لەسەرەتای سالانی پەنجایەکاندا مالمان لەگەڕەکی تەعجیل بوو، مالی شێخ فەتاحی موفتیش جیرانمان بوون. شەوانە بەیەکەوە ڕامان دەبوارد. کە دڵیشمان نارەحەت دەبوو، بەدوای حاجی عەبدوڵلای دەفژەنماندا دەنارد، بەتایبەتی شەوانی دووشەممە و پێنج شەممە، ئەگەر مەولوودی نەبوایە لەلامان میوان دەبوو (مەحموود زامدار)ی برام ئەو کاتە منداڵ بوو. بەدوای "حاجی"دا دەچوو، ماڵیشیان لە گەڕەکی عارەبان (کۆڵانەکەی بەرامبەر باتەی ئێستا بوو). ئەویش خۆی و دەفەکەی دەهات و دەستی پێ دەکرد، بەو دەنگە خۆشەی دنیای دەهێنایە جۆش و خرۆش دەرو جیران هەمووی لەسەرمان کۆ دەبوودەوە. من و شێخ فەتاحیش ناوە ناوە مەقامات و قۆریاتی تورکیمان لەگەڵ دەچراند..!! )"شێخ فەتاحی موفتی لە دانیشتنێکی تایبەت لەماڵیاندا بۆی گێڕامەوە گوتی: "ساڵی (١٩٥١) لەبن قەڵات لە نزیک بەنزینخانەی کۆن دووکانی پایسکلچیاتیم هەبوو. خۆم ماتۆڕم لێدەخوڕی. هەر وەختێ دڵم بگوشرابایە بەدوای حاجی عەبدوڵلای دەفژەنم دەنارد. ئەویش بەخۆیی و دەفەکەی لەپشتەوەی ماتۆڕەکە سوار دەبوو دەچووینە سەر ئاوی (میفتاح) لەوێ مام حاجی بەخۆی و دەنگە زولاڵەکەیەوە دەستی پێ دەکرد، شیعر و مەقامات و قۆریاتە بەتامەکانی دەچراند، منیش تنۆک تنۆک فرمێسک بەچاومدا دەهاتە خوارێ".

سەید سەعیدی دامرچی (١٩٢٥ هەولێر) هونەرمەند و دەنگخۆشی شاری هەولێر بۆی گێڕامەوە گوتی: "حاجی عەبدوڵلا دۆستی نزیکی من بوو. لەهەمان کاتیشدا حەزی بەدەنگی من دەکرد. هەموو جارێک لەکاتی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر منی لەتەنیشت خۆی دادەناو داوای لێ دەکردم شتێکی بۆ بخوێنم، منیش دڵی حاجیم نەدەشکاند چەند بەندێک لە (کەرەمم) بۆ دەخوێند، کە بشی زانیایە من شەرم دەکەم دەفەکەی لەمن دەکردە پەنا".

سەید ئیسماعیلی مەولوود خوێن و دەنگخۆشی شاری هەولێر بۆی گێڕامەوە گوتی: "من لەکاتی خۆیدا لەبن دەستی حاجی عەبدوڵلای دەفژەن فێری خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر بووم،.. چاکەو پیاوەتیی زۆری بەسەر منەوە هەبووە، بەبەردەوامی لەگەڵ تاخمەکەی ئەودا کارم کردووە، شان بەشانی ئەو مامۆستایە دەنگم هەڵێناوە. پاپخە کۆرو موتەلیب و دەروێش ئەحمەدو مام یەحیای حەمامچی و خێلەو تنقشەو هی تریشمان لەگەڵدا بوون".

ئەمەو لەلایەکی تریشەوە مامۆستا محەممەدی کوڕی حاجی عەبدوڵلای دەفژەن سەبارەت بەنهێنییەکانی ژیاننامەی باوکی بۆی گێڕامەوە گوتی: ".. باوکم یەکێک بووە لەمەقامزان و مەولوود خوێنە بەناوبانگەکانی کوردستان. جگە لەخوێندنەوەی مەولوودی شاعیریش بووە، نازناوی (ئارامی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە و چەندین شیعری بەسۆزی لەستایشی پێغەمبەری مەزن داناوە. لە کاتی خوێندنەوەی مەولوودی گوتوویەتی و هەروەها دەفتەرێکی گەورەی پڕ لەشیعری هەبووە، بەڵام پاش مردنی کەس نەیزانیوە چیی بەسەرهات، گەلێک شیعری تەخمیس کراوی هەبووە، دۆستی نزیکی مامۆستا ڕەشاد ئەفەندی موفتی و شێخ فەتاحی برای و مەلا مەسعوودی بێبەش و حاجی فایقی محەممەد سوڵتانی بازرگان و حاجی جەمیلی قاپقاپچی و مەلا نادری سەعاتچی و سۆفی حەمک دەروێش مچوڵ، سەید ئیبراهیمی بەرزنجی و مەلا سابیری یابە و کەسانی دیکە بووە. بە بەردەوامی هاتوچۆی تەکیە و مزگەوتەکانی دەکرد لەلای مەلا ئەفەندی و کاکی هیرانی ڕێزی تایبەتی خۆی هەبووەو دۆستی نزیکی شێخ جەلالی شێخ جەمیل ئەفەندی خانەقا بووە، شیعریان بەیەکەوە داناوە. هەروەها چەندین جار (مەلا مەحموودی بێخود)ی شاعیر لەشاری سولەیمانییەوە دەهات کە خاڵی مامۆستا ڕەمزی مەلا مارف بوو کە ئەو کاتەش لەهەولێر (مەئموور ماڵ) بووە.. لای ئەو میوان دەبوو، بەدوای باوکمیاندا دەنارد بۆ ئەوەی شتێک بخوێنێ. ئەویش کۆڕو مەجلیسی گەرم دەکرد خەڵکی لەدەوری کۆ دەبوونەوە تاوەکو بەرەبەیانی دەنگی لێوە دەهات.."

* * *

حاجی عەبدوڵلا ساڵی

(١٩٧٥) بەمـوئەززین لەمـزگـەوتی (ئاڵتـی بەرمـــاغ) دادەمــــەزرێ. لەماوەی ژیانیشیدا زۆر دەست كورت و بێ دەرامـەت بووە، خـوێندنەوەی مـــەولوودیش ئەو كـــاتە لە دینارو نیـــــــوێـك زیاتـر نەبووە، دوای دابەشكردنی ئەو پارەیە سێ چوار درهەمی بۆ دەمایەوە؟

مـــەلا نوورەددین ئەڵڵا وێردیی بەقاڵ بۆی گێڕامەوە گوتی: "حاجی عـەبدوڵڵا زۆر دەسـتی كـورت بوو، خــــەڵكی ئەو شــــارەش بەزۆری یارمەتییان دەداو زۆر جاریش وارێك دەكەوت لەكاتی خوێندنەوەی مەولوود ئەگەر بیزانیایە كەسێك بەتەمایە مـەولوود بكات، ئەویش پێـشـــینە پارەی لێ وەردەگرت، ئەو دەنگخۆشە ژیانی بەهەژاری و دەستكورتی بەسەر برد." هەروەها وەسـتـا عـوسـمـانی قـاورمـەچی (هونەر دۆسـتی شـاری هەولێــر) بۆی گــێــڕامــەوە گــوتی: "دوكـانمان لە تەنیـشـت مـزگـەوتی (ئاڵتی بەرمـاغ) بوو، جـارێكیـان حاجی عەبدوڵڵا لەدوای نوێژی عەسر لە مــزگــەوت هاتە دەرەوە دەســتی ڕاسـتەی خستە سەر شانم" و گوتی: "عوسمان قسەیەكت بۆ دەگێڕمەوە.. لەكـاتی خـۆیدا كـاكی هیـرانی پێی گوتم حاجی عەبۆ تۆ تاوەكو مردن تێر نان ناخـۆی، لەئاخـیری تەمـەنیـشت لەبرسـان دەمری" وادیارە قـسـەكـانی ڕاست دەرچوو.

حاجی عـەبدوڵڵا لەدوا تەمـەنی ژیانیـدا تووشی نەخـۆشی هات و بۆ ماوەیەك لەماڵەوە كەوت. سەبارەت بەنەخـۆشـیـیـەكـەش شـێـخ جونەید گێڕایەوە گوتی: حاجی عەبۆ لەماڵەوە نەخـۆش كـەوتبـوو بەدوایدا ناردم و لەهەمـان كـاتیـشـدا داوای (مـێـوژی ڕەش)ی لێ كـردم.. منیش هەڵـســام دوو كیلۆ مێـوژە ڕەشەی خۆشناوەتیم بـۆ بـرد. هـەنـدەی پـێ نـەچـوو ئـەو مـەولوود خوێن و دەنگخۆشە كۆچی دوایی كـرد.. ئەمـەو لەلایەكی تردەوە شێخ فـەرهادی كـوڕی شێخ یووسـفی نەقشـبـەندی بۆی گـێـڕامـەوە گـوتی: "حـاجی عـەبدوڵڵا دۆسـتـی نزیـكی باوكم بووە، زۆرجار دەهاتە مزگـەوتی خـــانەقـــاو بەو دەنگە خـــۆش و زولاڵەكەیەوە مەولوودی لە ستـایشی پێـغـەمـبـەری مـەزن دەخـوێـندەوە، بەتایبەتی (شـیـعری) لە باخان ئاه و نـاڵـین دێ..) بـەدەنـگـە نـاسـك و زولاڵەكەی دەیچڕی.. لەدوا تەمەنی ژیانیـدا نەخـۆش كـەوت، بەبیـرم دێ لەمـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٩٦٣) حـاجی هاتە خزمـەتی باوكم و شـێخ جەلالی شێخ جەمیل ئەفەندیش لەوێ ئامـادە بوو.. ئەویش غـەمگین دیار بوو، ڕووی لە باوكم كـرد گـوتی: زۆر نەخـۆشم و پێـویسـتم بەعـەمـەلیـات هـەیـە... زۆریـش دەتـرسـم لـەو عـەمـەلیـاتە دەرنەچم.. لەپاشـان هەر ئەو ساڵە بوو ماڵئاوایی لێ كردین"

حـاجی عـەبدوڵڵا بۆ مـاوەیەكی كەم لەماڵەوە كەوت و لەپاشان مەرگ مـەودای نەداو لەسـەعـات (شـەش و بیـسـت و پێنج) دەقـیـقـەی سـەر لەبەیانیی ڕۆژی هەینی، یەكـەم ڕۆژی جـەژنی قـوربانی پیـرۆز (حـەجج ئەكبـەر)ی (١١) مـانگی زولحـجەی سـاڵی (١٣٨٢)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٩٦٣) لە مـاڵەكـەی خـۆیدا دڵە گەورەكەی لەلێدان كەوت و لەتەمەنی (٦١) سـاڵـیدا مـاڵـئاوایی لەخزم و كـەس و دۆست و برادەرانی دەكـات، هەر ئەو ڕۆژەش بەدەف و عــەلەم لە گۆڕستـانی (ئیمام محەمەد) لەشاری هەولێر بەخاك سپێردرا.

مـــردنی ئەو مـــەقــامـــزان و مـــەولوودخـــوێن و دەنگخـــۆشــە خەسارەتێكی گـەورە بوو لە هونەری مـەقامـات و خـوێندنەوەی مـەولوودی پێغەمبەرو قوریات لەو شارە كەوت. خۆشبەختـانە لەپاش مردنی چەندین كاسێتی تۆماركراوی بەدەنگی خۆی بۆمــانی جێ هێـشــتــووە. كـەوا لەئەرشیفی تۆمارگای خوالێخۆشبوو (كاك لەتیفی چەخماخچی و وەستا پیربال) و خەڵكانی دیكە پارێزراون. هەروەها چەندین كاسێتی دیكەی، كە (ئێـمـە نەمـانبیـسـتـووە) لە تەكـیـەو مـزگـەوت و دیوەخـانەكـانی مـاڵە گەورەكانی ئەو شارەدا تۆمار كراوە..

سـەرچاوەكان:

* وریا ئەحـمـەد، حـاجی عـەبدوڵڵای دەفژەن، گـۆڤـاری كـاروان، ژمـارە، ٣١ی نیـســانی، ١٩٨٥، لاپەڕە ٥٨.
* جـەلال خـدر، حـاجی عـەبدوڵڵای مـەقـامـزان و دەفـژەن، گـۆڤـاری هەولێـر، ژمـارە، ٧ لە هاوینی، ٢٠٠٠.
* مـەقـامناس و دەنگخـۆشـەكـانی شـاری هەولێر، بەرگی سـێـیـەم، كـورە هەولێـرییـەك، داینـاوە، دەستنووس.

# حاجی جەمیلی قاپقاپچی
# ١٩٠٤-١٩٩٦

جەلال خدر

مەولوود خوێن و دەنگخۆش و قۆریاتبێژی شاری هەولێر حاجی جەمیلی قاپقاپچی کوڕی حاجی ئیبراهیمی کوڕی حاجی محەممەدە.

سەبارەت بە بنەماڵەو عەشیرەتی ئەو دەنگخۆشە، باپیری بە ئەسڵ خەڵکی گوندەکانی دەشتی هەولێرە و لە عەشیرەتی (بن دیانە)، لە کاتی خۆیدا لەسەر زەوی و زارو میرات لەگەڵ برایەکانی ناکۆکی پەیدا دەبێ و لە پاشان لەگەڵ ماڵ و منداڵی دەشتی دزەییاتی بەجێ دەهێڵێ روو لە شاری هەولێر دەکات، لە قەڵاتێ نیشتەجێ دەبێت و نەوەی لێ دەکەوێتەوە.

مام حاجی جەمیل بەر لەمردنیشی بە بەردەوامی هاتوچۆی ماڵیانم دەکرد و ئەحواڵیم دەپرسی، جارێکیان لەگەڵ مام سەید عەبدوڵڵای قورئان خوێن و موئەزینی مزگەوتی (مەلا تەها) لە ماڵیان دانیشتبووین هەمان باسی بنەماڵەکەی خۆی بۆ کردین، ئەوەی شایانی باس کردنە، کاک جەمالی کوڕیشی لەو مەجلیسەدا ئامادە بوو.

مام حاجی لە ساڵی (١٩٠٤) لە گەڕەکی تۆپخانەی قەڵای شاری هەولێرێ چاوی بە دنیای گەورە



ڕووناک کردۆتەوە، لە تەمەنی (٧) ساڵان لە لای مامۆستا مەلا ئیبراهیمی حەنەفی لە مزگەوتی گەورەی قەڵاتێ دەست بە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەکات. دوای تەواوکردنی جزوعەمە و تەبارەک و چەندین کتێبی بچووک و گوڵستانی سەعدی تەواودەکات لە پاشان واز لە خوێندن دەهێنێ.

لە ساڵی (١٩١٤) جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێ دەکات، ئیدی ڕەشبگیر لەو شاردا دەگەڕێ، خەڵکێکی یەکجار زۆر دەستگیر دەکەن بۆ ئەوەی ڕەوانەی شەڕی سەفەر بەلگی بکەن، یەکێک لەوانە (حاجی ئیبراهیمی) باوکی بووە دەستگیر کراوە و ڕەوانەی ئەو شەڕە کرا، ماڵ و منداڵیشی بۆ ڕۆژگاری ڕەش و قات و قڕی و برسیەتی جێ هێشت.

مام حاجی جەمیل بۆی گێڕامەوە و گوتی: "من و دایکم و خوشکم بە دوای باوکم کەوتین تاوەکو (مەعەسکەری ڕەشکێن) چووین، لە پاشان باوکم شوون بزر بوو، کەس نەیزانی چی بەسەر هات و ئێمەیشی بۆ ڕۆژێکی ناخۆش بەجێ هێشت.. منیش ناچار بووم لەو تەمەنە بچووکەدا دەست بە کاسبی کردن بکەم لەگەڵ دایکمدا ئیشی (سەقا)یان دەکرد. لە بەرامبەر چێشتخانەی تاجریانی ئێستا و لە شوێنی ئوتێلی شەهرەزاد (کە بەم دواییە باڵەخانەی ئەحمەد جامبازی ڕەحمەتی) لەسەر دروست کرا، کانییەکی ئاو هەبوو، من و دایکم هەموو ڕۆژێک بە وڵاخ ئاومان بۆ سەر قەڵاتێ دەبرد و بەسەر ماڵە گەورەکاندا دابەشمان دەکرد، هەر کاروانە ئاوێک (عانەیەکمان) وەردەگرت، برسیەتی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو بە چاوی خۆم دیم خەڵکێکی یەکجار زۆر لەبرسان

مردن، لە پاشان مەلایەکان فتوایان دا، کەوا گۆشتی (گوێ درێژ و هێستر و پشیلە) حەڵاڵ بکرێ، مام حاجی بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و گوتی: لە ساڵی (١٩١٨) دەوڵەتی عوسمانی رووخا و پاشەکشەی لێ کرد بەچاوی خۆم بینیم سوپای ئینگلیز، کە پێک هاتبوون لە (سیکە و گورگە) لە ئاوی میری پەڕینەوە، ئێمەش لە بەدەنی قەڵاتێ لەگەڵ مشکۆی هونەرمەند تەماشامان دەکرد لە پاشان گرانی نەما و باری گوزەرانی ئەو خەڵکە باشتر بوو."

مام حاجی لە ساڵی ١٩٢٢ لەگەڵ وەستا ئیسماعیل بەنا دەستی بە ئیشکردن کردووە، ئەو پیاوە وەستایەکی چاک بووە لە دروستکردنی دیوار و تاق و پەنجەرە و رەفکەی ماڵان، مام حاجیش بەردەستی کردووە.. لە ساڵی ١٩٢٦ لەلای وەستا سالمی کارگەچی ئیشی کردووە.. بۆ ماوەی شەش ساڵیش لەگەڵمام رەفیقەی کارگەچی و قادر رینگل ئیشی کارگەچیان کردووە، بۆ ماوەی چوار ساڵیش ئیشی پەڕەچیەتی کردووە..

لە ساڵی ١٩٣٦ بە مەبەستی کاسبی کردن روو لە شاری کەرکووک دەکات و لەوێ لەلای وەستایەکی (سوری) فێری دروستکردنی (قاپقاپ) دەبێت و لە پاشان لەبن قەڵاتێ دوکانێک دادەنێ و دەست بە ئیشی قاپقاپچیەتی دەکات، لەو ماوەیەشدا بە بەردەوامی هاتوچۆی تەکیەی تاڵەبانی دەکات و لەلای (شێخ عەلی تاڵەبانی)دا رێزی تایبەتی هەبووە، لەهەمان کاتیشدا دۆستایەتی لەگەڵ مامۆستای بەناوبانگ (مەلا تەهای مەلا یاسینی موسەلاّی کەرکووکی) پەیدا دەکات و چەندین ئوسولی مەقامات و قۆریاتی تورکی لێ فێردەبێت، دۆستایەتی لەگەڵ رەشەی کوللە رەزا و محەمەدی چل بۆین و تۆپال حەمە و مستەفا قەلاّیی و عیزەددین نعمەت و کەسانی دیکە پەیدا دەکات. بەشداری لە حەلەقەی زکر و تەهلیلەی تەکیەدا دەکا و هاتوچۆی خانەقای سەید ئەحمەد و دیوەخانی شێخ حەسیبی لەیلانی دەکات.

حاجی جەمیل لە ساڵی ١٩٤١ دەگەڕێتەوە شاری هەولێر و بەهەمان شێوەی کەرکوک دوکان دادەنێ و دەست بە ئیشی قاپقاپچیەتی دەکات و بەو ناوەش ناوبانگ دەردەکات.

## مام حاجی جەمیل و مەولوود خوێندن

حاجی جەمیل هەر لە منداڵییەوە حەزی بە خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەرو مقامات و قۆریات کردووە. عاشقی دەنگی بەسۆزی مامۆستای خۆی (شەهابەی هەولێری) بووە، کە هەموو شەوانی دووشەممە و پێنج شەممە و رۆژانی هەینی لەسەر تەلاری منارەی مزگەوتی قەلاّتێ دەستی بە سەلاکێشان دەکرد، بەو دەنگە ئاسمانییەی دنیای دەهەژاند و مەلا ئەفەندی لە قەسری باداوە گوێی لە دەنگی دەبوو، مام حاجی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر لە سەید مەردان و عەلی کوڕ فێربووە ئسوولی و (کەرەم)ی لە حاجی عەبدوڵلا وەرگرتووە و مەقامی (دیوانیش) لە حاجی وەکا چایەچی فێربووە، بە بەردەوامیش هاتوچۆی تەکیە و دیوەخانەکانی دەکرد و دەنگی هەڵدەهێنا، بەتایبەتی لە تەکیەی شێخ شەریف و تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما و تەکیەی شێخ محێدین بەرزنجی و شوێنی دیکە دەکرد، قەسیدەی دەخوێند و لە زکر و تەهلیلە بەشداری دەکرد، شان بەشانی حاجی عەبدوڵلای دەڤژەن و مەلا نادری سەعاتچی و سۆفی حەمک و مەلا نادری بوستانچی و مەلا عەلی کەبابچی و خەڵکانی دیکە مەولوودی دەخوێندەوە.

حاجی جەمیل زۆر حەزی لە سەفەرکردن بووە، جگە لە حەج چۆتە ئێران و لەشاری تەهران شان بەشانی ئەو دەنگ خۆشانە دەنگی هەڵهێناوە، لە سەرەتای ساڵانی شێستەکاندا چۆتە وڵاتی "شام" سوریا و لوبنان و وڵاتی میسری دیوە و چاوی بە گۆرانیبێژی بەناوبانگ (مامۆستا محەمەد عەبدولوەهاب و فەرید ئەترەش) کەوتووە.

لە ساڵ ١٩٧٩ لەگەڵ مشکۆ و چەند هونەرمەندێکی دیکە چووتە شاری ئەستەمبوڵ و لەوێ لەگەڵ دەنگ خۆشەکانی ئەو شارە دەنگی هەڵهێناوە.

مشکۆ بۆی گێڕامەوە گوتی: جارێکیان لە ئەستەمبوڵ لە دوکانی هونەرمەندی شاری کەرکووک (ئیبراهیم رەئووف) دانیشتبووین، حاجی جەمیلیش زوو لێی هەڵسا و لە دوکانەکەی ئەودا دەستی بە قۆریات و کەرەم چراندن کرد خەڵکێکی یەکجار زۆر لەسەرمان خڕبوونەوە و گوێیان بۆ دەنگی حاجی جەمیل شل کردبوو، چەند

كـەسـانێك، بەرچاوی ئەو شـارە داوایان لێ كـردین بۆ داوەتكردنی تایبـەت لەمـاڵـیـان، بەڵام ئێـمـە مـاوەكـەمـان كـەم بوو نەمـانتـوانی داوەت قبوڵ بكەین.

كاك غائب ئەكرەمی قەیماغ فرۆش بۆی گێڕامەوە و گوتی: جارێكیان لە شاری ئەستەمبوڵ پیاسەمان دەكرد، لەكاتی دەمەو عەسر بوو، لە نزیك مزگەوتێكی گەورە راوەستابووین، لەناكـاو گـوێمـان لە دەنگێك بوو، شێوەی لە دەنگی (حاجی جەمیل قـاپقـاپچی) دەكـرد بانگی دەدا، منیش خۆم پێ رانەگیرا و چوومە ناو مزگەوتەكە، كاتێك تەماشا دەكەم، ئەوا حاجی جەمیلە لە مەحفەلی مزگەوتی ئەستەمبوڵ بانگ دەدات..

مام حاجی جەمیل بەشداری زۆربەی زۆری خـوێندنەوەی مـەولوودی پێغەمبەری ئەو شارە كردووە، لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەی خەڵكی ئەو شارە پێیان دەگوت (ئەگلەنجە) بەشـداری دەكـرد و شـان بەشـانی (مشكۆ و حاجی فائیقی محەمەد سولتانی بازرگان و حەیدەرە كەچەڵ و پیرداودە كۆرە و شاكر حەمە فارس و محەمەدی مەلا كەریم بەناو محەمەد ئەحمەد ئەربیللی و حەلوبی قەساب و مـام جامیلە و سـەید سـەعیدی دامرچی و ئیمام حەمیدی كوورەچی و محەمەد عاشق و خەڵكانی دیكە قـۆریات و كـەرەمی چڕاندووە.. كاسێتی تۆمار كراویشی بە دەنگی خۆی هەیە.

مام حاجی شارەزاییەكی تەواوی لە ئوسوڵی مەقامات و قۆریاتی توركی هەبووە، بەتایبەتی (مەقامی بەیات) و (سـەبا) و (دیوان) و (رەست) و كەرەم و قۆریاتی (كوردۆ) و (مخالف) و (یەتمی) و (نوباتچی) و (دەل حـەسـەن) و (بێشـیـری) و (عومەر گەلە) و (موچەڵا)..

مـام حـاجی جـەمیل وەكـو دەنگ خۆشەكانی دیكەی ئەو شارە حەزی بەوە نەدەكـرد، كـەوا دەنگی لەسـەر قـەوان یان لە ئێسگە و تەلەفـزیۆن تۆمـار بكات، كـاك جـەمـالی كوڕی بۆی گـێـڕامـەوە گـوتی: زۆر جـاران داوایان لە باوكم كردووە، كەوا دەنگی خۆی لەسەر قـەوان یان لە ئێسـگە تۆمـــار بكـات، بەڵام باوكم رازی نەبووە چونكە ئەوكـاتە تۆمـاركـردنی دەنگ بە (عـەیب) دەچوو، لەهەمـان كـاتیـشـدا هونەرمـەند لەو شـارە بە چاوێكی سووك تەماشا دەكران.

حاجی جەمیل قاپقاپچی- لەلای مـەلا ئەبوبەكـرەئەفـەندی (مـەلای گچكە) رێزی تایبەتی خۆی هەبووە لە دیوەخـانی (ئەحـمـەد عـوسـمـان)ی موتەسەریفی هەولێر و عەلی پاشای دۆغرەمەچی و مەلا محەمەدی موفتی و شێخە رەشكە و شێخ محێدینی گـەرەكی عـارەبان رێزی هەبووە. لە دیوەخانی ئەواندا دەنگی هەڵهێناوە- مـەقـامـات و قـۆریات و كـەرەمی چڕاندووە.

لە سـالی ۱۹۷۷ لەلایەن (ئەمـینداریتی گـشـتی رۆشنبـیـری و لاوانی هەرێمی كـوردسـتـان) لە زەمـانی حكومـەتی مـەركـەزی بڕوانامـەی تەقـدیری وەرگـرتووە و لەهەمـان كـاتیـشـدا لە ئاهەنگەكـانی برایانی ئوجـاغی توركـمـان بە بەردەوامی بەشداری دەكرد و چەندین چاوپێكەوتنی تەلەفزیۆنی لەگەڵدا ساز دراوە..

لەدوا تەمـەنی ژیانیـدا تووشی نەخـۆشی هاتووە، بۆ مـاوەیەك لە ماڵەوە كەوتووە، بۆ ئەو مەبەستەش من بە بەردەوامی هاتوچۆی مـاڵیـانم دەكـرد و لە ئەحـواڵیم دەپرسی و دوو رۆژ بەر لەمـردنی لەلای دانیشـتـووم دوا قۆریاتی ئەمەیە:

**قەلاسز**

**ئەربیل ئولماز قـەلاسـز**
**ئود مـەن قـویدم گـیـتم**
**سز سـاغ لغتـەن قـەلاسـز**

ئەوە بوو مەرگ مەودای نەدا و لە سەعات شەش و بیست دەقیقەی سەر لەبەیانی رۆژی هەینی ۲ ی مـانگی ئابی سـاڵی ۱۹۹٦ دڵە گەورەكەی لە لێدان كەوت، بۆ دوا جار ماڵئاوایی لە خـزم و كـەس و كـار و دۆست و برادەرانی كـرد، لەهەمـان رۆژ بە ئامـادەبوونی گـشت هونەرمـەند و هونەردۆسـتـانی ئەو شـارە لە گۆڕستانی (شێخی چۆلی) بە خاك سپێردرا.. مردنی ئەو مەولوود خوێن و مـەقـامـزان و قـۆریات بێـژە خەسارەتێكی گەورە بوو لە هونەری مەقـامـات و قـۆریات و كـەرەم لەو شارە كەوت لەپاش مردنیشی چەندین كاسێتی تۆماركراوی بە دەنگە بەسۆز و زوڵاڵەكەی لەدوای خۆیدا بۆ بەجێ هێشتووین.

لە چاوپێكەوتنێكی تەلەفـزیۆنی سـەبارەت بەو هونەرمـەندە دوا شت گوتم..

**(قـەرەلار كـیـرمـشـەم یەسـتـاد باشم قـودرەتن چاكلمش قـەلامـدا قـاشم مانم نە نەنم اولب نە بەبەم نە شیرین قرداشم حاجی جمیل عشقان د دولانرەم شوم مەزار).**

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش). ژمارە (۳) بڵاوبۆتەوە.

# حەیدەر بەقاڵ
# ١٩٠٦- ١٩٧٩

**جەلال خدر**



حەیدەر بەقاڵ، مەشهور بە حەیدەرە کەچەڵ کوڕی حاجی عەبدولڕەحمانی کوڕی حاجی حوسێنی نەجارە، لە ساڵی ١٩٠٦ لە گەڕەکی سەرای قەڵاتی شاری هەولێر چاوی بە دنیای گەورە ڕووناک کردۆتەوە، هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنی قوتابخانە کردووە، بەڵام لەبەر هەژاری و دەستکورتی نەیتوانیوە قوتابخانە تەواو بکات.

هەر لە منداڵییەوە لە دوکانی باوکیدا ئیشی دارتاشی کردووە، لە تەمەنی (١٥-١٦) ساڵاندا ئیشی ئاسنگەری کردووە، سەبارەت بەو ئیشەی جارێکیان هونەرمەند و دەنگخۆشی شاری هەولێر (مام سەید سەعیدی دامرچی) (١٩٢٥-هەولێر) بۆی گێرامەوە و گوتی: منداڵ بووم لە دوکانی ئاسنگەری لەلای برا گەورەم شاگرد بووم، حەیدەرە کەچەڵیش بۆ ماوەیەک لەلامان ئیشی ئاسنگەری دەکرد و ئەوکاتە دەنگی زۆر خۆش بوو، منیش حەزم لە گۆرانی و قۆریاتی تورکی دەکرد، بەڵام نەمدەزانی، مام حەیدەر ئەمەی بە فرسەت زانیبوو، دەبوایە هەر جارێک (کوبە)یەکی بۆ بکڕم ئەوجا فێری قۆریاتێکم بکات، مام حەیدەر لە تەمەنی (١٨-١٩) ساڵیدا دەستی بە ئیشی قوڕکاری کردووە و وەستایەکانی شاری هەولێر ئەو دەنگخۆشەیان لەگەڵ خۆیان دەبردە سەر ئیش، لەوانە: (وەستا نادری بەنا) هەموو جارێک لەگەڵ خۆیدا دەیبردە سەر ئیش و لە هەمان کاتیشدا گۆرانی و بەستە و قۆریاتی تورکی پێدەگوت و ڕۆژانەی تەواوی دەدایێ، مام حەیدەر بەم شێوەیە ژیانی هەرزەکاری بەسەر دەبات، لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا جارێکیان ڕوو لە گومرگی شاری هەولێر دەکات بۆ ئەوەی ئیش بکات، جەماعەتێک لەسەر مەزادی دادەنێن، ئەویش بەدەم گۆرانی گوتن ڕزق دەفرۆشی و خەڵکێکی زۆر لەخۆی کۆدەکاتەوە، مشتەری زۆر دەبێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ڕق و کینە لەگەڵ جەماعەتێکی دیکە، کە پیاوی (ڕەشید ئاغا)ی هەولێری بوون، لە ئەنجامدا دەبێتە شەڕ و ئایەڵن جارێکی تر ئیش بکات، ئەویش پەنا دەباتە بەر مام (حاجی لەتیفی قەساب)، کە یەکێک بووە لە پیاوماقووڵ و بەرچاوی شاری هەولێر، ئەویش کۆمەڵێک قەساب کۆ دەکاتەوە دەچنە (علوە) و لەوێ شەڕێکی گەورە ڕوودەدات، پیاوانی پۆلیس ناتوانن لێکیان بکەنەوە، لە ئەنجامدا پەنا بۆ (مەلا ئەفەندی) مەلای گچکە دەبەن ئەو کێشەکە چارەسەر دەکات، پیاوانی ڕەشید ئاغا ناچار دەبن واز لە مام حەیدەر بهێنن بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی ئیش بکات، لەو ڕۆژەوە مام حەیدەر وەزعی باش دەبێت و لەپاشان (حاجی

موحسین)ی برای لەگەڵ خۆی دەهێنێ و دەست بە کاسبی دەکەن، ئەوکاتە گومرگ لە نزیک گەراجی (جەلال خەلیل)ی ئێستا بووە، لەپاشان گواستراوەتەوە بۆ پشت یانەی فەرمانبەران نزیک مەرقەدی شێخەڵلا و لە پاشان چووەتە لای پردی سەیداوە.

مام حەیدەر تاوەکو ساڵی ۱۹۷۹ لەسەر ئەو کارە ماوەتەوە، لەپاشان میری گومرگ (تأمین) دەکا، ئەویش پەکی دەکەوێ.

### حاجی حەیدەر و گۆرانی گوتن

مام حەیدەر لە منداڵییەوە عاشقی دەنگی مامۆستای خۆی (شەهابە هەولێری) بووە، چونکە ئەوکاتە ئەو هونەرمەندە بلیمەتە لە مەیدانی مەقاماتی عێراقی و قۆریاتی تورکی ناوبانگی دەرکردبوو، مام حەیدەر گێڕایەوە گوتی: من منداڵ بووم زۆرجار لەگەڵ باوکمدا شەوان سەردانی دیوەخانی ماڵە گەورە و پیاوماقووڵانی ئەو شارەمان دەکرد، بەتایبەتی دیوەخانی (مەلا ئەفەندی) و (محەمەد ئەفەندی موفتی) و (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) و (ئەحمەد عوسمانی) موتەسەریف و (ئەدیب ئاغای ئەسعەدی) و (عەلی ئاغای عوزێری) و (حاجی عەبۆ ئاغا) و چەندین شوێنی دیکە، زۆرجار وارێک دەکەوت من و مشکۆ و چەندین کەسی دیکە لە پەنجەرەی دیوەخانی ئەو ماڵانە ملمان دەهێنایە ژوورەوە بۆ ئەوەی شتێک لە مەقامزانی بەناوبانگ (شەهابە) فێربین، کاتێک شەهابە زانی من و مشکۆ و حاجی فائیقی محەمەد سوڵتانی بازرگان و حاجی جەمیلی قاپقاپچی و پیرداوەدە کۆر و کەسانی دیکە دەنگمان خۆشە بۆ ئەو مەبەستە زۆر یارمەتی دەداین، بۆ ئەوەی شتێکی لێ فێربین، مام حەیدەر جگە لە شەهابە عاشقی دەنگی (سەید مەردان و حاجی والی چایەچی و عەلی کۆر و محەمەد چلبۆین و حاجی عەبدوڵلای خەیاڵ و بەکرە کەچەڵ و حاجی عەبدوڵلای دەفژەن) بووە، لە شاری کەرکووکیش دۆستایەتی لەگەڵ مامۆستا عەلی مەردان و رەشەی کوللە رەزا و عیزەدین نیعمەت و تۆپاڵ حەمەد و محەمەد گوڵبۆی و عەلی قەلعالی و فەخرەدین نەرگچم و کەسانی دیکەدا هەبووە، کاتێک لە قەوانەکانی (جەلال بەگی) هاتە کایەوە، مام حەیدەر بە بەردەوامی گوێی لەو قەوانانە دەگرت، بەتایبەتی (قەوانی قارشوغلار) و (چوبان ئۆغلی)، لەکاتی چڕاندنی ئەو قەوانانە لاسای ئەوی بە تەواوی دەکردەوە.

مام حەیدەر هیچ کاتێک حەزی بەوە نەدەکرد، کەوا دەنگی لەسەر قەوان یان لە ئێستگە و تەلەفزیۆن و کاسێت تۆماربکات گەلێک هەلی گەورەی لەدەست خۆی داوە، لە ساڵانی چلەکاندا چەندین جار بەرپرسی کۆمپانیای (بایزەفون و ئادیۆن و کولومبیا و چەخماچی) داوایان لێکردووە، کەوا دەنگی لەسەر قەوان تۆماربکات بەڵام ئەو رازی نەبووە.

لە ساڵی ۱۹٤۱ جارێکیان مامۆستا (کامیل کاکەمین) بەڕێوەبەری ئێزگەی بەغدا/ بەشی کوردی هاتۆتە شاری هەولێر و داوای لە دەنگخۆشەکانی ئەو شارە وەکو: (مشکۆ و حەیدەر بەقاڵ و پیرداوەدە کۆرە و شاکر حەمە فارس و حاجی جەمیل قاپقاپچی و کەسانی دیکە کردووە، کە لە ئێستگە گۆرانی بڵێن، بەڵام هیچ کامێکیان رازی نەبوون تەنها (مام حەسەنی خوجێ) نەبێت، کە یەکەمین کەس بووە لە هەولێر لە ئێستگەی کوردی دوو گۆرانی گوتووە، یەکەمیان (مەقامی حیجاز) ئەوی دیکە (نیوە شەوی) بووە، ئەوکاتەش ئامێری تۆمارکردن نەبووە، ئەو گۆرانییانە بەخۆڕایی بە هەوا دەچوون.

جارێکیان چەند هونەرمەندێکی ئێستگەی بەغدا بەشی عەرەبی لە ساڵی ۱۹٥٥ بۆ گەشتوگوزار روو لە شاری هەولێر دەکەن لە پاشان لە هاوینەهەواری (گەلی عەلی بەگ) لێ پاڵ دەدەنەوە، لەوانە: (مامۆستا محەمەدی گوبانچی و نازم غەزالی و زوهرە حوسێن) یان لەگەڵ چەند مۆسیقاژەنێکیان لەگەڵدا بووە.

ئەو رۆژە چەند دەنگخۆشێکی ئەو شارە وەکو: (مشکۆ و مام حەمیدی کوورەچی و مام حەیدەری بەقاڵ) و چەند کەسێکی دیکە لەو شوێنەدا ئامادە بوون (مام سەید بەدرەدین) کە دۆستێکی نزیکی مام حەیدەر بووە، پێی دەڵێ: (ئەمە شوێنی تۆیە دەنگ هەڵێنە) ئەویش دەست

دەخاتە بناگوێ و بە مەقامی دەشت بۆی هەڵدەستێ و دەڵێ:

**تۆبەکردم کە دگەر بادەی گلگون نخورەم**
**ئەگەر یار ساقی شەوە هەم مەی و مەیخانە خورەم**

بەم شێوەیە بۆی هەڵدەستێ و دەبێتە مایەی سەرسوڕمانی ئەو خەڵکە حازر بووە، مۆسیقاژەنی عێراقی بەناوبانگ مامۆستا (جەمیل بەشیر) خۆی پێ ڕاناگیرێ و دێتە لایان لەسەر سەری مام حەیدەر ڕادەوەستێ و تاوەکو مەقامەکە تەواو دەکات لەپاشان خۆی پێیان دەناسێنێ و داوا لە مام حەیدەر دەکات بێتە شاری بەغدا و دەنگی لە ئێستگەی/ کوردی تۆمار بکات، بەڵام ئەو ڕازی نەبووە، هەلێکی گەورەی لەدەست خۆی دا، چونکە ئەگەر بهاتبایە داوای مامۆستا جەمیل بەشیری قبوڵ بکردایە بە هاوکاری تیپی مۆسیقای ئێستگە دەیتوانی چەندین گۆرانی بەو دەنگەخۆشەی تۆماربکات.

مامۆستا عیزەدین فەیزی بۆی گێڕامەوە گوتی: لە ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٧) (حلفی بەغدا) لە مابەینی تورکیا و عێراق بەسترا، بۆ ئەو مەبەستە وەفدێکی گەورە لە تورکیاوە هاتبوونە شاری بەغدا، لەوێشەوە بۆ شاری هەولێر داوەت کران، موتەسەریفی شاری هەولێری ئەو کاتە: (خالید نەقشەبەندی) پێشوازی لێکردن و بۆ شەو لە یانەی فەرمانبەران داوەت کران، چەندین پیاوماقووڵ و بەرپرسی ئەو شارە ئامادەبوون، یەکێک لەوانەی داوەت کرابوو (حەیدەرە کەچەڵ) بوو، ئەو شەوە دەستی پێکرد ئەمما چۆن دەستپێکردنێک بەناو بەستە و گۆرانی و مەقاماتی کوردی و قۆریاتی تورکی دەچڕاند، ئەمەش بووە مایەی سەرسوڕمانی میوانەکان، لەپاش تەواو بوونی ئاهەنگەکە بانگیان کرد لە ناوەڕاستی میوانەکان دانرا، لەپاشان داوایان لێکرد، کەوا داوەتنامەی بۆ ڕەوانە بکەن بۆ شاری ئەنقەرەی پایتەخت بچێ و لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانی تورکیا چەندین قەوان تۆماربکات، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، مامۆستا عیزەدین بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی گوتی: دوای تەواوبوونی ئەو ئاهەنگە خەڵکێکی یەکجار زۆر لەبەر دەرگای یانەی فەرمانبەران ڕاوەستابوون، بەڵام لەبەر هەژاری ڕێگایان پێنەدرابوو، کە بەشداری لەو ئاهەنگە خۆشەدا بکەن. کاتێک مام حەیدەر دێتە دەرەوە تەماشای ئەو خەڵکە حازربووە دەکات، ئەویش ناکاتە نامەردی و لەسەر ڕەسیف دادەنیشی دەست بە گۆرانی و قۆریات گوتن دەکات، خۆشییەکەی لەوەدابوو ئەو فەرمانبەرانەی کە لە ژوور دانیشتبوون هەموویان بەڕاکردن هاتنەدەرەوە لەسەر ڕەسیف لە تەنیشت مام حەیدەر لێی دانیشتن و تاوەکو بەرەبەیانی ئاهەنگەکە بەردەوام بوو.

### دەنگی مام حەیدەر چۆن تۆمارکرا؟

لەکاتی خۆیدا لەو شارە کەس دەنگی خۆی تۆمار نەدەکرد، چونکە بە شتێکی (عەیب) دەچوو، هونەرمەند بە چاوێکی سووک تەماشا دەکران، بۆیە چەندین هونەرمەندی مەقامزان و دەنگخۆشی ئەو شارە وەکو: شەهابە و حاجی وەلی و سەید مەردان و قادر ڕەنگل و سەید محێدین و سەید خەنجەر و مەلا شەریفی مەلا ئیبراهیمی میهری و بەکرە کەچەڵ و عەلی کوێر و مەلا ساڵحی دەفژەن و دەروێش ڕەمەزانی سلێمان و دەروێش مجوڵ و مەلا نادری بوستانچی و خەڵکانی دیکە، بەخۆڕایی چوونە ژێر ئەو خاکە بێ ئەوەی ئاسەوارێک لەدوای خۆیاندا جێبهێڵن، مام حەیدەر جارێکیان بۆی گێڕامەوە، گوتی: (لە ساڵانی سییەکاندا من و مشکۆی حازری گوێندە و هونەرمەند بووین لەو شارەدا دەسووڕاینەوە، کەس ژنی نەدەداینێ، لەهەمان کاتیشدا بە چاوی (چاوەش) تەماشا دەکراین)، بۆیە هونەرمەند و دەنگخۆشەکانی ئەو شارە نەیانویستووە خۆیان ئاشکرا بکەن.

سەبارەت بە تۆمارکردنی دەنگی مام حەیدەر ڕاستییەک هەیە و نکۆڵی لێ ناکرێت بۆ ئەو مەبەستە لەدوای مردنی داوای لێبووردن لەخۆی و بنەماڵەکەی دەکەین، چونکە بەسەرهاتێکی ناخۆش بۆ مێژوو دەگێڕینەوە:

لە ساڵانی شەستەکاندا جارێکیان جەماعەتێک لە شاری کەرکووک بە میوانی دێنە لای مام حەیدەر بۆ ئەوەی

لە ئاهەنگی بووک گواستنەوەدا دەعوەتی بکەن، ئەویش کاتێک بەمە دەزانێ روو لە هاوینەهەواری شەقلاوە دەکات و دەچێتە ماڵی مام شاکری چاوشلی (دارفرۆش)، چونکە ئەو بنەماڵەیە سێ مانگی هاوین لە شەقلاوەدا کەپریان هەبوو، خۆی لەوێ دەشارێتەوە ئەوانیش بەدوایدا دەچن لەوێ هەرچۆنێک بێت رازی دەکەن، ئەویش لەگەڵیان دەچێتە شاری کەرکووک و ئاهەنگێکی قەشەنگ لە قەڵاتی کەرکووک سازدەکات، هونەرمەند و دەنگخۆشەکانی ئەو شارە ئامادە دەبن وا رێک دەکەوێ کورە گەنجێک کە عاشقی دەنگیەتی ئالەتی تۆمارکردنی دەنگ (مسجل)ێکی بچووک لە باخەڵی خۆی دادەنێ، چەند لایەنێکی ئەو ئاهەنگە تۆماردەکات، لەپاش ماوەیەک ئەو شتە ئاشکرا دەبێت و مام حەیدەر گلەیی لە ماڵەکە دەکات، چونکە دەنگی تۆمارکراوە، ئەوانیش یەخەی کورە گەنجەکە دەگرن و بۆ ئەوەی کاسێتەکەی لێ بستێنن، بەڵام رازی نابێت، لە ئەنجامدا ئەو کورە گەنجە لەسەر ئەو کاسێتە دەکوژرێ، لەپاش ئەم رووداوە مام حەیدەر رازی دەبێت دەنگی تۆمار بکرێت، چونکە چەندین کەسایەتی ئەو شارەش دڵیان لە مام حەیدەر شکا، لەوانە مشکۆی هونەرمەند بۆ ماوەی ساڵێک قسەی لەگەڵ نەکرد، لەسەر ئەم رووداوە دڵتەزێنە، هەر ئەم هۆیەش بوو بە دەرگایەک بۆ تۆمارکردنی دەنگی ئەو هونەرمەندە، هەروەها چەندین کاسێتی تۆمارکراوی (ئێمە نەبیستووی) هەیە، کە لە ماڵی پیاوماقووڵ و کەسایەتی ئەو شارەدا بە دزییەوە تۆمارکراوە لە ئەرشیفی خۆیاندا پارێزراون.

### مام حەیدەری نوکتەچی و قسەخۆش

مام حەیدەر هەتا بڵێی پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەچی و چاوتێر بوو، ماڵی دنیا لەلای ئەو هیچ نەبووە، ئەوەی لەدەستی بهاتبایە لەسەر برادەرەکانی خەرجی دەکرد، مەجلیسی هەمیشە گەرم بوو، خەڵک لە دەوری کۆدەبوونەوە، گوێیان بۆ قسە خۆشەکانی رادەگرت، لێرەدا شتێکم بەبیر هاتەوە، جارێکیان مزگەوتی قەڵاتێ نوێ دەکرایەوە بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەک بە سەرۆکایەتی مامۆستا رەشاد ئەفەندی رەحمەتی و چەند کەسانێک دانرا بۆ کۆکردنەوەی پارە لە خەڵک، لە گومرگی چوونە لای مام حەیدەر، ئەویش خۆی شاردەوە پارەی نەدا، ئەوانیش ئەو باسەیان بۆ رەشاد ئەفەندی گێرایەوە، ئەویش گوتی: (من لە حەقی دێم).

بۆ بەیانی دەستی دایە تەلەفۆن لەگەڵ خێزانی مام حەیدەر قسەی کرد و گوتی: "نەتزانیوە حەیدەر بەتەمایە ژن بهێنێ و دایک و باوکی ژنە لەگەڵ دوو شاهێد لەلام دانیشتوون، ئێمەش چاوەڕوانی ئەو دەکەین بۆ ئەوەی ژنەکەی لێ مارە بکەین و نازانین لەکوێیە"، تەلەفۆنەکەی داخست، ئەو رۆژەش وا رێک دەکەوێ کۆمەڵێک لە سەوزەفرۆش و باخچەچی پردێ بە میوان هاتبوونە لای مام حەیدەر، کاتێک چووە ماڵەوە بۆ ئەوەی خێزانی ئاگادار بکاتەوە خواردن حازر بکات، تەماشای دەکات ئاگری لێ دەبارێ، ئەویش باسی مامۆستا رەشاد ئەفەندی بۆ دەکات، مام حەیدەر یەکسەر بە شتەکە دەزانێ، بەناچاری میوانەکان لە کەبابخانە داوەت دەکات.

جارێکیان مام حەیدەر لە دیوەخانی ماڵی عەلی ئاغای عوزێری میوان دەبێ، دەست بە قۆریات گوتن دەکات، ئەو رۆژەش وا رێک دەکەوێ (دادە ئەمۆش) خوشکی عەلی کۆری مەولوودخوێن و مەقامزانی شاری هەولێر لەهەمان شوێن داوەت کراوە، گۆرانی و قۆریات بۆ ئافرەتەکان لە قاتی سەرەوەی قەسرەکەدا دەچڕێ، لەگەڵ مام حەیدەر دەکەونە (مقابەلە) کردن لە بەرامبەر یەکتری قۆریات دەچڕن، مام حەیدەر لە حەقی ئەمۆش نایەت، (شێخ جەمیل ئەفەندی) خانەقاش لەو کۆڕەدا ئامادە دەبێ، دەزانێ مام حەیدەر زوو پەکی دەکەوێ، دەچێتە تەنیشتی و یارمەتی دەدات، (واتە لە ژێرەوە قۆریاتی پێدەڵێ)، ئەمۆش لە شوێنی خۆیدا یەکسەر دەزانێ بە قۆریاتێک وەڵامی دەداتەوە، پێی دەڵێ لە شوێنی خۆیدا بێدەنگی دەکات:

**قەلادە بیر بەدەن وار**
**بەدە استنە دوران وار**
**حیدر بیلە داگسن**

### سەنە بەر نوکرەدان وار
### مام حەیدەر و سەعید قەزاز

دۆستایەتی مام حەیدەر لەگەڵ کەسایەتی ناسراوی عێراق (سەعید قەزاز) وەزیری ناوخۆی پێش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی چلەکان، کاتێک سەعید قەزاز موتەسەریفی شاری هەولێر بووە، لە ماوەی (١٠ی ئەیلوولی ١٩٤٤ تا ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٤٧)، عاشقی دەنگی بووە، لە هەموو مەجلیسێکی خۆیدا داوەت نامەی بۆ ناردووە یان هەرجارێک سەردانی ئەو شارەی بکردبایە یەکسەر داوای ئەوی دەکرد، بەسەرهاتی زۆر سەبارەت بە وەفاداری ئەو هونەرمەندە هەبوو تاوەکو مردنیشی وێنەی (سەعید قەزاز)ی لە ژووری میوانان لەماڵی خۆیدا هەڵواسیبوو.

خوالێخۆشبوو: مامۆستا کەنعانی کوری شوکر بەزاز بۆی گێڕامەوە گوتی: لە هاوینی ساڵی (١٩٥٦)دا ماڵمان لە حاجی ئۆمەران بوو، رۆژێکیان بەردەرگای ناحیە زۆر قەرەباڵغ بوو، خەڵکێکی زۆر راوەستابوون، منیش پرسیم گوتیان میوان لە شاری بەغدا هاتووە، کە تەماشام کرد (نووری سەعید)ی سەرۆکی وەزیران و سەعید قەزازی وەزیری ناوخۆ و خالید نەقشەبەندی موتەسەریفی هەولێر و چەندین کەسایەتی ناسراو و بەرچاوی ئەو شارەیان لەگەڵدا بوو.

کاتێک کە شەوداهات کۆڕ و مەجلیس گەرم بوو، ئەوکاتەش مام حەیدەرە کەچەڵ لەگەڵ خاڵە تاهیر تۆفیق و مام رەسول گەردی داوەت کرابوون، ئەو شەوە مام حەیدەر بەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەیەوە دنیای خرۆشاند و تاوەکو شەوێکی درەنگ ئاهەنگەکە بەردەوام بوو.

مامۆستا نەژاد عەبدوڵڵا عەزیز بۆی گێڕامەوە، گوتی: سەعید قەزاز دۆستی نزیکی باوکم بوو، ئەوکاتە باوکم (بەڕێوەبەری ناحیە)ی شەقڵاوە بوو هەموو جارێک تەلەفۆنی بۆ باوکم دەکرد، لە هەمان کاتیشدا داوای دەکرد، کەوا (مام حەیدەر) لە فلانە رۆژ لە ماڵمان ئامادەبێت، جارێکیان لەسەر تەلەفۆن داوای لە مام حەیدەر کرد، کەوا قۆریاتی بۆ بڵێ، ئەویش دەستی پێکرد بۆ ماوەی سەعاتێک قۆریاتی تورکی چڕاند، خۆشییەکەی لەوەدابوو (بەداڵەی بەغدا بە کەرکووک بەسترابوو) (کەرکووک بە هەولێر) و (هەولێر بە مەسیف) و (مەسیف بۆ شەقڵاوە) بەسترابوو، لەماوەی ئەو سەعاتەدا گشت خەتەکان دەپچڕا لەبەر جەنابی وەزیر و هەمووشیان گوێیان لە دەنگی مام حەیدەر دەبوو، کە قۆریاتی دەگوت.

مامۆستا نەژاد بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی گوتی: مام حەیدەر دۆستی نزیکی منیش بوو، بەتایبەتی لە سەرەتای ساڵانی شەستەکاندا لە هۆڵی ژمارە (١)ی یانەی فەرمانبەران کە لە نزیک دەرگای سەرەکی بوو دادەنیشتین کۆڕ و بەزم گەرم دەبوو، ئەوانەی ئامادە دەبوون وەکو (خاڵە تاهیر تۆفیق و فەتاح جەبار و قادری حاجی مەمەد و جاروبارێش مام رەسوڵ گەردی و خەڵکانی دیکە، (کە ئێستا ناویانم لەبیرنەماوە) کە درەنگ دادەهات مام حەیدەرمان لێ پەیدادەبوو، بە ئومێدی ئەوەی زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام کاتێکی سەری گەرم دەبوو لەبەر گۆرانی و قۆریات گوتن ئاگای لە سات و کات نەدەما، ئەوجا خەمی چوونە ماڵەوەی لەبەر بوو، هەرجارێک یەکێک خۆی تەبەرع دەکرد و لەگەڵ خۆیدا دەیبردە ماڵەوە، بەم شێوەیە رامان دەبوارد لەدوا تەمەنی ژیانیدا جارێکیان لە (ئامادەیی پیشەسازی کارەبا)، کە ئەوکاتە مامۆستا بووم، هاتە لام تەوسیەی کورەکەی کرد کە لەلامان قوتابی بوو، منیش لە تەندروستی و ئەحواڵیم پرسی بە زمانی تورکی گوتی: (ئەفەندی زۆر خەستەیەم ئازم قالب) واتە (ئەفەندی زۆر نەخۆشم کەمم مایە)، پاش چەند مانگێک ئەو هونەرمەندە بلیمەتە ماڵئاوایی لێکردین، لەپاش مردنیش جارێکیان (حاجی موحسین)ی برای کە دوکانی لە تەنیشت دەرگای گۆڕستانی گەورەی هەولێر بوو بۆی گێڕامەوە گوتی (حاجی حەیدەر زۆر جار باسی مامۆستا عەبدوڵڵای) باوکتی دەکرد نوکتە و سەرگوزشتەی خۆشی ئەو و بەسەرهاتی سەیری دەگێڕایەوە.

مام حەیدەر دۆستایەتی لەگەڵ چەندین کەسایەتی ناسراو و بەرچاوی ئەو شارە هەبوو وەکو (مامۆستا جەوودەت ئەحمەد ناجی و هاشم عەبدوڵڵای ئەندازیار و

عەبدولوەهابی حاجی حەسەن و محەمەد شەهاب دەباغ و جەلال عەبدول و جەبار فەتاح و شێخ جەمالی تاجەدین و مام یاسین تەقی ئەسعەدی و حەسەن ونسی مقاول و قادر جمسی و حاكم تەحسین و حاكم قەدۆ و مامۆستا نەژاد عەبدوللا و فەوزی ئەفەندی و كەسانی دیكە، دۆستە نزیكەكانی لە پزیشكەكان پێكهاتبوون لە دكتۆر عەبدولڕەزاق دەباغ و دكتۆر ئاگوپ نیشیاتی و ئیحسان میرزا و محەمەد شێخۆ و عوسمان ئەحمەد ئاغای عوزێری و حیكمەت حەكیم، كە هەموو جارێك بە عود بەشداری لەگەڵیان دەكرد.

هونەرمەندەكانیش وەكو خاڵە تایەر و ڕەسوڵ گەردی و جامیلەی سایق و مامۆستا باكووری بەخۆی و عودەكەی ئامادە دەبوون، دكتۆر عەبدولڕەزاق بۆی گێڕامەوە، گوتی: "مام حەیدەر دۆستی نزیكی من بوو، لە زۆربەی زۆری كۆڕ و مەجلیسەكانی ئەودا بەشداریم دەكرد و زۆرجار لە شاری بەغدا و موسڵ ئەگەر میوانم بهاتبایە مام حەیدەریش داوەت دەكرا، بۆ ئەوەی ئاهەنگەكەمان خۆش بكات تاوەكو جارێكیان كۆمەڵێك دكتۆر لە شاری بەغدا بە میوانی هاتبوون، لەوانە: (دكتۆر سالم دملوس) و چەندین پزیشكی موسڵاوی لەگەڵدابوون، ئەو شەو مام حەیدەر گەرمی كرد، بەو دەنگە خۆشەیەوە دنیای هەژاند، ئەو هونەرمەندە پیاوێكی قسەخۆش و نوكتەچی بوو، لێرەدا شتێكم بەبیر هاتەوە لە ساڵی ١٩٧٩ جارێكیان میری گومرگی (تأمین) كرد بۆ ئەو مەبەستە ویستم بە تەلەفۆن شەڕی پێبفرۆشم، پێمگوت: "لەخوای بەزیادبێ گومرگ تەئمین كراو بۆ خۆت ئیسراحەت دەكەی، خوا قبوڵ ناكات ئەو دەنگە خۆشە خەسار بكەی بە هاواركردن و مەزادكردنی تەماتە و خیار و شووتی و تەرەپیاز، دەنگی تۆ تەنیا بۆ گۆرانی گوتن چاكە) پاش ماوەیەكی دیكە (تأمین صحی) پەیدابوو، خەڵكی ئەو شارە بە دەهۆڵ و زوڕنا كەوتنە سەر شەقام، ئەوجارە مام حەیدەر تەلەفۆنی بۆ كردم گوتی: (دكتۆر لە خوای بەزیادبێ وا عیادەكان تەئمین كران، ئیشەكەی ئێمە زۆر بە بێدەنگی بوو، بەڵام تەئمین كردنەكەی ئێوە دەهۆڵ و زوڕناشی لەگەڵدا بوو).

دكتۆر عەبدولڕەزاق بەردەوام بوو لەسەر قسەكانی گوتی: لە ساڵانی شەستەكاندا ئەوكاتەی (بەدرەدین عەلی) موتەسەریفی هەولێر بوو، وەفدێك لە شاری بەغدا بە میوانی هاتبوونە شاری هەولێر، شەو لە یانەی فەرمانبەران داوەت كران، مام حەیدەر ئەو شەوە دنیای خرۆشاند، زۆریش حەزی دەكرد ناوی كورد و كوردستان بهێنێ بەڵام لە بەدرەدین عەلی دەترسا، ئەوكاتە بارودۆخ ناخۆش بوو، موتەسەریف ڕۆیشت، ئەویش دەستی پێكرد، لەوكات و ساتە ناخۆشەدا گۆرانی لەسەر كوردستان گوت، كاتی تەواوبوونی ئاهەنگەكە قسەیەكی زۆر خۆشی كرد، بە عەرەبی گوتی: (إني وطني بەلام وطني حي..).

مام حەیدەر جگە لە هونەرمەندی پیاوێكی بەرچاوی ئەو شارە بوو، هەمیشە مەجلیسی گەرم بووە، لەدوا تەمەنی ژیانیدا بڕیاریدا لەگەڵ خێزانی ڕوو لە حەجی ماڵی خوا بكەن، وەكو دەگێڕنەوە كاتێك دەگاتە (شاری مەدینە) زەوقی هەڵدەستی دەست بە خوێندنی موناجات و مەدحی پێغەمبەر دەكات، ئەو خەڵكەی كە لەگەڵیدا بوون هەموویان دەستیان بە گریان كرد.

لەدواییدا تووشی نەخۆشی هات و لەلایەن حكومەتی مەركەزی ڕەوانەی شاری (لەندەن) كرا بۆ چارەسەركردن، لەوێش بۆ كوردە ئاوارەكان چەندین ئاهەنگی گۆرانی و قۆریاتی چڕاند.

لەپاشان مەرگ مەودای نەدا و لە ڕۆژی ١٩٧٩/١٢/٤ دڵە گەورەكەی لە لێدان كەوت، لە گۆڕستانی گەورەی هەولێر بە خاك سپێردرا، مردنی ئەو هونەرمەندە بلیمەتە زیانێكی گەورەبوو لە هونەری ئەو شارە كەوت.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (٢) وەرگیراوە.

# مشکۆ
# ١٩٠٨- ١٩٨٩

**جەلال خدر**



کەس نییە لە کوردستاندا ناوبانگی هونەرمەندی میللی و گۆرانیبێژی خۆڕسکی شاری هەولێر (مشکۆی هەولێری) نەبیستبێ، ئەو بلیمەتە بە سەدان کاسێتی تۆمارکراوی لەدوای خۆی بەجێهێشت، لە هەموویان بە تام و چێژتر، گۆرانی (لەپاش مەرگم) بوو کە لە هەر چوار پارچەی کوردستان ناوبانگی داوەتەوە... مشکۆ، ناوی تەواوی "حاجی شەوکەت کوڕی سەعید دیرەیی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئاغای دیرەییە" لە عەشیرەتی (زراری)یە.. (دێر) گوندێکە کەوتۆتە بەشی رۆژئاوای چیای پیرمام کە سەر بە هاوینەهەواری (سەلاحەدین)ە.

وەکو دەگێڕنەوە ئەو گوندە لە سەردەمی حەزرەتی عیسا (خوا لێی رازی بێت) ئاوەدان بۆتەوە لەپاشان کوێر بۆتەوە، لە سەردەمی هاتنی ئایینی ئیسلام، دووبارە خەڵکی لێ ژیاوە، تاوەکو ئێستاکەش ئاسەواری دیواری کۆنە دێرەکی ئەو زەمانە ماوە...

دایکی مشکۆ ناوی (دادە مێرۆش کچی خەلیل عەلاف) بووە.. مام خەلیل لەناو خەڵکی شاری هەولێر بە (خەلیلی فاتمە عارەب) مەشهورە، خێزانەکەشی ناوی (عادلە) خان بووە.

مشکۆ لە ساڵی ١٩٠٨ لە گەڕەکی سەرای قەڵای هەولێر چاوی بە دنیا رووناک بۆتەوە. لە ساڵی ١٩١٤ کاتێ جەنگی جیهانی یەکەم دەست پێدەکات، لە شاری هەولێر رەشبگیری دەبێت، سەعید دێرە ماڵی خۆی دەگوازێتەوە بۆ گوندی دێر، چونکە ئەو ساڵە ساڵی گرانی گەورە و قاتوقڕی و برسیەتی و نەخۆشی لەناو خەڵکدا بڵاوبۆوە.. لەو ماوەیەدا مشکۆ دەکەوێتە ناو ئاووهەوایەکی خۆشتر و شەوانە دیوەخانی باوکی قەرەباڵغ دەبێت، مشکۆ بۆی گێڕامەوە گوتی: "ماڵمان لە گوندی دێر بوو شەوانە دیوەخانی باوکم قەرەباڵغ دەبوو، چەندین دەنگخۆش و گۆیندە و لاوک و حەیرانبێژ دەهاتن شەویان بە رۆژ دەکردەوە.. بە تایبەتی (کاوێس ئاغا و عەزیز ئاغا و مەحمود پالانی و فەقێ سمایلی پەلکان) لە هەمان کاتیشدا ئافرەتێک هەبوو جلی پیاوانی لەبەردەکرد و تفەنگ و خەریتەی لە شانی دەکرد و پیاوی فەتاح ئاغای هەرکی بووە، ئەویش زۆرجار دەهاتە دیوەخان و لاوک و حەیرانی بەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەی دەچڕاند".

لە ساڵی ١٩١٨ کاتێک جەنگی جیهانی کۆتایی پێدێت و ئینگلیز شاری هەولێر داگیر دەکات، ماڵی مشکۆ دووبارە دەگەڕێتەوە قەڵاتی هەولێر.

لە ساڵی ١٩٢٣ سەعید دێرەیی باوکی مشکۆ بە نەخۆشی رشانەوە کۆچی دوایی دەکات، مشکۆ بە هەتیوی دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا (سابیر عەلافی) خاڵی بەخێوی دەکات... مشکۆ بۆی گێڕامەوە گوتی: بۆ یەکەمین جار سابیری خاڵم لە قوتابخانە دایناو، بۆ ئەوەی فێری خوێندن

و نووسین ببم و واز لە یاری کۆلان و شەڕوشۆڕ بێنم ڕوو لە خوێندن بکەم، یەکەم ڕۆژ لە قوتابخانە لەگەڵ حەسەن فەندی دوو قوتابی بەشەڕ هاتم ئێمەیان بردە لای بەڕێوەبەری قوتابخانە، پیاوێکی زۆر غەدار بوو، ناوبانگیم بیستبوو، کە خراپ لە قوتابیان دەدات، حەسەن ئەفەندی فەرمانیدا بۆ ئەوەی فەلاقە بکرێین، دوو فەڕاش هاتن فەلاقە خانەیەکیان بۆمان دامەزراند. دوو قوتابییەکە پێش من فەلاقە کران و هاواریان دەگەیشتە ئاسمان، ئەوجارە نۆرەی من هات، خۆم ڕاپچڕی و لەدەستیان رامکرد، کاتێک ئاوڕمدایەوە حەسەن ئەفەندی بە خۆی و حەیزدرانی دەستی و دوو فەڕاشەکە بەدوامەوە بوون، لەبەر دەرگای قوتابخانە دەستگیرکرام. زانیم سزای من لە هی ئەوان خراپتر دەبێت، دوو فەڕاشەکە خۆیان بەسەردادام بۆ ئەوەی رانەکەم، حەسەن ئەفەندی بەڕەڵای کردم بۆ ئەوەی پێش بکەوم، بۆ فەلاقە کردن، منیش مەجالێکم وەرگرت و پاڵێکم بە حەسەنە فەندی وەنا و فڕێمدایە ناو قوڕ و چڵپاوی پێش دەرگای قوتابخانە و رامکرد، ئەو ڕۆژەی لە قوتابخانە دانرام هەر ئەو ڕۆژەش فەسڵ کرام.

**مشکۆ و گۆرانی**

ئەوەی لای ئێمە زانراوە مشکۆ بۆ یەکەمین جار لە دیوەخانیماڵی (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) دەنگی هەڵێناوە و گۆرانی و مقامات و قۆریاتی تورکی لە بەرامبەر مامۆستای خۆی (شەهابەی هەولێری) چڕاندووە. چونکە گۆرانی و مقامات لەوی فێربووە، شەهاب قوتابخانەکی تەواو بووە لە ئوسولی مقاماتی عیراقی و لە قورئان خوێندنیش بێ هاوتا بووە، لەکاتی خۆی لەسەر دەستی مامۆستای بەناوبانگ (سەید مەردان) (١٨٧٤-١٩٥٢) فێری ئوسولی مقامات بووە، لە ساڵی ١٩٣١ جارێکیان عەلی پاشای دۆغرەمەچی دەبێتە نائب لە پەرلەمان و لەپاش گەڕانەوەی لە ماڵیاندا ئاهەنگێکی قەشەنگ ساز دەکات و چەندین دەنگ خۆشی ئەو سەردەمە وەکو (شەهابە و سەید مەردان و حاجی والی چایەچی و عەلی کۆر ئامادە دەبن) شەهاب مقامات دەخوێنێ، حاجی حەمدی عەلی خان لەو کۆڕە ئامادە دەبێت، دەڵێ: ئێوە نازانن کەوا مشکۆش گۆرانی بێژە و تەقلیدی مامۆستای خۆی (شەهابە) دەکاتەوە، لەوکاتەشدا سابیری خاڵی مشکۆش لەو مەجلیسەدا ئامادە بووە، بەدوای مشکۆدا دەنێرن و سابیریش دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ و تەلاق دەخوات دەڵێ "ئەگەر مشکۆ گۆرانی نەڵێت ئەوا بەو دەمانچەیە دەیکوژم". مشکۆش بە ناچاری و ئارەقەی نیوچەوان دەسڕێتەوە لەناو مەجلیسی پیاو ماقوولانی ئەو



شارەدا دەستی دەخاتە بناگوێ و بۆ یەکەمین جار لەسەر نەغمەی مقامی بەیات بۆی هەڵدەستێ، شەرمی دەشکێ و لەو رۆژەدا دەبێتە گۆرانی بێژ و لەناو خەڵکی ئەو شارە ناوبانگ دەردەکات، ئەمە و لەلایەکی تریشەوە (وەستا عوسمان قاورمەچی) بۆی گێرامەوە گوتی: "لە ساڵی ١٩٢٥ کاتێک باوکم دایکمی هێناوە، ئەو کاتەش بووکگواستنەوە بە پێیان و وڵاخ بووە، دایکم دەڵێ کاتێک منیان لە گەڕەکی عارەبان بە بووک گواستەوە، بۆ گەڕەکی خانەقا، چەند دەنگ خۆشێک لە پێشەوە بەدەم رۆیشتنەوە گۆرانیان دەگوت، لەوانە (عەلی کۆری) مەولود خوێن بوو، هەروەها مشکۆش لەوکات تەمەنی (١٦-١٧) ساڵان بوو (دەمبکەکی) بەدەستەوە بوو بۆ ئەو خەڵکە گۆرانی و بەستەی دەچڕاند". واتە مشکۆ هەر لەسەردەمی گەنجییەوە حەزی لە گۆرانی و مقامات دەکرد، ئەو هۆیانەش بووە پاڵی پێوەناوە کە رۆژێک لە رۆژان ببێتە گۆرانیبێژ.

**لەپاش مەرگم چۆن سەری هەڵدا؟**

مشکۆ بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٣٩ ژنی هێناوە، ئەویش (هەیبەتی کچی حاجی مەحموودی عەلاف) بووە. لەو ژنەی تاقە کچێکی لێ هەبووە، لە ساڵی ١٩٤٣ جارێکیان مشکۆ لە ماڵەوە بەشەڕدێت و دڵی تەنگ دەبێت، روو لە شاری بەغدا دەکات، ژنەکەی و تاقە کچەکەی و دایکی بەجێ دەهێڵێ، پاش ماوەیەک خێزانەکەی تووشی نەخۆشی (گرانەتا) دەبێت و کۆچی دوایی دەکات، لێرە لە شاری هەولێرێ (مام فەتەلی گۆزدلی) شوفێر بەدوای مشکۆدا دەچێت و دەیدۆزێتەوە، ئەویش بە پەلە دەگەڕێتەوە شاری هەولێر، بەڵام دوای چی؟ کاتێک دەبینێ کارلەکار ترازاوە ئەویش بە ناچاری روو لە گۆڕستان دەکات و دەچێتە سەر گۆڕی و دەڵێ: "لەپاش مەرگم چ فایدە، بێیە سەر قەبرم لەبۆ شیوەن"، خۆی ئەم پارچە شیعرە هی ئەختەری شاعیرە، مشکۆ دەستکاری تیا کردووە، لەپاش ماوەیەک ئەم گۆرانییە لەناو دیوەخانەکانی شاری هەولێر ناوبانگ دەردەکات و لەدواتریش دەپەڕێتەوە بۆ شارەکانی دیکەی کوردستان.

ئەمەش دەقی شیعری ئەختەرە:

**بەتیری غەمزەی دووچاوی مەستی تۆ بریندارم**



**دەچێ بۆ عەرشی ئەعلا دائیمە فەریاد و هاوارم**
**فیدات بم تاکەی ئەم جەورە بە کوشتن سا عیلاجم کە**
**لە دەرد و میحنەتی دووری گەلێ لەم ژینە بێزارم**
**لەپاش مەرگم چ فایدە بێیە سەر قەبرم لەبۆ شیوەن**
**هەتا ماوم نەفەس بفەرموو بپرسە چۆنە بیمارم**
**جەسودیم دێ کەسی تر کوشتەی عیشوە و نیگاهت بێ**
**سوپەر بۆ دڵ لەهەرلا بۆ خەدەنگی تیری دڵدارم**
**بەبێ سووچ و قەباحەت چاوەکەم بۆ چ لێم تەوەللا بووی**
**روح و دین و دڵ تەسلیمە قوربان بەس بێ ئازارم**
**خۆراکم خوێنی دڵ بوو هەر کە میوانی موحیبەت بووم**
**لە ئێستاوە دیاریدا کە ئاخر چوون ئەبێ کارم**

لە ساڵانی پەنجاکان کاتێک وەستا (لەتیفی چەخماخچی و وەستا پیرباڵ) ئامێری تۆمارکردنیان لە شاری بەغدا بۆ یەکەمین جار هێنایە هەولێر، یەکەم کەس مشکۆ بووە گۆرانی لەپاش مەرگمی تۆمار کرد، لە پاشان لە ئوتێلی (مام جەمیل) چەندین کاسێتیان لەگەڵ (شاکر حەمە فارس و پیرداودە کۆرە و جەمیل منیر) تۆمارکردووە، هەروەها لاوکی (جەوێ... جەوێ)ی کاوێس ئاغا، کە لەکاتی خۆیدا لەسەر قەوان تۆماری کردبوو، داوایەتییە مشکۆ چونکە لەکاتی خۆیدا ئەم لاوکە مشکۆ لە چایخانەی (عەلی فلەیح)دا لە بەرامبەر کاوێس ئاغا چڕاندوویەتی، ئەویش زۆری پێخۆش بووە.. ئەم لاوکەش لەلای مشکۆوە لەسەر کاسێت تۆمارکراوە.

**مشکۆ و شاری کەرکوک و سولەیمانی و موسڵ**

مەقام زان و دەنگ خۆشی شاری کەرکوک (حەمە

دریژ) بۆی گێرامەوە گوتی: " لە کۆتایی سالانی سییەکاندا کاتێک کە شەهابەی هونەرمەند و دەنگخۆش دەهاتە شاری کەرکوک لە خزمەتی شێخ عەلی تالەبانیدا میوان دەبوو، مشکۆشی لەگەڵ خۆی دەهێنا و بە خەڵکی ئەو شارەی دەناساند.

مشکۆ دۆستایەتی لەگەڵ چەندین هونەرمەند و دەنگخۆشی شاری کەرکوک پەیدا کرد، لەوانە: "مامۆستا عەلی مەردان و رەشەی کوللە رەزا و عەزەدین نیعمەت و توپاڵ حەمە و سمە بەربەر و عەبدولواحید گۆزەچی و حەمە دریژ و خەڵکانی تر... وە لە دیوەخانی شێخ حەسیبی لەیلان و خانەقای سەید ئەحمەد و چایەخانەی جوت قەحوە دەنگ هەڵدەهێنێ و مقامات و قۆریات دەچڕێ.. لەلایەن بنەماڵەی (نەفت چیەکانی) کەرکوک ریزی تایبەتی خۆی هەبووە، چونکە لە ئاخیێکی تایبەت بەرامبەر یەکێک لە کەسایەتی ئەو بنەماڵەیە مشکۆ وەستایەتی خۆی پیشانداوە بەتاقی تەنیا لە بەرامبەر چەندین دەنگخۆشی ئەو شارە دەنگی هەڵێناوە بەبێ ئەوەی کەسێ بتوانێ منافەسەی بکات. لە شاری سولەیمانیش چەندین جار ئاهەنگی گێراوە. لە سالی ۱۹۵٦دا (حەمەی فەرەج ئەفەندی) مشکۆی دەعوەتی سولەیمانی کردووە، لەسەر شەرەفی (شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحمودی نەمر) لەگەڵ رەشۆڵ عەبدوللا ئاهەنگیان گێراوە و شەویان بە رۆژ کردۆتەوە... هەروەها لەگەڵ (حەسەن زیرەک و مەحمود ئەفەندی) لە مالی شێخ رەئوفی خەفاف دەنگیان هەڵێناوە.

لەپاش شۆرشی چواردەی تەموزی ۱۹۵۸ لەگەڵ وەستا لەتیف چەخماخچی و وەستا تاقی چایەچی و شاکر حەمە فارس و حاجی فائیقی محەمەد سوڵتانی بازرگان، چونەتە شاری موسڵ و چەندین شریتیان تۆمارکردووە. بە تایبەتی ئەو ئاهەنگەی لە (مەلهەی ئەتلەس) بە هاوکاری مۆسیقا ژەنی بەناوبانگ (غانم یەحیا) کە ئەرمەنی بوو شریتی لەپاش مەرگمیان تۆمارکردووە.

لە سالی ۱۹٦۱ کاتێک شۆرشی ئەیلولی مەزن دەست پێدەکات، مشکۆش چەندین سروودی نیشتمانی چراند و بە تایبەتی لە سالی ۱۹٦۳ لە شەری هندرێنی خوێناوی، لەناو گەرمەی شەردا مشکۆی هەولێری وەک پێشمەرگەیەک بە گۆرانی گوتن لەو مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاوداوە دەڵێ:

**نامەوێ مولکی ئێران یان پادشایی خاکی رۆم**
**کێوی سەنعان بێ لە لوبنان ئەگە بە معشوقی بوی بڕۆم**
**خاکی وەتەن زۆر گرانە جێی ئابا و ئەجدادمانە**
**گەر بسووتێم گەر بکوژرێم بەرەو خاکی کوردستان دەڕۆم**
**گەر بسووتێم گەر بکوژرێم هەر دەڕۆم...**

هەروەها لەدوای بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری سالی ۱۹۷۰ مشکۆ هەموو شەوێک ئاهەنگی گۆرانی لەگەڵ خالە تاهیر و رەسول گەردی و فوئاد ئەحمەد و حەیدەر بەقاڵ (ناسراو بە حەیدەرە کەچەڵ) دەگێرا. لە سالی ۱۹۷۱ تووشی نەخۆشی هات و خرایە نەخۆشخانە و لە مانگی تشرینی یەکەم هەمان ساڵ لە مالی لەتیف چەخماخچی کاتێ لە نەخۆشخانە دەرچووە، ناوی (بارزانی) نەمر دەهێنێ. لەدوای ۱۱ی ئازاری سالی ۱۹۷٤ ئەم کاسێتە لەلایەن حکومەتی مەرکەزی قەدەغە کراوە. تیپی مۆسیقای ئەو سەردەمەش پێکهاتبوون لە (مامۆستا عەبدولواحد مەرجان-لەسەر کەمان و کاک مستەفا رەئووف لەسەر عود و کاک ئەکرەم بەکر ئیقاع...).

مشکۆ لە ماوەی ژیانیدا تاوەکو مردنی زیاتر لە (٦۰۰) کاسێتی تۆمارکراوی لەدوای خۆی بەجێهێشت، بەلام ئەوەی جێگای داخە، چەندین ئاهەنگی گۆرانی تایبەت لە مالەکاندا گوتراوە تاوەکو ئێستاش گوێمان لێ نەبووە.

مشکۆ لەدوای تەمەنی ژیانیدا تووشی نەخۆشی هاتووە ماوەیەک لە نەخۆشخانە و ماوەیەک لە مالەوە کەوتووە، لە ئەنجامدا مەرگ مەودای نەدا و لە شەوی هەینی لەسەر شەمەی ۱۹ی مانگی مایسی ۱۹۸۹ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و بۆ دواجار مالئاوایی لێکردین، بۆ بەیانی بەرەو گۆرستانی (ئیمام محەمەد) لە شاری هەولێر بە خاک سپێردرا، سلاو لە گیانی.

■

# مشکۆی قۆریات و مەقامبێژ
# ١٩٠٨-١٩٨٩

**باکووری**

"مشکۆی" هونەرمەندی قۆریات و بەستەی رەسەن و مەقامی کوردی. قەڵاتێکی تر بوو! قەڵاتێکی هونەری گۆرانی بوو لەتەک قەڵاتە دێرینەکەی هەولێر! لەلای خەڵکانی هونەر دۆست و خاوەن چێژ وەرگرتن لە گۆرانی، کە ناوی کۆیە هاتە نێو قسەوباسی هونەری ئاواز و مەقام، زوو ناوی سێوەو تاهیر تۆفیق دێ! ئەگەر ناوی هەولێر هات یەکسەر ناوی مشکۆ دێتە سەر زاران!. جا پێش ئەوەی باسێکی درێژی ئەو (قەڵاتە) هونەرمەندە بکەم، حەز دەکەم باسی یەکەم جار کە مشکۆم بینی و ناسی، بکەم! ئەو رۆژە یان (شەوە)م قەت لە یاد ناچێ: ئەڵێم (شەو) چونکە شەوبوو. شەوێکی زستانی ساڵی ١٩٥٨ بوو لە کۆیە. کە (مشکۆ)م دیت و یەکترمان ناسی: لە دەرگای ماڵەوەمان درا، منیان دەویست، کە چوومە دەرەوە، مامۆستایەکی قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە، ناوی مامۆستا خەلیل خۆشناو بوو، بە زەردەخەنەیەکەوە، دەستی بۆ درێژ کردم و تەوقەمان کرد، ئینجا



وتی: "هاتووم ئەمشەو بۆ ماڵمان دەعوەتت بکەم، لە خزمەتت دابین!" منیش بە زەردە خەنەوە وتم: خێرە؟ وتی: برادەرێکی گۆرانیبێژی هەولێری بەو دردنگانە گەیشتوتە کۆیە و ئەمشەو لەلام میوانە، جا حەز دەکەم لە گەڵیدا بەیەکدیتان بناسێنم و ئاشنایەتی لە گەڵیدا پەیداکەی، دەنگی خۆشەو حەزی لێ دەکەیت، گووتم: ئەگەر ئەمە راستی بێ، ئامادەم.

ئەوەبوو لەگەڵیدا چووم و عوودەکەشم برد، بەپێ بەرێ کەوتین تا ماڵیان، کە دووریش بوو، بەڵام ئەوسا لە کۆیە تاکسی نەبوو، مۆدەی تاکسی گرتن بۆ ناو شار پەیدا نەبوو بوو، تەنیا لەنێوان شارو دەوروبەری: بۆ هەولێر یا بۆ کەرکووک یا بۆ سلێمانی ترومبێل بەکرێ دەگیرا.

گەیشتینە ماڵی کاکە خەلیل و یەکسەر بۆ ژووری میوانان. ژوورێکی بچووک و قشتیلە. دووکەس لەسەر مافوورەکە دانیشتبوون، کە ئێمە چووینە ژووردوە، ئەوان هەڵسانە سەرپێ، ئینجا مامۆستا خەلیل وتی: تەقدیمتان دەکەم، باکووری، ئەوەش کاکە مشکۆیە: تۆقەم لەگەڵیدا کرد: پیاوێکی زەعیف و لاواز، کورتەک و شەرواڵکی لەبەر.. وتی: زۆر بەخێربێی مامۆستا، ناوبانگتمان لە هەولێر بیستووە! سوپاسم کرد و تۆقەیەکی گەرمان کرد، ئەوی تریش بە پێچەوانەوە: پیاوێکی قەڵەوی سەر گەوردو ورگ ئەستوور، جەمەدانێکی لەسەر و پشتێنێکی چەند جار لە تەنگەی پێچراو. مەیلەو کورتیلە! مامۆستای خانەخوێ وتی:

ئەمەش برادەرمانە: کاکە عەنتەر! پێکەنیم و وتم: وەڵڵا عەنتەر ئەمما عەنتەر، هەمووومان پێکەنین و دانیشتم: دووبارە بەخێرهاتنیان کردم، ئەوان هەریەکەو پێکیان لە پێش بوو، مامۆستاش بە خێرایی تەرتیباتەکەی بۆ من و بۆ خۆی کرد و لێی دانیشتین لەسەر مافوور و بالیف.. کاکە مشکۆ گەرم بوو بوو.. وتی: چیت بۆ بڵێم؟ من وتم: وەڵڵا مامۆستا مشکۆ، نازانم چی دەزانیت. حەز دەکەم خۆت ئەوەی حەزی لێ دەکەی و خۆشە بۆمان بڵێی. مشکۆ یەکسەر دەستی کرد بەچڕینی مەقامێکی بەیات و ئینجا بەستەکەی: ئەماڵم دەویٚ نەگەنجی دونیا. ئەی هاوار نەمام!

هەڵبەتە ئەم بەستەیەم گوێ لێ بوو بوو لە دانەرەکەی، کە (شێخ قابیل تاڵەبانی) بوو، کاتی خۆی لە ئێزگەی (رادیۆی) کوردی بەغدا لە ساڵی ١٩٥٣ تۆماری کردبوو و چەند جارێکیش، لە کەرکووک لەگەڵ شێخ قابیل دانیشتبووم و عوودێکی چاکیشی لێ دەدا، بەستەکەشی بەناوی (بێ ناو) تۆماری کردووە، ئێستاش ماوە جاروبار لە ئێزگەی بەغدای کوردییەوە پەخش دەکرێ.

شەوەکەمان زۆر خۆش رابوارد. بەتایبەتیش چونکە دراوسێی ماڵی مامۆستا خەلیل، ئەو کیژە (مامۆستایە) بوو، کە خەریک بوو ببێ بە دەزگیرانم. ئەویش لەگەڵ دەستە خوشکێکی تری هاتبوونە ماڵی مامۆستا، دیاربوو هاتوچۆیان لە بەینابوو. لە ژووری خێزان لەگەڵ منداڵەکان دانیشتبوون و گوێیان لێمان راگرتبوو، ئەم هەواڵە دوایی مامۆستا خەلیل پێی وتم، لە دەرەوە بوو، کە هاتەوە ژوورەوە وتی ئەوا هەندێ میوانمان هەن مامۆستای ئافرەتن و داوای گۆرانی عەرەبی دەکەن! من پێکەنیم و زانیم مەسەلە چییە، بەڵام مشکۆ و عەنتەر نەیان دەزانی.

ئەمە وەسفی یەکتر ناسینی من و هونەرمەندی قەڵاتی هەولێر، خوالێخۆشبوو مشکۆ بوو، بەڵام هەر ئەوشەوە هاتەوە یادم، کە ناوی (مشکۆ)م خوێندبووەوە لە وتارێکی خوالێخۆشبوو مۆسیقا ژەنی ناسراوی کورد، (قادر دیلان) کاتی خۆی لە رۆژنامەی (ژین)ی بڵاوکردبووەوە، کە تیایدا وەسفی ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای مەولەوی کردبوو، کە بەبۆنەی لافاوەکەی سلێمانی، لە پاییزی ساڵی ١٩٥٧ لە هەولێر گێڕابوویان و ناوی گۆرانیبێژە بەشداربووەکانیشی هێنابوو و نووسیبووی، کە حەیدەر بەقال و شێرکۆ (مشکۆ) و رەسول گەردی و...ئەوانی تر.

هەروەها کە هاتنە کۆیە، لەکۆیەش سێوەو من و چەند گۆرانیبێژێکی تر بەشداریان کرد، جا هەموو ناوەکان نووسرابوون، بڕوانە رۆژنامەی ژین ژمارە ١٣٧٢ لەم (ریپۆرتاج)ە شدا ناوی مشکۆ بەهەڵە (شێرکۆ)ی نووسیوە، چونکە رەحمەتی (قادر) دوای گەڕانەوەیان بۆ سلێمانی وتارەکەی نووسیبوو، بۆیە هەندێ ناوی لەیاد چووبوو و هەندێکیشی ناوی راستی هونەرمەندەکەی لە بیرچووبووەوە و بەو شێوەی کە هاتبووەوە بیری نووسیبووی، منیش دوایی ئەم شتەم زانی. کە شێرکۆ مەبەستی (مشکۆ) بوو.

لە ساڵی ١٩٦١ گوێزرامەوە بۆ



هەولێر، خوالێخۆشبوو خاڵە تاهیری نەمر ئەوسا لە موتەسەریفیەت فەرمانبەر بوو لە- زاتیە- وەک کاتبی دەرکردەو هاوردە، ئێمەش خانووێکمان بەکرێ گرتبوو، لە گەڕەکی عەرەبان، پشت بینایەی موتەسەریفیەت، بۆیە ڕۆژێ جارێ بەلانی کەمەوە دەچوومە لای و چایەکم دەخواردەوەو هەندێ باس و خواسی گۆرانی و وەزعی (ئێزگە)ی کوردی بەغدا و شتی ترمان دەکرد و ئنجا دەچوومەوە دەوامی خۆم، تاهیریش ئەغلەب ئێواران، ئەگەر نەچووبایە یانەی فەرمانبەران یاخود لەلایەک دەعوەت نەکرابایە دەهاتە ماڵمان و بەدوو قۆڵی بۆی دادەنیشتین و شەوەکەمان بەقسەو گۆرانی و عوود و گوێگرتن لە قەوانی کۆن بەسەر دەبرد.

لەو ماوەیەش کاکە تاهیر منی بە ژمارەیەک لە هونەرمەندی گۆرانی بێژی هەولێری وەک: حەیدەر بەقاڵ، مشکۆ، حاجی فایەق بەزاز، حاجی جەمیل قاپقاپچی، جامیلە، یونس مەحموود ناساند، جگە لەوانی خۆشم بە تەسادوف پێشتر هەندێکیانم ناسیبوون، بە تایبەتی مۆسیقا ژەنەکان، وەک: یەحیا مەرجان، مونعیم مەزهەر، زیا نوری قەساب، جەمال هدایەت، فوئاد ئەحمەد، محەممەد ئەربیللی، واحید مەرجان، مستەفا و عەدنان مەلا و عەبدوللەتیفی چەقماقچی و.. هتد.

بەلام ئەوانەی زۆر زۆر لە



گەڵیاندا زوو زوو دەمبینین و لە دەعودتی شەخسیاتی ناسراوی هەولێر دەعوەت دەکراین: کاکە تاهیر و رەسول گەردی و فوئاد ئەحمەد و حەیدەر و مشکۆ بووین.

لەوانەش: بەڕاستی زیاتر کاکە تاهیر و حەیدەر و بەندە ئامادەی زۆربەی دانیشتن و سەیران و گەشتی بەهاران لەگەڵ ناودارانی شار دەبووین، من زیاتر وەک مۆسیقا ژەنێک بانگ دەکرام. ئەو کەسانەش کە زیاتر بە زەوق بوون و لەدانیشتنانی ماڵان لە زستانان و لە سەیرانان لە بەهاران بەبێ هونەرمەندانی گۆرانی بێژ سەیران و دانیشتنەکانیان نە دەکرد، ئەو زاتانە بوون: دکتۆر عەبدولرەزاق دەباغ و براکەی محەممەد شەهاب دەباغ کە ئەوسا سەرۆک شارەوانی (رئیس بلدیە)ی هەولێر بوو، محەممەد حەسەن (سەرۆکی شارەوانی پێشتر) و عەبدولمونعیم مەسرەفی موتەسەریفی هەولێر لە ناوەڕاستی شەستەکاندا و حاجی حەمە شەریف و حەمەدەمین عەبۆ ئاغا و حەمە رەشیدی برایان و دکتۆر ئاگۆب و دکتۆر ئیحسان و دکتۆر (داناز)رەئووف دیشچی و ئیحسان موفتی (خەڵکی بادینان بوو) لە گەڵ فارس دزدیی، عەبدولقادر جێمسی و شێخ محەممەدی عەبۆ ئاغا و فەتاح ئاغا و عیزەدین فەیزی، کە هاورێی ئازیزی زۆربەی ئەو خەڵکانە بوو، هەروەها سەعید یوونس (مقاول) و سەلاح عوسمان ئەو ناوانەم هێنایەوە تەنیا بۆ مێژووی ئەم شارە کە لەوانەیە بۆ هەندێ نووسەری مێژووی هونەر وەک سەرچاوەیێک پێویستبن.

ئەمانەش زۆربەی ئاهەنگەکانیان ئەم سێ چوار هونەرمەندە بەناوبانگەی ئەوسا دەیانڕازاندنەوە: تاهیر تۆفیق، حەیدەر و مشکۆ و جەمیلە و رەسول گەردی و من.

بەلام مەرجیش نەبوو هەموو جارێ هەموویان بەشدارییان بکردایە، مشکۆ و گەردی ئەوەندە

خۆیان لەم جۆرە بەزمانە نەدەدا، مشکۆی هونەرمەند بە مەقام و قۆریاتییەوە و ڕەسول گەردی بە حەیرانەوە.. شوێنی تایبەتیان هەبوو لە دڵ و زەوقی هەولێرییان.

بۆیە ئامادەبوونیان لە یەکێ لەو شێوانە بەسترابووەوە بە هەبوونی یەک دوو کەسی خاوەن چێژ وەرگرتن لە قۆریات یا لە حەیران!

لەو ماوەیەدا جگە لەو کەسانەی لەسەرەوە ناوم هێنان، کە زۆر دانیشتن لەگەڵیاندا هەفتانە رووی دەدا، بەڵام خەڵکانی دیکەم ناسین کە ئەوانیش خاوەنی زەوق و حەزی ڕابواردن بە گوێ گرتن لە مۆسیقا و گۆرانی بوون، وەک: ئیسماعیل ئاغا یەعقوبی، پۆلسی (صیدلی)، عیزەدین قۆجە، میساکی بەرگدروو (ئەرمەنی بوو). زۆری حەز لە قۆریاتی تورکی بوو بە دەنگی حەیدەر و مشکۆ، هەروەها حاکم جەلیل و وشیار و کەمال عوسمان و براکەی سەلاح و، لەچەند بۆنەیەکیش حەسەن ڕەفعەت و عەلی شەریف و زۆرانی دیکە. کە ئەوانە کەم لەم جۆرە ئاهەنگانە ئامادە دەبوون.. بەڵام کە دەشهاتن بەڕاستی ئیسپاتیان دەکرد، کە دەزانن قیمەتی هونەر و گۆرانی و هونەرمەند چییە و بەوپەڕی ڕێزلێگرتن لە گەڵماندا ئێمەی هونەرمەندەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد و هەستی خۆیان بۆ ئێمە دەردەبڕی.

مشکۆ.. ناوی تەواوی: شەوکەت کوڕی سەعیدی کوڕی حاجی برایم ئاغای دیرەییە، خوالێخۆشبوو لەساڵی (١٩٠٨) لە گەڕەکی سەرا، لەنێو قەڵاتی هەولێر لە دایک بووە و دوای (٨١) ساڵ تەمەن، لە (١٩٨٩/٥/١٨) کۆچی دوایی کرد، هەر لە شاری خۆی زێدی باوو باپیرانی و لە گۆڕستانی (ئیمام محەمەد) بە خاک سپێردرا.

خوالێخۆشبوو لە ماوەی ئەو تەمەنەدا با بڵێین لە گەنجایەتی ڕا، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٤ و هەورازتر بوو، تا ئەو کاتەی نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی چیتر مەودای نەدا قورگی بۆ گۆرانی وتن بەکاربهێنێ، کە ئەویش لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٩ بوو، کە ماوەکە دەکاتە زیاتر لە (٦٠) ساڵ لە تەمەنی، هەر بە مەقام و قۆریات و بەستە گوتن خۆی خەریک کردووە و عاشقانی دەنگی مشکۆ عەودالی بوون و ئاهەنگ و بەزمەکانیانی جۆش داوە و خۆش کردووە.

ئەو ئاهەنگ و سەیرانانەی مشکۆی تیادا نەبوایە، دەنگی ئەو هونەرمەندە تیایدا نەیچریکاندبایە، بە تایبەتی لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا، ئەوە بە ئاهەنگ و بەزمێکی خۆش نەدەژمێردرا، من خۆم لەگەڵ هوورمەندانی هەولێر چەندین جار سەفەرمان کردووە، یا داوەت کراوین لەلایەن سەندیکای دکتۆران و ئەجزاچیان و فەرمانبەرەکانی بانقی ڕافدەین و جەماوەری تر، کە مشکۆمان لەگەڵ نەبوایە، هەروەها هەرجارە یەکێک دەیگوت: کوڕینە.. ئەرێ نابینن دەنگی مشکۆمان لێ کەمە؟ چونکە بەڕاستی لەناو هونەرمەندانی ئەم ناوچەیە



ئەستێرەیەکی گەش بوو، شوێنی خۆی لە دڵی هەمواندا کردبووەوە! بەزم و دانیشتنی خۆی لەگەڵ تاهیر و رەسول و حەیدەر جاروبار بۆمانی دەگێڕایەوە، ئەگەر بەرێکەوت پێکەوە کۆ بووبووینایەوە بۆ بۆنەیەک.

لە بیرمە، لە رۆژی سێیەمی کۆچی خوالێخۆشبوو (تاهیر تۆفیق) لە ئۆتۆمبێلێکدا من و مشکۆ و مەحموود زامدار بەرێکەوتین بۆ (کۆیە) تا ئامادەی پرسەی هونەرمەندی گەورە بین، مشکۆ و مەحموود لە دواوە بوون، من لە پێشەوە لای شوفێرەکە بووم.

رۆژی (٢٢/ ١٠/١٩٨٧) بوو، مشکۆی نەمر، تا گەیشتینە کۆیە، ناوە ناوە باسێکی تایەری مەزنی دەکرد، رووداوێکی دەگێڕایەوە کە لە کاتی خۆیدا، ساڵێ لە ساڵان رۆژێ لە رۆژان لە سەفەرێکدا لە ماڵێ لە هۆڵێکدا پێکەوە بەشداربیان کردووە، خۆی و تایەر و هونەرمەندانی تر. جا کە رووداوەکانی دەگێڕایەوە، فرمێسکی خۆشەویستی بۆ هاورێی شیرینی وەک باران دەرژاند، تا کەمێک هێورمان دەکردەوە.. زۆر جاریش ئێمەشی بە گریان دەهێنا، لەو شتانەی دەیگێڕایەوە، جارێکیان، لە دەڤەری بادینان دەیگوت لە ئاهەنگێکدا پێکەوە بووین، کاتێ کاک تاهیر گۆرانی دەچڕی، میوانە دەوڵەمەندەکان، دەچوونە لای لەسەر شانۆ، ماچیان دەکرد و ئنجا پارە (١٠) دیناری و پێنج دیناریان دەردەهێنا بە (سەفتە) و بەسەر تاهیریان دادەباراند! بەڵام ئەو هیچ گوێی نەئەدانێ و تادەوری خۆی تەواو دەکرد، ئنجا بە هێواشی دەهاتەوە شوێنەکەی خۆی لەلامان، کە لەسەر یەک مێز جێگامان بۆ دانرابوو، بێ ئەوەی تاهیر بپرسێ ئەو پارەیە.. ئەو هەموو کاغەزە.. دە باوی و پێنج باوی، چییان لێ هات؟ کێ بردی؟ ئەمەندە عزەت نەفسی هەبوو، ئەگەر چی دەشمزانی (ئەوە هەر قسەی مشکۆ بوو) کەوا خاڵە تاهیر دە دیناری لە گیرفان نەبوو!

ئەم هونەرمەندە، وەک هەموو گۆرانی بێژەکانی رەسەنی ئەم وڵاتەمان هەر لە منداڵییەوە گۆرانی و سروودیان وتووە و پێگەیشتوون، هەر ئەو خۆرسکییەیە، کە لە کۆمەڵەکەی خۆیان بۆیان ماوەتەوە و پێی پەروەردە بوون، بەداخەوە هەموویان نەخوێندەوار بوون.

ئەوەی زۆر بەختی باش بووە ئەوا قوتابخانەی سەرەتایی خوێندووە، ئەگینا هەموویان سوختە و لەلای مەلا کەمێک ئەلف و بێیان خوێندووە و باری ئابووری و ژیان لێ نەگەڕاوە خوێندنی قوتابخانە بەرزەکان تەواو کەن.. لە هەمان کاتیشدا لە هەموو کوردستان مۆسیقا ژەنێک نەبووە یارمەتیان بدات.. یا پەیمانگایەک نەبووە بۆ فێرکردنی مۆسیقا و دەنگ تاکو تیایدا دەنگ و بەهرەی خۆیان پەروەردە بکەن، ئەوەتا مشکۆی بەهرەوەر لە پەنجاکاندا ناچار پەنا دەباتە بەر مۆسیقاژەنی موسڵاوی (غانم یەحیا) کە لە (ملهی) لەوێ مۆسیقاژەن بوو، بە پارەی خۆی کاکە مشکۆ لەگەڵ چەند هاورێیەکی داوای لێ دەکەن مۆسیقا بۆ مشکۆ لێ بدا بە کەمانچە، بەم جۆرە کاسێتێکی بۆ پڕ دەکرێتەوە بە چەند مەقام و قۆریات و گۆرانییەکەی هونەرمەندی کەرکوک (شێخ قابیل تاڵەبانی- واتا بێ ناو) کە (ئەی هاوار نەمام) بوو.

خوالێخۆشبوو (لەتیف چەقماقچی) لەدوای پەنجاکاندا و دوای ئەوەی منیش هاتمە هەولێر و لەگەڵ چەند مۆسیقا ژەنێک کە تاک تاک پەیدابوون لە چەند دانیشتنێک، هەر لە ماڵی خۆی (واتا ماڵی کاکە لەتیف)ی رەحمەتی چەند کاسێتێک بۆ چەند گۆرانی بێژێک پڕکرایەوە، وەک: رەسول گەردی و محەمەد ئەربیللی و مشکۆ و باکووری و تاهیر تۆفیق و جەبار ئەربیللی و یەک دوو حەیران بێژو و لاوک بێژی دیکە، کە بەراستی ئەم کارە خزمەتێکی گەورە بوو بۆ پاراستنی بەشێکی زۆری گۆرانی رەسەنی کوردی، مۆسیقاژەنەکان، جگە لە خۆم، کاکە یەحیا مەرجان و براکەی واحید مەرجان و یوسف باکووری و مستەفا رەئووف و عەدنانی مەلا و شەمسەدین عومەر بوون، کە هەمووشیان بەبێ موقابیل ئەم خزمەتەیان دەکرد، تەنانەت لەتیفی

هونەرمەند جگە لەو مەسرەفەی کە دەیکرد بۆ دانیشتنەکە بۆ خواردن و خواردنەوە و میوەو شتی دیکە، هەندێ پارەشی لە گیرفانی خۆی دەدایە گۆرانی بێژە هەژارەکان!!

ئەمە بوو حاڵی ئەو دۆخەی هونەرمەندانی وەک مشکۆ و غەیری مشکۆ و حاڵی هونەری مۆسیقا و گۆرانی، کە بەراستی قارەمانیەتی ئەو گۆرانی بێژە نەمرانە، کە توانیان لەو جۆرە کەشوهەوایە هونەرییە لاواز و بەستەزمان و بێ کەسە، هەنگاو بنێن و ڕێگای بەرخۆیان تەخت بکەن و بەهەر نرخێک بێ، جێی پێی خۆیان بکەنەوە و ڕێگاکە ببڕن ئەمە ئەوپەڕی خزمەت بوو کردیان.

لەچەند دانیشتنێک لە هەندێ شوێن، لەگەڵ خوالێخۆشبوو مشکۆ ئامادە دەبووم و بەعوودەوە بەشداریم لە گەڵیدا کردووە، یەکێک لە مەقامە بەناوبانگەکانی گۆرانییەکەی (لە پاش مەرگم) بوو، کە زۆر بەتام و خۆش دەیگوت، دەڵێن گوایا هەڵبەستی ئەم شیعرە دەگەڕێتەوە بۆ (ئەختەر)ی شاعیری دڵتەڕ و ئاغا و مەقامزانی کۆیە! بەڵام ئاوازەکە هەر مشکۆ خۆی بۆ شیعرەکەی (وەک مەقام) گوتووە.

کاکە جەماڵ دیلان چیرۆکی وتنی ئەم گۆرانییە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: مشکۆ لە ساڵی ١٩٣٩ ژنی هێناو کچێکی بوو، لە ساڵی ١٩٤٣ شدا بەرەو بەغدا ڕۆیشت و ژنەو کچەی لە هەولێر بەجێ هێشت.



پاشان ژنەکەی تووشی نەخۆشی گرانەتا (تیفۆئید) دەبێ و بەم نەخۆشییە دەمرێ! کاتێک مشکۆ ئەو هەواڵە دەبیستێ، بە پەلە دەگەڕێتەوە هەولێر، دەچێتە سەر گۆڕەکەی و شیعرەکەی (ئەختەر) بە دەسکارییەوە بە گۆرانی دەڵێ و (لە گەڵیدا هەڵبەتە دەگریێ) کە دەڵێ: لە پاش مەرگم چ فایدە بێیە سەر قەبرم لە بۆ شیوەن.

لە ساڵی ١٩٤٨ بۆ جاری دووەم هاوسەرێکی تری بۆ خۆی پێکدێنێ و لەو ژنەشی سێ منالی دەبێ: دوو کوڕەکەی یەشار و وشیار، بۆ خاتری بیرەوەری باوکیان کە زۆریان خۆش دەویست و ڕێزیان لێی دەگرت، تۆمارگەیەکیان کردۆتەوە بە ناوی (تۆمارگای مشکۆ).

مشکۆ لەگەڵ هونەرمەندانی کۆن وەک کاوێس ئاغا و عەزیز ئاغا و محەمەد عارفی جزیری و حەسەن جەزراوی و تاهیر تۆفیق و ئەوانی تر بەروح و بەگیان خۆشی دەویستن و خۆشیان دەویست..

مەقام و گۆرانی چڕینیش وەک خۆی لە چەند شوێنێک لە چاوپێکەوتن لەگەڵیدا بۆ رادیۆ و تەلەفزیۆن. لە مەقامزانی هەولێری (شەهابە) فێر بووە و زۆریشی حەز لە دەنگی ئەو بلیمەتە دەکرد.

ئەم هونەرمەندە (شەهابە) زۆر ناوی هاتووە لەسەر زاری هونەرمەند و گوێندەی ڕەسەن و کۆنەکانی هەولێر وەک مشکۆ و حەیدەر بەقاڵ و فایەق بازرگان و ئەوانی دیکە. دیارە مرۆڤێکی بەتوانا بووە و دەنگی زۆر خۆش بووە.

لەڕۆژی ٧/ ١٠/ ١٩٧٦ بۆ یەکەم جار لە هەولێر ئاهەنگێک بە پەلە ڕێکخرا، لەسەر شانۆی هۆڵی لاوان کە ئەمڕۆ بەشێکە لە بینایەی وەزارەتی ڕۆشنبیری! ئاهەنگەکەش بە

بۆنەی (ڕۆژی جیهانی مۆسیقا) لە بەغداوە بروسکە هاتبوو بۆ ئەمین عامی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان کە دەبێ ئاهەنگێک بکرێ لە هەموو شارەکانی عیراق و گۆرانی بێژە کۆنەکان (رواد) ڕیزیان لێ بنرێ.

تەلیفۆنم بۆ کرا، بۆ ماڵەوە، کە دەبێ ئامادەی ئەو ئاهەنگە بم، هەرهەمان ڕۆژ بۆ ڕێزلێنانم، کە چووم دەبینم کاک مشکۆ و خاڵەتایەر و ڕەسوول گەردی و..هتد لەوێ ئامادەن.

ئەوەبوو تیپی مۆسیقای لاوان: شێرزاد سەرسپی و چەتۆ حەسەن و شەریف و یەک دوو مۆزیکژەنی دیکە لەسەر شانۆ بوون و دەست کرا بەمۆسیقا و یەکەیەکە بانگ کراینە سەر شانۆ بۆ پێشکەش کردنی ئاهەنگی خۆمان، تایەر و ڕەسوول و مشکۆ و من و ئەوانی دیکە.

لە کۆتایی ئاهەنگەکە یەکە یەکە بانگ کراینە سەر شانۆ جەنابی جێگری پارێزگا، خوالێخۆشبوو (کاکە ئەنوەر) بوو بانگ کرایە سەر شانۆ! ئێمە وامان زانی سەرو سەد دینارێکمان دەدەنێ! لە نێوان ڕەسول و مشکۆ مشتومڕ بە یەواشی دەستی پێ کرد و ڕەسول دەوی لە بناگێی مشکۆ نابوو. نەمزانی چی پێ دەگوت. بەڵام مشکۆ بە دەنگێکی نزم هەر پێ دەکەنی.

یەکەم کەس کە خەڵاتەکەی وەرگرت.. سەیرمان کرد (کاس)ێکە لەو کاسانەی دەبەخشنە یاریکەرانی تۆپانێ، کە نرخی کاسەکە لە (٢٥) فلس زیاتر نەبوو، حەمید مەرمەرچی کاسەکەی دەدایە سەید ئەنوەر، ئەویش تۆقەی لەگەڵ دەکردین و کاسەکەی لە دەستمان دەنا! بەڵێ بەم جۆرە بۆ یەکەم جار لە مێژووی عیراق، لە ڕۆژی جیهانی مۆسیقا، لە هەولێر هونەرمەندان ڕێزلێنرا! ئینجا ڕەسول گەردی بە هێواشی وتی: بەرێ..!! لە تۆپانێ بردمانەوە!! بەڕاستی من لەبەر پێکەنین زگم ئێشا! مشکۆ زیاتر..

وتەکەی خاڵە ڕەسولیش بووە مەتەڵ لە بەینمان!

هەر جارەی بەیەک گەیشتباین لە بۆنەیەک یا ئەو ڕۆژەمان دەهاتەوە بیرو سەر لەنوێ پێدەکەنینەوە، ئەوەی ڕاستی بێ من دانیشتم و تەسادوفم لەگەڵ مشکۆی نەمر زۆر کەم بوو، کەمتر بوو لەوانەی لەگەڵ حەیدەری حاجی عەبدولڕەحمان (حەیدەرە کەچەڵ)، بەڵام مشکۆم زۆر خۆش دەویست و دەنگی مشکۆم زۆر لەلا پەسند و ڕەسەن بوو.

بە کۆچی دوایی مشکۆی هونەرمەندی (قەڵات)ی گۆرانی هەولێر، بۆشاییەکی تەواو پەیدا بووە، ئەمڕۆ لەو شێوە گۆتنە و ئەو مەقام و قوریاتانەی مشکۆ دەیچڕین! ئەگەرچی یەک دوو کەس ئەمڕۆ قۆریات دەڵێن.. وەک محەمەد و جەبار و جەلال ئەربیللی بەڵام مشکۆ (مۆرک و شێوازی) تایبەتی خۆی هەبوو، دەنگی زوڵاڵ و هێمن و پڕ سۆز بوو، گەڕەکی عەرەبان کە مشکۆ تیایدا ژیا لە منالییەوە، تامی تایبەتی بەخشیبوو بەژێی دەنگی ئەو هونەرمەندە و لانەی منداڵی خۆی زۆر زۆر خۆش دەویست، ئێستاش ئەو گەڕەکە دێرینە خامۆشە!!

وەختە بڵێم جێ پێ و هەنگاوە لەسەرخۆیەکانی مشکۆ دەنگ و سەدایان لەو گەڕەکە مێژووییە دێت!

ئەو ڕۆژەی گەڕەکی عارەبان بێ مشکۆ مان، ڕۆژێکی خەماوی بوو.. ماڵ نەبوو بۆی نەگریێ!

لە ١٨/٥/١٩٨٩ ی (ڕۆژمێر)ەکەم، کە بیرەوەریەکانی خۆمم تێیدا نووسیوە نووسراوە: فرمێسکی ئەستێرەی ڕەنجم کەشتی تاوان ئەخنکێنێ.

سەرچاوەکان
١- نووسینەکانی کاکە جەمال دیلان، لە برایەتی ئەدەب و هونەر، گۆڤاری ڕامان، ١٩٩٧، گۆڤاری هەرێم، کانوونی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.
٢- جەلال بەیداغدار، ڕۆژنامەی برایەتی ١٩٩٧،
٣- ئەرشیف و بیرەوەریەکانی خۆم، بەشێکیان نووسراون و لە بەرنامەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی هەرێمی کوردستان، بڵاو کراونەتەوە و پەخش کراون.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٧) بڵاوبۆتەوە.

# حاجی فائیقی بازرگان
# ١٩١٨ - ١٩٩١

**جەلال خدر**



مەقاماناس و هونەرمەند و دەنگخۆشی شاری هەولێر (حاجی فائیقی کوڕی محەمەد سوڵتانی بازرگان)، بەڕەچەڵەک دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی (موئەزن زادە)ی هەولێری.. کە لە کۆنەوە لە قەڵاتدا ژیاون.. وەکو زانراویشە باپیرە گەورەیان، کە ناوی شێخ عەبدوڵلا بووە، زانایەکی بەرز و خوداپەرست و ئایینپەروەر بووە لەو شارەدا، لە کاتی خۆیدا چۆتە شاری موسڵ و ئیجازەی ئیرشاد و شێخایەتی لەسەر دەستی (شێخ عوسمان خەتیبی موسڵێ) وەرگرتووە لەپاشان گەڕاوەتەوە بۆ شاری هەولێر و لە قەڵات تەکیەی کردۆتەوە، خەڵک روویان تێکردووە و زکر و تەهلیلەی تێدا بەردەوام بووە، پاش مردنیشی منداڵەکانی جێگایان گرتۆتەوە، گەڕەکی تەکیەی قەڵاتیش بەناوی ئەو مرۆیە مەزنە ناوزەد کراوە.

حاجی فائیق، لە ساڵی ١٩١٨ لە گەڕەکی تەکیەی قەڵاتی هەولێر چاوی بە دنیای گەورە رووناک کردۆتەوە... لە تەمەنی (٦) ساڵان دەخرێتە بەر خوێندنی قورئانی پیرۆز لەلای مامۆستا مەلا (ئیبراهیمی حەنەفی) لە خانەقای جەمیلە فەندی دەخوێنێ، پاش تەواو بوونی جزو عەمە و تەبارەک و چەندین کتێبی بچووک، لە تەمەنی حەوت ساڵان دەخرێتە قوتابخانە، تاوەکو پۆلی چواردەمی سەرەتایی دەخوێنێ، پاشان وازی لە خوێندن هێنا و لەگەڵ باوکی دەستی کردووە بە ئیشکردن، بۆ ماوەیەکی زۆر لەلای وەستا عەبدۆکی خەیات ئیشی کردووە، ئەو وەستا عەبدۆکە شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە ئسووڵی مەقامات و دۆستی نزیکی (شەهابەی هەولێری) بووە، مام حاجی گەلێک سوودی لەو وەستایە وەرگرتووە....

لە ساڵی ١٩٣٦ بۆتە سەرباز و بۆ ماوەی دوو ساڵ لە سەربازی ماوەتەوە سەبارەت بەو سەردەمە

جارێکیان مشکۆی هونەرمەند بۆی گێرامەوە گوتی: (من و حاجی فائیق و مام سالّ) ناوی سەربازیمان هات بۆ ماوەیەک لە ئۆردی هەولێر سەربازیمان کرد، بەلاّم پاشان دایکم منی بە بەدەل کرییەوە ئیدی رزگارم بوو، بەلاّم حاجی فائیق و مام سالّ هەریەکەیان بۆ ماوەی دوو سالّ سەربازییان راکێشا، پاش تەواو بوونی خزمەتی سەربازی، حاجی فائیق بۆ ماوەی (٩) سالاّن کاری شوفێراتی کردووە، لە رێگای دیانە و رەواندز و حەریر.

لە سالّی ١٩٥٨ (حاجی محەمەد سولّتانی بازرگان)ی باوکی کۆچی دوایی دەکات و حاجی فائیقیش لە جێگای ئەودا دەستی بە ئیشی بازرگانی کردووە و لە سالّی ١٩٦٠دا حەجی مالّی خوای کردووە، حاجی فائیق هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنی قورئانی پیرۆز و خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر و بانگدان و سەلاکێشان و مەقامات و قۆریات کردووە، لە زەمانی ئەویشدا دوو مامۆستای بەناوبانگ لەو شارەدا هەبوون وەکو: (شەهابە و سەید مەردان) بوون، لە هەمان کاتیشدا عاشقی دەنگیان بووە لە مەجلیسی ئەواندا دانیشتووە، تاوەکو بە تەواوی فێری ئسووڵی مەقامات ببێ، لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بووە تاوەکو سالّی ١٩٣٨ بۆ یەکەمین جار دەست بە خوێندنی مەقامات دەکات، لە کاتێکدا مامۆستای خۆی (شەهابە) لە کۆڕ و مەجلیسی (محەمەد فەندی موفتی) لە مزگەوتی قەلاّت داخیلی مەقامات دەبێ، بە شیعرێکی حەزرەتی شێخ عەبدولڕەحمانی خالیسی تالّەبانی کەرکووک بۆی هەلّدەستێ و دەلّێ:

**{عاشق اولب روزی ئەزەلدەن ساقیە پەیامز**
**عالەمی غەوغایە سالد نەحرەیی مەستانەمز**
**عالەمی شەراب تر وسلدەن جانا مەست اولمشغ**
**سری وەحدەت تر هەمیشە بادەی مەینی نەمز}**

لێرەدا حاجی فائیق لە مابەینی دوو لووتکە چیای گەورەی وەک شەهابە و سەید مەردان بە غەزەلێک لەسەر نەغمەی مەقامی (مەنسوری) دەست پێدەکات و دەلّێ:

**گۆزن زلفی گیف جانە پەریستان اولمشەم**
**فرقەتی رویم داد بلاهی زاری گیریان اولمشەم**

حاجی فائیق لە سالّی ١٩٥٩ بۆ یەکەمین جار دەچێتە ئێستگەی بەغدا، بەشی تورکی، لەگەلّ هونەرمەندان: (محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و یونس خەتات و نورەدین عەساف و چەندین کەسی دیکە، بۆ گۆرانی تۆمارکردن، لەپاش تاقیکردنەوە مام حاجی سێ گۆرانی تۆمار دەکات: کە لەسەر نەغمەی مەقامی: (رەست، بەیات، سەبا) بوون، چەندین جاریش لەگەلّ مشکۆی هونەرمەند هاتوچوی شاری موسلّیان کردووە، گۆرانییان تۆمارکردووە، بە تایبەتی لە سالّی ١٩٦٢ لە گازینۆی "ئەتلەس" لەسەر شەرەفی (غانم یەحیای) ئەرمەنی و مۆسیقاژەنی بەناوبانگ، چەندین کاسێتیان بەو دەنگە زولالەوە تۆمارکردووە، چەندین جاریش لەگەلّ خوالێخۆشبووان: (حەیدەرە کەچەلّ و خالّە تاهیر و مامۆستا باکووری) ئاهەنگی گۆرانییان سازداوە.

مام حاجی شارەزاییەکی تەواوی لە ئسووڵی مەقاماتی عیراقیدا هەبووە، بە تایبەتی مەقامی (رەست و سێگا و بەیات و نەوا و سەبا و ناری و مەنسوری و بەهەرزاوی و حەکیمی و حوسەینی و دەشت و دیوان و موحەیەر....هتد، مام حاجی بە بەردەوامی هاتوچۆی شاری کەرکوکی دەکرد و لە تەکیەی شێخ عەلی تالّەبانی شان بەشانی

دەنگخۆشەكانی ئەو شارە دەنگی هەڵێناوە، دۆستایەتی لەگەڵ هونەرمەندی بەناوبانگ (مامۆستا عەلی مەردان)دا هەبووە... بەشداریشی لە خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر (د. خ) كردووە، دۆستی نزیكی گۆرانیبێژان رەشەی كوللە و رەزا و عزەدین نیعمەت و تۆپاڵ حەمە و محەمەد گوڵ بۆی و فەخرەدین ئەرگیچ و عالی قەلعالی و مەمەد قەلای و خەڵكانی دیكە بووە، لە ساڵی ١٩٦٣دا بەشداری لە ئاهەنگی گۆرانییەكانی (هیلال ئەحمەری) كەركووكی كردووە، چەندین گۆرانی تۆماركردووە، لە شاری هەولێریش چەندین دۆستی نزیكی هەبوو، لەوانە مامۆستا رەشادە فەندی موفتی، مشكۆ، عەلی فلەیحی چایەچی، حاجی حەمدی عەلی خان، مام ساڵ، حاجی جەمیلی قاپقاپچی، سەید سەعید دامرچی، حاجی عەبدوڵلای دەفژەن، بەكرە كەچەڵ، حاجی عەبدوڵلای حاجی خەیاڵ، وەستا لەتیفی چەخماخچی، مام تاقی چایەچی، سەید سەلیم، وەستا پیریاڵ، وەستا جەلالی چەخماخچی...هتد، مام حاجی لە زۆربەی زۆری ئاهەنگەكانی ئەو شارەدا بەشداری دەكرد، بەتایبەتی ئاهەنگەكانی برایانی (ئۆجاغی توركمان) لە هەولێر، بەو دەنگە خۆشەی مەقامی (رەستی) دەچڕی، تاوەكو ئەمڕۆش لەگەڵدا بێت لەدوای (شەهابە) هیچ كەسێك نەهاتووە ئەو مەقامەی وەكو حاجی فائیق خوێندبێت، هەتا جارێكیان لە ساڵی ١٩٧٧ لە ئاهەنگێكدا، كە لە هۆڵی گەل سازدرابوو، چەندین كەسایەتی شاری بەغدا بانگهێشت كرابوون یەكێك لەوانە مامۆستا (حەقی شبلی) بوو، كاتێك مام حاجی مەقامی رەستی لەسەر شانۆ گوتووە، ئەویش زۆر كەیفی پێهاتووە و گوتوویەتی لە شاری بەغداش ئەو مەقامە بەم شێوەیە نەگوتراوە.

مام حاجی لەدوا تەمەنی ژیانیدا، تووشی نەخۆشی هات و لە ساڵی ١٩٩١ بۆ ماوەی چوار ساڵ لەسەر جێگا كەوت و خەڵك بەدەگمەن سەریان لێدەدا و لە ئەنجامدا لە رۆژی یەک شەممەی ٣٠ مانگی نیسانی ساڵی ١٩٩٥ بۆ دواجارماڵئاوایی دەكات، لە گۆڕستانی رێگای مەخموور (كارگەی قیر) بە خاک دەسپێردرێ.

لەم باسەماندا هەرچەند باسی ئەو مەقامزانە بكەین تەواو نابێ و هونەرمەندیش لە وڵاتی ئێمەدا تاوەكو نەچێتە ژێر خاک قەدری نازانرێ، دەتوانم بڵێم لەدوای (سەید مەردان و شەهابە) ناوی مام حاجی فائیق دێت، كە ئاستی لە ئاستی (محەمەد گوبانچی) كەمتر نەبووە، چونكە زۆربەی هەرە زۆری مەقاماتی دەزانی... پێش كۆچكردنی بەدوایدا ناردووم منیش لەگەڵ هاورێی خۆشەویستم سەباح نەجمەدینی رەحمەتی، بەیەكەوە لەلای دانیشتووین و وەسیەت و دوا قۆریاتی لەلای من گوتووە (خێزانی و منژوی) كوری شایەتن لەسەر قسەكانم دوا قۆریاتی ئەمەیە:

**گێت بزم چاغمز**
**وێران اولد باغمز**
**یل اولد یاعیش اولد**
**كولا اولد تۆپراغمز**

لە كۆتاییدا هیچ دەسەڵاتێكمان نییە هەر ئەوەندەمان لەدەست دێت بڵێین:

**سەن قەلایدو**
**مەن تەپە سەن قەلایدو**
**حاجی فائیق یروده مەن اولایدم**
**یرمدە سەن قەلایدو.**

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (٤) وەرگیراوە.

# مام حەمیدی کوورەچی ۱۹۱۹-۱۹۸۳

**جەلال خدر**

قۆریاتبێژ و هونەرمەند و دەنگخۆشی شاری هەولێر (مام حەمید)ی کوڕی مام مەجیدی کوڕی میکایلی کوڕی مەحمودی کوڕی وەستا رەجەبی کوورەچییە.

وەکو لە ریش سپی و پیاوماقووڵە کوورەچییەکانم بیستووە، دەڵێن مام رەجەب بە ئەسڵ (بن عەجەم) بووە، لەناو خەڵکی ئەو شارە بە (رەجەبە کوڕ) بەناوبانگ بووە، چونکە چاوی چەپی تانەی لەسەر بووە، لەکاتی خۆیدا لەناو عەجەمەکانی ئێران سەری خۆی هەڵگرتووە، دوای ئەوەی تووشی دوژمن و دوژمنکاری هاتووە، پیاوێکی لەدەست زەڕ بووە، بۆیە رووتی کردۆتەوە باشووری کوردستان و لە شاری هەولێر نیشتەجێ بووە، لە هەمان کاتیشدا وەستایەکی چاک و دەستڕەنگین بووە، بەتایبەتی لە دروستکردنی کەرپووچ و خشت و جەڕە و گۆسکە و شەربەی ئاو، کاتی خۆشی ئەو پیشەیەی لە باوکی فێربووە، کاتێکیش خەڵکی ئەو شارە زانیویانە، کە پیاوێکی کاسب و دەستڕەنگینە (مام ئیسماعیل) ناوێک لە گەڕەکی تەعجیل کچی خۆی لێ مارە کردووە، لەپاشانماڵی بۆ خۆی داناوە، خوا سێ کوڕی داوەتێ بەناوی (مەحموود و عەبۆ و سلێمانە) ئەمانەش نەوەیان لێ



کەوتۆتەوە، لەناو بنەماڵەی کوورەچییان دەنگخۆشی چاکیان لێ هەڵکەوتووە، لە هەموویان بەناوبانگتر مام سەمەدی کوورەچی (۱۸۹۷-۱۹۸۰) بووە.

مام حەمیدی کوورەچی لە ساڵی ۱۹۱۹ لە گەڕەکی تەعجیلی ئیسلام، لە کۆڵانی کوورەچییان لە شاری هەولێر، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.

مام حەمید لە منداڵییەوە حەزی لە قۆریات کردووە، ئاشقی دەنگی هونەرمەندی بەناوبانگ (شەهابەی هەولێری) بووە، ئسووڵی قۆریاتیش لەسەر دەستی (مام سەمەد) و مەقامی (دیوانی) لە حاجی وەلی چایەچی فێربووە، (ئسوولی کەرەم) لەسەر دەستی حاجی عەبدوڵڵای خەیاێ و (وەستا مەمۆی) کارگەچی فێربووە، حەیرانیشی لە سەیدە کۆرە و خاڵە رەسووڵ گەردی وەرگرتووە.

مام حەمید بۆی گێڕامەوە، گوتی: لەکاتی خۆی منداڵ بووم، زۆر حەزم لە گۆرانی و قۆریات گوتن دەکرد، مشکۆ و حەیدەرە کەچەڵ پێش من قۆریات و مەقاماتیان دەگوت، چونکە ئەوان لە شەهابە نزیک بوون، منیش لەگەڵ هاوڕێی منداڵیم شاکر حەمە فارس دەچووینە چایخانەی (سەمەدی) مامم، بۆ ئەوەی گوێی لێ رابگرین، ئەویش عادەتی وابوو، هەموو جارێک بەدوای گۆرانیبێژی بەناوبانگی شاری کەرکووک (محەمەدی چلبۆین-ی ۱۸۸۵-۱۹۵۸ )دا دەنارد، بە میوانی دەهاتە هەولێرێ و لای ئەو میوان دەبوو، خەڵکی ئەو شارە لە چایخانەدا لە دەوری ئەو وەستایە کۆدەبوونەوە و گوێیان بۆ شل دەکرد، چونکە زۆربەی شێوازی مەقامات و قۆریاتی دەزانی، ئێمەش هەر جارێ خۆمان لەبن مێزی چایخانە دەشاردەوە تاوەکو شێوازەکەی بە تەواوی وەربگرین، هەتا جارێکیان ئەو مەقامەزانە قۆریاتی (عومەرد گەلەی) دەچڕاند، کە بە (ئەبلە نینم) دەست پێدەکات، منیش لە دەمیم وەرگرت، زۆر بەجوانی بۆم دووبارە کردەوە، کاتێک مامم گوێی لێ بوو زۆری پێناخۆش

بوو، چونكە دەیزانی ئێمە لەو زووتر وەرمان دەگرت و دووبارەمان دەكردەوە، كە تووڕە دەبوو، دەیگوت (من پارەیەكی زۆر سەرف دەكەم تاوەكو فێری ئسوولی قۆریات بیم، بەڵام (حەمید و شاكر) بە حازری دێتە بەردەستیان).

كاتێك كۆمەڵە هونەرمەندێكی شاری بەغدا بۆ گەشتوگوزار هاتنە گەلی عەلی بەگ، لەوانە مامۆستا (گویانچی و نازم غەزالی و زوهرە حوسێن)یان لەگەڵدا بوو، (مشكۆ و حەیدەر بەقاێ و مام حەمید كوورەچی لەو شوێنەدا ئامادە بوون، مام حەیدەر مەقامی دەشتی چڕاندووە، مام حەمیدیش چەند قۆریاتێكی (دەل حەسەنی) چڕاندووە، بۆتە مایەی سەرسوڕمانی میوانەكان.

**مام حەمید كوورەچی و حەسەن زیرەك**

مام حەمید بۆی گێڕەمەوە گوتی لە ساڵی ١٩٥٧ جارێكیان حەسەن زیرەك بە میوانی هاتبووە شاری هەولێر، مشكۆ دەعوەتی كردبوو، شەوانەش لە ئوتێلی مام جەمیل دەخەوت، شەوێكیان ئەو حەسەن زیرەكە بە میوانی هاتە كوورە و دەفەیەكی بچووكی بە دەستەوە بوو، وا رێك كەوت ئەو شەوە شەوی هەینی بوو، ئێمەش كوورەمان ئاگر دەدا و كەس نەدەخەوت، حەسەن زیرەكیش دەستی بە گۆرانی گوتن كرد و منیش ناوە ناوە بە قۆریاتێكی (كوردۆ) یان (مخالیف) بۆی هەڵدەستام، تاوەكو بەیانی ئاهەنگەكەمان بەردەوام بوو، یەكێك لە گۆرانییە خۆشەكانی حەسەن زیرەك گۆرانی (هەی نیزام بۆ خۆم نیزام.... من لێرەدا عەسكەرم) بوو، كە زۆر بەجوانی دەیگوت، منیش دوو سێ جار پێم دووبارە كردەوە، بۆ بەیانی برا بچووكەكەم پێی گوتم (حەمید خوا كوڕێكی پێداوی حەزدەكەین ناوی لێ بنێی، منیش لەبەر خاتری گۆرانییەكەی حەسەن زیرەك ناوم لێنا -نیزام).

مام حەمید لە گەڕەكی تەعجیل دوكانی دانابوو، بەبیرم دێ لە ساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٣) دا دوكانەكەی لە تەنیشت دوكانی (حەمەدئەمین پۆلیس)ی مامم بوو، منیش ئەوكاتە لای شاگرد بووم، بە هاوینان بەفری دەفرۆشت و بە زستانانیش جەرە و گۆسكە و شەربەی ئاو، دەستی زۆر كورت بوو، نیوەڕۆیان بازاڕ چۆڵ دەبوو مام حەمید لەسەر پارچە حەسیرێك لێی پاڵدەدایەوە، دەستی دەخستە بناگوێی و دەستی دەكرد بە قۆریات و كەردم گوتن.

مامیشم دەستەسرێكی سووری هەبوو، دەری دەهێنا و فرمێسكی چاوی دەسڕییەوە، چونكە زەمانی هونەرمەندی بەناوبانگ (شەهابەی هەولێری) دەهێنایەوە یادی، دۆستێكی نزیكی مامم بووە، ماوەیەكی زۆریش بەیەكەوە رایان بواردووە، لەلایەكی تریشەوە كاتێك شەهابە بە هاوكاری (عەلی فلەیحی چایەچی) لە ساڵی ١٩٣٢ چووە شاری بەغدا، بەرامبەر كەلسومی هونەرمەند گۆرانی گوتووە، ئەو مام حەمەدەمینەی ئەحمەدە رەشی لەگەڵدا بووە، یادگارییە خۆشەكانی زەمانی زووی بەبیر دەهاتەوە، بۆیە دەستی بە گریان دەكرد، بە تایبەتی كاتێك حەمید داخلی كەردم چڕاندووە.

مام حەمید لەدواییدا دوكانەكەی فرۆشتە (فاقەی حەمەد مەندۆ) و دوایی گەڕایەوە سەر ئیشی كوورەچییەتی، لەپاشان منداڵەكانی (هیوا، بە هیوا كوورەچی ناسراوە و دڵشاد و نیزام و رەئووف پێڕاگەیشتن ئینجا ئەو وازی لە ئیشكردن هێنا).

مام حەمید لە ئەگلەنجەكانی شاری هەولێر شان بە شانی دەنگخۆشەكانی ئەو شارە وەكو (مشكۆ و حەیدەر بەقاێ و شاكر حەمە فارس و حاجی جەمیلی قاپقاپچی و پیرداودە كۆرە و محەمەد ئەحمەد بەربیلی و محەمەد عاشق و سەید سەعید دامرچی و كەسانی دیكە) گۆرانی قۆریات و كەردمی چڕاندووە.

چەندین جاریش داوای لێ كراوە، كە روو لە ئێستگەی بەغدا، بەشی توركمانی بكات، بۆ گۆرانی تۆماركردن، بەڵام ئەو رازی نەبووە، چونكە ئەو كاتە گۆرانی گوتن عەیب بوو، هونەرمەند بە چاوێكی سووك تەماشا دەكران، هەروەها شان بە شانی دەنگخۆشەكانی شاری كەركووك گۆرانی و قۆریاتی توركی گوتووە لە پاش ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٦ بە بەردەوامی لە ئاهەنگەكانی برایانی ئوجاغی توركمانی بەشداری دەكرد، قۆریات و كەردمی دەگوت، زۆرجاریش لە كاتی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر مناجاتی دەخوێندەوە. ئەوەبوو لە چوارەمین رۆژی جەژنی رەمەزانی پیرۆز لە رۆژی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٨٣ دڵە گەورەكەی مام حەمید لە لێدان كەوت و بۆ دواجار ماڵئاوایی دەكات و لە گۆڕستانی شێخ مەعروفی باداوە بەخاك دەسپێردرێ و چەندین كاسێتی تۆماركراوی لەدوای خۆی جێهێشت.

# جەواد رەسووڵ ناجی
# ١٩٢٢- ١٩٧٥

کەریم شارەزا

هونەرمەندی شێوەکار و ئەکتەر و دەرهێنەری شانۆی کوردی و پەروەردەکار مامۆستا جەواد رەسوڵ ناجی، لەساڵی ١٩٢٢دا لەشاری کۆیە لەدایک بووە. چاوی بەدیمەنی کێوە بەرزەکانی باواجی و هەیبەت سوڵتان کراوەتەوە. لەبەر ئەوەی کە باوکی لە سەرەتای بیستەکانەوە فەرمانبەری میری بووە، بۆیە جەوادی منداڵ و مێردمنداڵ لەگەڵ ماڵی باوکیدا گەلێک شار و شارۆچکەی کوردستان گەڕاوە و لێیاندا ژیاوە، بەڵام لە دواییدا لەشاری هەولێر نیشتەجێ بوون. لەساڵی ١٩٢٨دا خراوەتە بەر خوێندن و قوتاغی سەرەتایی و ناوەندی لە ساڵی ١٩٤١دا تەواو کردووە و هەر لەو ساڵەدا چووەتە بەغدا و لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ئەعزەمییە وەرگیراوە. لەو قوتابخانەیەدا بنچینەی هونەری شێوەکاری و پەیکەر داڕێژی لە مامۆستایان قاسم ناجی و فەتحی سەفوەت فێربووە و لەهاوینی ١٩٤٤دا خوێندنی تەواو کردووە بۆ مانگی تشرینی یەکەم بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دامەزراوە و لەگەڵ هاوڕێیی هونەرمەندی گیانی بەگیانی مامۆستا جابر پیرداود و هونەرمەندی مەزنی شێوەکار مامۆستا (دانیال عوزێر قەساب)، کە یەکێک بووە لە جوولەکەکانی هەولێر دەورێکی گرنگیان لە پەروەردەکردنی گیانی هونەری شێوەکاری لەناو قوتابیانی پارێزگای هەولێردا بینیوە. بەتایبەتی کە لە ساڵی (١٩٥٠)ەوە تاکو ١٩٦١ مامۆستا بووە لە دواناوەندی هەولێری کوڕان یاخود کە لەگەڵ دامەزراندنی بەشی هۆبەکانی فێرکردن لە پەروەردەی هەولێر لەگەڵ مامۆستا جابر پیرداود دەورێکی دیار و بەرچاو، لە پێشخستنی هونەر و شێوەکاری لەم پارێزگایەدا دەبینێ.

کاتێکیش کە مامۆستا جەواد لە ساڵی ١٩٦٤دا دەکرێت بە مامۆستای هونەری شێوەکاری لە خانەی مامۆستایانی هەولێر، دەورێکی گرنگتر دەگێڕێ لە پێگەیاندنی مامۆستایانی ئەو هونەرە جوانە بۆ قوتابخانەکانی کوردستان و تا ساڵی ١٩٧١ لەو قوتابخانەیەدا خزمەتی هونەری کوردی دەکات، ئینجا خۆی خانەنشین دەکات و دوای چوار ساڵ و لە رۆژی ١١/١١/١٩٧٥ بەنەخۆشی ئیفلیجی کۆچی دوایی دەکات.

جەواد رەسووڵ هەر هونەرمەندێکی لێهاتووی شێوەکاری نەبوو، بەڵکو ئەکتەر و دەرهێنەری شانۆی کوردیش بوو، چ لە سەردەمی قوتابییەتی و چ لە سەردەمی مامۆستایی دەورێکی سەرکەوتووی لە نواندنی شانۆگەرییەکانی (نیرۆن) و (عوتەیل)ی شەکسپیردا بینیوە، لە هەمان کاتیشدا مرۆڤێکی رەند و قسەخۆش و نیشتمان پەروەرێکی پێشکەوتنخوازیش بووە.

* سوود لە نووسینێکی کاک مومتاز حەیدەری وەرگیراوە کە لە نووسەری نوێی ژمارە ٣ی ١٩٨٧دا بڵاوکراوەتەوە.

# تاهیر تۆفیق
# ١٩٢٢-١٩٨٧ز

حوسێن حاجی قادر (ئاری)

"من ناوم تایەری کوڕی تۆفیق کوڕی ئاوڕەحمانی کوڕی حەمەدی شێخانییە. لە ساڵی ١٩٢٢ز لە گەڕەکی بەفری قەندی شاری کۆیە یان لە ساڵی تەیاران لەدایک بووم، (هەروەکو خۆی لەسەر زاری دایکی دەیگێڕێتەوە). لە شاری ئاواز و گۆرانی و شیعری کوردی چاوی ژیانم هەڵێناوە. لە ساڵی ١٩٢٩ز باوکم بردمی بۆ سوختەخانەی (مەلای رەش) و لەوێ خوێندنی قورئانی پیرۆز و گولستان و بۆستانم تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٣٢ز چوومە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیە و مامۆستاکانم لە پۆلی دووەمیان دانام. لەوساوە بەمنیان دەگوت دەنگت خۆشە و خستمیانە تیپی سروودی قوتابخانە.

جارێ هەرزەکار بووم لە ساڵی ١٩٣٦ز دەستم بەگۆرانی گوتن کرد. شیعرەکانی (نالی و کوردی و حاجی قادر و بێخود و سافی و عەونی و مەیلی و زەکی و دڵدار)م لەبەرکردن. کە لەلایەن گۆرانیبێژەکانی کۆیەی



وەکو (سێوە) و (مەلا ئەسعەد) و (ئەحمەدی حەمە مەلا) و (حەمەددەمینە گۆجە) و (قادری حەمدی حەمامچی) و (حوسەینی حەبەتۆز) و (فەقێ ئەحمەدە کوڕە) و (وەستا قادری لبادچی) و (حەمەرەشیدی شێرزاد) و خۆشم یەکێک بووم لەو گۆرانیبێژانە.

لە ساڵانی ١٩٣٦ تا ١٩٤٠ لەهەموو باخێک و مزگەوت و ماڵێکدا لە ئاهەنگی مەولودی پێغەمبەر و لەکۆڕ و دانیشتنی تایبەتی خۆم، مەقام و بەستەی کوردیم لەسەر زار بوو، چونکە ئەوساکە کۆیە شارێکی پڕ خۆشی و شادی بوو، مەڵبەندی ساز و ئاواز و گۆرانی کوردی بوو.

محەمەد تۆفیق وردی نووسیویەتی کە تایەر تۆفیق هاوڕێی بووە و لەپۆلی دووەمی سەرەتاییەوە دەستی بەگۆرانی گوتن کردووە چ لە قوتابخانە و چ لە دەرەوە چرای کۆڕی خۆشی بوو.

تایەر تۆفیق کە باسی ژیان و رابواردنی خۆی دەکات دەڵێ: (کۆڕی دانیشتن و رابواردنی ئەوسای ناو باخ و رەزانمان بەزۆری لەگەڵ هونەرمەند و هونەردۆستانی وەکو (عومەری مام عەولا و ئەحمەدی حەمە مەلا و عوسمان عەونی و عوسمانی مام عەولا و وەستا عەبدەی ئاسنگەر و ساڵحی قەساب و ئەحمەدی مامە عەدە و سۆفی محەمەدی قەساب بوو. بەڵام ئەو خۆشییە تاکو ساڵانی ١٩٤٢- ١٩٤٣ز خایاند، چونکە گرانییەکی کوشندە لە ئەنجامی

جەنگی دووەمی جیهانی بەسەر ولاتدا داهات).

* لەو ساڵەدا بەناچاری تایەر تۆفیق، کە لە قوناغی ناوەندی خوێندن بوو قوتابخانە بەجێ دەهێڵێ و لە شارەوانی کۆیە دەبێتە کرێکار تاکو یارمەتی بەرێوەچوونی ئەندامانی خێزانەکەی بدات.

* تایەر تۆفیق لە هەرەتی لاویەتیدا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ خوا لێخۆشبوو (حەمە تایەری حاجی ئەفەندی) هەبووە، کە مرۆڤێکی رۆشنبیری دنیادیتە و بەسەلیقە و قسە خۆش بوو. ماوەیەکیش کە (حەمە تایەری حاجی ئەفەندی) بە فەرمانبەری چۆتە بەسرە، تایەر تۆفیقی لەگەڵ بووە. زۆرجار لە ماڵەکەیان لەوێ گۆرانی گوتووە و بەدەنگە خۆشەکەی هەستی غەریبایەتی ئەندامانی خێزانەکەی رەواندووەتەوە بە تایبەتی کە مەقامی (شیرین بەهاردی) گوتووە، ئاووهەوای شاری بەسرای قەراغ شەتوڵ عەرەبیان لێ بووە بە ئاووهەوای سەیرانگاکانی کوردستان.

پاشان دەگەرێتەوە کۆیە تاکو ساڵی ١٩٤٥ز دوای برانەوەی جەنگی دووەمی جیهان چووەتە بەغداو بەهۆی خزمێکی خۆی خوالێخۆشبوو (سەمەدی حاجی محەمەدی بەننا) دەچێتە ئێستگەی رادیۆی بەغدا بەشی کوردی، کە ئەوسا (کامیل ئەمین و قادر قەزاز) لەوێ بوون، زۆریان پێ خۆشدەبێ و بەمووچەی هەفتانەی دوو دینار دادەمەزرێت و هەفتەی نیو سەعات ئاهەنگێکی گۆرانی راستەوخۆ لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئێستگەی کوردی پێشکەش دەکات، چونکە ئەوکات تۆمارکەر نەبووە!

* یەکەم گۆرانیش کە لە ئێستگەی کوردی بلاوی دەکاتەوە مەقامی (حیجاز) (نیوەشەو) (لە گوریّ لە سوّرە گوریّ) و لەگەڵ بەستەی (کراس زەردێ) بوون و هەردووکیان هۆنراوەی فۆلکلۆرین. تاهیر تۆفیق لە کاسێتێکدا خۆی باسی ئەو دوو گۆرانییە دەکات، کە بۆ یەکەم جار گوتوونیەتی و بە نەخۆشی و لەسەر جێگاش دوو کۆپلە بەبێ مۆسیقا تۆمار دەکات.

* جیاوازی نێوان وشەی ئەو بەندانەی تایەر تۆفیق لە گۆرانی (لە گوریّ لەسوّرە گوریّ) دەیگوت لەگەڵ وشەی بەندەکانی هەمان مەقام، کە (مەلا ئەسعەد و سێوە) گوتوویانە و کاتی خۆی تایەر تۆفیق لەوان فێر بووبوو... وای لە مام تۆفیقی باوکی دەکرد، کە (بەیانییان دەهاتە لام لە چایخانەی لاوان)، کە هەندێ جار بە توندی دەبێتی لە دەستی دەداو دەیگوت (نانا تایەر وانابێ...!!!) لەو کاتەی کە تایەر گۆرانییەکەی دەگوت.

لە ساڵی ١٩٤٥ کە تایەر تۆفیق چووە ئێستگەی کوردی رادیۆی بەغدا (من = نووسەری ئەو بابەتە) پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم، کە خوا لێخۆشبوو (محەمەد عەبدوڵلا چایەچی) ئامۆزام، کە ناسرابوو بە (حەمە گەمحان) هاورێیەکی دڵسۆزی تایەر تۆفیق بوو....

چایخانەیەکی لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکەی (جەمال ئاغای حەویزی) لە کۆیە هەبوو... تازە رادیۆیەکی گەورەی مۆدیلی (مارکۆنی) کریبوو کە بەپاتری گەورە ئیشی دەکرد، چونکە کارەبا لەکۆیە نەبوو. پاشان چایخانەکەی گواستەوە تەنیشت دایەرەی ئیستهلاک لەژێر دایەرەی شارەوانی و بەرامبەر مزگەوتی گەورە. هەفتانە کە تایەر تۆفیق نۆرەی بلاوکردنەوەی ئاهەنگی گۆرانی دەبوو، ئەو رۆژە وا بزانم چوارشەممان بوو، ئەوا دوای نوێژی عەسرێ یان پێش مەغریب خەڵکێکی زۆر لە چایخانەکە جێگەیان دەگرت ئەوەی جێگەی نەبووایە لەژووری چایخانەکە، یا لە دەرەوە رادەوەستان تاکو گوێیان لە دەنگی تایەر تۆفیق بێت، ئەوسا چای شیرین بە دوو عانە و دیشلەمەش بەیەک عانە بوو (واتا چوار فلس)، زۆرباشم لە بیرە کاتێ کاک محەمەد هاتەوە ماڵێ و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ چایخانەکە و کورسییەکی بەرامبەر رادیۆکە بۆ دانام و گوێم لەیەکەم ئاهەنگی گۆرانی تایەر تۆفیق بوو، کە لە رادیۆی کوردی بلاوکرایەوە.

(ئێوارەی هاوینان چایخانەکە لەسەر گۆمی (حەمەدبەگ) دەکرایەوە، کە کەوتووتە سەر رێگای ناورەزان لەخوار مزگەوتی مەلا ئەسعەددەوە).

پاش ماوەیەک خاڵە تایەر هەندێ لە گۆرانییەکانی لە کۆمپانیاکانی گرامەفۆن لەسەر قەوان تۆمارکرد، کە بەناوبانگترینیان کۆمپانیای

(بیضافون) و (چەقماقچی) بوون بەسەدان قەوان کە چەند بەستەو گۆرانییەکیان لەسەر تۆمار کرابوو لە شارەکانی کوردستاندا بلاوبوونەوە، چونکە هەندێ لە ماڵە دەوڵەمەندەکان و چایخانەکان سندوقی گرامەفۆنیان هەبوو، لە هەموویشیان بەناوبانگتر سندوقی (ابو الکلب) بوو. هەندێ لە گرامەفۆنەکان بۆری دەنگ گەورەکردنیان پێوەبوو، هەندێکیشیان وەکو جانتا وابوون.

لەو بەستە و گۆرانییانەی کە خاڵە تایەر لەسەر قەوان تۆماری کردبوون: (بەستەی چی بکەم جەرگم سووتاوە) و (کراس زەردێ) بوون، کە هەردووکیان شیعر و ئاوازی فۆلکلۆرین.

هەرزەکار و لاوانی کور و کچ لە کوردستان زۆر حەز لە کراس زەردێ دەکەن و تایەر تۆفیقیش ناوبانگی پێ دەرکردبوو.

جارێکیان گوێم لەتایەر تۆفیق بوو گوتی: لە ئاهەنگێکدا گەرم داهاتبووم مەقامی (دڵی بردم بەناز و عیشوەوە) دەگوت، گوێم لێ بوو کچێکی جاحێڵ دەیگوت: ئەوە چییە هەر مەقام و هەر مەقام دە بەسە بیبڕەوە (کراس زەردەکەمان بۆ بڵێ)! منیش یەکسەر مەقامەکەم بڕی و دەستم کرد بەگوتنی (کراس زەردێ) ئینجا بەجارێ خەڵکەکە کەیف خۆش بوون و ئاهەنگەکە گەرمتر بوو.

ساڵی ١٩٥٦ لە بەغدا خاڵە تایەر یەکەم شریتی گۆرانی بەبێ مۆسیقا بۆ کاکە حەمە لە ئوتێل



حەکیم تۆمار دەکات، کە کاک محەمەد چایەچی چووە بەغدا و تۆمارکەرێکی فلیپسی گەورەی کڕی، بە شریتی بەکرەی گەورە ئیشی دەکرد.

* هەموو بەیانییەک لەپێش هەموو کەس (خاڵە تۆفیقی) باوکی تایەر تۆفیق (ناسراو بە تۆفیقە درێژ ١٨٧٠- ١٩٥٨ز) لە گازینۆکە ئامادە دەبوو، هەر گۆرانییەکی تایەری داوا بکردایە، یەکسەر بۆم لێدەدا. ئەگەر هەستی بەنارێکی گوتنی وشەیەک یا بەندێک بکردایە، یەکسەر دەستی لە دەستی دەدا و دەیگوت (ئانا کوڕم تایەر وانابێت!!) مام تۆفیق دەنگی زۆر خۆش بوو، بەڵام لای هەموو کەس گۆرانی نەدەگوت.

جارێکیان لەکاتی دڵتەنگیدا گوتی: ئای زەمانە، کوڕی خەڵک دەبنە موهەندیس و دختۆر و زاپت، کوڕی منیش بوویتە گۆرانیبێژ و چاوەش!!

* لەسەر پێشنیاری مامۆستا باکووری هونەرمەند چەند بیرەوەرییەک و گۆرانی خۆشی بێ مۆسیقا و بە مۆسیقا کە لە ساڵانی ١٩٥٦ بەرەو سەرەوە تۆمار کرابوون، لە پرۆگرامێکی تایبەتی بەناوی (گۆرانیبێژە نەمرەکان) لەرۆژی ٢٠٠١/٧/١٠ لە ئێستگەی رادیۆی هەرێمی کوردستان لەهەولێر پێشکەش کرا.

هەروەها من و مامۆستا باکووری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیمان بۆ تەلەفزیۆنی هەرێمی کوردستان لەهەولێر بەناوی (گۆرانیبێژە نەمرەکان) بۆ ماوەی سەعاتێک زیاتر بۆ تۆمارکرد و شەوی ١٩/ ٢٠-١٠-٢٠٠١ بە بۆنەی کۆچی دوایی خاڵە تایەری نەمر پەخش کرا.

*** هاتنەوەی تایەر تۆفیق لە بەغداوە بۆ هەولێر**

لە ١٩٥٦/٩/١٢ کاک تایەر تۆفیق دێتەوە هەولێر بە فەرمانبەری (بەکاتبی ناحیەی سیدەکان) دادەمەزرێت و ماوەی ساڵێک لەوێ دەبێت و ساڵی ١٩٥٧ دەگەڕێتەوە بەغدا لە وەزارەتی ناوخۆ دەبێتە فەرمانبەر و هاتوچۆی ئێستگەی رادیۆی کوردیش دەکات.

* خاڵە تایەر زۆری حەزدەکرد سەردانی کۆیە بکات و دڵی بە دیمەنە جوانەکان و دیتنی دۆست و برادەرەکانی خۆش دەبوو، دەبا بزانین لەبارەی خۆشی کۆیە و بیرەوەرییەکانی دەڵێ چی؟ (باوەڕناکەم ئەو وەختی لە دنیادا

(مەبەستی سالانی ١٩٣٦-١٩٤٢)ە لەکۆیە خۆشتر بوویێ رەزو باخێکی یەجگار زۆر هەتا بلێی دیمەنێکی جوان و خۆش و دلگیر و سیحراوی. گۆرانی گوتن لە کۆیە عادەت بوو لەهەموو مالێک و کۆلانە و کووچەیەک و مزگەوتێک، کۆیە وەک مۆمێک بوو دەسووتا لەنێوان شارەکانی هەولێر و سولەیمانی).

* دوای شۆرشی چواردەی تەمووزی سالی ١٩٥٨ چەند جار خالە تایەر بەسەفەر هاتووتەوە کۆیە و لەگەل دۆست و برادەرەکانی ئاهەنگی خۆشیان گێراوە... لەسالی ١٩٦١ تیپی مەولەوی سولەیمانی بەمیوانی هاتنە کۆیە، ئاهەنگێک لەیانەی فەرمانبەران سازکرا، لەوانەی کە لە تیپی مەولەوی بەشدارییان کرد، وەک لەیادم ماوە، هونەرمەندان (قادر دیلان و نەجاتی عەبدە و ولیەم یۆحەننا) بوون و چەندین گۆرانی لەلایەن تیپی باواجی کۆیە و تیپی مەولەوی پێشکەش دەکەن.

*** کەسایەتی تایەر تۆفیق**

خالە تایەر لە پێشەکی کتێبی گولی سەربەستیدا دەلێ: (سالی ١٩٦٠ داوای گواستنەوەم کرد بۆ هەولێر و تاکو ئێستاش لەو شارە دێرینەی کوردستانم. خۆم نەمهێشتووە هەتا ئێستاکەشی لەگەلدا بێت کەس دلی لێم برەنجێ).

بەلێ خالە تایەری هونەرمەند مرۆڤێکی بێ فیز و نوکتە بازو قسەخۆش و نەفس بەرز و بەعیززەت نەفس بوو، نەتەوەپەروەرێکی جەرگ سۆز بوو، تاکو مردیش وشەی شەرمەزاری لەناو گۆرانییەکانی دەرنەکەوت.

* مامۆستا باکووری هونەرمەند لەسەر زاری هونەرمەند مشکۆی هەولێری گێرایەوە گوتی: جارێکیان هونەرمەندی نەمر تایەر تۆفیق لە ئاهەنگێکی گەورەی بەزم و گۆرانی لە دهۆک یا شوێنێکی دی لەو ناوچەیە بەشداری کرد، کە تایەر تۆفیق دەستی بەگۆرانی گوتن کرد هەندێ کەس چوونە سەر شانۆکە و پارەی نۆتەی دە دیناری و پێنج دینارییان بەسەردا دەباراند و لە بەینی خەلکەکە بوو بە مونافەسە، ئەوەندەیان پارە بەسەردا باراند پری ژێر پێیەکانی بوو، بەلام تایەری نەمر لەگۆرانی گوتن بەردەوام بوو ئاوری لێ نەدانەوە تاکو گۆرانییەکانی تەواو کرد و یەکسەر چوو لە جێگاکەی خۆی دانیشت و دەستی بۆ پارە نەبرد!! مشکۆی هونەرمەند گوتی: لەو کاتەشدا دلنیابووم کە تایەر تۆفیق پێنج دیناری لە گیرفاندا نەبوو.

*** تایەر تۆفیق و دلدار ١٩١٨-١٩٤٨**

شاعیری نەمری کورد (یونس رەئووف= دلدار) خاوەنی سروودی (ئەی رەقیب) برادەرێکی زۆر نزیکی خالە تایەر بووە. لە یەک گەرەک و کۆلانە یارییان کردووە و گەورەبوون.. بۆیە تایەر تۆفیق دەیگوت: زۆر حەز لە شیعرەکانی دلدار دەکەم و لەدوای گۆرانی (ئەی بادی شەمال) حەزم لە گۆرانی (زولف و ئەگریجەی یارە).

* ئەگەرچی تایەر تۆفیق بەگوتنی جۆرەکانی مەقام ناوبانگی دەرکردووە، بەلام لەماوەی پەنجا سالی ژیانی هونەریدا چەند سروودیشی چریوە و تۆمارکردووە لەوانەش سروودی (هێزی گەل و ئەی نەتەوەی کاوەی دلێر)، کە هەردووکیان لەشیعری مامۆستا کەریم شارەزان و ئاوازی ئەحمەد ئەلخەلیلن. هەروەها لەشیعری مامۆستا دلزار شیعری (گەنجێ) بەشێوەی مەنەلۆج تۆمارکردووە.

*** حەواخانی خێزانی تایەر تۆفیق**

حەواخانی خێزانی تایەر تۆفیق نموونەی رەوشت بەرزی و رێکوپێکی و کابانی مال بوو. لەماوەی هاوسەرییەتیان لەگەل یەکدا، بەوپەری شادی و خۆشی و بێ کێشە ژیانیان بردەسەر، سەرەرای ئەو خانووە بچکۆلەی ئیدارەی محەللی لە گەرەکی سەیداوەی هەولێر و ئەو ناو مالە ئاساییەی هەیان بوو، ئەوا مالەکەیان نموونەی جوانی و پاک و خاوێنی بوو. یەکتریان زۆر خۆشدەویست و رێزیان لەخزم و کەس و برادەر و میوانان زۆر دەگرت. هەردەم زەردەخەنەیان لەسەر لێوان بوو گرژییان پێوە دیار نەبوو. ئەو کاتەی کە تایەر لەسەر جێگەی نەخۆشی بوایە و زەردەخەنەیەکی بەسەر لێودا هاتبایە، ئەوا بەهۆی خۆشەویستی حەواخان بوو، بەراستی لێک وەشابوونەوە، بەلام بەداخەوە لە ١٨/١٠/١٩٨٦ کۆچی دوایی کرد

و ماڵێکی سارد و سڕی بۆ تایەر تۆفیق بەجێهێشت.

کۆچی دوایی حەواخان، بوو بەکارێکی دڵتەزێن و زۆر زوو کاری کردە سەر تەندروستی تایەر و ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپتری برد و فرمێسکی گەرمی داباراند. لەکاتی مردنەکەی چەندجار سەری تەرمەکەی هەڵدایەوە دەیگوت: نا باوەڕناکەم حەوا مردبێ؟!

شەفیقی برای تایەر تۆفیق لەسەر زمانی ڕەسول گەردی بۆی گێڕامەوە، کە تایەر تۆفیق لەدوای مردنی حەواخان بڕیاری دابوو، کە خانووەکە بەجێ بهێڵێ، چونکە توانای ژیانی لەوێدا نەماوە، دەیەوێ بچێتە دەرەوەی وڵات و هەموو شتومەکەکانی ماڵەکەی دەداتە (شەفیق)، بەڵام بەسەردا نەخۆشییەکەی زۆر سەخت بوو، ناچار لە هەولێرەوە چووە بەغدا بۆ چارەسەرکردن، بەڵام سوودی نەبوو، بۆیە هەوڵی دا بچێتە دەرەوەی وڵات و داواکارییەکی بۆ (لیژنەی پزیشکی تایبەتی لە دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری) پێشکەش کرد تاکو بینێرنە دەرەوەی وڵات بۆ چارەسەرکردن، بەڵام لیژنەکە بڕیاریان دا لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر بخەوێندرێ و ئەنجامی پشکنینەکەشی جەڵتەی دەماغی پێشوو بووە.

کە تاهیر تۆفیق هاتەوە هەولێر دووبارە لەماڵەکەی خۆی دابەزی و خوشک و خوارزاکانی خزمەتێکی زۆر باشیان دەکرد.

لەو ماوەیەدا تەندروستی زۆر تێکچوو، پێویستی بە چارەسەرکردنی سروشتی هەبوو.

کاک عەبدولباست عەبدولسەمەد (چارەسەرکەری سروشتی) لە نەخۆشخانەی رزگاری، بەهۆی هونەرمەندان زانی تایەر تۆفیق نەخۆشە و پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە، بۆیە بە هەستێکی نیشتمانپەروەرانەوە بۆ ماوەی سێ مانگ هاتوچۆی ماڵەکەی کرد و بەبێ هیچ بەرامبەرێک چارەسەری دەکرد، چونکە دەیزانی تایەر تۆفیق هونەرمەندی ڕەسەن و چاونەترسە و گۆرانییەکانی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی دەبزوێنن.

*** ئەندامانی بنەماڵەکەی تایەر تۆفیق**

باوکی ناوی (تۆفیق کوڕی ئاوڕەحمانی حەمەدی شێخانییە). ناسراو بوو بە تۆفیقە درێژ (١٨٧٠-١٩٥٨ز) دەنگێکی خۆشی هەبووە. کاتی خۆی گۆرانی گوتووە. کە گوێی لە تایەر دەبێ مەقامی شیرین بەهارە دەڵێت دەستی بەگریان کردووە.. زۆر قسەخۆش و نوکتەباز و لەسەرخۆ و خاوەنی عیززەتی نەفس بووە. (جلکی کوردی و جەمەدانی شینی لە (چوویت) دراو و پەستەکی سپی هەر لەخۆی دەهات).

بەشی زۆری ژیانی خۆی بەکاسبی بەڕێ کرد، دوکانێکی گچکەی هەبوو، بە تەنەکە نەوتی دەکڕی و بە شووشە دەیفرۆشتەوە.

دایکی ناوی عیسمەت بوو لەساڵی ١٩٦٢ کۆچی دوایی کردووە، دوو خوشکی هەبوو (شەوکەت و حەمەدیە) زۆریان خزمەت کرد. تایەر تۆفیق حەزی دەکرد بەردەوام شەوکەتی لەلابێ، بەڵام شەوکەتی خوشکی شەش مانگ پێش کۆچی دوایی تایەر ئەویش کۆچی دوایی کرد واتا لەمانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٧ مردنی شەوکەتیش دوای مردنی حەواخان بەجارێ کاریان کردە سەر تەندروستی خاڵە تایەر و پتر بەرەو خراپی چوو.

ئینجا حەمدیەی خوشکی و کافیە و ناسکەی خوارزای کچانی شەوکەت و کاک سەڵاح نووری مێردی کافیە و کاک دلاوەر حەمەتایەری کوڕی حەمدیە. هەموویان کەوتنە ڕێزگرتن و خزمەتکردنی خاڵە تایەریان شەو و ڕۆژ بەدەوری چارپایەکەیدا بوون و هەر کارێکی هەبوایە بۆیان جێبەجێ دەکرد و دڵیان دەداوە.

براکانی ناویان (زاهیر و مەغدید و شەفیق)ە، لە کۆیە دەژیان و ناوە ناوە بەسەردان دەهاتنە لای کاکە تایەر.. ئێستا ٢٠٠٢/٢/١٥ تەنیا شەفیق لەژیاندا ماوەو لەکۆیە بەتەنیا دەژیت.

کە تەندروستی زۆر تێکچوو، حەمدیەی خوشکی و شەفیقی برای و خوارزاکانی و کاک سەڵاح نووری مێردی کافیەی خوارزای هاتنە لای.. دوای ڕێزلێگرتن و دڵدانەوەیەکی زۆر، داوایان لێ کرد کە بە ئارەزووی خۆی ماڵی یەکێکیان هەڵبژێرێ، تاکو لەوێ باشتر خزمەتی بکەن.. ئەویش چاوێکی بەدار و دیواری

ژوورەکەی و شتومەکەکانی و وێنەکەی خۆی و حەواخان داگیرا و فرمێسک لە چاوەکانی قەتیس مان و گوتی: باشە لەدوای حەوا ئەو ماڵە بەجێ دێڵم و دەچمەوە ماڵی کافیەی خوارزام و کاک سەلاحی زاوام.. دەرگای ماڵەکەیان داخست و بەرەو شاری کۆیەیان بردەوە..

ماوەی چەند مانگێک لەماڵی کاک سەلاح، کافیە و منداڵەکانی خزمەتێکی بێ قسووریان کرد.

ئەو ماوەیەی کە لە کۆیە بوو هەندێ لە برادەرەکانی سەریان لێدەداو دڵخۆشییان دەدایەوە، لەوانەش: (عومەری مام عەولاّ و عەبدولڕەحمانە رووتە و ئەندامانی تیپی باواجی و کاک جەلال جۆبار.. هەروەها لە هەولێرەوە کاکە حەمەی چایەچی و کاک محەمەد مستەفا کەبابچی و عەبدوڵلا کەبابچی و رەسول گەردی و لە سولەیمانیشەوە کاک خالد دلێر سەریان لێدەداو رێزیان لێدەگرت.

**کۆچی دوایی تایەر تۆفیق**

کاک شەفیق تۆفیقی برای خاڵە تایەر، برادەرێکی زۆر کۆنە و زۆر بەوەفایە، ئێستا لە کۆیە بە تەنیایی ژیان دەباتەسەر، رۆژی ٢٠٠١/١١/٩ چوومە لای چەند پرسیارێکم لێکرد لەبارەی دوا رۆژەکانی ژیانی کاکە تایەری برای، ئەویش گوتی: دوو هەفتە پێش مردنی لەسەر داوای خۆی بە نەخۆشی کاکمیان هێناوە کۆیە، هەفتەیەک لە ماڵی زاهیری برام بوو، براژنم و منداڵەکانی کاکە زاهیر خزمەتێکی باشیان دەکرد.. بەڵام رۆژ بە رۆژ تەندروستی خراپتر دەبوو، هەموو رۆژێک چەندجار دەچوومە لای، بێزاری پیشان دەدا و دەیگوت ئای شەفیق ژیانم چەند خۆشدەوێ!! بەڵام هێزم نەماوە و بەردەوام سەرم دێشێ و لێرە توانای هەراو کێشەی ناو منداڵانم نەماوە، حەزدەکەم ببەیە لای خۆت!

پیکابێکم هێناو لەگەڵ کاک مەجید عەبدولڕەحمان کە ئەو لە کۆڵێی کرد خستمانە ناو پیکابەکە و درێژمان کرد، کە گەیشتینە لای ئەو بینایەی ژوورەکەی منی تێدایە و کەوتۆتە سەر دوکانەکانی دایەرەی ئەوقاف بەرامبەر کتێبخانەی گشتی لە ناوەڕاستی شەقامە سەرەکییەکەی کۆیە لەوێ دووبارە کاک مەجید لەکۆڵێی کرد و بردمانە سەرەوە، لە ژوورەکەی خۆم لەسەر جێگا درێژمان کرد، چونکە منیش بە تەنیایی دەژیام.. ماوەی هەفتەیەک شەو و رۆژ لە خزمەتی دابووم، ئەویش وەکو مۆمێک دەتوایەوە و کز دەبوو.. تاکو بەیانی رۆژی سێشەممە رێکەوتی ١٩٨٧/١٠/٢٠ لە کاتژمێر ٢٥.٦ دڵەکەی لە لێدان کەوت و بەگریان و هاوار لە ژوورەکەم هاتمەخوارێ و ئاگاداری دۆست و برادەرانم کرد لە ماوەیەکی زۆر کەم بەسەدان کەس کۆبوونەوە تەرمەکەمان هەر لەوێ شووشت و کفنمان کرد... ئینجا بە شانان بردمانە (مزگەوتی گەورە)..

جەماوەرێکی یەجگار زۆر بەرێپێوان بەرەو گۆڕستانی شەهیدانمان برد و دەیان وێنە و فیلمی ڤیدیۆیی بۆ رێوڕەسمی بردنە سەر گۆڕستان و بەخاکسپاردنی وەرگیرا.. لەوێش لە (گۆڕستانی غەریبان= شەهیدان) لە تەنیشت (عیسمەتی دایکی و شەوکەتی خوشکی بەرامبەر) کەکۆن و هەیبەتسوڵتان بەخاک سپێردرا.

لەبارەی دوا وەسیەت و پاشماوەی میراتی ماڵەکەی شەفیق گوتی: پێش کۆچی دوایی توانای قسەکردنی نەمابوو، خواردنی پێ قووت نەدەدرا، تەنیا بەچاوەکانی دەیدواندم و فرمێسکی دادەباراند و زۆری حەز لە ژیان بوو، میراتەکەشی بریتی بوو لە هەندێ (جلک و قۆندەرە)، کە ئەوانەم کردە خێر لەگەڵ دوو کانتۆری جلکان و تەلەفزیۆن و سەلاجەیەک و قەرەوێڵەیەک... (ئەوانەش لەناو خانووەکەی ئیدارەی محەلی/ گەڕەکی سەیداوەی هەولێر) بوون... هەمووم فرۆشت و هەندێ پارەم دایە براکانم. هەروەها ١٤٠٠٠ دیناریشی هەبوو لەسەر وەسیەتی خۆی بۆم کردە مەسرەفی تازیەکە و (قەبرەکەشم) پێ رێکخست و قەفەزێکیشم لەسەر دروست کردووە، کە قوفڵ دەدرێت و کلیلەکەشی لای خۆمە..

* لە کتێبی ژیان و سەربردەو بەرهەمەکانی تاهیر تۆفیق وەرگیراوە لە ئامادەکردنی (حوسێن حاجی قادر (ئاری)

# شاکر حەمە فارس
# ١٩٢٣- ١٩٩٤

**جەلال خدر**

یەکێک لە قۆریات بێژ و دەنگخۆشەکانی شاری هەولێر (مام شاکری بەننا)ی کوڕی حەمە فارس عەلافە. لەساڵی ١٩٢٣ لە گەڕەکی عارەبان لە شاری هەولێر چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. لەبەر ئەوەی باوکی پیشەی (عەلاف) بوو، لەگەڵ حاجی حەمەدی عەلی خان و سابیر عەلاف، ئەو کاتە لەناو بازاڕی هەولێر لەنزیک دوکانی قەسابەکانی ئێستا بوو. (شاکر) ( لەگەڵ باوکی ئەم پیشەیەی کردووە. لەپاشان وازی لەو کارە هێناوە و دەستی بە کرێکاری کردووە. لەژێر دەستی چەند وەستایەکی هەولێر وەک (وەستا عەساف و وەستا تەهای بەننا و وەستا خدر) و کەسانی تر ئیشی کردووە، تاوەکو شاکر وەستایەکی چاکی لێ دەرچووە. تا کۆچی دواییشی کرد پیشەی بەننایی کردووە.

شاکر حەمە فارس هەر لە منداڵییەوە حەزی لە گۆرانی و مەقامات کردووە، چونکە شاری هەولێر چەندین گۆرانی بێژ ومەقامزان و دەنگ خۆشی لێ هەڵکەوتووە، وەکو مشکۆ و حەیدەرە کەچەڵ و حاجی جەمیلی قاپ قاپچی و مام سەمەدی کوورەچی و حاجی ئەحمەدی جامباز و کەسانی تر. بەڵام لە خەڵکانی ترم بیستووە، کە گوایە شاکر لە تەمەنی گەنجیدا تووشی خۆشەویستییەکی پڕ لە ناکامی بووە. لە ئەنجامی ئەم خۆشەویستییە ئەو دوو گەنجە بەیەک نەگەیشتوون، کچەکە تووشی نەخۆشی هاتووە، لە ئەنجامی بەیەک نەگەیشتنیان کۆچی دوایی کردووە و هەر ئەو هۆکارەش وا لە مام شاکر دەکات، کە دڵی خۆی بەگۆرانی و مەقامات و قۆریات بداتەوە. زۆربەی ژیانی لەبن منارەی چۆلی بەسەربات.

مام حەیدەری کوورەچی بۆی گێڕامەوە گوتی: لەکاتی خۆیدا منداڵ بووم، زۆر حەزم لە گۆرانی و قۆریات دەکرد، مشکۆ و حەیدەرە کەچەڵ پێش من قۆریات و مەقاماتیان دەگوت، چونکە ئەوان لە شەهابە فێربوون، منیش لەگەڵ هاوڕێی منداڵیم (شاکر حەمە فارس)ی خاڵم دەچووینە چایەخانەی (مام سەمەدی) کوورەچی مامم بۆ ئەوەی گوێی لێ رابگرین، چونکە وەستایەکی چاک بوو، لە هەمان کاتیشدا عادەتی وابوو هەموو جارێک بەدوای گۆرانی بێژە بەناوبانگەکانی شاری کەرکووک (محەمەدی چل بۆین)ی (١٨٨٥- ١٩٥٨)دا دەنارد و ئەویش بە میوانی دەهاتە هەولێر لای ئەو میوان دەبوو. خەڵکی ئەو شارە لەو چایەخانەدا لە دەوری ئەو هونەرمەندە کۆدەبوونەوە و گوێیان بۆ شل دەکرد، چونکە زۆربەی زۆری ئسوولی مەقامات و قۆریاتی تورکی دەزانی. ئێمەش واتە (من و شاکر) هەموو جارێ خۆمان لەبن مێزی چایەخانەدا دەشاردەوە تاوەکو ئسوولی مەقامات فێرببین، هەتا جارێکیان ئەو مەقامزانە قۆریاتی (عومەرە گەلەی) دەگوت، کە بە (ئەبلە نێینم) دەست پێ دەکات. منیش لە دەمیم وەرگرت، زۆر بەجوانی بۆم دووبارە کردەوە، کاتێکی مامم گوێی لێ بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو، چونکە دەیزانی ئێمە لەو زووتر وەرمان دەگرت و دووبارەمان دەکردەوە. کە تووڕەش دەبوو، دەیگوت: (من پارەکی زۆر سەرف دەکەم تاوەکو فێری ئسووڵی قۆریات ببم، بەڵام (حەمید و شاکر) بەحازری دێتە بەر دەستیان).

* * *

شاکر لە تەمەنی گەنجیەتی فێری ئسووڵی قۆریات و مەقامات دەبێ، ئسووڵی کەرەم دیوان لەحاجی عەبدوڵڵای خەیاڵ و وەستا مەمۆی کارگەچی فێر دەبێت و شان بەشانی دەنگ خۆشەکانی شاری هەولێر وەک

مشکۆ و محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و نورەدین عەسافلی و محەمەد عاشق و کەسانی تر بەشداری لە ئاهەنگەکانی ئەگلەنجەی شاری هەولێر دەکات.

لە ساڵی ١٩٥٩ کاتێک بەرپرسی ئێستگەی بەغدا/ بەشی تورکمانی هاتە شاری هەولێر، داوای لەدەنگ خۆشەکانی ئەو شارە کرد بۆ ئەوەی دەنگیان لە ئێستگە تۆمار بکەن یەکێک لەوانە وەستا شاکر بووە، کە داوای لێ کراوە، بەڵام ئەو رازی نەبووە دەنگی تۆمار بکات، چونکە ئەوکاتە گۆرانی گوتن بەعەیب دەچوو، بەڵام چەند کەسێک رێگای ئێستگەی بەغدایان گرتەبەر، لەوانە (حاجی فائقی محەمەد سوڵتان بازرگان و محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و یونس خەتات) و کەسانی تر گۆرانییان تۆمار کرد.

***

وەستا پیربالی چایەچی (خاوەنی تۆمارگای بێخاڵ) بۆی گێرامەوە گوتی: لەساڵانی ١٩٥٣- ١٩٥٤ بۆ یەکەمین جار ئامێری تۆمارکردن (تسجیل) جۆری سیم لەگەڵ خوالێخۆشبوو وەستا لەتیفی چەخماخچییان هێنایە شاری هەولێر... بۆ ئەوەی دەنگی هونەرمەندی خالێخۆشبوو مشکۆ تۆمار بکەین. ئەو رۆژە چووینە ئوتێلی مام جەمیل یەکەمین کەس مشکۆ دەنگی تۆمار کرد و لەپاشان شاکر حەمە فارس دەنگی تۆمار کرد و پاش ئەویش مام جەمیلی ئوتێلچی بوو، کە چەند قۆریاتێکی چری.

***

مام شاکر دۆستایەتی لەگەڵ چەندین دەنگ خۆشی قۆریات بێژی شاری کەرکووک هەبووە، لەوانە (رەشەی کوللەرەزا و عزەدین نیعمەت و عەلی قەلعالی و مەمەد قەڵایی و فەخرەدین ئەرگێچ و کەسانی تر و لەگەڵ مشکۆی هەولێریدا هاتوچۆی ئەوشارەی کردووە، شان بەشانی ئەو دەنگ خۆشانە دەنگی هەڵێناوە، بە تایبەتی لە شەوانی رەمەزاندا، کە لەشاری کەرکوک و خەڵکی ئەو شارەش گوێیان بۆ شل دەکرد.

شاکر دەنگی یەکجار خۆش بوو، بە تایبەتی لەکاتی کەردم گوتندا کە دەنگی هەڵدەهێنا دەنگی وەک زەنگوڵە دەزرنگایەوە، هەتا جارێکیان مام مستەفای کەبابچی بۆی گێرامەوە گوتی شەوێک هونەرمەندی خوالێخۆشبوو مشکۆ لەگەڵ خاڵە تاهیر تۆفیق لە ماڵمان میوان بوون، مشکۆش شاکر حەمە فارسی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ئەو شەوە مشکۆ دەستی پێکرد ئاهەنگێکی خۆش بوو، لەناکاو خەنجەرەکەی خۆی دەرهێنا و ویستی لەزگی خۆی بدات لەبەر ئەوەی قۆریاتەکەی مشکۆ زۆر کاری تێکرد، هەر چۆنێک بێت نەیانهێشت لەخۆی بدات. شاکر دەنگی زۆر خۆش بوو بەتایبەتی لەکاتی قۆریات و کەردم گوتندا دەنگی هەڵدەهێنا و شان بەشانی دەنگ خۆشەکانی ئەو شارە دەنگیان هەڵێناوە.

سەید سەعید دامرچی بۆی گێرامەوە گوتی: شاکر حەمە فارس دەنگی زۆر خۆش بوو، هەموو جارێک بەبەر دوکانی ئاسنگەریم رەت دەبوو، داوای لێدەکردم کە بەندێک کەرەمی بۆ بڵێم، چونکە زۆر حەزی بە دەنگی من دەکرد، منیش دڵم نەدەشکاند و قۆریات و کەرەمم بۆ دەگوت، یان زۆرجار دەچووینە ئوتێلی مام جەمیلی لەگەڵ مشکۆ و پیرداوەدە کۆرە دەنگمان هەڵدەهێنا، شاکریش بەشداری لەگەڵمان دەکرد و کەرەمی دەگوت. کە لەکاتی خۆیدا لە حاجی عەبدوڵلای خەیاڵ فێر بوو بوو، چونکە حاجی عەبدوڵلا کتێبی کەرەمی هەبووە. زۆر بەراست و رەوانی فێرمانی دەکرد، هەروەها مەمۆ کارگەچی هەبوو ئەویش دەنگی زۆر خۆش بوو گشت بەندەکانی کەرەمی لەبەر کردبوو، زۆر بەجوانی بۆمانی دەچراند، ئێمەش گوێمان بۆ شل دەکرد.

شاکر حەمە فارس لەدوا تەمەنی ژیانیدا، تووشی نەخۆشی هات و بۆ ماوەیەک لەماڵەوە کەوت، ئەویش ئەوەبوو مەرگ مەودای نەدا و لەرۆژی چوارشەممەی ٢٤ مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٢ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و لە گۆرستانی کارگەی قیر بەخاک سپێردرا.

مردنی ئەو دەنگ خۆشە خەسارەتێکی گەورە بوو، لە هونەری مەقامات و قۆریات لەوشارە، پاش مردنی چەند کاسێتی تۆمارکراوی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە، کە لە ئەرشیفی تۆمارگای لەتیف چەخماخچی و وەستا پیربالی چایەچی و کەسانی تر پارێزراوە، چەند کاسێتی تری نەبیستراوی هەیە، کە لە ئاهەنگی تایبەتی ماڵی پیاوە گەورەکانی ئەو شارە پارێزراون.

■



هونەرمەند رەسوڵ بێزار گەردی
[illegible]

# رەسوڵ گەردی
# ١٩٢٤-١٩٩٤

**سەفین رەسوڵ گەردی**

### پێشەکی

پێش کۆچی دوایی، حەیرانبێژی بەتوانا نەخۆش بوو، نەخۆشی هێزی ئارامی لێ بڕیبوو. ئێوارەیەک رووی کردە ماڵمان و مەحجوبی کردم، دەمێک بوو لەسەر ئەوە رێکەوتبووین ناوناوە من سەری لێبدەم لەبەر نەخۆشییەکەی.

رەسوڵ گەردی وتی: بەم نەخۆشییەوە هاتم، تکایەکم هەیە دەبێ بیهێنیتە دی، بە تۆ نەبێ بەکەسی تر ناچێتەسەر، وتم: ئەمر دەکەی! ئینجا بە هەناسەیەکی نامرادییەوە، رووی تێ کردم و وتی: بێگومان ئەمە دوا سەردانمە بۆ لای تۆ، بەڵام تکایەکم هەیە ئەگەر نەمردم و بۆم کرا هەموو گۆرانییە دانراوەکانم چاپ بکەم، دەبێ دوو وشەم بۆ بنووسیەوە، ئەگەر لەپاش مردنی خۆشم بلاوکرانەوە، ئەوکاتە بێگومان دوو وشەکە دەنووسیەوە. وتم: بەڵێنت دەدەمێ بۆتی بنووسمەوە و خۆشت لەسەر ئارەزووی یەزدانی پاک هەر زیندوو دەبی. کەچی وەکو دەبینن دوو وشەکە کەوتە دوای مردنی.

### هەوڵەکانی هونەرمەند رەسوڵ گەردی بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانی

رەسوڵ گەردی گرنگییەکی زۆری بەشیعری خۆی داوە لەرووی دانان و ئاواز و چڕینیانەوە، هەروەها بۆ ئەوەی رزگاریان بێ لەفەوتان هەوڵیدەدا بلاویان بکاتەوە، لێرە تەنیا ئەوانەی بلاودەکردەوە ئەوەی خۆی ئاوازی بۆ دادەنا و دەیانیچڕی. بەم جۆرە لەماوەی ژیانی هونەری پڕ لە بەرهەمی داهێنراویدا سێ کومەڵە شیعری بلاوکردەوە:

١- بژار، لەبەغدا لەساڵی ١٩٥٧ چاپ و بلاوکرایەوە. کۆمەڵە شیعرێکە بریتی بوو لە (١٥٠) حەیران و (١٠٢) سروود و (١٥٢) هەڵبەستی گۆرانییەکانی رەسوڵ گەردی خۆی و لەگەڵ هەندێ لە شیعری ئەم شاعیرانەی کە گۆرانیبێژ ئاوازی بۆ دانابوو: حەبیب عەلی میرانی، ئاغای جوکلاغا، پیربال مەحمود، کانی، ئیبراهیم یوسف، ئەحمەد هەردی، بورهان جاهید، مەلا مەسعوودی بێ بەش، ئەحمەد دڵزار، مفتی پێنجوێنی، عوسمان عوزێری و هی تر.

٢- گوڵە مێلاقەی کوردستان، لە بەغدا لەساڵی ١٩٦٠ چاپ و بلاوکرایەوە. ئەم کۆمەڵە (٤٠) حەیران و



هونەرمەند رەسوڵ بێزار گەردی لەسەردانی هونەرمەند شەماڵ سائیب
نەخۆشخانەی رزگاری _ شاری هەولێر ١٩٨٥.

(٢٢) سروود و (٢٤) لاوک و (٢٧) گۆرانی رەسوڵ گەردی خۆی و لەگەڵ هەندێ شیعری شاعیرانی تری گرتۆتەخۆ، لەوانە: حەبیب عەلی میرانی، دڵدار، مەدحەت بێ خەو، محەمەد حەسەن مەنگوری، جەمال شارباژێری، شێرکۆ بێکەس، تۆفیق وردی، کەمال غەمبار، کەریم شارەزا، کامەران موکری، کانی، پیرەمێرد، ئیبراهیم هۆشیار، شێخ تەها شێخ سەعید (رەهبەر)، بورهان جاهید، ئەحمەد دلزار، عوسمان عوزێری و هی تر.

٣- شیلان و شلێر، لە بەغدا لەساڵی ١٩٦٧ بلاوکراوەتەوە، ئەم کتێبە لە (١٢٤) سروود و شیعر و برێک بەستە و گۆرانی میللی تایبەتی رەسوڵ گەردی خۆی، پێکهاتووە لە ژێر کاریگەری شیعری میللی نەنووسراو (فۆلکلۆر)ی کوردی دانراون و هەر خۆشی ئاوازی بۆ رێکخستبوو.

٤- دارەشەکران، لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٧ بلاوکراوەتەوە، ئەم کتێبە لە دوو بەش پێکهاتووە (١٥٠) حەیران و (١٤٩) شیعر و گۆرانی دڵداری. تەواوی بەرهەمەکانی لەم کتێبەدا زادەی ئەندێشە و سۆز و هزری رەسوڵ گەردی خۆی بووە.

**حەیران:** ئەم جۆرە گۆرانییە هونەری تایبەتی دەشتی هەولێرە، نرخ و سەنگێکی زۆری لای گۆرانیبێژ هەبوو. وەک ئاشکرایە رەسوڵ گەردی بێگومان لە سەرەتای ژیانی هونەریدا حەیرانی باو و بەناوبانگی سەردەمی خۆی بەئاواز وتووە (کە ئەمەش دەچێتە پاڵ داهێنانەکانی هونەرمەند)، بەلام لەدواییدا خۆی حەیرانی داناوە. ئەم برە حەیرانانەی



هونەرمەندان رەسوڵ بێزار گەردی و شەوکەت سەعید نیرەیی (مشکۆ) لە کاتی سەردانی هونەرمەند تایەر تۆفیق لە نەخۆشخانەی رزگاری لە شاری هەولێر لە ١٠ / ٢ / ١٩٨٦.



هونەرمەندی نەمر رەسوڵ بێزار گەردی لە ئاهەنگێکی تایبەت لە یانەی فەرمانبەران لە شاری هەولێر بۆ بەخێرهاتنی هونەرمەندی ناکۆکی کوردستان تایەتشان لە ١ / ١١ / ١٩٧٨

ناو ئەم کتێبە شەقڵی گشتیی حەیرانی دەشتی هەولێریان تێدا بەدی دەکرێ، هەروەها بەسۆز و چێژ و بلیمەتی گۆرانیبێژیش ڤانگ دراون وچەند لاپەڕەیەکیشیان لە تۆماری حەیران زیاد کردووە.

**گۆرانی دڵداری:** ئەمەیان زۆربەی هەرە زۆری ئەدەبی میللی دەگرێتەوە. وەکو لەم کتێبەدا دەردەکەوێ لە بەشێک لەم جۆرە شیعرە لیریکیانەدا رەسوڵ گەردی داهێنانی دیارە و لاپەڕەی ئەدەبی میللی کوردی دەوڵەمەند کردووە.

پرۆفیسۆر: مارف خەزنەدار،
هەولێر- مەڵبەندی رووناکی،
٢ی ئۆکتۆبەر ١٩٩٧، لە کتێبی (دارە شەکران)ەوە.

### شتێک لە یاد و بیرەوەریدا هەوڵەکانی هونەرمەند رەسوڵ گەردی بۆ چاپکردنی حەیران و گۆرانییەکانی

لەنزیکەوە بەم جۆرە مام رەسوڵم ناسی: من لە منداڵی قۆناغی سەرەتاییم لە بەحرکە تەواوکرد، و بووم بە مامۆستای سەرەتایی ناو شاری هەولێر. دەمم لە نووسین و وەرگێراندا، لەسەرەتای حەفتاکان لە ریزی یەکێتی نووسەران قبوڵیان کردم و لەخولی یەکەم و دووەم بووم بەئەندامی دەستەی بەرێوەبەری لقی هەولێری یەکێتی نووسەران. لەخولی دووەمدا مامۆستای دیار و ناسراوی کورد عزەدین فەیزی سەرۆکی بەش بوو. ئەوساکە من لەقوتابخانەی سیروان (خەلەکانی ئێستا) مامۆستا بووم، رۆژێکیان لە پۆل بووم خەبەریان دامێ گوتیان وەرە رەسوڵ گەردی هاتووە تۆی دەوێ. کە من ئەمەم بیست هەر تاسێک بردمیەوە، تاسی خۆشی و سەرسامی. چونە مام

رەسوڵ هاتووە چی لە من دەوێ و چۆن منی ناسیوە و چۆنی زانیوە لێرەم!؟ کە چووم دیتم مام رەسوڵ بە هەیکەلێکی رێکوپێک و پۆشتەوە، بە ویقاری مرۆیەکی مەزن لەناوەندی حەوشە راوەستابوو. کە چاوی بەمن کەوت بە خەندە و قسەی خۆش و بە گەرمی باوەشی پێداکردم، و گوتی وەرە تۆ برازای منی، تائێستا تۆم نەناسیوە... کە دانیشتین دوای چاک و چۆنی و هەواڵ پرسین، گوتی کۆمەڵێ بەستە و حەیرانم هەیە دەمەوێ بیاننووسمەوە وەچاپیان بکەم بەڵام خۆم خەتم خۆش نییە، چوومە لای مامۆستا عزەدین فەیزی و ئەویش رەوانی لای تۆی کردم. ئیتر دەبێ تۆ بەستە و حەیرانەکانم بۆ بنووسیتەوە بۆئەوەی لەدەرفەتێکدا چاپیان بکەم. منیش کە لەخوام دەویست هونەرمەندێکی وا گەورە بناسم بەویەڕی شانازییەوە داواکەیم خستە سەر سەر و هەر لەوێ رێکەوتین هەموو ئێواران بچمە ماڵیان و لەوێ بەدووقۆڵی دابنیشین، ئەو بۆم بخوێنێتەوە و منیش بینووسمەوە. ئەو کاتە ئەو ماڵی لە تەیراوە بوو، لەپشت کۆنە ئۆرزدی و ئێمەش هەر ماڵمان لە تەیراوە بوو. هیچ گیروگرفتی هاتوچۆ و دانیشتنی ئێوارانمان لەپێش نەبوو. ماوەیەکی زۆر هاتوچۆی ماڵی مام رەسوڵم کرد و هەموو بەستە و حەیرانەکانم بە دوو دانە بۆ نووسییەوە، چونکە دەبوایە بە دوو دانە پێشکەشی سانسۆری بکات و ئەو کاتە روونووسی کردن وەکو ئێستا بردوی نەسەندبوو هەر ئەوسا مام رەسوڵ رووی لێنام کە پێشەکی بۆ حەیرانەکان بنووسم و منیش بەڵێنم پێدا کە کاتی چاپکردنی حەیرانەکان هات، نووسینی پێشەکییەکە بگرمە ئەستۆ. ئیتر من ئاگام لێبڕا نازانم داخۆ ئەوەی من نووسیمەوە لە سانسۆر رەفز کرایەوە و بزر بوو یان لە رووداوە جەرگبڕەکانی ساڵی ١٩٧٥ فەوتا، بەهەرحاڵ دەستنووسەکان نەمان و مام رەسوڵ هەرچەندە بە پەرۆشەوە بوو بەرهەمەکانی چاپ بکات بەڵام جارێکی تر نەگەڕایەوە سەر پاکنووس کردن و ئامادەکردنیان.

لێرەدا بەدەرفەتی دەزانم بۆ مێژوو شتێ لەبارەی مام رەسوڵ و کاک سەفینی کوڕی تۆماربکەم کە لەو ماوەیەدا سەرنجی ڕاکێشام. مام رەسوڵ گەردی پیاوێکی قسەخۆش و پۆشتەو پەرداخ و دڵکراوە بوو. حەزی لەجوانترین بەرگ و خۆشترین خواردن دەکرد. هەمیشە بەدەستە بەرگێکی تازە و پاکوخاوێن و بە چەفیەیێکی گەورە و رێشوودارەوە دەگەڕا. تابڵێی پیاوێکی سەخی تەبع و دڵ فراوان و میوان پەروەر و بەخزمایەتی بوو، نەفسی زۆر بەرز بوو، بەتەنیا لەماڵەوە دەژیا. لەم تەنیاییەدا ئەوەی بەتەنگیەوە دەهات کاکە سەفینی کوڕی بوو. من لەوەتی هەم هیچ کوڕێکم نەدیوە بەقەد کاک سەفین لەخزمەتی باوکی دابێ و شەو و رۆژ ئامادەبێ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و تۆزقاڵێک ماندووبوون و وەڕسی نەزانی. کاک سەفین لەم بارەیەوە مەگەر هەر لەناو چیرۆک و ئەفسانان نموونەی هەبێ. هەر لەماڵ رێکخستن و جل شوشتن و جەم ئامادەکردن و دەرمان پەیداکردن و میوان بەخێرهێنانەوە، تا پاککرنەوە و سەرشووشتن و هەموو خزمەتێکی تر.... ماوەی سی ساڵ زیاتر هەمووکات و توانا و خۆشی خۆی بۆ خزمەتی باوکی نەخۆش و تەنیا کەوتووی تەرخان کرد. خوا هەزار جار پاداشتی ئەو خۆبەخت کردنەی بداتەوە.

با بێمەوە سەر مەبەستی سەرەکی، مام رەسوڵ تا کۆچی دوایی کرد هەر بە هیوای ئەوەبوو بەرهەمەکانی بە چاپکراوی ببینێ، بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو خۆزگەیەی نەهاتە دی. ئێستا وا کاک سەفینی خەمخۆری ئەوسا و ئێستای خەریکە بەستە و حەیرانەکانی چاپ دەکا، پێش چاپکردنی حەیرانەکان جارێکی تر دەستنووسەکەی پێشاندام و داوای لێکردم پێشەکی بۆ بنووسم، منیش هەر لەبەر ئەو بەڵێنە کۆنەی بە مام رەسوڵم دابوو و هەم لەسەر قسەی برای بەڕێزم کاک سەفین بڕیارمدا شتێ وەکو پێشەکی بۆ حەیرانەکان بنووسم. دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم جارە (نەورۆز فاروق) کە ئێستا لەپۆلی چوارەمی بەشی کوردی کۆلێژی پەروەردە دەخوێنێ، ئەرکی نووسینەوەی



هونەرمەند رەسوڵ بێزار گەردی لەگەڵ هونەرمەندی باکووری کوردستان ئایشە شان لە ئاهەنگێکی دووقۆڵیدا لە شاری هەولێر ١ / ١١ / ١٩٧٨.

حەیرانەکانی گرتۆتە ئەستۆ و زۆر بەرێکوپێتکی کارەکەی ئەنجامداوە.

### سەرنجێکی خێرا لە حەیرانەکان

(حەیران، ئەمڕۆ هێواریٚ بۆنی گوڵان دیٚ. گەلی برا و برادەرینە، ئەمن زەینیٚ خۆم دەداوە بەژنەکی باریکەلانە و دووچاوی بەرک و گەردەنی پڕ لەخار و چارۆگەی سپی گەلەک شیرین لەملان دیٚ. دەرێمە ئەو زاڵم بابەی دەتۆ بینە ماچ کەم گەردەنەکی بە مەرجان، دەست شۆڕکەمەوە سەر جۆتە شەمام و شەمامی ڕۆستەم بەگی، ماچ کەم بەینی گوارەو خەزێمان، مەچووە مارە جیرانان لە درم گەلەک گران دیٚ.) حەیرانی ژمارە (٤٦)

حەیرانی کوردی، وەکو بەندەلاوک و ئازیزەوپایزە، بەزۆری لە سیٚ قافیە پێک دیٚ و بە سیٚ هەناسە دەگوتریٚ. بەشی یەکەم کورتە، بەشی دووەم لەو درێژترە، بەشی سێیەمیش لە هەموویان درێژترە. سەرواکانی ئەم حەیرانە کە هێڵیان بەژێردا کێشراون ئەمانەن (گوران دیٚ، لەملان دیٚ، گراندیٚ). وشەکانی سەروا بریتین لە (گوران، ملان، گران) وشەی (دیٚ) پاش سەروایە (ڕەدیف). هەربۆیەش من بەگوێرەی ئەم سیٚ سەروایە حەیرانەکەم لێک جیاکردەوە و ڕستەکانی هەر بەشێکم بەسەریەکەوە نووسی. واشم پیٚ باش بوو هەموو حەیرانەکان بەو شێوەیە بنووسرابانەوە کە هەرسیٚ سەروای ناوەوە لەبەینی وشە و دەستەواژە و ڕستەکان بیٚ، بەڵام بەگشتی هەر حەیرانێک دەکریٚ بەسیٚ بەشی سەرەکی.

لەبارەی کێشەوە، هێشتا لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستی و فراوان لەم بارەیەوە ئەنجام نەدراوە و بەتەواوی یەکلا نەکراوەتەوە. ئەگەر لێرەو لەویٚ لە لێکۆڵینەوەکاندا بەتەواوی ساغ نەکراوەتەوە. هەندیٚ دەیبەنەوە سەر پەخشانە شیعر و هەندیٚ بە کێشی بازنەیی لێکی دەدەنەوە، بەڵام پێویستی بەلێکۆڵینەوەی ڕەسەن و قووڵ هەیە تا بەتەواوی هەقیقەتی دەربخەن.

هەموو حەیرانێک بە وشەی (حەیران) دەست پێدەکات و سەر هەڵدەدات و پەل داویٚ، ئینجا لەوەوە نەشونما دەکات و دوای وشەی (حەیران) کاتەکە دیاری دەکات: (حەیران/ ئەوڕۆ سبیانیٚ... ئەوڕۆ هێواریٚ... ئەو سارەکە بواریٚ... ئەوسارەکە زستانیٚ... ئەوڕۆ نیوەڕوانیٚ...



ئەوشۆکە... ئەوڕۆکە...).

یان شوێنەکە دەستنیشان دەکات: (حەیران/ لەبانی بانیان لەبانی سەربەنیٚ... لە شینەکان لە شینکی هەڵگۆزی... لە زوورگان لە زوورگی قەرەنی... لە قووچی قەزەنی لە گێجان لەگێجی زووری... هەولێر هەولێرە... چیایەکەی قەرەچووغی...).

یان ناو و سیفەت و نازناوی یارەکەی هەڵدەدات: (حەیران/ قورینگە... هەمینە... کێژۆرە گوریٚ... مامزە...).

یان بەدەستەواژەی تر دەکەوێتەوە وەکو (حەیران/ سوارەک ڕاوەستایە... چاوم قاسیدە... نۆری بەنۆری... کێژ دەریٚ... هەرچی دەبێتە...)

لەم سەرەتایانە حەیران بەشی هەرەزۆری بەدەستنیشانکردنی کاتەکە دەست پێدەکات، و ئینجا شوێنەکە و ئینجا ناوەکە و ئینجا وشە و دەستەواژەی تر، بەزۆریش وادەبیٚ لەگەڵ کاتەکە یەکسەر شوێنەکەش دیاری دەکریٚ: (حەیران ئەوڕۆ سبیانیٚ قەپران شبن دەچیٚ بە بیرۆناوە... حەیران ئەوڕۆ سبیانیٚ زێبیٚ بادینان لەمن دیٚ و دەسامیٚ...) ئینجا پاش ئەو پێشەکییە حەیرانبێژ دەچێتە ناو باسەکەی و بە یارەکەی خۆی هەڵدەڵیٚ، بە مامز و سۆنە و قازوقورینگی دەشوبهێنیٚ...وەسفی قەدوباڵای دەکا...باسی گەردەنی بەخاڵ و بەژنەکی باریک و دووچاوی ڕەشکۆکە دەکات... بەخشڵ و پلپڵە و بازن و ئەنگوستیلەیدا دێتە خواریٚ. زۆر جار خۆی ڕاوکەرە و یارەکەی کارمامزە، ئەو دەشت و گرد و زوورگانەی پیٚ دەکا و ئاخری لەو شوێنەی خۆی دەیەویٚ ڕاوی دەکا.

**شوێنی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی حەیران:**

هەر ناوچەیەکی کوردستان جۆرە ئاواز و گۆرانییەکی تایبەتی تێدا باوە. حەیرانیش لە ناوچەی دەشتی هەولێر و پشدەر و موکریانی ئەودیو بڵاوە. زۆرجار ئەو گفتوگۆیە هاتۆتە پێشەوە و گەرم کراوە. ئایا حەیران لە دەشتی هەولێر لەدایک بووە و ئینجا پەڕیوەتە پشدەر بەرەو موکریانی هەڵکشاوە یان لە موکریانەوە پەیدابووە و شۆڕبۆتەوە خوارێ بۆ ناوچەی هەولێر؟ ئەمە پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ورد هەیە، و بەلسەرپێی یەکلا ناکرێتەوە. گرنگ ئەوەیە ئەمڕۆ حەیران لەو ناوچە پان و بەرینەدا هەیە، و لە هەر بەشێکی ئەو ناوچەیەشدا ڕەنگدانەوەی باری ژیان و جوگرافیان، و دابونەریت و ڕەوشتی ئەو شوێنەی پێوە دیارە. ئەگەر چی بەراوردێکی سەرپێیی حەیرانەکانی ناوچەی هەولێر و ئەوانەی ناوچەی موکریان ئەوە دەردەخات ناوی زۆر شوێنی ناوچەکانی هەولێر لە حەیرانەکانی موکریانی دووبارە دەبێتەوە، بەڵام (ئەوەندەی من ئاگاداربم) ناوی هیچ شوێنی موکریان لە حەیرانەکانی ناوچەی هەولێردا نەهاتوون. ئەمەو زیاتر ئەو ڕایە دەچەسپێنێ کە حەیران بەگشتی پتر ڕەنگدانەوەی ناوچەی هەولێرە و دوورنییە لێرە سەری هەڵدابێ و یاساکانی چەسپابێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەکو گوتم ئەمە هەروا بەئاسانی ساغ ناکرێتەوە، پێویستی بە دواداچوونێکی زانستی وردی بەردەوام هەیە.

**هەندێ لایەنی ناواخنی حەیران:**

حەیران هەرچەندە لە سۆزێکی دڵدارییەوە پیاو بۆ خۆشەویستەکەی دەری دەبڕێ، زۆر شتی تێدا هاتووە. بەتایبەتی ناوهێنانی شوێنی جۆراوجۆری جوگرافی و وەسفی خشڵ و بەرگی کچە و شەیدایی بەدوای دڵخوازو دەوری بەدکار لە لێککردنی دڵدارەکان و دەوری پێناو بۆ لێک نزیککردنەوەیان و ئەو دیارەی پێشکەش حەیران دەکرێ و ئەو گلەیی و گازاندەیەی لەیەکتری دەکەن. لەخوارەوە هەندێ لەو لایەنانە دەخەینە بەرچاو:

**شوێن لە حەیراندا:**

یەکێ لە سیما جیاکەرەوەکانی حەیران ئەوەیە کە ناوی زۆر شوێن باس دەکا. ناوی دەیان و سەدان گوند و شار و گرد و کانی و ڕووبار و جۆگە و کەند و دۆڵ و دەشت و مەزار و بیر و چیا و شاخ... لە حەیراندا هاتووە.

ناوی کانی و جۆگە و ڕووبار و بیر و سەراو، وەکو: (جۆگەی سەعیدئاغای، جۆگەی مەخموور، زێی بادینان، سراو، کانی وەکازی، کانی بەحرکەی، بیری مەحموودی سەنان، بەستۆڕە، کانی بێترمەی، کانی سەقاوێ، جۆگەی شێخەڵلای، ڕووباری سەرخمە، جۆگەو ئاوی چیمەنێ، هۆڕی باڵەکیان...).

ناوی گوند و شار و شارۆچکە، وەکو (ئازیکەند، باقرتە، شەرگات، تەورێز، سێقوچان، بەحرکە، زەرواو، هیران، نازەنین، قەرادزە، نۆچەوسرناج، خەزنەوتەرجان، قەفەر، هەریر، ڕەشوان، بەربیان، مەخموور، خاروان، ژدنگار، شێراوە، قەپەکیان، گرداڕەق، دهێمات، بتوێن، خەلیفان، شێخ مەموندیان، روست و گرتک، باتاس، بیردبات، چمژنیکان، هەرەجەو بیستانە، قەراتگە،....).

ناوی چیا و گرد و دۆڵ و شیو باسک، وەکو (چارچەڵی هەرکیان، سپیەڕێزی خەیلانیان، زوورگی قەرەنی، زوورگە زراو، بازاڕگە، گردەسۆری سیپان، گردی کوشافی، گردی پیرداوی، چیای سەفین، مەقلوبی شێخانی، گردی تەرمووسەکی، دۆڵی هەرشەمێ، سەربەندی، بستی گۆگەمان، بێژینگ بەسەر،....).

ناوی هەندێ دەشت و ناوچەی گشتی وەکو (دەشتی قەراجی، کەندێناوە، مرکیە) ناوی مەزاری پیاوچاکان وەکو: (غەوسی بەغدایێ، گومبەتی عەبدولعەزیزی، گومبەتی عەولای عارەبی، شێخ وەیس، پیربەدری هەنارە،



هونەرمەند ڕەسوڵ بێزار گەردی لە ئاهەنگێکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە بۆنەی سالیادی نەورۆزەوە ساڵی ١٩٧٠.

شێرەسوار...).

ناوی ئەم شوێنانە لە حەیرانان بەرێکوپێکی نەهاتووە، بەپەرتوبڵاوی هاتوون دەشێ سەرلەنوێ بیرێنەوە تەک یەکتر و نەخشەی جوگرافی خۆیانی لێ دروستبکرێ. گرنگی ناوهێنانی ئەم شوێنانە لە حەیراندا بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١- ناوی ئەو شوێنانە لەو حەیرانانەدا چەسپاون وەکو بەڵگەیی خۆیان گرتووە.

٢- هەندێ لەوشوێنانە ئێستا نەماون، و یان لەبەر کارەساتی سروشتی یان لەبەر پێشکەوتنی شارستانیەتی یان بەدەست داگیرکەران فەوتاون و لەسەر نەخشەی زەویدا سڕاونەتەوە.

٣- هەندێ لەو شوێنە کوردیانە، کوردیان لێ وەدەرناوە و عارەبیان لێ نیشتەجێ کراوە وەکو گوندەکانی ناوچەی قەراج و کەندیناوە و شەمامک..

## ناوی عەشیرەت و سەرۆک هۆز و ناودار و ئافرەتی بەناوبانگ:

حەیران ناوی زۆر عەشیرەت و سەرۆک هۆز و مرۆی بەناوبانگ و ئافرەتی هەڵکەوتی هێناوە کە لەکاتی خۆیدا دیار و بەرچاو بوون و پیاوەکان بە دلێر و ئازایەتی و ئافرەتەکانیش بەجوانی و خانومانی و نازداری ناوبانگیان دەرکردووە. ئەمەش هەندێ لەو ناوانە: عەشیرەتەکانی وەکو (گەردی، دزەیی، داسنی، بۆلی، سیان، مامەسێنی، لەک،..) پیاوە ناودارەکان وەکو (کاکلاغەی گەردی، مامراغەی زراری، مامەغای کۆیە، برایمی بایزی، وەستا سدقی رواندزێ، مەولودی حەسەناغەی،...) ئافرەتە نازەنینەکان وەکو (خەجیجی رەحمان، جەواهێری ئەحمەدی باربنان، ئەسمەری کابایزی، خانزادی سۆران،...) ئەمانە و دەیان ناوی ناودارانی کورد لە دووتوێی حەیراندا تۆمار کراون.

## خشڵ و کەرەستەی خەمڵینی ئافرەت:

(حەیران ئەوڕۆ سبیانێ، هەولێر هەولێرە، هەولێر لە غێمێ، دەرێمە بەژنی باریکەلانە، زەندێ بەبازن، قامکی بە ئەنگوستیلە، ملەکەی بە کرمۆکە، پەنجەکی بەخەنە، گوارەت پیرۆز بێ لەگەر خەزێمێ....) حەیرانی ژمارە



هونەرمەندانی پێشمەرگە رەسوڵ بێزار گەردی و فوئاد ئەحمەد، چۆمان ٦ / ١٠ / ١٩٧٤.

(٨٠).

لەم دوو بەشەی حەیرانی ژمارە (٨٠) دا ناوی پێنج جۆرە خشڵ هاتووە کە زۆر لە حەیراندا دووبارە دەبنەوە. جگە لەم خشڵانە دەیان خشڵی تری کوردی کە ئافرەتی کورد خۆیان پێ دەخەملێنن، لەم حەیرانەدا بەکارهاتوون، ئەمانە هەندێکیانن (تافگەو هەوری، هیزار، شەدە، دوگمەلاگیرە، تۆق و تەلەسم، حەمایل و عاشق بەند، مەرجان، مووری، لاسەرە، چارۆگە، ئێمەنی سۆر، گوارە، قەنەفر، کلیلەی سینگ و مەمکان، سنجاق و دەرزی، خڕخاڵ، کرمۆکە، پلپلە، تاس،....).

## پێناو و بەدکار:

لە حەیران زۆر جار باسی دوو کەسی دژ بەیەک دەکرێ، کە یەکێکیان پێناوە لەنێوان دڵداری دڵخوازدا دەوری چاکە دەگێڕێ و هەوڵدەدا بەیەکیان بگەیەنێ، ئەوی تریش بەدکارە و دڕکی مەم و زینانە و هەوڵدەدا دوو دڵدار لەیەک بکا.

## پێناو:

پێناو هۆی چاکە و قسە هێنان و بردنە بۆ مەبەستی بەیەکگەیاندنی دوو دڵدار و دڵخواز. عاشق خەبەری بەپێناو دەنێرێ بۆ حەیرانەکەی خۆی کە بۆی بچێتە جێژوانی (ئەمن ئەوڕۆکە چاوم بە پێناوێ دەکەوت، دەمگوت: دەتو وەرە دەستی منت دامەن بێ، ئەتۆ ئەوڕۆکە لە بۆم برێ بە بەژنەکی برند و دوو چاوی رەشکۆکە، سبەی دانی هێوارێ لەبۆم بێتەوە جێراوگەی ژوانی جاران) بۆئەوەی ئەوانیش بۆ خۆیان بکەن (تەکبیرێ). جاری واش دەبێ حەیران بە پێناوێ جوابان دەنێرێ بۆ کوڕەتیمە لاوە:

(حەیرانەکەی من جوابا دەنێرێ بە پێناوێ دەرێ: ئەو سارەکە پایزێ یان بەماری دونیا بێ یان بەنووکی خەنجەرێ لەبن دەستی گولەکەی مێردان زوو دەرم بێنی). وایش دەبێ حەیران هەر لەماڵە بابی بێ و ئەو جوابە بە پێناوێ بۆ کوڕەتیمە لاوەی بنێرێ. (ئەوڕۆکە دەگەمە پێناوێ جوابێک دەدەمێ دەیگۆت: بەژنێ باریک دەرێ: بەسیە چیدی دانانیشم لە مارە بابان، یان دەرم بێنە بە ماری دونیایێ یان ئەوەتانێ دەستم لێ بەردە..) ئەمە دەوری دڵسوزانەی پێناوە، بەڵام ئەمسینترین پێناو ئەوەیە کە (حەزلێکردن هەنگینێ خۆشە لە ناو چیغ و ڕەشماران، کیژ تازە پێرابگا، داکی پێناو بێ...)

**بەدکار:**

بەپێچەوانەی پێناو کە هەمیشە قاسیدی خێرو چاکەیە، هەردوولا بە پەرۆشەوە چاوەڕێی دەرکەوتنی دەکەن بۆ ئەوەی خەبەرێکی خۆشیان بۆ بێنێ و ڕاسپاردەیەکی گرنگیان بۆ ببا، بەدکار هەمیشە بەدوای تێکدانی بەینی کوڕ و کچدا دەگەڕێ، بۆیە لە هەرکوێ دەربکەوێ شەڕوخراپە و بەدکاریی لەگەڵ خۆی دێنێ. کوڕ و کچە هەمیشە بە پارێزەوە دەچنە ژوان و بەترسەوە یەکتر دەدوێن نەوەک بەدکارێک پێبزانێ و لێیان لەدەنگ بدا. (لەرکی بەدکاری گوندی خۆمان، خۆ دەرباز بکەین بەنیوەی شەوێ) تەنانەت هەموو لێک دوورکەوتنەوەیەک دەبێ بەمایەی ترس و دڵەڕاوکێ نەوەک بەدکار دڵیان لەیەک بڕەنجێنێ، ئەوەتا کچ دەڵێ: (گەلەک مەترسییان دەکەم ئەوسارەکە چەند سارە چوویتەوە گوندی بێگانان بەقسەی بەدکاران درێژکەی لە من شکابێ).

**خەبەری بەینی کوڕو کچە:**

زۆرجار کچە جوابان دەنێرێ کە کوڕەکە چیتر دەستەوەستان دانەنیشێ، بێتە پێشێ یا بەماڵی دونیا یا بەزەبری خەنجەرێ بۆ خۆی دەربێنێ. کچە هەمیشە ئامادەیە بەکراسی بەری بۆ کوڕ بچێ (لەگەڵت دێم بەگرێ چارۆکێ)، تەنانەت دوای شووکردنیشی مەیلی کوڕە لاوەکەی خۆی هەر دانانێ و جوابان بەپێناوێ دەنێرێ بێ لە دەست مێردەگولەی دەربێنێ.

کوڕیش ئامادەیە قوربانی بەئازیزترین شت بدا کە تفەنگی شانی خۆیەتی بۆ ئەوەی بۆ کچەتیمە حەیرانەکەی بەدیاری بدا (تفەنگی سەر ملیت لۆ دەفرۆشم دەیدەمە بەمەرجان و خەریتە بە قەنەفرێ). کە یارەکەی گلەیی لێدەکات دوو گراوی گرتینە، کوڕە حاشا لێ ناکا. دەڵێ ئەم دوو گراویەم بۆیە گرتینە (یەکیانت بۆدەکەم بە کۆیلە، ئەوەی دی بەلانک ژینە.)

**هەندێ لێکچواندنی تایبەتی ناو حەیران:**

هەندێ نموونەی زۆر دەگمەن و جوانی لێکچواندن لە حەیراندا هاتووە، لە هەمووش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە یەکێ لە تایبەتمەندە جیاکەرەوەکانی لێکچواندنی ناو حەیران ئەوەیە کە لەجیاتی ئامرازی لێکچواندن، دەستەواژەی (بۆمن بمێنێ) بەکاردێ:

(دەبا ڕوومەتی لەبۆ من بمێنێ بەتۆیی گوڕێ، چاوی بەپیارە و ژێرپیارەی عەجەمێ، مەمکی بەجووتە سێوەی ڕوستاوی، بەژنی بەدارەکەی عوودێ هەموو فەسڵی بەهاران وەکی شین دەبێتەوە لە ناو باغ و چارباغی میری شەقڵاوێ).

ئەمەش هەندێ لێکچواندنی تایبەتی ناو حەیران:

- لێکچواندنی سینگ و مەمک بەدوکانی عەتاران (سینگ و مەمکی حەیرانێ دەشوبهێنم بەوان دوکانی عەتاران، هێوارە و سبەینان دەستی خۆم تێدا دەگێڕا).

- لێکچواندنی بەژن بە نەمامی دارسێو، و چاو بەچاوی کارمامزی ناو ڕەوێ (بەژن نەمام سێوی ساردە پایزانی، چاو کارمامزی جوان ناو ڕەوێ).

- لێکچواندنی گەردن بەشووشەی بەلوور، و پەرچەم بە



هونەرمەندی پێشمەرگە ڕەسوڵ بێزار گەردی لە کاتی شیعر خوێندنەوە و سروود گوتن لە ئێزگەی دەنگی کوردستان ٦ / ١٠ / ١٩٧٤

ئاوریشمی عەتاران (گەردەنی ئەو چاو ڕەشەی لەبۆ من بمێنێ بەشووشەی بلەوری، پەرچەمی بە ئاوریشمی عەتاران وەکو دەفرۆشن لە شارەکەی پیرە تەوریزێ).

**وەستاکارییەکی ورد:**

کوڕە کەپرێک بۆ کچەتیمە حەیرانەکەی دروست دەکا، بەڵام وەستاکارییەکی بێ وێنەی تێدا خەرج دەکا. خەیاڵێکی شاعیرانەی زۆر ناسکی دەخاتە کار و کەپرێکی نموونەیی دروست دەکات، لە هەڵبژاردنی شوێنەکە و بەکارهێنانی کەرەستەی نایاب و هونەر نواندندا گوێ داهێنانی دەباتەوە.

کەپرەکەی لەسەری سەفینی دروست دەکات، کە شوێنێکی هەرە بەرزی ئەو ناوچەیە و بەسەر هەموو لایەکدا دەڕوانێ و ئەوەی لەژێر ئەو کەپرە بڵندە دابنیشێ هەموو ناوچەکە لەخوار خۆیەوە دەبینێ. بناغەی دەکا بەسۆتکە و دیواری بەقەنەفر و کاریتەی لە دار کنێر و دارەڕێی بە سۆرە گوڵ و هەراشی بە ڕەشە ڕەیحان. ئینجا سواغی دەدا بە گوڵە شیلان دەیڕشێنێ بە گوڵاوێ. ئینجا شەو لە سێباری نیوە شەوێ دەستی یارەکەی دەگرێ و دەیباتە ناو ئەو شانشینەی کە شەو بای لێدەدا، ئەو بۆنە دەڕوا بۆ سەر ماڵە دیانان. (حەیرانی ژمارە ٤)

ئەگەر خەیاڵی شاعیرانەی حەیرانبێژ ئەو کەپرە ناسک و بۆندارە بۆ نازدارەکەی دروست بکا، ئەوا کچەتیمە حەیرانیش ئەم مەرحەمە بۆ برینی کوڕەتیمە حەیرانەکەی دەگرێتەوە، چونکە شەوبایێ پیرە پایزێ گەڵەک ساردە نەوەک بداتەوە لە برینی کوڕەتیمە حەیرانێ، برینی دووخانە نەخۆ بکێشێتەوە میراتە زوخەمێ لەگەر تەشەنێ.

یاردەستە مەرحەمەکی دەگرێتەوە لە تۆزی هیزارێ، لەگەردی شەدێ، لەئاوگری خەزێمێ.

دکتۆر عەزیز گەردی،
هەولێر ١٩٩٩، لە کتێبی (دارەشەکران)ەوە.

## کورتە باسێک دەربارەی
## ژیانی هونەرمەند (ڕەسوڵ بێزار گەردی)

هونەرمەند (ڕەسوڵ بێزار گەردی) ناوی تەواوی (ڕەسوڵ ئیبراهیم سوڵتان)-ە. لە گوندی (قەڵادگە) لە دەشتی



هونەرمەندی پێشمەرگە ڕەسوڵ بێزار گەردی _ دەربەند ٣٠ . ١٠ . ١٩٧٤.

بەڕانەتی (هەولێر) لە ساڵی ١٩٢٢ز لەبنەماڵەیەکی ئایینی پەروەردا چاوی هەڵێناوە، بەڵام هەر بەکۆرپەیی باوکی کۆچی دوایی کرد بەبێ سۆزی باوکی گەورە بوو، هونەرمەند دوو برای تری هەبوو بەناوی (عەلی و خدر)، بەڵام لەبەر هەژاری و دەردەسەری دوای ماوەیەکی کەم پاش مردنی باوکیان ئەوانیش گیانیان بەیەزدان دەسپێرن. دوای چەند ساڵێک دایکی شوو دەکاتەوە بە(محەمەد عەبدوڵلا) و دەچێ بۆ (دیبەگە) و هونەرمەند لای مامەکانی جێ دەهێڵن، بەڵام هونەرمەند بەبێ دایکی ناسرەوێ و لەگەڵ دایکی لە دیبەگە ژیان بەسەر دەبا و هەر لەوێش دەچێ بۆ قوتابخانە بەناوی (ڕەسوڵ محەمەد عەبدوڵلا) بۆیە ناوی لە تۆمارگەی ڕەسمی هەر بەم ناوە تۆمار کراوە. لەو کاتەدا هونەرمەند هەر لەتەمەنی منداڵیدا بەهرەمەندیی لە سروود و گۆرانی گوتندا بەدەردەکەوێ و دەنگخۆشی ئەو منداڵە بچووکە لە دیبەگە بڵاو دەبێتەوە، هونەرمەند تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی دەخوێنێ، و لەبەر هەژاری و بێدەرامەتی بیر لە کەسوکاری خۆی دەکاتەوە و دووبارە ڕوو لە ماڵە مامەکانی دەکاتەوە، لەناوچەی زرارەتی لەگوندی (گردی ماوان) دوو مامی دەبێ بەناوی (میکائیل و ئیسماعیل شازێ) پاشان دەچێتە سەر ماڵی باوکی کە مەڕوماڵاتێکی زۆری لەدوا بەجێمابوو، و دەبێ بەشوان، بەڵام زۆر حەز لە ڕاو دەکات ئیتر لەگەڵ شوانی دەست بەڕاوە ماسی و تەیروتوار دەکات، و ئێوارەش بەحەیران و گۆرانی گوتندا بەرەو (گردی ماوان) دەگەڕایەوە. پاش چەند ساڵێک لەوێ مەڕوماڵاتەکەی دەفرۆشێ و دەچێتە شاری هەولێر بۆ لای داپیرەی کە ناوی (فاتم) بوو لە

گەرەكی عارەبان بەچاودێری پلكی كە ناوی (ستی) بوو، بۆ هەڵسووڕاندنی ژیانی خۆی و داپیرەی دەست بەكاركردن دەكات، تاوەكو بانگ دەكرێ بۆ خزمەتی سەربازیی لە ساڵی (١٩٤٠) هەر لە سەربازیشدا لەبەر پاكوخاوێنی و رێكوپێكی دەیكەنە (ئینزبات) و بەشداری شەڕی (ڕەشید عالی) دەكات لەو شەڕەدا زامدار دەبێ، دوای چاكبوونەوە و تەواوكردنی ماوەی سەربازی، دەبێ بەپۆلیسی سوارە واتە (الخیالە) بۆ ماوەیەك دەنێردرێتە شاری (كۆیە) لەم ماوانەدا هونەرمەند هەر بەردەوام دەبێ لە گوتنی حەیران و بەستە و گۆرانی، بەم شێوەیەش لە شاری كۆیەش هەر بە پۆشتەیی و پاكوخاوێنی و دەنگخۆشی بەناوبانگ دەبێ و زۆر خۆشەویست دەبێ لەلای خەڵكی ئەم شارە، ئینجا دەگوازرێتەوە بۆ (ڕانیە) و ناوچەی (میرزا رۆستەم) لەوێش هەر زوو خەڵكی ئاشنای دەبن، پاش ماوەیەك هاوسەرێك هەڵدەبژێرێ بۆ خۆی كە ناوی (ئامینە محەمەد حەسەن)ـە لە بنەماڵەیەكی ناودار لە هۆزی (بلباس) لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٤) هەر لە میرزا رۆستەم دەمێنێتەوە تاساڵی (١٩٤٧)، ئنجا دەگەڕێتەوە شاری هەولێر هەر لە هەمان ساڵ هونەرمەند ڕوو لەئیزگە و تەلەفزیۆنی بەغدا دەكات بۆ ئەوەی بەرهەمەكانی بلاوبكاتەوە ببێ بەگۆرانیبێژ و بەشێوازێكی تازە خزمەتی هونەری كوردی، بەتایبەتی حەیران و بەستە بكات، و یەكەم كەس بوو كە حەیرانی كوردی لە ئێزگە و تەلەڤزیۆن تۆمار بكات و بلاو بكاتەوە.

دوای ماوەیەك لە هەولێر و دەوروبەری دەبێتە چاودێر لە (فەرمانگەی ئەشغال) دوای چەند ساڵێك واز لەم كارەش دەهێنێ بۆئەوەی بەیەكجارەكی خۆی تەرخان بكات بۆ خزمەتی هونەری رەسەنی كوردی.

هونەرمەند رەسوڵ بێزار گەردی باوكی چوار منداڵ بوو دوو كوڕ و دوو كچ (كەیفی - سەفین - سەرگوڵ - شاهیدە) وادیاربوو لەدوای چوار منداڵ لەگەڵ هاوسەرەكەی تووشی چەند گیروگرفت دەبن لەژیانی خێزانییاندا، تا دەگاتە ئەوەی كە دەست لێك بەردەن، و لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٢) بەیەكجاری كۆتایی بەژیانی هاوسەری دێنن. و هونەرمەند بڕیاردەدا كە ئیتر ژیانێكی تەنیایی بەسەر ببات تا دوا ژیانی.

هونەرمەندی كۆچكردوو نیشتمان پەروەر و گیانێكی كوردایەتی هەبوو، بەشداری لە زۆربەی ئەو ئاهەنگانە كردووە كە لە بۆنە كوردیەكانەوە سازدەكرا، بەتایبەتی لە ئاهەنگەكانی نەورۆز بە ئاشكرا و بەنهێنی، لە خۆبردووانە ئاهەنگەكانی دەرازاندوە و ئامادەبووانی دڵخۆش دەكرد و گیانی كوردایەتیانی بەرز دەكردەوە هانیدەدان بە شیعر و ئاواز و سروود و گۆرانی و حەیرانە بەچێژەكانی خۆی. تا وای لێهات تووشی چەندین گیروگرفت هات لەساڵی (١٩٦٨) لە ئێزگە و تەلەڤزیۆن دوورخرایەوە، لە (١٩٧٠/٣/١١) گەڕایەوە بۆ ئێزگە بۆ بەردەوامبوون لەخزمەتی هونەری رەسەنی كوردی تا (١٩٧٤/٣/١١).

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕش، هونەرمەند پەیوەندی بەشۆڕش دەكات وەك هەموو كوردێكی دڵسۆز ڕوو لە چیا سەركەشەكانی كوردستان دەكات و درێژە بەخەباتی خۆی دەدات، بەڵام كوڕی هونەر لەیاد ناكات و چەندین سروودی نیشتمانی و شۆڕشگێڕی دادەرێژێ و هەروەها بەحەیران و بەستەش ئێزگەی شۆڕش دەوڵەمەند دەكات.

لە ساڵی (١٩٧٨) رەسوڵ گەردی تووشی نەخۆشی دڵ



هونەرمەندی پێشمەرگە رەسوڵ بێزار گەردی لەگەڵ مامۆستا تاریق جامباز ( ئەندام پەرلەمان) چۆمان ١٣ / ١ / ١٩٧٥.

دەبێت و لەسەر ئەركی حكومەتی ئەو كاتی ئیراق ڕەوانەی (لەندەن) دەكرێ بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری دڵ، دوای سەركەوتنی نەشتەرگەریەكە دكتۆرەكان پێی دەڵێن دەبێ دوای (١٥) پانزە ساڵی تر بێتەوە لایان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەكی تر، بەڵام ڕەسوڵ بێزار گەردی گیانی بەرزی نیشتیمان پەروەرەیی ڕێی پێنادات دوای ڕاپەڕین ڕوو لە بەغـــدا بكات بۆ ئەوەی ڕەوانەی لەندەن بكرێ بۆ چارەسەركردن، كەچی زۆر بەداخەوە لە كوردستان كەس نەبوو دەستی یارمەتی بۆ درێژ بكات، تاوەكو ڕەوانەی دەرەوە بكرێ بۆ چارەسەركردن، و تەنانەت بۆدابینكردنی داودەرمانەكانیشی لێرە، تا وای لێهات نەخۆشییەكەی پەرەی سەند و چۆكی پێدادا و لە ١٧/ ١٠ / ١٩٩٤ گیانی پاكی بەخوای گەورە سپارد، و لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەد نێژرا.

ڕەسوڵ گەردی چەندین بەرهەمی هونەری لە شیعر و هەڵبەست و سروود و حەیران و بەستە و گۆرانی و ئاوازی بۆ كورد بەجێهێشت، كە دەكرێ وەك گەنجینەیەك بپارێزرێ كە ئەمیش بەرهەمی زیاتر لە پەنجا ساڵەی خزمەتی هونەری ڕەسەنی كوردی بوون.

## گوڵبژێرێك لە حەیرانەكانی مامۆستا ڕەسوڵ گەردی

-١-

حەیران ئەتو ئەوڕۆكە سبیانێ[١]
سەری خۆتم لە بۆ برند كە گەردنت گەلەك زەردە
خار بێنە دەرێ،
گەلی براو برادەرینە، با كەس لۆمەی من نەكا
ئەمن تۆبەم كردیە
لە سەر دەستی بەژنەكی برندو دوو چاوی بەرەك و زەندێ[٢] بە بازن
قامكەكی[٣] بە ئەنگوستیلە
وەكی سۆفیەكانی سەر بە پەڕ[٤] هەتا ڕۆژی مردنێ
پاش وی ناكەم نەزەرێ،
ئەمن ئەوڕۆ هێوارێ
لە زارێ[٥] كۆرانێ
دەگەیە حەیرانەكەی خۆم دەمگۆت:
دەتو بینە دەستی چۆیە داوێمە سەر ملی بە كەزی



هونەرمەندی پێشمەرگە ڕەسوڵ بێزار گەردی لەگەڵ پێشمەرگەكانی تیپی مۆسیقای شۆڕش
٣ / ٢ / ١٩٧٥

دەگرم جۆتە شەمامە و شەمامەی خڕی خەیلانی[٦]
هەر وەكی بەرێ[٧]
ئەتو ئەو سارەكە سەری چەند سارانە
سینگ و مەمكی تو لۆ من پاوان[٨] بوو
هەموو دەمێ كیژە كۆچەری
گەردەن مامزی، جوانی پشدەرێ

-٢-

حەیران ئەوڕۆ هێوارێ
چەندم گاز كردی[٩] لە بستی گۆگەمان
ئەتو دەستت برند نابی، لە بەر بازن و بەربازنان
چاوت هەر نایێ، لە بەر بسك[١٠] و شابسكان[١١]
ناوەڵڵا لە بەر هوردە پەرچەمان،
گەلی خزمینە
هەتا بەژنەكی برندو دوو چاوی بەرەك و قامكەكی بە ئەنگوستیلە
كیژ بێ لە مارە بابان، ئەمنیش چیدی هەرناگرم كەسەر[١٢] و خەمان

-٣-

حەیران ئەوڕۆ هێوارێ
چەندم گاز كردی لە سەر بەدەنێ[١٣]
گەلی دۆستینە
دەمگۆتە بەژنەكی باریك و دوو چاوی ڕەشكۆكە
زەندێ بە بازن، قامكی بە ئەنگوستیلە، گەردنی بە

خەناوکە:

ئەتو پەرچەمت گەلە ڕەشە مەینێ لە خەنێ
ئەمن ئەو سارەکە بەهارێ
دەچمەوە دەرێ، لە کاولە وراتێ
ئۆیاری منت لە ملی بی
ئەتو پاش من جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەران[14]
لە دەست کەس مەنێ

-٤-

حەیران چەندم گاز کردی لە سەرێی سەفینی[15]
ئەمن ئەو سارەکە هاوینێ
کەپرەکی لە بۆ تو دەکەم لە برندی[16] سەفینی
شەمار[17] لێی بدا ڕاینەهەژێنی
بناغەی دادەنێم لە سوێتکەی[18]، دیواری دەکەم بە قەنەفرێ
کاریتەی دادەنێم لە داری دار کنێرێ[19]
دارە ڕێی دەکەم بە سۆرە گورێ
هەراشی[20] دەکەم بە ڕەشە ڕەیحانی
سـ اغـ دەکەم بە خەنەی، مالنجی دەکەم بە خاسە ڕەنگێ[21]
دەرکەی لۆدەکەم لە داری عوودێ[22]
چەپەری[23] لە گورە شیلانێ
دەیرشێنم بە گولاوی
نەخۆ حەیرانەکەی من هێوارە و سبەینان پێی رازی نەبی سەری دەرێنی،
گەلی خزم و برادەرینە
ئەوجا ئەمن شەو لە سێباری نیوەشەوێ[24]
دەستی ئەو زالمە بابەی دەگرم
دەیبەمەوە ناو ئەوێ
شانەشینی شەو بای شەوێ لێی بدا
بۆنی بروا لۆ سەر مارە دیانان
لە خەوەکی خۆش هەریان بستێنی

-٥-

حەیران لە بانی بانیان لە بانی سەربەنێ[25]
ئەمن ئەورۆکە گەلەک بریندارم
برینم کەتینەوە بەدەنێ،
بەرام چی بکەم؟
هەر چەندی دەکەم و ناکەم
چ برادەری بە بەقاو بە متمانم[26] نینە
جوابەکی لە بۆ من بداتە ئەوان حەکیمان لوقمانان بێنەوە سەرینم
بە چاوان تەماشم بکەن، بەردەستانم نەکەنێ،
دووەمینیان لە بۆم برێنەوە
بەژنەکی باریکەلانە، دەبا بێتەوە سەرینم
برێ: گەلی دەستە خوشکان وەرن
دەستەکی مەلحەمێ بگرینەوە لە بۆ کورەتیمە حەیرانێ
لە تۆزی هیزارێ[27]، لە گەردی شەدێ[28]
لە ناو گری خەزێمێ[29]
لە بن شۆرابە و شۆرابەی بە بازن
باوێتەوە سەر برینی کورە تیمە حەیرانێ
بپێچین بەلیفکی هیزرائ
گرێی دەین بە قەدی شەدێ
نەخۆشە و بایێ پیرە پایزێ
گەلەک ساردە بداتەوە لە برینێ کورە تیمە حەیرانێ
برینی دوور خانە، نەخۆ بکێشیتەوە میراتە زوخمێ لەگەر تەشەنێ

-٦-

حەیران ئەمن ئەورۆ سبیانێ
نازانم لە بۆت بە کێندەرێ دا هەر برێم
بە زبنە تیرێ[30]
گەلی خزم و برادەرینە
سینگی حەیرانێم گوڕواینە[31] لە بەر تۆق و



ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە هونەرمەندان: محەمەد حەزە، ئیبراهیم حەیات، شەوکەت ڕەشید.
دانیشتووەکان لە ڕاستەوە هونەرمەندان: سەلاح ڕەشید، ڕەسوڵ گەردی، دایکی ئەسعەد توفیق، تایەر توفیق
لە ٢٠/٤/١٩٧٠ ئەم وێنەیە گیراوە.

تەلەسمان[٣٢]

دەستی منیش براینە لە بەر میراتە کەلەپچە و زنجیری،
گەلی برادەرینە، ئەمن حەیرانی خۆم دەشوبێنم[٣٣]
بە خەجیجی ڕەحمانی، جەواهێری ئەحمەد بارینان
ئەسمەری کابایزی، خانزادی سۆران
وەکی سەردەمەکی
حوکمی خۆی دەگێرا لە بنەبنەی هەریری

-٧-

حەیران ئەورۆ سبیانی
لە قەراتان لە قەراتی دوێنێ[٣٤]،
گەلی برادەرینە، وەسمانە خێلی دەیگۆت:
ئەنگۆ جوابەکی لە بۆ من بدەنەوە ئەوان عەگیدان
لە بۆ من لێ بدەنەوە خەندەکان
لە گەر هەرامە نۆینێ[٣٥]،
گەلی خزمینە
ئەورۆکە سەت حەیف مخابنێ دنیاییم دەمینێ
لە بۆ کیژۆرە زراریان
ئەورۆ سبیانێ لەبۆ سەر خمێ ڕەشوانی[٣٦]
خرخاریان[٣٧] کەتیە لە بەر ڕەفت و ڕۆیینێ

-٨-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
دەشتی قەراجێ[٣٨] کاکی بەکاکی،
گەلی برادەرینە، ئەنگۆ چ لۆمەی من مەکەن
ئەمن دیاریم لۆ بەژنی باریکەلانە دەنارد
سەلامیش لە داکی،
گەلی خزمینە
ئەمن دەست لە سەر بەژنەکی باریکەلانە هەرناگرم
هەتا ئەوێ ڕۆژێ گرتیانم لە کفنی نەدەن
بە کۆمەرەکی دۆست و برادەران
شۆرم نەکەنەوە، تەسلیمم نەکەن بە گۆڕی خاکی.

-٩-

حەیران ئەو سارەکە بەهارەکم لێداهات
دەنگم بە نیشانان دەزانی،
گەلی برادەرینە، ئەمن ئەورۆ سبیانی



[illegible] ١٩٧٣

زەینی خۆم دەداوە لە دێی مەخموری
خەزێم زێر لە من دەیان گرتەوە ساراو و کانی
جەیرانی من کارمامزە
دەلەوەڕێتەوە لە دەوزێ و دەو زێی بادینان
دەخوا هوردە کنێران
چاوی بە کۆمەرەکی ڕاوکەران دەکەت
ڕادەپەڕی، دەپسێنی گوفکی مێکوکێ
لە بەر نوسکەی تاژیان
هەوراز دەبودوە لە بۆ جۆتە گومبەتی
سولتان عەبدوڵلای[٣٩] خۆمان
گەلی برادەرینە
ئەمن گەلەک نەفام بووم لە دەستم چوو، قەدرم نەزانی

-١٠-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
مامزە لە زورگ و هەرەتی سێ قوچانێ[٤٠]
گەلی خزمینە
هەموو هێوارە و سبیانان پێش بەیانیان
شۆڕ دەبوەوە لە دەو ڕووبارێ
دەمگۆت: دەتوبینە ماچ کەم خەت و خاری گەردەنێ،
قاشی[٤١] بڕۆیێ
زێدە جوانی، مل بە مەرجانێ
حەیران ئەتو ئەوسارەکە سەری چەند سارانە
لە سەر من ڕاوەستای بە حەز لێکردنێ

ئەو سارەکەش لە سەرم ڕاوەستە بە دەستگیرانێ

-١١-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
قەپلان(٤٢) شین دەچی بە بیر و ئاوە
گەلی براو برادەرینە
دەنگۆ وەرن بە چاوێ من بڕۆننە
بەژنەکی برند و سەرەکی بە هیزار و قامکەکی بە ئەنگوستیلە
پەنجەی بە خەنە، مامز لە باسکی، جوانی بە ناوە
گەلی خزم و برادرینە
ئەمن دونێ پاش نوێژی مەغریبێ
لە ڕێی سراوێ
دەگەیمە حەیرانەکەی خۆم دەمگۆت:
دەتوبینە ماچ کەم بەینی گوارە و خەزێمان
قەفی سمێران تێکەر بکەمەوەلە گەر هوردە پەرچەمان
گەلی برادرینە، ئەمزانی حەیرانەکەی من لە سەر چ زیزە؟
ئاوری نەداوە

-١٢-

حەیران ئەورۆ هێوارێ
گردە سۆری(٤٣) سیانان
لە منی مار وێران
گەلە دوورە وراتە
گەلی خزمینە
بەژنەکی برند و دوو چاوی ڕەشکۆکە
دەرێ: کورە تیمە حەیران
ئەتو وەرە ئەورۆ هێوارێ
لە ڕکی بەدکارێ گوندی خۆمان
سینگ و مەمکی منت پێشکێش بی
هەر دوو لا ڕوومەتیشم لۆ تو خەراتە
گەلی برادرینە
ئەمن ئەورۆ سبیانی
دەچوومەوە جێی ژوانێ
چاوم هەرنەدەهات لە بەر مۆری و مەرجانان
زێڕی سەرمەمکان

حەمایلە و عاشق بەندان(٤٤)
بەرام چبکەم؟
لەوێ دەمێ، بایەکەی شەماری دەیبزافت(٤٥)
دەیداوە لە بسک و شابسکان
وەدەردەکەوتن ڕوومەت و هەنی(٤٦)
خرای دەکردەوە کەپر و ساباتە

-١٣-

حەیران مامزە لە دەشتی کۆیێ
گەلی برادەرینە
بەژنێ برند و قامکی بە ئەنگوستیلە و
گەردەنی بە کرمۆکە(٤٧)
پەنجەی بە خەنە
هێوارە و سبەینان
مەشقی خۆی دەکا بە چاو و برۆیێ
حەیران دەتو وەرە ماچ کەم چەرخی ڕوومەتی
خاری گەردەنێ
جۆتە نارنجی ناو باغەران
وەکی مەم و زینێ بکەین گرۆیێ(٤٨)
گەلی خزمینە
ئەمن هەنگینێ
دەست لە سەر بەژنەکی باریکەلانە هەردەگرم
وەکی حەزرەتی عیزرائیل بێتەخوارێ
چۆک بدا لە سەر سینگم
بە ڕۆحی منی مار وێران



هونەرمەند ڕەسول بێزار گەردی و هونەرمەندی ناوداری عەرەبی سەمیرە تۆفیق لەگەڵ ئەندامانی تیپەکەی خۆی لە هۆڵی خولد لە بەغدا ٣ / ٦ / ١٩٧٠.

بباتەوە هەرامە نسکۆیێ[٤٩]

-١٤-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
زەینی خۆم دەداوە قەراتی پیرە هەولێرێ
لە ناو تەمێدا برند و ڕکە
گەلی خزمینە، ئەو سارەکە بەهارێ
سۆرە گورم دەچاندن
ڕەشە ڕەیحان دەیانگرتەوە، هوردە پەلکە
گەلی براو برادەرینە، ئەگەر لە من دەپرسن
حەزلێکردن هەنگینێ[٥٠] خۆشە
لە بن چیغ و ڕەشماران
وەکی کوڕ دادەنێ خەتی سمێران
کیژیش دادەنێ بنێ جۆتە مەمکان

-١٥-

حەیران مامزە لە سەر مەزاری
بەژن برندی گەردەن میناتی[٥١]
گەلی برادەرینە، هەموو بەهار و پایزان
وەختی کۆچ و کۆچباری ڕەوەندان
خۆی دەهاوێشتەوە ناو زورگ و هەرەتی شەرە بۆتی[٥٢]
ئەوەندەی دەکەم و ناکەم
نازانم لە سەر چ لە من زیزە؟
نایێتە رایێ،
گەلی دۆستینە، ئەمن ئەورۆ سبیانی لە جێی ژوانێ
دەگەیە چاو ڕەشەکەی ناو ماران
دەمگۆت: دەتو وەرە ماچ کەم
چەرخی ڕوومەتێ، گەردەنێ بە خەناوکە
ئەمن پاشی تۆ ناکەم نەزدرێ
بڕوام پێبکە، هەتا هەتایێ

-١٦-

حەیران ئەورۆ سبیانێ گەوارەکی لە من دەهیناوە
چەند ڕەشی تاری،
گەلی دۆست و برادەرینە
لە من تەردەکاتەوە
سەرێ قەرەبۆتک و قەرەبێتکان[٥٣]



هونەرمەند و پێشمەرگە ڕەسول بیرار گەردی لەگەڵ مامۆستا شەمسەدین موفتی
( مامی بەڕێز عەدنان موفتی) - چۆمان

خوناوێ گورگەی[٥٤] گەرمکی بامەندان[٥٥]
ناودڵلا کۆرکەری تۆماری[٥٦]
گەلی خزمینە
ئەمن بەهاران بباماییەوە
خەرجەستینی[٥٧] ماچان
لە بەراتیی کۆچ و کۆچباری دزەییان
لە دەشتی کاولە قەراجی
لەمابەینی معێجیلە و کاولە مشاری[٥٨]

-١٧-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
زێیی بادینان لە من دێ و دەسافێ[٥٩]
گەلی برا و برادەرینە،
شەپۆری خۆی دەداوە لە عاویە[٦٠] و عاویان
کلکەیی گوێری[٦١] گردی کوشافی[٦٢]
دەبا سینگ و مەمکی ئەو زاڵم بابەی
لە بۆ من بمینێ، بەو جۆتە گومەتی سوڵتان عەولای خۆمان
فەسلی بەهاران دەچمەوە تەوافی

-١٨-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
ڕۆژم لێ هەرات لەسەربێ سەفینی
دەیداوە لە باغی سۆرگوران
لە سیلەی ڕەزی

بن سێبەری دار شەنگەبیان
سەر کانی بێترمەی[63]
بەژنەکی برند و دوو چاوی بەرەک و سەرەکی بەتاس[64]
دانیشتیە بە پەنجەی بە خەنە
لانکی دەژینی،
گەلی خزم و برادەرینە
ئەورۆ سبیانێ
حەیرانەکەی من جوابان دەنێری بە پێناوێ
دەرێ: ئەو سارەکە پایزێ یان بە ماری دنیایێ
یان بە نووکی خەنجەرێ
لە بن دەستی گولەکەی مێردان زوو دەرم بینی

-١٩-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
نازانم لە بۆت بە کێندەرێدا هەر برێم
بە بنەی شەرگاتی[65]
گەلی دۆست و برادەرینە
حەیرانەکەی من
کارمامزەکی چاو رەشی گەردەن سپی بە خارە
دەلەوەرێتەوە لە بن گردی باقرتی[66]
گۆری مەعمەلی ئازی کەندی[67] بندیانان[68]
هێوارە و سبیانان
ئاوی خۆی دەخواردەوە لە جۆگەی کاولە مەخموری
ئەمن جۆتە تاژیەکی شلەشینم بەردەدایێ
هەورازیان دەکردەوە لە بۆ گومەتی برایمی بایزی[69]
کانی وەکازەی[70] بازارگە[71] و بازارگان
بیری مەحمودی سەنان[72]
سەرەکیان لێدەدا
رووی خۆی دەکردەوە کاولە وراتێ
ئەگەر ئەوسارەکە زستانێ
بەژنی باریکم نەدەنێ
بە خزمایەتی خۆ من نابمەوە
برایمی مەلا زێندینان[73] خاتونە پەری رابکێشم
لێم ببیتەوە رۆژەکی قەرەسوپایێ[74]

-٢٠-

حەیران ئەورۆ نیورانێ
لە خۆم دوودری، لە خۆم درکوری
گەلی براو برادەرینە
ئەمن حەیفم ئەو حەیفە[75] نیە
ئەو ساردکە سەری چەند سارانە
سەیارەت بە دوو چاوی بەلەک بەژنەکی برند و قامکەکی بە ئەنگوستیلە
سەرەکی بە لاسەرە[76]
کەتیمەوە بەندی میراتە قفلی[77]
بەرام ئەمن سەت حەیف و مخابنی دنیایێم دەمینێ
دەرێن: ئەو سارەکە حەیرانەکەی تۆ
رەنگی سیسترە لە پەلکی گورێ

-٢١-

حەیران ئەورۆ هێوارێ
زەینی خۆم دەداوە، دەو بەستۆرە و بە ستۆرەی خۆمان
لە من بەدرکە شینە
گەلی خزمینە
ئەمن دەچمەوە سەر گردی تەلوسەکی[78]
روویێ خۆم دەداوە بەحرکەی[79] رەنگین
لە من بە قونگر و قەرات و جۆگە و کانینە
دەمگۆتە بەژنەکی باریکەلانە و دوو چاوی بەرەک:
دەتو بینە ماچ کەم ناسکەیێ رووومەتێ
رێزی خەناوکان
ئەورۆ هێوارێ چاوم بە جێی ژوانێ دەکەت
لە من هەردەوەشانەوە[80] کەونە برینە



هونەرمەند رەسول بێزار گەردی لە کاتی سەردانی هونەرمەندی شاری هەولێر
شەوکەت سەعید بیردی (عشکو) لە نەخۆشخانەی برگاری لە شاری هەولێر لە ٢ / ١ / ١٩٨٦

-٢٢-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
سوندەکت لە بۆ دەخۆم کە پێی دەرێن بەندە[٨١]
بەو شێخ وەیسی[٨٢]
مار لە قەبرستانێ بەحرکێ
بەو پیر بەدری هەناری[٨٣]
بەو شێرە سواردێ[٨٤]
کە ماری خۆی دانایتەوە لە لێوی ڕووبارێ
لە مابەینی هەردوو دەربەندە
گەلی دۆست و برادەرینە
ئەوی بێتە کوشتن
لە سەر بەژنەکی برند و دوو چاوی بەرەک
لە هەموو خزم و برادەران، شین و گریانە
ئەما لە کاکی تۆ، شایی و گۆوەندە

-٢٣-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
بەحرکە لەمن بە دارەمێوە،
گەلی برادەرینە، ئەمن ئەوسارەکە هاوینێ
دەچمەوە باغ و چارباغی هیران و نازەنینێ[٨٥]
چاوان دەگێڕم بە خۆخ و سێود
گەلی خزمینە، ئەمن هەینێ هیوێ[٨٦]
بەژنی باریک و دوو چاوی ڕەشکۆکە دادەنێم
وەکی بێتەوە لە مارە خەزووران، لانک لە پشتی، کوڕ بەرێوە

-٢٤-

حەیران کێژۆرە جوانێ
ئەمن ئەورۆکە سبیانێ
دەچمەوە شاردکەی پیرە هەولێرێ
نازانم چت لە بۆ هەرگرم لە سەر دوکانی؟
کیژ دەرێ: کوڕە تیمە لاوە
ئەتو کەوتیەکم لە بۆ بینە
بەری لە سۆرە گورێ
پشتی لە ڕەشە رەیحانێ
خەناوکەش لە بیرنەکەی لە گەر قەنەفر و مەرجانێ



هونەرمەندە نەمرەکانی کورد، ڕەسوڵ بێزار گەردی، عەلی مەردان، حەسەنی جزیری، تایەر توفیق
لە نەورۆزی ١٩٧١ ئەم وێنەیە گیراوە.

-٢٥-

حەیران سوارەک راوەستایە
لە بەرددرکەی مارێ
ئەوەندەی دەکەم و ناکەم
قەد پەیانابی
گەلی خزمینە
داکی حەیرانی گاز دەکا دەرێ:
دەتۆ برۆ کیژم
کورە تیمە حەیرانی خۆتە
لەمن مەترسێ دری ڕازیکە
نارێمە بابی
ئەوجا بەژنەکی باریکەلانە دەرێ:
دایە ئەمن چ سووم لە کوڕەتیمە حەیرانی خۆم نیە
لە بۆی دەترازێنم دەرزیلەی سوخمان
پێشکێشی دەکەم، جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەران
گەلەک مەترسیان دەکەم
ئەوسارەکە چەند سارە
چوویتەوە گوندی بێگانان
بەقسەی بەدکاران
دریژگەی لەمن شکابی

-٢٦-

حەیران ئەورۆ هێوارێ
بەهارە بۆنی گوران دێ
گەلی براو برادەرینە

ئەمن زەینی خۆم دەدایەوە
بەژنەکی باریکە لانەو دوو چاوتی بەرەک و
گەردەنی پڕ لە خار و چارۆگەی سپی
گەلەک شیرن لە ملان دێ
دەرێمە ئەو زاڵم بابەی
دەتو بینە ماچ کەم گەردەنەکی بە مەرجان
دەست شۆڕ کەمەوە
سەر جۆتە شەمامە و شەمامەی ڕۆستەم بەگی
ماچ کەم بەینی گوارە و خەزێمان
مەچووە مارە جیرانان
لە درم گەلەک گران دێ

-٢٧-

حەیرانی من ئەوڕۆکە بووکە
چاو برند ناکا لە ناو دیلانێ
گەلی برادەرینە
بریا ئەمن هەموو سبیانان
بیامایەوە باجگری ماچان
لە بەرایێ کۆمەری دارکەران
سەر لە سبیانێ
لە چاو ڕەشی تۆماریان
لە خەزێم شۆڕی بەحرکەییان
لە لفکە شۆڕی کۆییان
لە تاس بەسەری هەولێرییان
لە گەردەن کێلی ڕواندزییان
لە سەر بەهیزاری دزەییان
لە پلپلە[٨٧] شۆڕی خۆشناوان
ناوەڵلا لە کیژۆرە سیانان
لە بەرایی کۆچ و کۆچباری
لە تەنگانەی کاولە جاستانێ[٨٨]

-٢٨-

حەیران ئەوڕۆ سبیانێ
بەستۆرە و بەستۆرەی رەنگین، لە منی مار وێران
لە بەربیانێ
گەلی برادەرینە
ئەمن زەینی خۆم دەداوە
مامەراغەی[٨٩] زراری داتیشتیە
لە بن سێبەری داری شەکرانێ[٩٠]
مامەر دەرێ: گەلی خزمینە
ئەمن زەینی خۆم دەداوە
بەر دەرکەی ماری بابی ئەسمەرێ
بەر دەرکەی وانم جۆخینە
یەمەنی[٩١] وانم سۆرە
کراسی وانم دارکەژۆکەن[٩٢]
گوارەی وانم زێڕن، پێنج گۆنە
زێدە لە هەموو عاشیرەتان، گۆریە چەلینە[٩٣]
شاییەک دەگەڕێ
لە بەر دیوانی ئەسمەرێ
بە پەنجەیێ بەخەنە
قامکێ بە ئەنگوستیلە
قاوەی دەگێڕی، بەوێ فینجانێ

-٢٩-

حەیران ئەوڕۆ سبیانێ
زەینی خۆم دەداوە دەو بەستۆرە و بەستۆرەی رەنگین
لە کاکی تو.بە کفرە شینە[٩٤]
گەلی خزمینە
ئەمن ئەوڕۆ ئاوڕی خۆم دەداوە
زورگی فامخاران و قەپەکیان[٩٥] بناری زێرواوی
ئەوبەر ئەوبەری کۆچەرە ڕەشمار نشینە
گەلی براو برادەرینە
ئەمن ئەوسارەکە سەری چەند سارانە



هونەرمەندە نەمرەکان عیسا بەرواری، گوڵبەهار، ڕەسووڵ بێزار گەردی ـ بەغدا ١١ / ٣ / ١٩٧٣.

ڕاو ڕاوە شکارم لە دو ئەسمەرەکی مل بە خەناوکەی
پەنجە بە خەنەی زێرینە

-٣٠-

حەیران ئەورۆ هێواریێ
ئەستێرەکم لێ هەرات لە لای یەمەنێ
گەلی دۆست و برادەرینە
پێرو هەراتن[٩٦]
ئەوەندەی دەکەم و ناکەم تەرازوو ناگەنێ[٩٧]
ئەمن سەت حەیف و مخابنێ دنیاییێم دەمینێ
لەبۆ ئەوان تەنکە ژنان
شەدە شلان چاو بە کلان بەمارە و تەراقن[٩٨]
لە کن گولەکەی مێردان
ئەوەندەی شێخ و مەلایان دەکەم، ج ڕێی ناچێ

-٣١-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
دەنێرمە کن وەستا سدیقی ڕواندزێ[٩٩]
خەزێمەکت لە بۆ دروست بکاتن
سێ ڕێزە گژنیژەی لێبدا[١٠٠]
جۆشیبدا لە ناو کوورەی
ناوێتەوە بەر دەوی گیرە و سندانێ،
گەلی برادەرینە
ئەورۆ سبیانێ
خەزێم دەهاتەوە لۆ بەژنی باریکەلانە
دەیهاویشتەوە سەر چەرخی ڕوومەتێ
لە من دەگرتەوە
جێی شەو راموسانێ[١٠١]
گەلی خزمینە
ئەمن دەرێم: وەستا دەتو کورەبی لەهەر دوو چاوان
کۆجەبی لە دەستان
سەقەت بی لە پێیان
لاڵ بی لە زمانان
هەر سی ڕۆژی ڕەمەزانێ
بە ڕۆژی بی ددانت شەمێ بی
ئاگرت لە مارێ بەربی
کلیلەی بزر بکەی



هونەرمەند ڕەسوڵ بێزار گەردی لەکۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان بەبۆنەی نەورۆز، بیستانە - هەولێر

ئاگر خوشتر بی، دوور لە کابانێ

-٣٢-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
لە سپیلکان لە سپیلکی سەرخانێ
گەلی براو برادەرینە
بایەک دێ لەگەڵ تاوەکی بارانێ
ئەورۆ هەرچی خێرخواز بێ جوابەکی لۆ من بداتەوە
بەژنەکی برند و دوو چاوێی بەرەک گەردەنەکی بە مەرجان
ئەورۆ سێ ڕۆژە مایمەوە لە جێی ژوانێ
براینە: بریا بەهاران ببامە خەرجەستینی ماچان
لە پێشەوە پێشی خەلیفانێ لە سەر پردێ ڕواندزێ
لە هۆری باڵەکیان لە چارچەلێ هەرکیان
لە سپیەرێزی خەیلانیان
لە مێرگەچەتویی شێخ مەموندیان[١٠٢]
لە ڕوست و گرتکان[١٠٣]
هەموو سبەینان
لە سەر کۆسپەی کاولە بێجانێ، لە هەریر و باتاسێ
لە شەقراوەی سەر کانیێ سەقاوێ[١٠٤]
دانی هێواران
ئاوری خۆم دەدەمەوە لە کیژە دیانان
لە سەر کانی خۆمانێ لە هەولێرێ
لەسەر جۆگەی شێخەڵلای[١٠٥]
لە سەربەرزێری هەولێرییان

لەسەر کانێی بەحرکەی، لە کیژۆکاری گەردییان
لە دەشتی کاولە قەراجی، لە سەربەهێزاری دزەییان
بە دەستەکی بە بازنی، بە پەنجەیی بە خەنە
دەکوتنەوە کۆزێ لە گەر کۆتانێ

-٣٣-

حەیران ئەورۆ هێواریێ
گرجان شین دەچی
بێ تۆز و گەردە
گەلی خزمینە
ئەورۆ دەگەیە پێناوێ
جوابەکی دەدامێ
دەیگۆت: بەژنی باریک دەرێ
بەسیەتی، چیدی دانانیشم لە مارە بابان
یان دەرم بینە بە ماری دنیایێ
یان ئەوەتانی دەستانم لێ بەردە
دەمگۆت: دەتو بینە ماچ کەم
ناسکەیێ ڕوومەتێ
خاری گەردەنێ
ئەوسارەکە یان سەری خۆمت لە سەر سەری دادەنێم
یان ئەوەتانی دەتکەمەوە بووکی ناو پەردە

-٣٤-

حەیران ئەورۆ هێواریێ
زەینی خۆم دەداوە
بنار و بناری گردی تلّی
بە بارە پۆرە
ئەورۆ دانی سبیانێ
لەسەر جۆگەی ئاوێ
دەگەیە حەیرانەکەی خۆم
دەمگۆت: دەتو بینە دەست باوێمە
سەر ملی بە کەزی
ماچ کەم چەرخی ڕوومەتێ
بە قسەی بەدکاران مەکە
بوختانیان زۆرە
گەلی برا و برادەرینە
حەیرانەکەی من دەرێ

کوڕەتیمە لاوە
دەزانم لۆکنە من هاتی
ئەمن هەتا ڕۆژی مردنێ
بە شەرت و پەیمان هەر گراوی تومە
یەکدی ماچ دەکەین
نۆرە بە نۆرە

-٣٥-

حەیران ئەورۆ نیوڕانێ
سەرێ من چەند دەیێشێ
دری من گەلەک بە ئاخ و کەسەرە
گەلی خزمینە
ئەمن ئەورۆ سبیانێ
دەچمەوە ناو باغ و چارباغی
کاک عەولّای هیران و نازەنینان(١٠٦)
سۆرە گوران
لە من دەیانکردەوە چەپەرە
ئەمن دەستێ بەژنێ باریکم دەگرت
دەچووینە خوارێ
لۆ دەو ڕووبارێ
کوریکە(١٠٧) و حاجیلە(١٠٨) تێکەردەبوون
بەهاریان تەڕە

-٣٦-

حەیران لە زورگان لە زورگی قەرەنی



هونەرمەند ڕەسوڵ بێزار گەردی و مامۆستا ئەحمەد سالار و ئیسماعیل گەیلانی
پیرمام ٢٧ / ٥ / ١٩٩٢

ئەورۆ هێواریێ
بایەکی شەماری لە من دەبزێوی
دەداتەوە لە سەر و پەرچەمان
بە دەردێخی روومەت و هەنی
بەژنی باریکەلانە، کارمامزەکی سۆر خرِنێک بە خارە
هەموو هێواران دەلەوەرِێتەوە لە شۆری حاجی کاوێسی
گـردە سـۆری سیـانان، ئاوی بن بەردی لەبەرهەوەت و هەوەتی سواران(109)
دەکەوتەوە کەرخی حوسێنی غازی(110)
سەر رێی کۆچ و کۆچباری کوردان
ئاوا دەبوّوە لۆ کاولە مەفتەنیّ(111)

-٣٧-

حەیران ئەورۆ هێواریێ
پیربوویمە لەگەر ئاخ وکەسەریّ،
گەلی خزمینە
ئەمن دەرێمە نۆبەرە جوانی ناوماران
وەرە ئەوسارەکە با برۆین
لە کاولە مەفتەنیّ
ئاوابین لەدار و بێداری
رووی خۆمان بدەینەوە مەرگە و پشدەریّ(112)
هەردووکمان ئەگەر مردین لەوراتی غەریبیان
لەکن یەکدیمان بنێژن
با گیا لەسەر سینگمان شین ببی
ئەوەل بارانی پەریّ

-٣٨-

حەیران ئەورۆ سبیانیّ
چەندم گازکردی لە پەرێزە جۆییّ
ئەمن سەت حەیف و مخابنیّ دنیاییم دەمینیّ
لە بۆ جۆتە شەمامە و شەمامەی رۆستەم بەگی
نازانم: نەگۆوانە لە بەر دەسکیّ قەرانکی(113)
نە لەبەر هەرمی مەرۆییّ(114)
گەلی برادەرینە
دەبا ئەورۆکە خوام بکا بە خورامی
بایەکەی شەماری سەبر سەبر دەداتەوە
لە بسک و شابسکان
هوردە پەرچەمان دەبزێوی



سیاسەتمەداری ناسراوی کورد عەزیز محەمەد لە میوانداریی هونەرمەند رەسول بێزار گەردی
١٩٩٣ / ٥ / ٢٦

لەگەر قونکی برۆییّ

-٣٩-

حەیران ئەورۆ سبیانیّ
چەندم گازکردی لەگردی کۆمیّ
بەژنت برندە، بەیداغی رۆمیّ
گەلی خزمینە
ئەنگۆ جوابەکی لەبۆ من بدەنەوە
داکی نازدار حەیرانیّ با گەلەکی چەک و خشلان
بە بەر بەژنی باریکەلانە وەنەکا
نەخۆ بچتەوە ناوشایی و هەرپەرِیێ
بەژنی گەلەک باریکە
نەخۆ لەبەر زێران بچۆمیّ(115)

-٤٠-

حەیران ئەورۆ سبیانیّ
کۆمەری راوکەران لە من دەکەتنەوە سەنگەران
گەلی براو برادەرینە
لە گێیانم گەلەک خۆشدیّ
کۆرِەی هەسپان(116) نووسکەی تاژییان(117)
ناوەڵلا چریکەی باز و سەقەران
ئەمن ئەورۆ لە زارێی کۆرانی
دەگەیمە بەژنەکی برند و پەنجەکی بە خەنە
دوو ماچم لێ دەخواست
یەکەکیان لە مابەینی جۆتە شەمامە و شەمامان

ئەوی دیشیان لە بن گورینگەی هیزارێ
هەتا ئەوێ رۆژی پێکدەبرین
چیدی لە گەر من مەکەوە شەڕان

-٤١-

حەیران ئەورۆ هێوارێ
قەڵادگە گەلەک قەدیمە گوندە[١١٨]
براینە لۆمەی من مەکەن، قەت بێ ئاو نابی
ئەگەر لە من دەپرسن، جێی ژوانی کیژۆرەکانی مەمک نارنجی
لۆ بەتار نابی؟
براینە ئەمن خەمم ئەو خەمە نیە
ئەو سارەکە بوارێ، دەچمەوە وراتەکەی غەریبیان
بەران ئەمن حەیف و سەت مخابنێ دنیایێم دەمینێ
لە بۆ حەیرانەکەی خۆم
سەرەکی بە لاسەرە، کەپوەکی بە خەزێمە
زۆر بە نادری بەجی دەمینێتەوە لە مارە بابی

-٤٢-

حەیران ئەورۆکە سەری چەند رۆژانە نەخۆشم
گەلەک مەترسیان دەکەم لە رۆژی مردنێ
گەلی برادەرینە
ئەنگۆ ج لۆمەی من مەکەن
ئەوەل جار دوو مەلایکەتی
بە سام و هەیبەتم دێنەوە سەرێ
لۆ پرسیارکردنێ
ئەوەل جار پسیاری دەروجیرانم لێدەکەن
دووەمینیان پسیاری مەمک گرتن و شەو رامووسانێ و دەست لۆ بردنێ

-٤٣-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
هەولێر هەولێرە، هەولێر لە غێمێ
دەرێمە بە ژنی باریکەلانە
زەندێ بە بازن، قامکێ بە ئەنگوستیلە
ملەکی بە کرمۆکە، پەنجەکی بە خەنە
گوارەت پیرۆزبی لەگەر خەزێمێ

حەیران ئەتو وەرە
ئەو سارەکە بە قسەی بەدکاری گوندێ مە
لەگەر من مەکە تۆرانێ
جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەران
لۆمن پێشکێشی کە
دنیا مردنە، هەتا سەر نیە
وەرە دانیشە دووقسانت برێمی

-٤٤-

حەیران ئەورۆ هێوارێ
لە دوم هەناردی لۆ چی نەهاتی؟
ئەورۆ سەری سێ رۆژانە
زانیتم بازن و خرخارت لە کن وەستا شەریفی زێرینگرە
جلکی بووکینیت لە سەر خەیاتێ
ئەتو ئەوسار سەری چەند ساران بوو
دۆست و گراویێی من بووی
ئەوسارەکە پایزێ
بە قسەی بەدکاران لە گەر من خاین دەرهاتی

-٤٥-

حەیران ئەگەر مردم قەد مەرێن درەنگە
گەلی برادەرینە
ئەنگۆ قەبرەکی لە بۆ من لێبدەن
لە سەر سینگ و مەمکی نازدار حەیرانێ
لێمەدەن بە کولینگ و بێران



هونەرمەند شەماڵ سائیب، مامۆستا مومتاز حەیدەری، دکتۆر عەزیز گەردی، د.مەولود ئیبراهیم لە میوانداریی مامۆستا رەسوڵ بێزار گەردی.

بیرازی گەلەک تەنگە
لەبۆم گاز کەنە ئەوان کوڕیەکانی مەمک نەهاتی
سووکە ژنەکانی دەست بە بازن
دەبا بێنەوە سەرینم، فرمێسکانم لە بۆ بباریێن
بە دەستی بە خەنە لە خۆ بدەن
شینەکم لە بۆ بگێرن، بە ئاواز و دەنگە

-٤٦-

حەیران لە گێچان لە گێچی زووری ،
گەلی برادەرینە
حەیرانەکەی من کارمامزە دەلەوەڕێتەوە لە دەشتی کاولە قەراجی
دەو شۆڕ و دەو شۆڕان
خەندەکی مامە خەلیفەی ئازیکەندی بندیانان
هێوارە و سبیانان ئاوی خۆی دەخواردەوە
لە جۆگەی کاولە مەخموری،
بریا ئەمن هەموو بەهاران
ببامایە خەرجەستینی ماچان لە کیژۆرە سیانان
لە دۆرە دزەی ئەوەلی
وەکی هەموو سبیانان، دادەنیشی لە مابەینی دوو داران
بە دەستەکی بە بازن، بە قامکەکی بە ئەنگوستیلە
دەبڕیتەوە گوفکی مافووری[119]

-٤٧-

حەیران لە برندان لە برندی شۆڕی
بەژنەکی باریکەلانە
دوو چاویێ ڕەشکۆکە، قامکێ بە ئەنگوستیلە
زەندێ بە بازن، کارمامزە
دانی سبەینە و هێواران
دەکەوێ لە ساکە گۆڕێ،
ئەمن ئەوسارەکە بەهارێ
دەچمە سەفەرێ
ئەتو ودرە سوندەکم لە بۆ بخۆ، بەو چاکی لە گەزنێ[120]
بە غەوسی[121] مار لە دەشتی پیرە بەغدایێ
بە قسەی چ کەسان مەیلت نەگۆڕێ

-٤٨-



مامۆستای شانۆکار ئەحمەد سالار لەمیوانداریەتی هونەرمەند مامۆستا رەسوڵ بێژار گەردی هەولێر ١٩٩٢

حەیران کیژۆرە گورێ
ئەتو ئەوسارەکە هاوینێ
سەبرەکم لێ بگرە هەتا جۆخێن هەردەگیرێ دەچمەوە شارەکەی قۆچە موسرێ
تفەنگی سەر ملیت لۆ دەفرۆشم
. دەیدەم بە مەرجان، خەریتە بە قەنەفرێ
کیژدەرێ: کوڕەتیمە حەیران
ئەتو هەنگینێ تفەنگی سەر ملی لە بۆ من بفرۆشی
وەکی ئەمن بمرم مەیتم ڕابیری
هەمووم بەدارە بازەی وەبکرێ

-٤٩-

حەیران قورینگ و گۆزەلە
بە چ دەراو کانیاکانی نابی ڕازی
گەلی برادەرینە
ئەورۆ سبیانێ
مارێ بابی حەیرانێ
لێی دەناوە، شۆڕدەبوونەوە
لە بۆ زینێی دارەبزمارەی[122]
هەریاندەداوە لە دەو بوغازی
خۆزیا ئەمن هەموو بەهاران
ببامایەوە خەرجەستینی ماچان
لە کیژۆرە دزەییان
لە بەرایێ کۆچ و کۆچباری هەموو ڕەوەندی
لە کەرخی حوسێنی غازی

-٥٠-

حەیران گوندیە دێمە
گەلی برادەرینە
ئەمن زێڕەكم هەیە
لە سەت مسقالی یەک کێمە
ئەمن نازانم ئەو سارەکە پایزێ
نە لۆ خۆم بکەمە تەنکەی تفەنگێ
نەلۆ بەژنی باریکەلانە
بکەمەوە گوارە و خەزێمە
گەلی خزمینە
حەیرانەکەی من دەرێ: کورە تیمە لاوە
ئەتو ئەورۆ هێوارێ
لە گەر کۆمەڕدکی جوامێران وەرە کن بابم
ئەگەر رازی نەبوو، بە گرتی چارۆگی لەگەرت دێمە

-٥١-

حەیران هەولێر هەولێرە
لە سەری قەراتە لە بنی باژێرە
گەلی برادەرینە
سینگ و مەمکی حەیرانێ
دەشوێنم بە وان دوکانی عەتاران
هێوارە و سبیانان
دەستی خۆم تێدا دەگێرا
ئەمن دەرێمە بەژنەکی برند، قەد و قامەتەکی شیرن
وەرە ئەوسارەکە بەهارێ، دەستی خۆمان تێکبگرین
بچینەوە سەر سولتان عەبدوللای خۆمان
مرازمان حاسڵ بی لە خۆمان بگرین
دوو هەزار زێڕە

-٥٢-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
لە مرکیەی غوبارە
لە سەنیەی تۆزە،
ماری بابی حەیرانێ
لێی دەناوە، دەپەڕیەوە لە کەندیناوەی
ئاوا دەبوون لە زەینیێ دارەبزمارەی
هەریان دەداوە لە دەشتی کاولە قەراجی
هەواریان دەگرت بە گۆزە گۆزە
کیژ دەرێ: کورەتیمە حەیران
ئەتو ئەو شەو لە سێباری نیوە شەوێ
پارێزەکی باوێ سەر جێ و بالینگانی من
لێو باوێ سەر ناسکەی رووەمەتێ
پێشی بەیانیان، دوو ماچان بکە لە بن رێزی خەناوکان
سەبرۆکە سەبرۆکە
بە پەنجەی خۆت سنجاقم لە جێ وەگۆزە

-٥٣-

حەیران لە شینکان لە شینکی هەڵگۆزێ
گەلی برادەرینە
ئەمن ئەورۆ سبیانێ
زەینی خۆم دەداوە، قەراتی پیرە هەولێرێ
بزر بووە لە بەر غوبار و تۆزێ
دەرێمە بەژنەکی برند و قەد و قامەتەکی باریکەلانە:
وەرە ئەو سارەکە بەهارێ دەستی خۆمان تێکبگرین
بچینەوە سەر جۆتە گومبەتی عەبدولعەزیزی[١٢٣]
وەکی هەموو ناسک و ناسک بەدەن
لەگەر یەک دەکەنەوە، جەژنە و پیرۆزێ

-٥٤-

حەیران هەمینە
گەلی برا و برادەرینە
گەردەنی زەرد، دوو چاوی شینە



هونەرمەندە نەمرەکان رەسوڵ بێزار گەردی و تاپەر توفیق لە هەڵپەرکێ
بە بونەی سالیادی نەورۆز ٢٢ / ٣ / ١٩٥٤

سینگ و بەرۆكی جوانی ناو ماران
لە بەر مۆری و مەرجانان
دوگمە و دەرزیلان
حەمایلە و عاشقبەندی سەر مەمكان
خینی شیرینە، شانەی هەنگینە
ئەمن سوندەكت لە بۆ دەخۆم
درت چ نەكا
ئەمن پاشی تو چ دۆست و گراوی دیم نینە

**-٥٥-**

حەیران ئەورۆ سبیانێ
رۆژم لێهەرات، گەزەنگان داوێ
دەرێمە بەژنەكی برند و پەنجەكی بە خەنە:
پەرچەمەت گەلەک زەردن
خەنەی پێ ناوێ
دەبا روومەتی لە بۆ من بمێنێ
بە تۆپی گوری چاوت
بە پیارە و ژێر پیارەی عەجەمێ
مەمكی بەو جۆتە سێوی روستاوێ[١٢٤]
بەژنی بە دارەكەی عوودێ
هەموو فەسلی بەهاران وەكی شین دەبیتەوە
لە ناو باغ و چارباغی میری شەقلاوێ
دەستی من دامەنی حەزرەتی سلێمان پێغەمبەری بێ
با حوكمی خۆی بكاتەوە
لە سەر تەیروتواری عاسمانان، بكەن سێبەرێ
نەخۆ روومەتی ئەو زالم بابەی رەش ببیتن
لە بەر گەزەنگی هەتاوێ

**-٥٦-**

حەیران ئەورۆ سبیانێ
دەچمەوە كێلی كێستانان، لۆ ناو چاوبەرەكان
كێلەشین[١٢٥] لە بەر بەفرێ رێ نادا
گەلی خزمینە
هەموو خەرک و جیرانی گوندێمە
گرتییێ[١٢٦] دەستی حاكمانن
ئەمنیش گرتییێ دەستێ بەژنەكی باریكم
لێی كردیەوە گرانەتا، ئەوەندەی دەكەم و ناكەم، قەت



لە راستەوە: حوسێن عەلی ئاغا، كەمال رەشید ئاغا دزەیی، رەسول بیزار گەردی، جەنگی ئالەبانی، خورشید شێرە ١ / ٢ / ١٩٥٥.

بەرم نادا
گەلی برادەرینە
ئەمن سینگ و مەمكی ئەو چاو رەشەی دەشوبێنم
بە دوكانی مەرجانان، ئەوەندەی مامەلەتی لێ دەكەم، چ جوابان نادا

**-٥٧-**

حەیران ئەورۆ سبیانێ
دەبا زورگەزراوی خۆمان، لە گەر من یار بی
ئەمن ئەو سارەكە بەهارێ
دەچمەوە سەر جۆتە گومبەتی سولتان عەولای خۆمان
تەماشا دەكەم دەشتی كاولە لە قەراجی
بە عام لە من دیار بی
گەلی خزمینە
حەزلێكردن هەنگینێ خۆشە، لە ناو چیغ و رەشماران
كیژ تازە پێ رابگا داكی پێناو بی

**-٥٨-**

حەیران ئەورۆ هێوارێ
گەلەک مەترسیان دەكەم بمرم
لە جوانی پیرە بەهارێ گەلی برادەرینە
وەسیەتەكی دەكەم
كفنم لە بۆ بینن لە شاری هەولێرێ
تابووتم لە مەقلوبی شێخان[١٢٧]
ئەلحەدم لەكاولە ژنگارێ[١٢٨]
براینە دەرێمە بەژنەكی برند، دوو چاوێی بەرەک:

ئەگەر مامەوە لە سەر دنیایێ
یان دەرت دەینم بە ماری، یان بە نووکی خەنجەرێ
دەتکەمەوە کابانی مارێ

-٥٩-

حەیران مامزە هێوارە و سبیانان
لە هەمزە کۆری[١٢٩]
گەلی برا و برادەرینە
چاوم لەدو بەژنێ باریکەلانە
زەندێ بە بازن دوور بینە، دنیای دەنۆری،
ئەو ساردکە سەری چەند سارانە
شەنگ و شۆرێ گوندی
دۆست و گراویێ من بوو
ئەمن چبکەم؟
ئەورۆکە بە کۆمەرەکی سواران
دەیبەن لۆ گولەکەی مێردان
بە کەسک و سۆری
لە ملی ئاراون مەرجان و مۆری

-٦٠-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
کوریکەک[١٣٠] بوومایە لە کوریکی کەسنەناسی
گەلی برا و برادەرینە
هەموو بەهاران شین ببامایەوە، لە سەر گردی پیرداودی
بەرامبەر شێراوە و قووچەبلباسی[١٣١]
خزمینە، حەیرانەکەی من
جوابان دەنێری بە پێناوی، دەرێ:
بەسە، ئەمن چیدی دانانیشم لە مارە بابان
جۆتە شەمامە و شەمامەی بەندی باغەرانم
شل بووینە لە بن کەوێ و کراسی

-٦١-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
کوریکەک بوومایە لە کوریکی گاگرۆیێ[١٣٢]
گەلی براینە ...
هەموو بەهاران، ئەمن شین ببامایەوە
لە ناو باغ و چارباغی حەماغەی کۆیێ

ئەمن هەینێ دەست لە سەر بەژنەکی برند
دوو چاویێ بەرەک هەردەگرم
هەتا ئەوێ رۆژێ
حەزرەتی عزرائیل دێتەخوارێ
لە سەر سینگم چۆک دەدا
بە رۆحی منی غەریبە ماری، دەباتەوە نسکۆیێ

-٦٢-

حەیران، چاوی ئەو نازدارەی لەبۆ من بمینێ
بەو ئەستێرەی پێشی بەیانی، کە هەردێ لە پەنای گردی
روومەتی ئەو زالم بابەی بمینێ
بەو سۆرە گوری لە باغان، لە باغی حەماغەی کۆیێ
وەکو هەموو فەسلێ بەهاران
بولبولی مارویێران
دەگەر عەلێکی بەیانی، سەلامی خۆی لێکردی
کیژ دەرێ: گەلی دەستە خوشکان
زۆر زۆر ناخۆشە لە پێش عیبادەڵلای خوای
کە عاشق حاشا لە مەعشووقی خۆ کردی

-٦٣-

حەیران ئەمن ئەورۆ پایزەکم گەیشتێ
درەنگم بە نیشانان دەزانی
سوسنان، هەلالان، بەیبوونان، کراس رەشان
لە منی مارویێران
دەیان گرتەوە دەراوکانی[١٣٣]



هونەرمەند رەسول بێزار گەردی و شاعیری خواڵێخۆشبوو پیربال مەحمود ٢ / ٣ / ١٩٥٦

ئەمن دونێ هێوارێ
لە کانیێ بەر ماران دەگەیمە پێناوێ
دەمگۆت: چاوێی مەحبوبەکەی بەرماران، لەخۆڕا ڕەشن
دەیگۆت: نا.. کلێ لە شاران
لە چاوی خۆی دەکاتەوە بارگرانی

-٦٤-

حەیران ئەوڕۆکە سەدای پیرە پایزم گەیشتێ
وەعدەی گەلاوێژ دەزر زرێ[١٣٤]
کیژ دەرێ: گەلێ دەستە خوشکان
پێ لە ڕکێبی گەنج عوسمان[١٣٥]
بە زرێیەکی داودی دەعمرێ[١٣٦]
گەلێ برا و برادەرینە
دەست کردنەوە گەلەک موبارەکە
قەت چ سەر بێ ئەجەل ناچتەوە بن گڕی
حەیران دەتو وەرە جێی ڕاموسانێ
خەت و خاری گەردەنێ، چەرخی ڕوومەتێ
لۆ لە من سرێ[١٣٧]

-٦٥-

حەیران چیایەکەی قەرەچوغی[١٣٨]
لە دەشتی قەراجی خۆمان
لە من پاوانە
گەلێ برا و برادەرینە
هەموو سارێ فەسلێ پایزان
لە عەشیرەتی سیان و مامەسێنیان[١٣٩]
دەیگرمەوە بە زەمانە
حەیرانەکەی من چاوڕەشەکی بەژن برندە
لە ناو هۆبە[١٤٠] ڕەشماران لە کەرخی حوسێنی غازی
زێدە لە جوانێ
مل بە خەناوەکە و مەرجانە

-٦٦-

حەیران بەحرکە گوندەکی گەلەک قەدیمە
بە کانی و ئاوە
هەموو فەسلێ بەهاران
دەچنە دەرێ لە گوندی لۆ هەوار گرتنێ


هونەرمەند ڕەسوڵ نێزار لە ئاهەنگێک لەگەڵ تیپی موسیقای سلێمانی ٩ ٩ ١٩٥٧

لە سەر لێوی بەستوڕەی خۆمان
کۆچ و کۆچبار لەدویەک مەڕ و بەرخیان تێکەراوە
ئەگەر لە من دەپرسن
هەموو کیژوکاری گوندان گەلەک جوانن
ئەمما ئەسمەرێ ناو ماران
لە جوانیدا گەلەک بە ناوە،
ئەمن ئەوشۆ لە جێی ژوانێ، دەگیمە پێناوێ
دەیگۆ: کوڕەتیمە حەیران هەموو ڕەنجت بە خەسار چوو
دوو ڕۆژی دی لەبۆ حەیرانەکەی تو، دەخورێتەوە شەکراوە[١٤١]

-٦٧-

حەیران بەهارە وەختی جۆزەردان
ئەوڕۆ دانی هێوارێ
حەیران کارمامزە
لە زورگ و هەلەتی پیرەشی[١٤٢]
سەبرۆکە سەبرۆکە شۆڕ دەبیتەوە
سەر بیری ئاوی سێبەردان[١٤٣]
ئەمن ئەوسارەکە وەختی جۆخینان
دەستی بە ژنی برند و دوو چاوێی ڕەشکۆکە دەگرم
لەرکی بەدکاران دەیکەمەوە بووکی ناو پەردان
هەرچی دەبێتە باعیزی دوو دران
لە سەر جێی بناری
شەو و ڕۆژ ئۆخەی نەکا ڕەنج بە خەسار بێ
بە هەموو دەردان

-٦٨-

حەیران هەرچی دەبێتە باعیزی دوو دران

ئاگرەکی لە مارێی بەربی، وەرگەڕێ
بە تەنەکەکی نەفتی حەلەبێ
بە جونیەکی دەرمانی موسرێ،
بە گۆگردی عەتاراندا گەڕێ
هەر کاتە بایەکەی شەمارێ
بە خۆی لە لای ژۆری بی
کلیلەی بزرکا
سەرتاپا ئاگر لە مارێ بگەڕێ

-٦٩-

حەیران قەراتی شارەکەی هەولێر
گەلەک قەدیمە
دەرکەی دوو دەری
گەلی برا و برادەرینە
ئەمن ئەورۆ هێوارێ
زەینی خۆم دەداوە
ئەو ناسک و ناسک بەدەنەی
دێتەوە لە سەر جۆگەی شێخەڵلای
لە بن کراسەکی کتان
جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەران
بە بایەکەی شەماری
دەڕوا و دەلەری
دەمگۆتە حەیرانەکەی خۆم:
دەتو بینە ماچ کەم چەرخی ڕوومەتێ
خارێ گەردەنێ
دیاریم هینایە، بسکۆکەی زێڕین
لە بۆ بەرسەری

-٧٠-

حەیران ئەورۆکە باجگرم
لە لفکە شۆر و بەژن برند و چاو بە کلی ڕەوەندۆکان
کە ڕۆژ گەزەنگی دەدا و نەدەداوە
لە مابەینی کۆز و کوتانێ
گەلی برادەرینە
لەبەر بۆنی خەناوکەی بە قەنەفران و سۆتکەی دەوری
سینگ و مەمکۆران
بۆنی خۆ دەدەن هەتا سبیانێ

ئەمن نازانم لە سەر چ؟
کلیلەی بیستانی ساوا لۆ بەمن ناسپێری؟
لە شەو ڕاموسانێ

-٧١-

حەیران ئەورۆ باجگرم
لە تاس بەسەر و پلپلە شۆری خۆشناوان[١٤٤]
وەکی بە دەستەکی بەبازن
پەنجەی بەخەنە داوێنەوە
کەپر و ساباتێ، پەلکی هوردە گوران
لە گەر میراتە شیلانێ
براینە، حەیرانەکەی من گەلەک مندارە
لە سێو ڕنینێ، لانادا لۆ من میراتە چەپەرێ
ماچکەم چەرخی ڕوومەتێ
دەست باوێمە سەر جۆتە مەمکۆران، لە تووە شانێ
گەلی خزمینە
دەپاڕێمەوە لە خودای گەورە، هەتا ئەوێ ڕۆژێ
ئەمن و بەژنی باریکەلانە پێکدەبڕێین
دەستی خۆمان گیردەکەین، لە دەست لە مەلانێ

-٧٢-

حەیران ئەورۆ سەر لە سبیانێ
لە شلومل و پشتێن شال و سەر بە کۆچەکی
کیژە بلباسان[١٤٥] وەکی دادەنیشن
ئەوبەر ئەوبەر لە سەر جۆگەی گرجانێ
لۆ مەندیل بادانێ



هونەرمەندە نەمرەکان رەسول بێزار گەردی، حەسەن جزیری، عەلی مەردان
هۆڵی مەلیک فەیسەل لە بەغدا ٢٧ / ٣ / ١٩٥٨

گەلی خزمینە
دانی نیوڕانان شۆڕ دەبنەوە
لۆ سەر ڕووباری سەرخمەی
چاوان دەگێڕن، لە گورە شیلانێ
حەیران دەتو بینە پەنجەی بە خەنەم لە ناو پەنجەی نێ
سێ ماچان دەخوازم بە دری خۆم
یەکەکیان لە خاری گەردەنێ
دوودم لە چەرخی ڕوومەتێ
سێیەم لە بن گورینگەی هیزارێ
ئەمن ئەوساردکە چەند سارە
ڕاوەستایمە لەسەر تو، لۆ ژن هێنانێ

-٧٣-

حەیران قورینگە هێوارە و سبیانان
لە سەر جوگە و ئاوی چیمەنی،
گەلی برا و برادەرینە
بە چاو و برۆیانم ڕادەگری
بە ناسکە لێوانیش پێدەکەنی
کیژ دەرێ: کوڕەتیمە حەیران
وەرە ئەوڕۆ دەستی خۆمان تێکبگرین
بچینەوە خوارێ دەو جوگەو دەو جۆگان
بە کنێر و حاجیلە و هوردە بەیبونان
لۆ جێی ژوانێ
بەرامبەر مێرگی ڕەشەنی
ئەوجا خوا ئەمن بکا بەخورامی بایەکی شەماری
وەکی دەداتەوە لە هوردە پەرچەمان
لۆم بەدەرێخی ڕوومەت و هەنی

-٧٤-

حەیران، چاوی تو گەلەک جوانترە
هەموو دەمێ لە چاوی مامزان
بەژنی تو هەرچووە
وەکی نەمامە سێوەکانی کوردستانی ڕەنگین
بەران سەت حەیف و مخابنە
لە دەستی ئەوان نەزانان، بە خۆڕا ڕزان
ئەو جۆتە کەزی تو هاتینە خوارێ
بە سەر ملاندا وەکی کەلکەلی نێرگزان



هونەرمەند ڕەسولێ بێزار گەردی لە گەلێ هونەرمەند عەفیفە ئەسکەندەر
لە یانەی سکەك شاری بەغدا لە ٣ / ٨ / ١٩٦٢.

-٧٥-

حەیران ئەوڕۆ سبیانێ
ڕۆژم لێهەرات لەسەر گۆوەندی
لە ناو کوریک و ڕێواسان
شەوق و شەبەقی خۆی دەداوە لە گۆیێ کەمەران
گورینگە قەرەپۆشیان، لە پلپلەی تاسان
خودا مرازی ئەمن توی حاسڵ بکردابایەوە
ئەودل ڕۆژی بەهارێ
لە ناو کوراگ و ڕێواسان

-٧٦-

حەیرانی من ئەوڕۆ سبیانێ
قورینگەکی چاو ڕەشە
لە مابەینی چیمەن و دەشتی شنۆیێ
گەلی خزمینە

ئەورۆ لە كاتی ژوانێ
دەگەیە ئەو زاڵم بابەی دەمگۆت:
دەتو بینەماچ كەم خاری گەردەنێ
هەتا در دەرێ بەسە
بۆنكەم بەینی هەر دوو جۆتە لیمۆیێ
حەیرانەكەی من دەرێ: كوڕەتیمە لاوە
ئەمن لۆ تو درم لانكە
بەرام دەبێ سوندەكم لەبۆ بخۆی، هەتا ئەوێ ڕۆژێ
شۆڕت دەكەنەوە ناو گۆڕەكی تاریك
لە گەر من نەكەی درۆیێ

-٧٧-

حەیران ئەورۆ سبیانێ
ڕۆژم لێهەرات، لە سەر چیایەكەی مەكەی
شەوق و شەبەقی خۆی دەداوە لە ماری خودای
لە ڕۆژی زیارەتێ
وەكی لەگەر حاجیان دەپاڕێمەوە
لە دەورەی كابەی[١٤٦]، لە باری تەعالان
لە ڕۆژی مەحشەرێ بێ بەریم نەكەی
گەلی موسلمانان
تۆبە یەكجارە لە مەقامی خودای بێ شەریك، دووبارەی نەكەی

-٧٨-

حەیران لە شینكان لە شینكی هەڵگۆزێ
گەلی موسڵمانان
گورەك بامایە لە گوری ڕووناسێ
هەموو جەژنی قوربانێ
لە مەقامی خوای گەورە دابنێم هۆزێ
دەوەرن گەلی حاجیان
هەموومان بەدر پاكی بچینەوە مەدینەی منەوەرە
لۆ كن پێغەمبەری ئاخری زەمانی و پیاوچاكان و هەر چار یاران
لەگەریان بكەینە جەژنە پیرۆزێ

**پەراوێزەكان:**

(١) سبیانێ: بەیانی
(٢) زەند: بەشێكە لە دەست لە نێوان دەست و باسك.
(٣) قامك: پەنجە، ئەنگوست، دیلك، پل
(٤) سەربەپەر: پیاوچاكێكی ناوچەی بادینانی بەناوبانگە.
(٥) زارێ كورانێ: سەری كۆڵانێ
(٦) خەیلانی: ناوی هۆزێكی كوردی ناوچەی هەولێرە.
(٧) بەرێ: سەرەتا
(٨) پاوان: شوێنە زەویەكە بە گژوگیاوە بۆ لەوەڕ بەكاردێ.
(٩) گازكردن: بانگكردن
(١٠) بسك: زولف
(١١) شابسك: زولفێكی ئەستووری لوولدراوە
(١٢) كەسەر: خەم و حەسرەت
(١٣) لەسەر بەدەنێ: ڕاكشان لەسەر تەنیشت
(١٤) باغەران: باخەڵ
(١٥) سەفین: چیای سەفین، كەوتۆتە شاری هەولێر
(١٦) برندی: بەرزایی
(١٧) شەمار: بای شەماڵ
(١٨) سوتكە: جۆرە گیایەكە لەدەم ئاودا دەڕوێ و بۆنێكی خۆشی هەیە، و بۆ زگ ئێشەش بەكاردێ.
(١٩) كنێر: جۆرە دارێكی بۆن خۆشە، بۆ گۆچان دروستكردن بەكاردێ.
(٢٠) هەراشی دەكەم: چاكی دەكەم، دروستی دەكەم، سەربان دروستكردن
(٢١) خاسە ڕەنگ: دەرمانێكی ڕەنگ سوورە
(٢٢) عوود: دارێكی ڕاست و ڕێكوپێكە
(٢٣) چەپەر: دیواری حەوشە، پەرژین
(٢٤) سێباری نیوەشەوێ: بەشی سێیەمی شەو
(٢٥) سەربەن: چیای پیرمام كەوتۆتە ناوچەی شاری هەولێر
(٢٦) بەقاومتمان: باوەڕپێكراو
(٢٧) هێزار: پارچە قوماشێكی جوانە ئافرەتی كوردەواری لەسەر خۆی دەبەستێ
(٢٨) گەردی شەدێ: تۆز و ئارەقەی شەدە
(٢٩) خەزێم: جۆرە خشڵێكی ئافرەتانە لە لووت دەبەسترێ
(٣٠) زینەتیر: چیایەكی سەرتیژە لە شاری هەولێر ناوچەی شەقلاوە
(٣١) گۆواینە: تێكچووە
(٣٢) تەلەسم: سحر
(٣٣) شویاندن: لەیەكچواندن، هاوشێوەن
(٣٤) قەراتی دوێن (دوین): قەڵاتی دوین شوێنی لەدایكبوونی سەلاحەدینی ئەیوبی، دەكەوێتە ناوچەی زرارەتی لە هەولێر
(٣٥) خەندەك ونۆین: چاڵێكی هەڵكەندراوە لەكاتی شەڕ بەكاردێ
(٣٦) ڕەشوان: گوندێكە لەسەر ڕووباری بەستۆرە لە باكوری شاری هەولێر

(٣٧) خرخار: خڕخاڵ، خلّخاڵ
(٣٨) قەراج: دەشتێکی بە پیتی کشتوکاڵییە لە باشووری هەولێر
(٣٩) سوڵتان عەبدوڵلا: پیاو چاکێکی ناوچەی مەخمورە
(٤٠) سێ قوچان: گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپە لە شاری هەولێر
(٤١) قاشی برۆ: ناوەڕاستی هەردوو برۆ
(٤٢) قەپلان: گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپە
(٤٣) گردەسوز: گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپە، دانیشتوی گوندەکە سەر بە عەشیرەتی سیانن
(٤٤) حەمایلە و عاشق بەندان: دوو جۆرە خشڵن بەسەر سینگی ئافرەتان بەکاردێ
(٤٥) دەبیزافت: دەیجوولاند
(٤٦) هەنی: بەشێکی روومەتە لە خوار کوڵم
(٤٧) کرمۆکە: جۆرە خشڵێکە لە زێڕ یان زیو دروستدەکرێ بۆ گەردنی ئافرەتان
(٤٨) گرۆ: مەرج، شەرت
(٤٩) نسکۆ: رۆح کێشان
(٥٠) هەنگینێ: ئەو کاتە
(٥١) گەردن مینا: گەردن شوشەیی بێگەرد
(٥٢) شەرەبۆت: گوندێکە سەر بە ناحیەی عەنکاوە لە شاری هەولێر
(٥٣) قەرەبۆتک و قەرەبێتکان: شاخن لە ناوچەی قەرەچوغ لە شاری هەولێر
(٥٤) گورگە: ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی دیبەگە لە شاری هەولێر
(٥٥) گەرمکی بامەندان: ناوی هۆزێکی کوردە لە ناوچەی کەندیناوەی سەر بە شاری هەولێر
(٥٦) تۆمار: گوندێکە سەر بە ناحیەی عەنکاوە
(٥٧) خەرجەستێن: ئەو کەسەی کە باج وەردەگرێ
(٥٨) معێجیلە و کاولە مشاری: دوو گوندن سەر بە ناحیەی گوێڕی شاری هەولێر
(٥٩) دەسافێ: روون دەبێتەوە
(٦٠) عاویە: ناوی رووبارە لە کاتی کشانەوە لە هاویندا
(٦١) گوێڕ: ناحیەیەکە سەر بە شاری هەولێر
(٦٢) کوشاف: گوندێکە سەر بە ناحیەی گوێڕ
(٦٣) بێترمە: ناوی کانیەکە لەسەرووی شارۆچکەی شەقڵاوە لە شاری هەولێر
(٦٤) تاس: جۆرە خشڵێکە بۆ رازاندنەوەی سەری ئافرەتان
(٦٥) شەرگات: ناوی قەزایەکە سەر بە شاری موسڵە
(٦٦) باقرت: ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی قەراج لە شاری هەولێر
(٦٧) ئازی کەند: ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی قەراج
(٦٨) بندیان: ناوی هۆزێکە لە دەشتی هەولێر
(٦٩) برایمی بایزی: پیاوێکی ناوداری عەشیرەتی دزەییە
(٧٠) وەکازە: ناوی کانیەکە لە چیای قەرەچوغ لە شاری هەولێر
(٧١) بازارگە: ناوی گەلیەکە لە چیای قەرەچوغ
(٧٢) مەحمودی سەنان: ناوی بیرێکی ئاوە لە دەروازەی بازارگە لە چیای قەرەچوغ
(٧٣) برایمی مەلا زێندینان: ناوی پاڵەوانی چیرۆکێکی راستی دڵداری کوردەوارییە
(٧٤) قەرەسوپا: سوپا یان لەشکرێکی زۆری بەتوانا
(٧٥) حەیف: مخابن، داخ
(٧٦) لاسەر: جۆرە بەستانێکی پۆشاکی سەری ئافرەتانە بە لاری دەبەسترێ
(٧٧) قفلی: بەندکراو
(٧٨) تەلوسەک: گردێکی ئاسەواری کۆنە کەوتۆتە سەر رووباری بەستۆرە
(٧٩) بەحرکە: پایتەختی ناوچەی گەردیایەتیە کەوتۆتە شاری هەولێر
(٨٠) هەردەوەشانەوە: هەڵدەوەشانەوە، دەکولانەوە
(٨١) بەندە: پەیمان
(٨٢) شێخ وەیسی: پیاو چاکێکە، گۆڕەکەی لە بەحرکەیە
(٨٣) پیر بەدری هەناری: پیاو چاکێکە، گۆڕەکەی لە گوندی هەنارەیە لە هەولێر
(٨٤) شێرەسوار: پیاو چاکێکە گۆڕەکەی دەکەوێتە دەربەندی سەیدی
(٨٥) هیران: ناوی ناحیەکە لە بناری سەفین، هیران: گوندێکە سەر بەناحیەی هیران لە شاری هەولێر
(٨٦) هیوێ: هیوا، ئومێد
(٨٧) پلپلە: جۆرە خشڵێکە ئافرەتان لە سنگ و بەرۆکی خۆیان دەدەن
(٨٨) جاستان: گوندێکی گەورەی سەر بە ناحیەی کەندیناوەی شاری هەولێرە
(٨٩) مامەراغەی زراری: پیاوێکی سوارچاکی ئازای بەناوبانگی عەشیرەتی زراری بوو
(٩٠) دارە شەکران: دارێکی گەورەی بەرزە لەسەر شوێنێکی بەرزی زوورگەکانی ناوچەی زرارەتیە، ئێستا بۆتە سەیرانگە
(٩١) یەمەنی: جۆرە پێڵاوێکی رەنگ سوور بوو، پینەدۆزەکان دروستیاندەکرد
(٩٢) دارکمژۆکان: رووەکێکی نەرم وشلە لەدەم ئاوەکان دەڕوێ
(٩٣) گۆریە چەلێن: گۆریەی بەدەست چنراو
(٩٤) کفر: ناوی جۆرە دارێکە لەدەم رووباران دەڕوێ
(٩٥) مخاران و قەپەکیان: ناوی دوو گوندی ناوچەی زرارەتێن لە شاری هەولێر
(٩٦) پێروو: ئەستێرەیەکی بەشەوقە، لە هاویندا لە پێش بەیانیاندا بەدەردەکەوێ
(٩٧) تەرازوو: کۆمەڵە ئەستێرەیەکن، شەو کاروان بەکاریان دێنێ بۆ

زانینی ڕێڕەوی ڕێگاوبانی هاتوچۆیان
(٩٨) بەمارە و تەراق: ئەو کچەی لە منداڵییەوە لە کوڕێک مارەکرابێ و هێشتا نەگوازرابێتەوە
(٩٩) وەستا سدیقی رواندزێ: وەستایەکی زێڕنگری بەناوبانگ بوو لە هەولێر
(١٠٠) گژنیژە: وردە خشڵە بۆ نەخش چنین بەکاردێ
(١٠١) راموسان: لە ئامێزگرتن و ماچکردن
(١٠٢) شێخ مەموندیان: هۆزێکی کوردن لە باکوری شاری هەولێر
(١٠٣) روست و گرتک: دوو گوندی گەورەی ناوچەی باڵەکایەتین لە نزیک قەزای چۆمان لە شاری هەولێر
(١٠٤) سەقاو: ناوی کانیەکە لە شارۆچکەی شەقلاوە لە شاری هەولێر
(١٠٥) شێخەڵلا: ناوی پیاو چاکێکە و ئەو گەڕەکەی مەزاری ئەوی لێیە بەناوی ئەو کراوە لە هەولێر، جاران کارێزێکی ناوی لێبوو
(١٠٦) کاک عەوڵای هیران: شێخی بەناوبانگی هیران بوو
(١٠٧) کوریکە: گوڵە نیسان
(١٠٨) حاجیلە: جۆرە گوڵێکی سپی و زەردی وردیلەیە لە بەهاران دەڕوێ
(١٠٩) هەوەت: هاوارکردن بە ئەوەتە ئەوەتە بۆ هاندانی راوچیان
(١١٠) حوسێنی غازی: ناوی پیاو چاکێکە لە ناوچەی بادینان
(١١١) مەفتەن: وڵات، نیشتمان
(١١٢) مەرگە و پشدەر: دوو ناوچەن لە قەزای قەڵادزێ لە شاری سلێمانی
(١١٣) قەرانک: ئامێرێکە وەکو داس وایە، گیشەکەر گیشەی پێ کۆدەکەنەوە
(١١٤) مەرۆ: ئەو بەشەیە لە گەنم وجۆ کە دەدروێتەوە
(١١٥) بچۆمێ: بچەمێتەوە، خوارببێتەوە
(١١٦) کۆڕەی هەسپیان: دەنگی ئەسپ
(١١٧) نووسکەی تاژییان: دەنگی تاژیان لە کاتی ماندووبوون
(١١٨) قەڵادگە: گوندێکە سەر بە ناحیەی عەنکاوە، دەکەوێتە رۆژئاوای شاری هەولێر، شوێنی لەدایکبوونی هونەرمەند رەسوڵ گەردییە
(١١٩) گوفکی مافوور: ریشی مافوور
(١٢٠) گەزنە: ناوی گوندێکی ناوچەی بەڕانەتیە، سەر بەناحیەی عەنکاوە
(١٢١) غەوس: مەبەست لە شێخ عەبدولقادری گەیلانیە
(١٢٢) دارەبزمار: دارێکی بەناوبانگە کەوتۆتە نزیک گوندی دێرەسەروکانی سەر بەناحیەی سەلاحەدین، خەڵکی بۆ هاتنەدی مراز و ئاواتەکانیان دەچن بزمارێک لەو دارە دەچەقێنن.
(١٢٣) گومبەتی عەبدولعەزیزی: مەزاری شێخ عەبدولعەزیزە، کە پیاو چاکێکی بەناوبانگە، و دەکاتە کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی
(١٢٤) روستایی: گوندێکی زۆر گەورەی ناوچەی باڵەکایەتیە، سەر بەقەزای چۆمان، بەناوی چیای حەسارۆست کراوە
(١٢٥) کێلەشین: بەشێکە لە چیای حەسارۆست، بەبەردەوامی بەفری لێ نابڕێتەوە
(١٢٦) گرتیێ: گیراو، بەندکراو
(١٢٧) مەقلوب: چیای مەقلوب بەتەنیا لەنێو دەشتاییەک بەرزبۆتەوە، دەکەوێتە ناوچەی شێخان، کە قەزایەکە دانیشتوانەکەی کوردن لە یەزیدی و موسڵمان پێکهاتوون
(١٢٨) ژنگار: ژەنگار، شەنگال، شەنگار، ناوی قەزایەکە لەناوچەی بادینان نزیک سنووری سوریا کە دانیشتوانەکەی کوردن یەزیدی و موسڵمانن
(١٢٩) هەمزەکۆر: ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپەی شاری هەولێر
(١٣٠) کوریک: گوڵێکی تازە پێگەیشتوو پێش ئەوەی ببێ بەخونچە
(١٣١) پیرداود و شێراوە و قووچەبلباس: سێ گوندن سەر بەناحیەی قوشتەپەی شاری هەولێر
(١٣٢) کوریکی گاگرۆیێ: کوریکە گوڵێکی بەهاریە، رەنگی سوور و مۆر و سپیە
(١٣٣) دەراوکانی: سەر ئاو و کانی و رووباران
(١٣٤) دەزر زری: پەیدادەبێ، بەدیاردەکەوێ
(١٣٥) گەنج عوسمان: پاڵەوانێکی کوردی موسڵمان بوو، لە بەغدا لە دژی مەغۆلەکان جەنگاوە
(١٣٦) زرێییەکی داودی: ئەو زرێیەی (قەڵغان) کە پێغەمبەر داود (د.خ) دروستی دەکرد
(١٣٧) سرێ: ساردێ، تۆراوێ، بێمەیلی
(١٣٨) قەرەچوغ: ناوی چیایەکە لە شاری هەولێر کە دەشتی قەراج و کەندیناوە لەیەک جیادەکاتەوە
(١٣٩) سیان و مامەسێنی: دوو عەشیرەتی گەورەی شاری هەولێرن و ئامۆزای یەکترن
(١٤٠) هۆبە: کۆمەڵ
(١٤١) دەخورێتەوە شەکراو: مارە دەکرێ
(١٤٢) پیرەش: ناوی گوندێکی سەر بەناحیەی عەنکاوەیە، دانیشتوانی لە عەشیرەتی گەردین
(١٤٣) سێبەردان: ناوی گوندێکە لەنزیک پیرەش
(١٤٤) خۆشناو: عەشیرەتێکی گەورەی کوردە نیشتەجێی شاری هەولێر و سلێمانین
(١٤٥) بلباس: عەشیرەتێکی گەورەی کوردە، نیشتەجێی ناوچەی پشدەر و هەولێرن
(١٤٦) کابە: کەعبە

# محەمەد عاشق
# ١٩٦٣-١٩٣٢

جەلال خدر

بەبیرم دێ منداڵ بووم لە ساڵانی ١٩٦٢-١٩٦٣، کە ئەوکاتەی ماڵمان لە گەڕەکی تەعجیل: کۆڵانی سەعدووناوە بوو، لە هەولێر، ئاهەنگی بووک گواستنەوە هەبوو... خەڵکی بە ئەمەکی ئەو شارە بە گەورە و بچووکیانەوە بەشدارییان تێدا دەکرد، ئیدی دەبووە ئاهەنگ و گۆرانی و بەزم و نوکتە و قسەی خۆش، بەتایبەتی لە شەوانی هەینی، دوای خوێندنی مەولوودی پێغەمبەر (د. خ)، کە لەلایەن مەقامزان و مەولوودخوێنی بەناوبانگی شاری هەولێر (حاجی عەبدوڵڵا دەفژەن) بە خۆی و بە کۆمەڵەکەی، کە پێکهاتبوون لە: (سەید ئیسماعیل و پاپخە کۆر و موتەلیب و دەروێش ئەحمەد، مام یەحیای حەمامچی و کەسانی دیکە، بەشدارییان لەو مەولوودەدا دەکرد). داخی گرانم دوای کۆچی دوایی (حاجی عەبدوڵڵا دەفژەن) خوێندنی مەولوود بەم شێوەی جاران نەما....

کەسیش نەیتوانی جێگای ئەو



بلیمەتە بگرێتەوە، دوای خوێندنی مەلوودیش، ئاهەنگی گۆرانی گوتن دەستی پێدەکرد، بەو ئاهەنگە دەگوترا (ئەگلەنجە)، ئەویش زۆربەی زۆری هونەرمەند و دەنگخۆشەکانی ئەو شارە وەکو (مشکۆ، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، پیرداوەدە کۆر و شاکر حەمە فارس و مام حەمیدی کوورەچی و نوورەدین عەسافلی و مام جامیلە و کەسانی دیکە بەشدارییان تێدا دەکرد، ئیدی دەبووە بەزمی گۆرانی و مەقامات و

قۆریات، زۆرجاریش ئاهەنگەکە تاوەکو بەرەبەیان بەردەوام دەبوو، لەپاشان لەگەڵ زاوا دەچوونە حەمام، لەوێش دووبارە ئاهەنگی گۆرانی گوتن دەستی پێدەکردەوە و زۆر جاریش دۆست و برادەرانی نزیکی زاوا نوکتەیان بە یەکتری دەکرد، ئەگەر هاتوو یەکێک کەوا خەو بیبردباوە، ئەوە چاویان بە (تەنی) رەش دەکرد و لە پاشان دەیان بردە بەر ئاوێنە و گاڵتەیان پێدەکرد... ئاهەنگەکە بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو، تاوەکو کاتی بووک گواستنەوە... لێرەدا یادگارییەکم بەبیرهاتەوە، لە کۆڵانی سەعدووناوە ئاهەنگی بووک گواستنەوە هەبوو، ئەو کەسەی ژنیان بۆ دەگواستەوە، هونەرمەندی بەناوبانگی شاری هەولێر (محەمەد ئەحمەد ئەربیلی) بوو، دوای نوێژی عەسر خەڵکێکی زۆر لەبەر دەرگای ماڵیان راوەستابوون، چاوەڕوانی هاتنی بووکیان دەکرد، ئێمەش لەسەردەمی منداڵیدا (سەردەمی بەرائەت) لەسەر پردی تەعجیل

لەگەڵ کۆمەڵێک لە برادەرانی سەردەمی منداڵیم چاوەڕوانی بووکمان دەکرد. خۆشییەکەی لەوەدا بوو، لەکاتی هاتنی بووک پارە و چوکلێت و میوژە رەش و گەنم و شیرناتی بەسەریدا دەکرا، عادەتی پێشان وابوو، کچی عازەب شیرناتییان کۆدەکردەوە، دەیانگوت: (مرادمان حاسڵ دەبێ) چەندین منداڵی بچووک دەکەوتنە بن دەست و پێیان.

لە سەربانی ماڵی زاوا چەندین دۆست و برادەرە نزیکەکانی راوەستابوون، چاوەڕێی هاتنی بووکیان دەکرد، کاتێک بووک لە ئۆتۆمۆبیل دادەبەزی لەبەر قەرەباڵغی خەڵک کەس ئەو بووکەی نەدیت، لەوکاتەدا (غەفوور قولی) دۆست و برادەری زاوا، بووکی خستە سەرشانی، بۆ ئەو خەڵکەی حازر بووە چاویان پێی بکەوێ، نابێ ئەوەش لەیادبکەین، کەوا هونەرمەند و دەنگخۆشی ئەو شارە ئەویش خوالێخۆشبوو (مام پیرداوەدە کۆرەی) رەحمەتی لەپێش ئاهەنگی بووکەکە دەڕۆیشت بەدەم گۆرانی گوتن دەنگی هەڵدەهێنا و دەیگوت: (بەدرەنگە بابی بووکێ... بەدرەنگە)، یان دەیگوت: (بووکمان هێناو هاتینەوە... لە جۆگەلەی پەرینەوە).

ئەو خەڵکەی دەهێنا جۆش و خرۆش، برادەرانی زاوا لە چواردەوری مام پیرداوەدە کۆرە سەمایان دەکرد، تاوەکو کەژاوەی بووکەکە دەگەیشتە بەر ماڵی زاوا، یەکێک لەو هونەرمەندە دەنگخۆشانەی، کە بەشداری لەو ئاهەنگەدا کردبوو، ئەویش گۆرانیبێژ و دەنگخۆشی جوانەمەرگ (محەمەد عاشق) بوو، کە لە سەربانی ماڵی زاوا راوەستا وەک ئەو خەڵکە حازر بوو، چەپڵەی لێ دەدا منیش بۆ یەکەمین جار و ئاخیر جاربوو، کە چاوم بەو هونەرمەندە بکەوێ، چونکە ئەو لە تەمەنی لاوی و گەرمەگەرمی ژیاندابوو، ئاهو حەسرەت و غەریبی و کەسادیێ و ماڵوێرانیدا ماڵئاوایی لە ژیاندا کرد.

### ژیاننامەی محەمەد عاشق

گۆرانیبێژ و هونەرمەند و قۆریاتبێژی شاری هەولێر، محەمەد عاشق، کوڕی ئیبراهیم هەولێرییە لە ساڵی ۱۹۳۲ لە گەڕەکی خانەقای شاری هەولێر چاوی بە دنیای رووناک هەڵهێناوە، لە تەمەنی حەوت ساڵان دەخرێتە بەر خوێندنی قوتابخانە، لە قوتابخانەی (ئەربیل ئوولا) دەست بە خوێندن دەکات، تاوەکو پۆلی چواری سەرەتایی دەخوێنێ، لە پاشان لەبەر هەژاری و دەستکورتی خوێندنی بۆ تەواو ناکرێت، بۆیە هەر لە منداڵییەوە دەست بە کاسبی دەکات، لە ساڵی ۱۹٤۳ لەلای (حیومی پەنچەرچی) جوو، کە دوکانی لە نزیک چایخانەی عەبۆ قاوەچی بوو، بۆ ماوەیەک شاگردی دەکات و لە پاشان واز لەو ئیشەی خۆی دەهێنێ و دەست بە ئیشی بۆیەچییەتی دەکات، لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکان دەبێتە سەرباز و بۆ ماوەی دوو ساڵ لە سەربازی دەمێنێتەوە، لە پاشان دووبارە دەگەڕێتەوە شاری هەولێر و دەست بە کاسبی دەکات، تاوەکو مردن لەسەر ئەو کارەی خۆی هەر بەردەوام دەبێت.

محەمەد عاشق هەر لە منداڵییەوە حەزی لە گۆرانی و بەستە و قۆریات و مەقامات کردووە، عاشقی دەنگی هونەرمەند مشکۆی هەولێری بوو، لە هەمان کاتیشدا گوێبیستی قەوانەکانی (جەلال بەگی) تورکی بووە.

لە ساڵی ۱۹۵۹ کاتێک بەرپرسی ئێستگەی بەغدا (بەشی تورکمانی) هاتۆتە شاری هەولێر، داوای لە چەند دەنگخۆشێکی ئەو شارە کردووە، بۆ ئەوەی دەنگیان لە رادیۆ تۆمار بکەن، هەندێکیان رازی نەبوون وەک: (مشکۆ، حەیدەرە کەچەڵ و مام حەمیدی کوورەچی و شاکر حەمە فارس و کەسانی دیکە)، بەڵام هەندێکی دیکەی وەک: (محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، حاجی فائیقی محەمەد سوڵتانی بازرگان و نورەدین عەسافلی و یونس خەتات) دەنگیان تۆمار کرد... یەکێکیش لەوانە محەمەد عاشق بوو، کە

بەتەما بوو دەنگی تۆماربکات، بەڵام نەیتوانی بەشداری بکات... ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ هونەرمەند محەمەد ئەحمەد ئەربیلی چووە ئێستگەی بەغدا و چەند گۆرانییەکی تۆمارکرد، لەوانە مەقامی (بەیات و حیجاز و سەبا) بوون.. محەمەد عاشق جگە لە شاری هەولێر دۆستایەتی لەگەڵ هونەرمەند و دەنگخۆشەکانی شاری کەرکووک، وەکو: (رەشەی کولله رەزا و عیزەدین نیعمەت و مەمەد قەڵایی و محەمەد گوێ بۆی و فەخرەدین ئەرگێچ)دا هەبووە، شان بەشانی ئەو دەنگخۆشانەی دەنگی، هەڵهێناوە و کاسێتی تۆمارکراوی هەیە، کە شانبەشانی (مشکۆ و حاجی جەمیلی قەپقاپچی و نووری مەلا نادر و هونەرمەندەکانی شاری کەرکووک لە ساڵی ١٩٦٢ قۆریاتی تورکی چڕیوە).

محەمەد عاشق لە ماوەی ژیانیدا هەرچەند کورت بووە، بەڵام بەشداری لە ئاهەنگی بووک گواستنەوە و ئەگلەنجەکانی ئەو شارەی کردووە، مەقامات و قۆریاتی چڕیوە.

محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، بۆی گێڕامەوە گوتی: محەمەد عاشق، برادەری سەردەمی منداڵیم بووە، دەنگی زۆر خۆش بووە، پیاوێکی هەژار و دەستکورت بووە، زۆرجار کە داوەت دەکراین لە شاری کەرکووک، یان پردێ، یان هەر شوێنێکی دیکە، ئەو هونەرمەندەم لەگەڵ خۆم دەبرد، بۆ ئەوەی بەشداری بکات و دەنگ هەڵێنێ و بە خەڵکی بناسێنم، چونکە تا بڵێیی پیاوێکی شەرمن بوو، لەکاتی خۆیدا من هەوڵمدا لەگەڵ خۆم بردمە ئێستگەی بەغدا، بۆئەوەی دەنگی تۆمار بکەم، محەمەد عاشق لە تەمەنی گەنجیدا ماڵئاوایی لێکردین، ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد هێشتا ژنی نەهێنابوو.

هەروەها مامۆستا یونس خەتاتی هونەرمەند بۆی گێڕامەوە گوتی: محەمەد عاشق، دۆستی سەردەمی منداڵیم بووە، لە گەڕەکی خانەقا بەیەکەوە گەورە بوون... زۆر حەزی لە قوریات دەکرد، بەشداری لە ئاهەنگی ئەو شارە دەکرد، شانبەشانی دەنگخۆشەکان دەنگی هەڵدەهێنا و لە تەمەنی گەنجیدا لە کۆڕ و مەجلیسی (پیرداودە کۆڕەی رەحمەتی) دادەنیشت و گوێی بۆ شل دەکرد، حەزی لە دەنگی هونەرمەندی بەناوبانگ (جەلال بەگ) دەکرد، قەوانەکانی ئەوی لەبەر کردبوو، هەروەها عاشقی دەنگی (مشکۆ و حەیدەرە کەچەڵ) بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو هونەرمەندە بە گەنجی سەری نایەوە، هەموو تاێ و سوێری ژیانی لەگەڵ خۆی بردە ژێر ئەو خاکە، زۆر بە غەریبی ماڵئاوایی لێکردین.

هونەرمەندی لاو کاک سالم فەتاح بۆی گێڕامەوە گوتی: لەکاتی خۆیدا من شاگردی بۆیاغچی بووم، جارێکیان لەگەڵ وەستاکانی ئەو شارە بۆ ئیشکردن باڵەخانەیەکی حکومیمان بۆیە دەکرد، زۆر جاریش وا رێکدەکەوت، محەمەد عاشقی هونەرمەند بەشداری لەو ئیشانە دەکرد، ئەویش عادەتی وابوو، لەکاتی ئیشکردندا دەستی بە گۆرانی و بەستە و قۆریات گوتن دەکرد، دەنگی زۆر خۆش بوو، بەتایبەتی کاتێک کە قۆریاتی (موچەلای) دەچڕی و شانبەشانی دەنگخۆشەکانی ئەو شارە دەنگی هەڵدەهێنا و قۆریاتی دەگوت.

محەمەد عاشق ژیانی بەم شێوەیە بەسەر دەبات، تاوەکو لە شەوی ٦ لەسەر ٧ی مانگی مایسی ساڵی ١٩٦٣ لەکاتی گەڕانەوەی لە ئاهەنگی بووک گواستنەوەی ماڵی برادەرێکی لە رێگا تووشی رشانەوە دەبێت و لە ئەنجامدا مەرگ مەودای نادات و ماڵئاوایی لە دوست و برادەرانی و خزمانی دەکات و بۆ بەیانی ئەو رۆژە لە گۆڕستانی (چراغ) لە شاری هەولێر بە خاک دەسپێردرێ.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (١١) وەرگیراوە.

# ئەبوو سەباح
# ١٩٣٥ - ٢٠٠١

**تاریق کارێزی**

هەمـــوو شـارو ئاواییـــەکی ئەم دنیـایە خاوەنی چەند خەسلەت و سیمایەکی تایبەتە، ئەو خەسلەت و سـیـمـــایانە چەندین کـەس و کـەسایەتییـــان لە پشـتـە، واتە دەگونجێ بلێین گەلێ کەسایەتی لە توێژو چینی جۆراوجۆرەوە نەخشی کـــارایان دەبێت لە دارشتن و خەملاندن و پێگەیاندنی سیماو مۆرکی تایبـەتی شـار، ئەو جۆرە کەسانە وەک سـمبوڵ دەچنە نێو یادەوەری خەڵکی شارەوە، کـارو کـردەوەو هەڵسـوکـەوتیـان وەک تۆمـاری ژیاننامـەیەکی دڵگیـر، دەکەوێتە سەر زاری خەڵکەوە، لە نێو خەیاڵ و بیرگەی دانیشتووانی شـار دەبنە پاڵەوان و کـاراکتـەری کـۆمـەڵایەتی، نەوە دوای نەوە، خـەڵکی شـار یادیان دەکـاتەوەو وەک ئەفـســـانەیەکی دنیـــای کەلتووری شـار، هەمیشە میوانی کـــۆڕو دانیــشتن و ئاهەنگ و یادەکان دەبن.

(ئەبوو سـەباح) لە وانەیە زۆر کـەم کـەس لە ئێـمـە دەزانێ، کـە ناوی "مــحــێــدین تاهیـــر



عەبدولکەریم"ەو لە ساڵی ١٩٣٥ دا لە گـونـدی (وەرێ)ی سـەر بە ناحیـەی بێتـواتە لە دایک بووە، یەکێکە لەو زات و کەسانەی، کە لە مـاوەی نیـو سـەدەدا سیـمـاو کـەسایەتی کـاراکتـەرێکی دیارو بەرجەستەی شاری هەولێر بوو.

(ئەبوو سـەباح)ی وێنەگـر، قـوڕەکـەی لە زەمـانێکی بەر لە ئێستا شێلدراوە، کەسایەتییەکی سـەرڕاست و پاک و بێ گـرفت و دەروون روون و ئـاوەدانـە، تـۆزو گـەردی ئەم زەمــانە نە کـاری لە رەوشـتی کـردووە و نە بەها بەرزو پیرۆزەکانی مرۆڤایەتیی لە لا کاڵ کـردۆتەوە. تا ئێـسـتـاش (ئەبوو ســەباح) باوەڕی بە بەخـشین و بەخششی پتر هەیە تا خەڵات و بەرات وەرگرتن، ئەو پەندە کوردییە لە ژیانیـــدا پیـادە دەکـات، کـە دەڵێ: "چاکە بکەو بیدە بە ئاوا"، دەروونی لە زمانی و زمانی لە دڵی و، دڵی لە نیـــازپاکی جـــودا نابێتـــەوە، لە خـێـرەوە دەست پێدەکات و بۆی دەدوێ و لە خێرو چاکـە دەڕوانی و تەنیـا چاکـەش دەکـات، بە راسـتی عـەجـایەب مـرۆڤـێکی ئەم سـەردەمـەیە، کـە (دۆلار) پەرســـتی و (پەیمان) شکێنیی و... چی و چی تێـــدا بووەتە باو! ئەم مرۆڤە بنیـادێکی گـــەورەی بەهاو ئاکـــارە لە نێـــو بنیـــادێکی لە ڕو وردی گـۆشت و ئێسقاندا.

**دۆستی دڵسۆزی هونەرمەندان**

دەڵێـن لە دنیـــای بەرچاودا عـاشق تەنیـا خۆشەویستـەکەی دەبینێ، هەر لە منداڵییەوە تیری

هونەر دڵی (ئەبوو سـەباح)ی سمیوە، بۆیە بووەتە عاشقێکی سەوداسەری هونەرو لە تەمەنی (٨) ساڵیدا (١٩٤٣) یەکەمین فیلمی (سەباح)ی بینیوە، کە ئەکتەرو گۆرانی بێژێکی ناسراوی لوبنانییە. هەر لەو رۆژەوە محێدێن تاهیری خەڵکی وەرێ و دانیشتووی هەولێر قسەی بن زمان و سەر زمانی بووەتە سەباح، تا وای لێهاتووە ئەویش بە ناوی سەباحەوە ناسراو بووە (ئەبوو سەباح)، کە لە زمانی عەرەبی واتای (باوکی سەباح) دەگەیەنێ و پەنامەکیش واتای (سەباح زادە) و (خاوەن سەباح) دەگەیەنێ.

عەشقی (ئەبوو سەباح) لەگەڵ عەشقی خەڵکی دی جیاوازە، ئەو لە عەشقێکی پاک و پاکیزەیی دایە، لە پشت و پەنای ئەو عەشقەوە هیچ خواستێکی دنیایی نییە، بەڵکو عەشقە لە پێناو جوانی و هونەر، لە پێناو رازی کردنی هەستێکی بەرزی سۆفیگەرییانە، ئەم جۆرە عەشقە گرێکی وا دەخاتە دەروونەوە کە لە هیچ سەرماو بەستەڵەکێکدا سارد نابێتەوە.

لە عەشق و خولیا بوونی بە هونەرو هونەرمەندان (ئەبوو سەباح) تەمەشای رەنگ و روو ناکات، گوێ ناداتە ئەوەی بە چ زمانێک دەدوێ یا خەڵکی کام وڵات و چ گۆشەو کەنارێکە. دۆست و دۆستایەتی گشت هونەرمەندان دەکات، کامیراکەی



ابو سەباح، هونەرمەندی عەرەبی سمیرة توفیق، نادیة جمال

خستۆتە خزمەت هونەرمەندانی کوردستان، بە سەدان وێنەی عەلی مەردان، حەسەن زیرەک، محەمەد عارف جزیری، حەسەن جزیری، باکووری، تایەر تۆفیق، رەسووڵ گەردی، جەمال جەلال، فوئاد ئەحمەد، سەلاح داودە، تەحسین تەها، حوسێن عەلی، شەماڵ سایب، عیسا بەرواری، نەسرین شێروان، گوڵبەهار، مشکۆ، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، فایەق بەزاز، حەیدەر عەبدولرەحمان، جەبار ئەحمەد، جەلال ئەحمەد، یونس خەتات، یونس مەحمود، نوردین عەساف، جەمیل قەپقاپچی و، بە سەدان وێنەی هونەرمەندانی عەرەبی وەک سەباح، سەمیرە تۆفیق، نەجاح سەلام، جاکلین، تەرووب، حوسێن نعمە، یاس خدر، داود ئەلقەیسی، داود ئەلعانی، سەلاح عەبدولغەفوور، نەسری شەمسەدین، مائیدە نەزهەت، مەها ئەلجابری، حەنان، شیشی عەبدۆ و، دەیان هونەرمەندی بیانی کە لە کوردستان یا لە بەغدا و شوێنانی دی لە ئاهەنگ و بۆنەکاندا گرتووە، لە گرتنی سەرجەم ئەم وێنانە ئەبوو سەباح بیری لە دەسکەوتی پارەو پووڵ نەکردۆتەوە، دەسکەوتی لە بواری دەروون و رازی کردنی هەستی جوانخوازی و جواندۆستیدا بووە، بەوەندە دەسکەوتەشی ئۆخەی و بەس لێکردووە.

دڵسۆزیی (ئەبوو سەباح) بۆ هونەرو هونەرمەندان گەیشتۆتە ئەو رادەیەی یەکێکی وەکو حەسەن زیرەک لەسەرە مەرگدا هێندەی هەر هەمووان و چەندین جار ناوی

هێناوەو سلاوی بۆ ناردووە، (ئەبوو سەباح)یش هەر لە هەولێرەوە تا دەگاتە سەر ناڵەشکێنەی بۆکان، بەپێ بۆ سەردانی ئارامگەکەی چووە، جا ئەگەر ئەمە عەشقی پاک و بێگەرد نەبێت بۆ هونەر؟ دەبێ عەشق چی بێت؟

**گەشتێک بە دنیای هونەرو پیشەکاندا**

هەر وەک لەسەر زاری ئەبوو سەباحم بیستووە، لە تەمەنی (٣) ساڵیدا، واتە لە ١٩٣٨ خانەوادەکەی دێتە هەولێرو لە گەڕەکی خانەقادا نیشتەجێ دەبن بێ ئەوەی بچێتە بەر خوێندن، فێری سووکە خوێندەوارییەک دەبێت، لە تەمەنی (٤) ساڵیدا دەبێتە شاگردی حاجی عەبدولڕەحمانی کارگەچی بە دروستکردنی لبادو کاری هەللاجییەوە خەریک دەبێت.

لە ساڵی ١٩٤٧ سینەما سەلاحەدین و لە ساڵی ١٩٤٨ یش سینەما حەمرا لە هەولێر دروست دەکرێت، لە ١٩٥٠ ئەبوو سەباح دەبێتە جارچیی فیلم و بە دوو شاگردەوە پروپاگەندەی بۆ فیلمەکان دەکرد، دوو شاگردەکە تابلۆیەکی گەورەی داریان هەڵدەگرت، کە پۆستەری فیلمەکەی لێدەدراو چێوەکەشی بە گوڵ و نایلۆن و زینە ئارایش دەدرا، ئەبوو سەباحیش لەبەر ئەوەی دەنگی خۆش بوو، تا تین و دەنگی تێدا بوو دەیچریکاندو ریکلامی بۆ فیلمەکان دەکرد.

زۆر کەس لەم پیشەیەدا بووەتە شاگردی ئەبوو سەباح و دواتر بوونەتە پیاوی گەورەو ناودار، هەندێ لەوانەی ناوەکانیانی وەبیر هاتەوە (مەولوود حەمەد، ئیسماعیل ئیبراهیم، مستەفا ئیبراهیم، غازی پیرداود، سالح عەباس و..) ئەوان تابلۆیەکەیان هەڵدەگرت و ئەویش بە زمانی عەرەبی هاواری دەکرد و پروپاگەندەی بۆ فیلمەکان دەکرد، لە نموونەی ئەم پروپاگەندەیە:

(تقدم سينما حمراء الصيفي اعظم فلم استعراضي للفنان الكبير بلبل افندي، تمثيل وغناء المطربة اللبنانية و شحرورة الوادي صباح، والموسيقار الكبير فريد الاطرش مع اسماعيل ياسين وحسن فائق وعبدالحميد زكي وسميحة توفيق).

وەک ئەبوو سەباح دەڵێ: هەر (١٠٠)م جارێک سەر لە نوێ پێدا دەهاتەوەو هەتا تینی تێدا بوو ئەو رستە پروپاگەندانەی وەک ریکلام دووبارە دەکردەوە، دنیایەک منداڵە وردکەشیان تێ دەورووکا.

لە ساڵی ١٩٥٣ دا ئەبوو سەباح لەگەڵ وەستا "کەمال داودی" وێنەگر ناسراو بە (کەماله کەر) یەکتر دەناسن، کە دوکانی وێنەگری هەبوو، کەرەستەو پێداویستەکانی وێنەگرتنی لە بەغدا دەکڕی و هەر لەو ساڵەشدا بوو، کە ستۆدیۆیەکی وێنەگرتنی بە ناوی (ستۆدیۆ کەمال) دانا، بەر لەوە مامۆستا گیوی موکریانی بە ئامێری وێنەگرتنی بەرهەتاو کاری وێنەگرتنی دەکرد، بەڵام مامۆستا کەمال یەکەم کەس بوو، کە پیشەی وێنەگرتنی کارەبایی هێنایە هەولێر، ئەبوو سەباحیش یەکەمین کەس بووە، کە بووەتە وێنەگری گەڕۆک و کامیرای کرتوەتە شان و، خەڵکی هەولێر بانگیان کردوتە ماڵان و وێنەی ئاهەنگ و شایی و هەموو جۆرە یادو بۆنەیەکی کۆمەڵایەتیی گرتووە.

ئەبوو سەباح دەڵێ: (...زۆر جار وێنەی زەماوەندی باوکێکم گرتووە، دواتر لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان کوڕی بووەو وێنەی ئاهەنگی ئەویشم گرتووەو... پاشان هەر ئەو کوڕە گەورە بووەو وێنەی زەماوەندی ژنهێنانی ئەویشم گرتووە...).

ئەبوو سەباحی وێنەگر چونکە خاوەن رەوشت و ئاکارێکی بەرز بوو، بۆیە خەڵکی شار بێ سڵەمینەوە دەرگای ماڵ و حاڵی خۆیان بۆ دەکردەوە، لە نزیکەوە بەشداریی بۆنەو یادو ئاهەنگەکانیان دەبوو، تا ساڵی ١٩٦٨ هەر دوو پیشەی ریکلام کردن بۆ سینەما حەمراو، وێنەگری گەڕۆکی کردووە، ئەو وێنەی دەگرت و مامۆستا کەمال لە لابووری ستۆدیۆکەی دەیشووشتەوەو چاپی دەکرد.

ئەبوو سەباح دەگێڕێتەوە:".. لە پەنجاکان و شەستەکاندا وێنەی سەباح و فەریدم لە فیلمەکان دەبڕی و لە ستۆدیۆ کەمال چاپمان

دەکرد، لەبەر خاتری گەشتیاران سێ مانگی هاوین لقی ستۆدیۆ کەمالمان لە شەقلاوە دەکردەوە، وێنەی گەشتیارانی بەغدایی و کوێتیم دەگرت، زۆرجار بە جل و بەرگی کوردییەوە وێنەیان دەگرت و زۆریان پێ جوان بوو... وەها ناوبانگم دەرکردبوو، بەغدایییەکان دەیانگوت: (روحوا دورو علی أبو صباح..".

### ٣٠٠ وێنەی سەباح لە ستۆدیۆی ئەبوو سەباح

ئەبوو سەباح بە زاری خۆی دەڵێ و ئەرشیفەکەی (یا چاکتر وایە بڵێین بەشێکی کەمی ماوی ئەرشیفەکەی) گەورەترین گەواهی بە دەستەوە دەدات، کە کامیراکەی چەشنی چاوێکی شەیداو سەوداسەری هونەرو هونەرمەندان، بە سەدان و بگرە هەزاران وێنەی جۆراوجۆری پۆرترێتی هونەرمەندان و دەستە دەستەی ئەوان و چالاکی و ئاهەنگ و بۆنەو ڤیستیڤاڵەکانی گرتووە.

لە ساڵی ١٩٦٨ دا لە نزیک سینەما سیروان (ستۆدیۆ ئەبوو سەباح) دەکاتەوە، ماوەی (٦) ساڵ تا بەشداری کردنی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٧٤، ئەبوو سەباح کار لە نێو ستۆدیۆکەیدا دەکات، وەک خۆی دەڵێ (٣٠٠) وێنەی سەباح و، خۆی و سەباحی هەبووە، (١٤٠) کاسێتی حەسەن زیرەکی هەبووە، پتر لە هەزار فیلمی هەبووە، کە ئەرشیف و بەڵگەنامەیەکی گرنگی وێنەیی و دیکۆمینت بوو، لەگەڵ بەشداری کردنی لە شۆڕش، سەرجەم ئەرشیفەکەی و نیوەی ماڵەکەی بە تالان دەچێ.

لە چوار ساڵەکەی دوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، ئەبوو سەباح وێنەگری رۆژنامەی (التاخي- برایەتی) بووە، وێنەکانی ئەبوو سەباح و ئەرشیفەکەی هەمیشە لە خزمەتی رۆژنامەنووسانی کورد و عەرەبدا بووە، ئەو گلەیی لە زۆربەی رۆژنامەنووسان دەکات، کە لە کاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵ و باس و بابەت و ریپۆرتاژەکانیان، وێنەکانی بڵاودەکەنەوە، بەڵام ناوەکەی فەرامۆش دەکەن، هەر لەو بارەیەوە ستایشی هەندێ رۆژنامەنووسیش دەکات، کە لەگەڵ بڵاوکردنەوەی هەر وێنەیەکی ئەو، ناوەکەشی لەبیر ناکەن.

زۆر رۆژنامەنووس یادگاری خۆش خۆشیان لەگەڵ ئەبوو سەباح دا هەیە، بەڵام کەمیان وەک حەسەن ئەلعانی رۆژنامەنووسی عیراقی ناوی دێنێ و ئەمەکی لە ئاستدا دەنوێنێ.

### ساڵانی شۆڕش و ئاوارەبوون لە ئێراندا

لە ساڵی ١٩٧٤ دا کاتێک حکومەتی عیراق لە بەندەکانی رێککەوتننامەی (١١)ی ئادار پاشگەز بووەوە، پشتی لەوە کرد، کە مافی خەڵکی کوردستان و نەتەوەکانی تر بدات، کڵپەی ئاگری شۆڕش لە هەموو دەروونێکدا تاوی سەند، سەرجەم چین و توێژەکانی گەلی کوردستان بێ تەکلیف و خۆڕسکانە، هەر لە کرێکارو جووتیارو بگرە تا دەگەیشتە وەزیر، وەک ئەوەی لە ریفراندۆمێکدا بن، پەیمان و بەڵێن شکێنێکی حکومەتی عیراقیان رەت کردەوە و چوونە ریزی شۆڕشەوە.

ئەبووسەباحی پیری وێنەگرانی هەولێریش لەم دەنگدان و ریفراندۆمە دوانەکەوت، چووە ریزی شۆڕش و لە ئەمینداریتی رۆشنبیری شۆڕشدا بە وێنەگر لە چۆمان دامەزرا، هەر لەوێشدا (ستۆدیۆ سەباح) دەکاتەوە، بە سەدان وێنەی پێشمەرگەو فەرماندەو بەرپرسانی شۆڕشی گرتووە، بە تایبەتی لە دەم رووباری چۆماندا.

ئەبوو سەباح لەم بارەیەوە دەڵێ: دەمنارد لە ئێرانەوە کەرەستەو پێداویستی وێنەگرتنم بۆ بێت، هەندێ جار خۆشم دەچووم و ئەوەی پێویست بایە دەمهێنا، ستۆدیۆ سەباح و لابوورێکم لە چۆمان دانا، سەدان وێنەی پێشمەرگەو بەرپرسانی عەسکەری و سیاسیم گرتووە، دیمەنی جۆراوجۆری گەلاڵەو شوێنانی دیکەشم لەو ساڵەدا زۆر دەگرت، کە شۆڕش نسکۆی هێنا، بارگەو هەوارم تێکناو بەرەو ئێران و دنیای ئاوارەیی چووم.

ئەبوو سەباح لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ستۆدیۆو ئەرشیفەکەی چۆمانیشم تالان کرا، بە تایبەتی لەو کاتەدا من لە مۆڵەتدا بووم و لە ئێران بووم، تا ڕۆژی ١٩٧٦/١٢/٢٠ پەنابەرێک بووم لە ئۆردوگای زێوە، دوای ناونووس کردنێک لە (مەڵبەندی وێنەگرانی هەواڵدەری فارس)، کە بە فارسی پێیان دەگوت: " مرکز خبرنگاران عکاس فارس" بە وێنەگر دامەزرام، ئەو بنکە ڕۆژنامەنووسییە لەشاری شیرازدا بوو- بۆ ئاگاداری تا ئێستاو دوای بەسەرچوونی (٢٥) ساڵ، ئەبوو سەباح کارتی ئەو بنکەیەی هەر لە لایەو ونی نەکردووە-، ئەو بنکەیە هەر وەک ئەبوو سەباح دەڵێ- (٦٤٢) وێنەگرو (٤٥) ئامێری چاپ کردنی وێنەی لێ بوو، لەوێدا پێشوازی لە شاندو میوانی بیانی دەکرا، وێنەو هەواڵیان ڕەوانەی تاران و ڕۆژنامەکانی دەکرا.

### گەڕانەوەیەک بۆ سەباح و ساڵانی پەنجا

هەر وەک پیری وێنەگرانی شار دەیگێڕێتەوە، لە ساڵانی پەنجاو شەستی سەدەی ڕابردوودا، خەڵکی کوردستان و تێکڕای عێراقیش، زۆر بە سادەیی، بەڵام بە ئاسوودەیی دەژیان، مرۆڤ ڕێزی لە مرۆڤ دەگرت و داب و نەریتە ڕەسەنەکانی دنیای کوردەواری و کۆمەڵگای کوردستان، میکانیزمێکی پڕ لە سۆزو



سەباحی هونەرمەندو ئەبوو سەباحی وێنەگر

خۆشەویستیی ساز کردبوو لە نێوان تێکڕای خەڵکدا.

بە یادەوەری یادگارەکانی ئەبوو سەباح دا شۆڕ دەبینەوەو یەک دوو گەوهەری یەکدانەی لێ دەخەینە ڕوو... ئەو بۆمان دێتە ئاخاوتن:... لە ساڵی ١٩٥٤دا ڕێوڕەسمی تاج لەسەر نانی مەلیک فەیسەڵی دووەم بوو، هەرچیم لە ماڵدا بوو فرۆشتم و گوێم بەوەش نەدا، کە (موتەخەلیف)ی عەسکەری بووم، بۆ ئاهەنگی تاج لەسەرنانی مەلیک فەیسەڵی دووەم، (سەباح)ی هونەرمەند بانگهێشت کرابوو، ئاهەنگەکە لە هوتێلی (سلێکت) بوو، کە هوتێلێکی زۆر گەورەو خۆش بوو. بە کامی دڵی خۆم گەیشتم و ئاهەنگەکەی سەباحم بینی، بەڵام ماڵ و سامانی خۆم لەسەر داناو ساڵێک و (٧) مانگ عەسکەریی زیادەشیان پێکردم! ئاهەقیشم مەگرن... دەنگ و ڕەنگی سەباحم پێ خۆش بوو، چەشنی تیشکێکی سیحراوی هەمیشە لە دڵمدا پرتەو دەدات، کێ حەدی هەبوو ناوی بێنێ...! بە خودا هەزارو یەک شەڕم لەسەر کردووەو دەیان جار شەق و تێهەڵدانم لەسەر ئەو خواردووە.

هەر لە پەنجاکاندا من و محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، دەهۆڵ ئەنگێوی ڕەمەزان بووین، ماڵی حاجی شەریفی زێڕینگەر لە قەلا بوو، هەموو شەوێک یەک کیلۆ بادەملیی بۆ دادەنایین و لە کورەکەیمان وەردەگرت، بۆ کاتی بەربانگ و ڕۆژ و شکاندن، لە سەر قەڵاوە ئیشارەتیان دەداینێ و لەگەڵ فەتاح حەمەدی قاچاغچی، کە ماڵەکەی لەکن بەنزینخانەی ئێستای ناو شار (بەنزینخانەی یەکگرتن) بوو، تۆپی ڕەمەزانمان دەتەقاند.

### گەڕانەوە بۆ هەولێر

پاش دوو ساڵ ئاوارەیی، ئەبوو سەباح لە ١٩٧٧ دا دەگەڕێتەوە هەولێر، هەڵبەت نە ستۆدیۆ ماوەو نە ئەرشیف، ماوەیەک بێ کار دەبێت، مۆڵەتی وێنەگریی نەدرایە، پاش (٦) مانگ لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر بە کارمەند دادەمەزرێت، تا ئێستاش لە هەمان دەزگا (ناوی ئێستای بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری هەولێرە) کارمەندو پسپۆڕی مۆڵەتدانی وێنە گرتنە.

دوای ئەوەی دوو جار ستۆدیۆ

ئەرشیفەکەی لەبەین دەچێت، ئەبوو سەباح پشت لە پیشەکەی ناکات، بەڵام لێشی سارد دەبێتەوە، ژێر بە ژێر درێژە بە کاری کوردایەتی دەدات، هاوکات درێژە بە ئاکاری مرۆڤدۆستانەی خۆشی دەدات، جار بە جار وەک وێنەگرێکی گەڕۆک و عەوداڵ و ئارەزووخواز، کامێرا دەگرێتە شان و لەم شوێن و لەو شوێن، لەم بۆنەو لەو یادەوەرییەدا بەشدار دەبێت.

هەڵوێستەکانی ئەبوو سەباح، سەدان جار کۆڕو دانیشتن و مەجلیسی نقومی خەندەو پێکەنین کردووە، بە تایبەتی لە هەڵوێستەکانی داکۆکی کردن لە سەباحی هونەرمەندو ناوبانگی، وەک خۆی دەڵێ دەیان جار شەڕو ئاژاوەو گێچەڵی لەسەرسەباحی شۆخ و شەنگ ناوەتەوە.

ئەمجارەیان ئەبوو سەباح بەسەرهاتێکی دوور لە سەباحمان بۆ دەگێڕێتەوە: "نەورۆزی ١٩٧٨ لە بەستۆڕە خەریکی وێنە گرتن بووم، وێنەی خێزان و خانەوادەکانی خەڵکی شارم دەگرت، هەردوو گیرفانم پڕ بوو لە فیلم، کە چوومەوە ماڵێ تەماشا دەکەم فیلمێک دیار نییە، یەکێ لە گیرفانەکانم کونێکی تێدا بوو، گەلێ تووڕەو گەرم بووم، گەلێ هاوارو هەرام بەسەر خێزانەکەمدا کردو رانک و چۆغەڵەکەم هەڵا هەڵا کردو گوتم ئێوە خەم ساردن، تووشی شەرمەزاریم دەکەن لەگەڵ ئەو خەڵکە.

هێندەی نەبرد فیلمەکەم لە نێو گۆڕەوییەکەمدا دۆزییەوەو دامە پڕمەی پێکەنین، گوتیان: ها چییە وا کەوتوویە پێکەنین پاش ئەو تووڕە بوونە؟! گوتم حاڵ و مەسەلە ئەوەیە".

لە ساڵی ١٩٦٣- ١٩٦٤ مامۆستا جەمالی برای مامۆستا کەمال دەچووە بەغدا، گوتی: چیتان بۆ بێنم؟ کەمال گوتی: کامێرایەکی باش بۆ ئەبوو سەباح بێنە... ئەوە بوو کامێرایەکی (لۆردومات)ی ئەڵمانیی بۆم هێنا بە (١٢٠) دینار، کە پارەیەکی یەکجار زۆر بوو.. لە مەیدانی تۆپێن وێنەم دەگرت و پلیتیشم دەفرۆشت، من لایەنگری یانەی سەلاحەدین بووم، کە لەگەڵ یانەی هەولێر ململانێیان بوو... گەمەی سەر کاس (جام) بوو، رەسووڵ ریکلامبێژی سینەما سەلاحەدین و لایەنگری یانەی هەولێر بوو، گوتی بیبەینەوە تا سبەینێ ئارەق لە نێو جامەکەدا دەخۆمەوە، منیش گوتم گەر بیبەینەوە ئەم شەو تا بەیانی شەربەتی تێدا دەخۆینەوە، حوسێ عەلی گۆڵچیی یانەی سەلاحەدین بوو، ئۆغز گۆلچیی یانەی هەولێر بوو، جەماوەر هەموو لەگەڵ یانەی هەولێر بوو، کەس چەپڵەی بۆ یانەی سەلاحەدین لێنەدەدا، هەر دوو تیپەکە هەر بە یەکسان مانەوە، بە لێدانی پەناڵتی یارییەکە کۆتایی هات.

حوسێن عەلی پەناڵتییەکەی گرتەوە، لە خۆشییان شاگەشکە بووم، لە مەیدانی یاری عاسێ بووم، گوتم نایەمە دەرێ تا ترومبێلێک نەهێنن و وێنەیەکی گەورەی سەباحی لەسەر دانەنێم، ئەوە بوو بە هەموو شاردا دەسووڕاینەوەو هاوارمان دەکرد:

کێ بردییەوە؟ مەندووب مەردان

کێ دۆڕاندی؟ سابیر حەننا

بەم جۆرە تا بەیانی بە هاوارو خۆشی و بە وێنەی سەباحەوە، بە دەم چەپڵەرێزانەوە بە کووچەو کۆڵانەکانی شاردا سووڕاینەوە.

لە ئەبوو سەباحمان پرسی: دوا قسەت؟

**(سەرنج)**

لە کاتێکدا گۆڤاری (پارش) لە چاپدا بوو، زۆر بە داخەوە بەرد بەیانی ٢٩/ ١/ ٢٠٠١ دڵە گەورەکەی (ئەبوو سەباح) لە کوتان وەستاو بۆ یەکجارەکی ماڵئاوایی لە ئێمە و ژیان و گشت خۆشەویستانی کرد، هەرچەندە زۆر پەرۆشی ئەوە بوو ئەم دیمانەیە ببینێ، ئێمە لە دڵەوە پرسەو سەرەخۆشیمان بۆ هەموو لایەک رادەگەیەنین، ئومێد دەکەین (ئەبوو سەباح)ی خوالێخۆشبوو جێی بەهەشتی بەرین بێت، ژمارە (٣)ی گۆڤاری (پارش)یش بەوە شەرافەتمەندە، کە دوایین دیمانەی لەگەڵ ئەو زاتە پاک و بە ئەمەکەو بەهەشتییەی هەولێر سازداوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (پارش) ژمارە (٣) بڵاوبۆتەوە.**

# سابیر خدر بەحرکەیی

**بایز عەباس**

ئەم هونەرمەندە میللییە ناوی (سابیر خدر محەمەد)ە، لە ساڵی ١٩٣٦ لە گوندی بەحرکەی بەرانەتی سەر بە شاری هەولێر لە دایک بووە، لە عەشیرەتی گەردییە، باب و باپیری خەڵکی (بەحرکە)یە، بە (سابیر خدر بەحرکەیی) ناسراوە، ئەم شایەرە هونەرمەندە میللییە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندە، زۆر لاوک و بەستە و گۆرانی فۆلکلۆری شایی و هەڵپەڕکێ دەزانێت، وەکو گۆرانی: ساوار کوتان- دروێنە- بێرەبا- مەشکە هەژاندن- گۆرانی شایی و هەڵپەڕکێ. راستە ئەم هونەرمەندە خوێندەواری نییە، بەڵام لە دانانی شیعری میللی بە توانایە و شیعری میللی داناوە، لە تەمەنی لاویدا زۆر دڵتەڕ و بەزەوق بووە، زۆر شایی رەشبەڵەکی کردووە و گۆرانی گوتووە، یادگاری بیرەوەری هەیە لەگەڵ هونەرمەندی میللی خوالێخۆشبوو (محەمەد گۆران)ی گردەچاڵ، پێکەوە لە شایی و بووکگواستنەوە و مەجلیس و دانیشتنی خزم و برادەران لە شاری هەولێر و گوندەکانی (بەحرکە-جمژنیکان-شەوزار) دانیشتوون و بەدوو قۆڵی گۆرانییان گوتووە، بێگومان لە گوندی (بەحرکە)ی بەرانەتی جاران لاوک بێژ و شایەری میللی هەبوون. (سابیر خدر بەحرکەیی) بۆ فێربوونی گۆرانی فۆلکلۆری سوودی لێیان وەرگرتووە. لە لاوک بێژەکانی گوندی (بەحرکە) ئەوانیش (مام مەولود عەلە) و (عەلی خارندی) فێربووە، هەروەها گۆرانی دروێنە لە (عەولا ماجیدی) فێربووە، کە خەڵکی گوندی (ماجیدی) بووە، کە منداڵ بووە ژیانی خەڵکی (بەحرکە) سادە و ساکاربووە. ژنانی ئاوایی لە کاتی (مەشکە هەژاندن- دەستاڕهاڕین-لانک هەژاندن) بەدەنگ و ئاوازی رەسەنی کوردەواری گۆرانی فۆلکلۆرییان گوتووە، ئەویش گوێی لێ راگرتوونە و لەبەری کردوون، بۆ بژێوی ژیانی خێزانەکەی دروێنە و جووتیاری و سەپانی کردووە. سەبارەت بە ژیان و هاتوچۆی جارانی خەڵکی (بەحرکە) دەڵێ: جاران خەڵک فەقیر بووە ئەو هەموو ئۆتۆمبیلە لە گوند نەبوو، تەنها ئۆتۆمبیلی (پەست)ی حەسۆی هەبوو کە برای (حاجی ساڵح لەک) بوو، (پەستی حەسۆی) دار بوو خەڵک بە (٢) درهەم سوار دەبوون دەچوونە هەولێر، (سابیر خدر بەحرکەیی) بە بانگدەر لە مزگەوتی گوندی (بەحرکە) دامەزراوە. لە مزگەوت بانگدەدات، بەڵام ئێستا خانەنشین کراوە، مەلایەکانی ئایینی پێیان گوتووە ئەگەر ئەتوو لە مەدرەسەیەکی فەقێیان بچووبایە بەرخوێندن، دەبووی بە عەولەمەکی گەورە، ئەویش بە مەلای گوتووە بە خودای مامۆستا چونکە ئەو گۆرانی گوتنە ئیشی شەیتانییە، هیچ خێری تێدانییە من ئەوەندە زیرەکم، ئەگەر لۆ مەلایەتی بایە قەت ئەوها زیرەک نەدەبووم، لە ساڵی ١٩٥٥ لە زەمانی مەلیکی لە (مرکز تدریب) لە باروتخانەی رەشکێن لە هەولێر بووە بە سەرباز، لە ساڵی ١٩٥٨ سەردانی رادیۆی کوردی بەغدا دەکات و دەچێتە لای (شەماڵ سائیب). حەیرانێکی بۆ دەڵێت. (شەمای سائیب) پێی گوتووە

جارێکی دیکە سەردانمان بکە ناوت دەنووسین پاشان (سابیر خدر بەحرکەیی) دێتەوە بۆ گوندی (بەحرکە)، پرس بە مەلا دەکات، مەلا پێی دەڵێ ئەوە معاشەکەی حەرامە دەبێ لەگەڵ ژنی ئەملۆدە دابنیشی و درۆیان بکەی، بۆیە (مام سابیر خدر بەحرکەیی) نەچووە بۆ رادیۆی کوردی بەغدا. لە ساڵی ١٩٥٥ لە چایخانەی (حاجی ئەکرەم) لە شاری هەولێر لە کۆڵانی (مزگەوتی ئاڵتی بەرماق) گۆرانی تۆمار کردووە، سەبارەت بە ( حەسەن زیرەک) گێڕایەوە و گوتی: وەختی خۆی (حەسەن زیرەک) هاتووە بۆ گوندی (بەحرکە) لە دیوەخانی (بایز ئاغا گەردی) گۆرانی چارۆگە و قاسپەی کەوی گوتووە پاشان گوتی: سەیدە کۆرەی گردجووتیار حەیرانبێژ و زورناژەن بوو، دەنگێکی خۆش و بەرزی هەبوو، کۆرە بوو هەردوو چاوەکانی رژابوون، زۆریش بەزەیی بوو حەیرانی دەگوت. (عەزیز نادر)ی خەڵکی گوندی (شێخەشەل) حەیرانی (سەیدە کۆرە)ی دەگوتەوە، هەروەها (عەزیزی حەمۆکی) لە گوندی (بەحرکە)ی حەیرانی دەگوتەوە، سەبارەت بە جۆر و شایی هەڵپەرکێ لە گوندی (بەحرکە) دەڵێت: لەلای ئێمە (٥) پێنج جۆرە شایی هەیە وەکو شایی (شێخانی- سێ پێیی- چۆپەیی- هەڵپەڕین- سووسکەیی)، ئەمەش هەندێک لە گۆرانی و شیعرە میللییەکانی: سابیر خدر بەحرکەیی و هۆنراوەی میللی، لە چاوپێکەوتنێکدا مامۆستا وریا ئەحمەد میوانی (سابیر خدر بەحرکەیی) بووە ئەو هۆنراوە میللییەی پێشکەش کردووە و دەڵێ:

**هاتم لەلای ئەولایە**
**بارەکم شەکر و چایە**
**خەرمانم لەبەر بایە**
**سینگم کاروان سەرایە**
**کەیفی گۆتنێم هەستایە**
**هەتا بەندەکی دەرێم**
**سەتی دی راوەستایە**
**ئەو بەندەش پێشکەش دەکەم**
**لەبۆ کاکە (وریا)یە**
**بۆ ئێزگەی کوردی**
**بۆ ئێزگەی کوردی نامە دەنێرم**
**هونەرمەندەکان بە خوا دەسپێرم**
**خەرکی بەحرکەیە و لیوای هەولێرم**

**خاوەن شەش بزن و دوو پیرە چێرم**
**هاوین و زستان لە ماستی تێرم**
**بەرامبەر دوژمن وەک بەچکە شێرم**
**ناو و نیشان و هۆدەکەم دیار**
**باوکم فەلاحە و بەخۆم کرێکار**
**لەو ئیشی وەها زۆر بووێە بە حەمبار**
**غەرگەم لەبەردا هەر چار فەسڵی سار**
**هەر لە سبیانێ هەتاکو هێوار**
**لە شار لە لادێ، لە لادێ بۆ شار**
**تشتێ هەردەگرم بەکوڵ و بە بار**
**بە فلس فلس تا دەبێتە هەزار**
**وەکە بووە هەزار دەبێتە یێک دینار**
**خاوەن دینارم پێم مەرێن هەژار**
**سابیر خدرم لێبیێن دیار**
**سەلام بە قەتار، دوعاش بە رووبار**
**پێشکێشت دەکەم ئەی برای نازدار**

جارێکیان خەڵکی بەحرکەیی پێیان گوتووە ئەتوو بۆچی باسی سفوور و ئەملۆدە ناکەی ئەویش ئەم هۆنراوە میللییەی بۆ ژنە ئەملۆدان گوتووە:

**گەورە و بچووک ئەما دنیا بووە نەفسی نەفسی**
**عالەم گەلەک مەغروور بووە لەبەر پراو و قەیسی**
**لاق داوێنە سەرلاقی لەسەر قەنەفە و کورسی**
**کراسی بە باغەر نمایە هەموویان کردیتە مەکسی**
**سەفەری خاریج دەکەن بێ ئەمری خزم و کەسی**
**لەناو حەوشەی دەگەرێن بەسەر کۆتی و بێ خواسی**
**دەچنە مارە جیرانان دەرێن راوەستە تەکسی**
**لەسەر شەقام و جادان فرِدەکەن کۆکە و بیبسی**
**هەندی بخۆن و بنوون کەتینە تەنگە نەفەسی**
**وەکی لێویان سۆردەکەن دەرۆن بە رەزا قورسی**

(سابیر خدر بەحرکەیی) و گۆرانی فۆلکلۆری: گۆرانی شایی و هەڵپەرکێ لەگەڵ (محەمەد گۆران) پێکەوە گوتوویانە:

**یار غەزال عەمرم غەزال**
**چار غەزالم دیتییە**
**ناوێ خۆتم پێ بڕێ**
**ئیسمی شەریفت چییە**

ناوێ خۆی پێ نەگۆتم
بلبلی شای پەرییە
قورینگ هاتنە گفتوگۆ
ناوێ یارم ستییە
بسکی خەیاتی خاوە
بستەک لە خوار مەمکییە
لە مەکتەبێ دەخوێنێ
سەفی سێی سانەوییە
هەموو سارێ ئێکەمە
سارەکی ساقیت نییە
ئەو مەحێ ئەمن دەیکەم
هێ برام هەمووی کوردییە
ئەوی خوا لێی گۆڕبی
لەکنی وایە تورکییە

***

لەسەر دزوێ قورعانان
نووسرایە ئەلف و کافە
شوانان مەڕ لێخوڕی
جامی هەردەگرت سافە
تاخمی کیژان وەدیارکەت
تێیدا بەگزادەی جافە
هەربەندەکی من دەیرێم
دەرێی تێل و غورافە
بابێ یارم دەکوژم
گەوادەی وەک شەوافە
عالەم وازن لێ نایێنی
ماشەڵا بێ ئینسافە
لەسەر دزوێ زەبوری
شوانان مەڕ لێخوڕی
جامی هەرگرت خاتوونێ
سەر بێری خۆیان دانا
لەوبن دارێ زەیتوونێ
یا دەرماناوێ شێخان
چارشەمان کیژ دەچوونێ
تازەی چاوێ خۆ شوشتییە
بە گوراو و بە سابوونێ
ماچی دوونێ هێوارێ

ئێستا دیارە جێی شوونێ
دەگەڕێ لەناو مارێ
لێ دەداتن قانوونێ
دەست و پەنجەی چەند رێکە
دەگەر جغارەی سەمسوونێ
پیرە سەفین برندە
بەرامبەری وتێلێ
بەژنی گەلەک برندە
بە میسالی دار تێلێ
قەولە یارم مێردی بکا
ترسێکەم بەجێیم بێلێ
ئێقەی کراسێ خۆ دەدروو
جێیێ چار پەنجان دێلێ
دیسان سەفین برندە
کلکەی وا لە حوجرانێ
بەژنێ باریک وارۆیی
گەلەک بە خان و مانی
قۆندەرەکەی تەلەفۆن
دەیکرد بەسەر پەنجانی
ناواغنێ قۆندەرەی
ئارمووشی هیندستانێ
چاوێ وەستای کۆرەبی
دەگەر دەرزی و دورمانی
ئەوی دەرێ شایێرم
با ئەو بەندەی بزانی
وەک عەلی بەردەشانی
بەڕۆژ دەبە خانەخوێ
بەشەو دەبە مێوانێ

سابیر خدر بەحرکەیی و گۆرانی ساوار کوتان:

یاڵڵا یائەڵڵا- یاڵڵا یائەڵڵلا
مارێ تەنکەی لەقەد گردی
جەڕەی پڕ کرد داینا عەردی
داکی گەییێ بەنامەردی
گۆتی کێ بوو ماچی کردی
گۆتی دایە خەتام نەبوو
بەپێش مارياندا رابردم
ئەو هێتیمە گازی کردم

جەرەم خوار بوو لۆی ڕاست کردم
دەستی ڕاستەی دەملی کردم
بەو دەستێ دیش مەمکی گرتم
بەزۆرداری ماچی کردم
گوتی کیژێ چەند عەیاری
درت تەرە وەک خەیاری
کیژ ماچ ناکرێ بەزۆرداری
درۆی دەکەی وەک سەگساری
گوتی دایە ئەوها نابم
تو و شیش بە من کەبابم
ئەتوو کووبووی لەگەڵ بابم
لەگەر بابت جاروبار بووم
لەبۆ کوڕان تەبەرا بووم
گوتی دایە مەمکە لۆمە
ئەو هێتیمە جەرگی خۆمە
بە خوای کیژێ ناتکەم لۆمە
سەرم سپییە پشتم کۆمە
ئەو ئیشانە لەمەڕ خۆمە

* * *

سابیر خدر بەحرکەیی و گۆرانی دروێنە، کاتی خۆی ئەم گۆرانییەی دروێنەی لە (عەولای ماجیدی) فێربووە:

باریکێ ڕەنگ لیمۆیی
ئاگرت بەردایتە ماران
چاوێ تۆم گەلاوێژە
هەردێ لەناو گەواران
ئەوسار لۆخۆت دەخوازم
چیدیکە مەکە خەیاران
کچێ وەختی دەچیە پەرێزی
شیرین هەردەگری سواران
دەنا هەمبێزت گەورە مەکە
ماندیەبی لەدوای یاران
مەمکێ یارم گووزاینە
ئەمن ژوانێ دەگەر یارێم گرت
لۆم بێتە جێگەی جاران
دەنا ناوێرم ناوی بینم
لەبەر چەغل و بەدکاران

* * *

یارم دەچیتە مەڕ دۆشینێ:

یارم دەچیتە مەڕ دۆشینێ
بە هەنجەتی کار مژینێ
بەرخی ساوای لۆ دەژمێرم
لەسەر ڕێگای خۆم دەنوێنم
یارەکەم دێتن دەیگەوزێنم
یان شیرەکەی لێ دەڕژێنم
یان دوو ماچی لێ دەستێنم
کەرەک وانان هەمووان گازکەن
سەریان کۆت کەن پێیان خواس کەن
چاو بەرەکێم لۆ دەربازکەن
ئەمان سی یێ دەغیل سی یێ
عەیشێ و فاتێ و بەگیسی یێ
هەرسێک دەڕۆن لۆ خۆشیێ
بەجێم دێلن لە تاری یێ
خۆش دێ دەنگی لایە لایێ
دەبنوو بنوو کوڕیەی دایێ
چبکەم کوڕیەم خەوت نایێ
دەبنوو بنوو هەی کتووپڕبی
ڕەبی ڕۆژە سەر در خڕبی

* * *

* ئەم گۆرانییە فۆلکلۆرییە لە شایی و هەڵپەڕکێی (سێ پێیی) لەسەر مەقامی بەیات دەگوترێ لە کاسێت وەرمگرتووە.

سەرچاوەکان:

١- ڕۆژی ٢٠٠٥/١٢/١٢ لە گوندی بەحرکە میوانی هونەرمەند (سابیر خدر بەحرکەیی) بووم گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی دروێنە و ساوارکوتان و هەموو شیعرە میللییەکان و لەگەڵ ژیاننامەی لەزاری هونەرمەندە وەرگرتووە و لەسەر کاسێت تۆمارم کردوونە.

٢- گۆرانی فۆلکلۆری (لەسەر دزوێ قورعانان). کە گۆرانی شایی و هەڵپەڕکێیە لە کاسێتێکی کۆنی هونەرمەندم وەرگرتووە. کە ماوەی (٣٠) ساڵ زیاترە تۆماری کردووە، ئەو کاسێتە لە تۆمارگای عەبدوڵڵا برادۆست هەیە.

# ئەسکەندەر عوسمان جامباز
# ١٩٣٨-١٩٩٤

**کەریم شارەزا**



وێنەکێشی هونەرمەندی لێهاتووی شاری هەولێری مێژوویی، مامۆستا ئەسکەندەر عوسمان جامباز لەساڵی ١٩٣٨دا لەهەولێر لەدایک بووەو چاوی بەدیمەنەکانی قەڵای مێژوویی و منارەی چۆلی و دەشت و دەری شارە خۆشەویستەکەی کراوەتەوەو لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەرو کاسبکاری جامباز پێگەییوە.

خوێندنی سەرەتایی لەساڵی ١٩٤٥دا لەقوتابخانەی ئیبن خەلەکانی کوڕان دەست پێکردووە و هەموو پۆلەکانی ئەو قۆناغەی خوێندنی بەزیرەکی بڕیوەو لە تاقیکردنەوەی وەزاری دەرچووەو بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی چووەتە قوتابخانەی ناوەندیی کۆماری و لە ساڵی ١٩٥٨دا خوێندنی ئەم قۆناغەشی تەواوکردووە. لە پایزی هەمان ساڵدا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە هەولێر وەرگیراوە و لەسەر دەستی هونەرمەندی شێوەکاریی مامۆستا "جەواد ڕەسووڵ ناجی" بەچاکی دەست و بازووی لە هونەری شێوەکاریی بەهێز بووە و لەساڵی ١٩٦١دا خوێندنی تەواوکردووە و هەر ئەو ساڵە لەقوتابخانەی سەرەتایی (گوندی سیاوە) دامەزراوە. بەڵام چونکە مامۆستایەکی وێنەکێشی بەهرەدار بووە، بۆیە بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٦٢-١٩٦٣دا دەگوێزرێتەوە بۆ ناو شاری هەولێرو لەقوتابخانەی هەولێری سەرەتایی نموونەیی، دەکرێ بەمامۆستای وانەکانی شێوەکاریی لە پۆلەکانی ئەو قوتابخانەیەدا.

لەسەرەتای ساڵانی نەوەتەکانی سەدەی ڕابردووەوە مامۆستا ئەسکەندەر هەستی بە نەخۆشییەکی خراپ کردو ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو هیچ چارەسەرییەک دادی نەدا تاکو لەڕۆژی ١٨/٨/١٩٩٤دا لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردو هەموو هونەرمەندانی شارەکە لە ڕێوڕەسمی ناشتنی تەرمەکەی بەشدارییان کرد.

هەرچەندە مامۆستا ئەسکەندەر بەرواڵەت لەبەر چاومان ون بوو، بەڵام تابلۆو کەڤالەکانی لەبەر چاومان ون نابن و شوێنی هونەریی لەناو بنەماڵەکەیاندا بەچۆڵی نەماوەتەوە، چونکە کچێک و کوڕێکی وەکو باوکیان بەهرەی هونەری وێنەکێشان و شێوەکارییان هەیەو نەیان هێشتووە کاروانی هونەریی وێنەکێشان لە بنەماڵەکەیاندا بپسێتەوە و بووەستێ.

**مامۆستا ئەسکەندەر عوسمان و ژیانی هونەریی:**

مامۆستا ئەسکەندەر عوسمان لەسەردەمی خوێندنی سەرەتاییەوە بەهرەی وێنەکێشانی لێ بەدی کراوە، لە سەرەتادا لاسایی وێنەکێشە هونەرمەندەکانی هەولێری وەک مامۆستایان دانیال قەساب و جەواد رەسووڵ ناجی کردۆتەوە. بەڵام کە گەیشتۆتە قۆناغی خوێندنی خانەی مامۆستایان، سوودی زۆری لە ئامۆژگاری و رێنماییەکانی مامۆستای بەهرەداری شێوەکاریی جەواد رەسووڵ ناجی وەرگرتووە و هونەرەکەی پتر گەشەی کردووە و هەوڵی داوە رێبازێکی تایبەتی بگرێ و روو بکاتە دیمەنە رەسەنەکانی ژیانی کوردەواری. بەتایبەتی ژیانی کۆچەری و لادێ نشینی و ئاژەڵداریی. چونکە بنەماڵەکەی جامباز بووە و تێکەڵاویی پەیوەندیی بەخەڵکی لادێ و کۆچەرییەوە هەبووە و خەریکی کڕین و فرۆشتنی وڵاغ بووە، بۆیە ئەو لایەنەی لە تابلۆکانی زاڵە و لەهونەری وێنەکێشانی پۆرترێتیش گەلێک دەست ڕۆیشتوو بووە.

یەکەمین تابلۆی مامۆستا ئەسکەندەر بەناوی (ژنە بۆڵی) بووە. ئینجا تابلۆ نایابەکانی (مانگا دۆشین) و (ژنە دۆم). ئەگەر بمانەوێ هەندێک لەتابلۆ هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە بەهرەدارەوە بدوێین، ئەوا دەبێ ئەم راستییانە بڵێین، کە لەماوەی ژیانی ٥٦ ساڵیدا ٣٠٠ تابلۆی نایابی کێشاوەو جگە لەمانەش مەرگی ناوەختی ماوەی نەداوە ١٦ تابلۆی بەردەستی تەواو بکات، ئەو هونەرمەندە بەهرەدارە لەساڵی ١٩٦٢دا لەیەکەم پێشانگای هونەریی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر بەچەند تابلۆیەک بەشداری کردووەو لەناو هەمووان تابلۆی (ژنە بۆڵی) سەرنجی تەماشاکارانی پێشانگاکەی راکێشاوەو هونەرناسان و رەخنەگران بەتابلۆیەکی نایاب و سەرکەوتوویان داناوەو لەپێشانگاکانی پەروەردەی هەولێر لە ساڵانی ١٩٦٥ و ١٩٦٦ و ١٩٦٧ و ١٩٦٨دا بەتابلۆی تازەو سەرنجڕاکێش بەشداری کردووەو لە ساڵانی ١٩٨٢ و ١٩٨٣شدا بەشداری لەپێشانگای ڤیستیڤاڵی رۆشنبیری کوردی لەهۆڵی میدیا لەشاری هەولێردا کردووەو هونەر پەروەران بەوێنە کێشێکی ریالیستی مەزنیان داناوە. لەو پێشانگایانەدا گەلێک تابلۆی مامۆستا ئەسکەندەر پەسەند کراون و وەک نموونەی تابلۆی کوردی برداروان بۆ دەرەوەی کوردستان و عێراق. لەوانە ئێستاکە ٣ تابلۆی لە ئیتاڵیاو ٢شی لە وڵاتی سوێدە، چەند تابلۆیەکیشی لە وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندنی عێراق لە شاری بەغداو چەندانی دیکەشی بوونەتە موڵکی هونەردۆستانی کورد لە هەولێر و سلێمانی و کەرکووک و شارەکانی دیکەی کوردستاندا.

# ئەنوەر تاهیر مام خدر
# ١٩٤١-١٩٩٦

کەریم شارەزا

مۆسیقازانی قانوون ژەن و گۆرانی بێژی لێهاتوو و مۆنۆلۆژستی هونەرمەندی کورد ئەنوەر تاهیر مام خدر، لەساڵی ١٩٤١دا لەگەڕەکی قەڵاتی شاری کۆیە، شاری ئەدەب و هونەری کوردی چاوی بەژیانی هەڵێناوەو لە بنەماڵەیەکی ناسراوی ئەو شارە مێژووییەی کۆیە، بنەماڵەی (ساڵحی) سەری هەڵداوەو خوێندنی سەرەتایی لەساڵی ١٩٤٧دا لەقوتابخانەی زانستی کۆیە دەست پێکردووەو خوێندنی قۆناغی ناوەندیشی هەر لەشارەکەی خۆی بووەو لەساڵی ١٩٥٩دا، بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووەو چووەتە بەغداو لەپەیمانگای هونەرە جوانەکان وەرگیراوەو لەبەشی مۆسیقا، ئامێری (قانوون)ی خوێندووە.

کە خوێندنی ئەو پەیمانگایەی تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٦٢دا لەشاری کەرکوک لەقوتابخانەی ئیمام قاسم دامەزراوەو بووەتە مامۆستای هونەری مۆسیقاو سروودی نیشتمانی.

دوای چوار ساڵ خزمەتکردنی نەوەی نوێی کورد، لەو پارێزگایە گوێزراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێرو لەسەر داوای خۆی ناردراوە بۆ قوتابخانەکانی شاری کۆیە بۆ گوتنەوەی وانەی سروودو مۆسیقاو تا دوا ڕۆژی ژیانی کە لە ١٤/١/١٩٩٦دا کۆتایی هات و چووە دنیای نەمرانی هونەری کوردییەوە، خزمەتێکی زۆری مۆسیقاو ئاوازی کوردی کرد.

**ژیانی هونەریی ئەنوەر تاهیر:**

ژیانی هونەری مامۆستا ئەنوەر تاهیر لەساڵی (١٩٥٧)ەوە دەست پێدەکات، لەو کاتەی کە ئەندامێکی دەنگخۆشی کۆرسی تیپی باواجی سەر بە دواناوەندیی کۆیە بووە، بەسەرۆکایەتی مامۆستا باکووری مۆسیقازان و گۆرانی بێژ، لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکانیش لە شاری کۆیە لەبەهاری ١٩٥٨دا هەمان دەوری چالاکی لەکۆرسدا بینی و لەسەر دەستی مامۆستا باکووری مامۆستای سەرۆکی کۆمەڵە کە فێری سەرەتایەکی باش بوو لەهونەری مۆسیقاو ئاوازی کوردی و کە چووە پەیمانگای هونەرە جوانەکانیش لەبەغدا پسپۆری لەقانوون ژەنی پەیدا کردووەو کە دەریش چووە، گەلێک ئاوازی مۆسیقای بەسۆزی بەقانوونەکەی ژەنیوەو هەندێک ئاوازی سەرکەوتووی بۆ سروودو گۆرانی و مۆنۆلۆژ داناوەو وەک مۆنۆلۆژستێکی سەرکەوتووی کورد ناسراوەو تاکو ئێستاکەش گۆرانی و مۆنۆلۆژەکانی لەگوێماندا دەزرنگێتەوە و ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لەریزی مۆنۆلۆژستەکانی دیکەی کوردی وەکو عەزیز عەلی و سابیر عەبدولڕەحمانە.

مامۆستا ئەنوەر جگە لەمۆنۆلۆژیش لەبواری سروودی نیشتمانی و تەوشیحی ئایینی و مەقام و بەستەی کوردیش دەستێکی باشی هەبووەو شیعری گەلێک لەشاعیرە مەزنەکانی کوردی وەک نالی و کوردی و حاجی قادری کۆیی و دوای ئەوانەش سیعری شاعیری هاوچەرخی وەک زەکی هەناری کردووە بەگۆرانی سەرکەوتوو.

■

# فوئاد ئەحمەد
# ١٩٣٢-٢٠٠٤

کەریم شارەزا



فوئاد کوڕی ئەحمەد تەبیب کوڕی سولەیمان ناسراو بە (فوئاد ئەحمەد)، لە ساڵی ١٩٣٢دا لە گوندی (عەوێنە)ی دەشتی هەولێر لەدایک بووە و چاوی بەدیمەنە جوانەکانی کوردستان کراوەتەوە و لەباوەشی بنەماڵەیەکی ئاینپەروەر لە هۆزی نانەکەلی پەروەردە بووە. باوکی پزیشکێکی میللی بووە و گەلێک نەخۆشی بەداو دەرمانی کوردەواری چارەسەر کردووە.

فوئاد منداڵ دەبێ، کە باوکی ماڵەکەی دێنێتە شاری هەولێرو لەپایزی ساڵی ١٩٤٠دا ئەم رۆڵە تەمەن ٨ ساڵانەیە دەخاتە بەر خوێندن لە (قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی هەولێر) و هەموو دەرسەکانی ئەو قۆناغەی بەزمانی کوردی خوێندووە تاکو لەساڵی ١٩٤٨دا خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووەو بەپلەیەکی باش لەتاقیکردنەوەی گشتی دەرچووەو بۆ پایزی ئەو ساڵە دەچێتە دهۆک و لەخانەی مامۆستایانی لادێ وەردەگیرێ و هەر پێنج ساڵەکەی خوێندنی بەسەرکەوتوویی دەبڕێ و لەپایزی ١٩٥٣دا دەردەچێ و دەکرێتە مامۆستای (قوتابخانەی عالّلای سەرەتایی) لە کەندێناوەی پارێزگای هەولێر. دوای ماوەیەک دەنێردرێ بۆ قوتابخانەی گوندی (گرد عازەبان) لەدەشتی هەولێر، دوای چەند ساڵێک دەگوێزرێتەوە بۆ ناو شاری هەولێر و لەپاڵ گوتنەوەی وانەی هەمە جۆرە، دەرسی (سروود و مۆسیقا)ش بەقوتابییەکانی دەڵێ و ناوبانگی هونەریی دەردەکات. بۆیە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر لەساڵی خوێندنی ١٩٥٩-١٩٦٠دا دەیکاتە لێپرسراوی چالاکی هونەریی قوتابخانە سەرەتاییەکانی پارێزگای هەولێر تاکو ساڵی ١٩٧٠ ئەم ئەرکەی بەجوانترین شێوە بەجێهێناوە. ئەندامێکی کاراش بووە لەتیپی هونەری هەولێردا.

فوئاد ئەحمەدی هونەرمەند لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە چۆتە نێو دنیای هونەری گۆرانی کوردی و لە (ساڵی ١٩٥٣)وە کەوتۆتە سەر گۆرانی گوتن لە بۆنە نیشتمانییەکان و ئاهەنگی تایبەتی دۆستانیدا. یەکەم جار لەسەر رێبازی حەسەن زیرەک گۆرانی گوتووە وەک گۆرانییەکانی (باوانەکەی بابم)، (سەوزە لەباژێڕ بێ) و هی تر... بەڵام لەدواییدا، کە لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٥دا چووەتە ئێستگەی کوردی رادیۆی بەغدا وردە وردە بووەتە خاوەنی دەنگی خۆی و سروودی نەورۆزی تۆمار کردووە. لەساڵی ١٩٥٩دا گۆرانی (ئەمیرەکەم)ی لەئاوازی خۆی و لەشیعری مامۆستا مەجید ئاسنگەر تۆمار کردووە، کە سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

**ئەمیرەکەم، دڵگیرەکەم،**
**بەهارت لێ شەرمەزارە**
**گوڵی گیانە یەخسیرەکەم**
**تیرت لەدڵ سەد هەزارە!!**

دوای ئەمەش زنجیرەیەکی گۆرانی ناسک و پڕ سۆزی لە شیعری "مەدحەت بێ خەو" لەو ئێستگەیە گوت و تۆماری کردن، وەک گۆرانی (گیانی شیرین) کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

**گیانی شیرین ئەی نازداری بێگەردم**
**ئەی ئارامی دڵەی پڕ زام و دەردم**

لەگەڵ گۆرانییە ناودارەکەی (ئافرەتە نیوەی گرنگی گەلان) کە لەساڵی ١٩٥٩دا بۆ رۆژی ئافرەتانی جیهانی دانابوو، فوئادی هونەرمەند ئاوازێکی بەسۆزی بۆ داناو بەو بۆنەیەوە تۆماری کردوودو سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

**ئافرەتە نیوەی گرنگی گەلان**
**باخچەی ئادەمیزادە لەجیهان**
**ئافرەت دارێکە بۆ بەرزیی ژیان**
**دێنێتە بەرهەم رۆڵەی پاڵەوان!**

فوئادی هونەرمەند لەساڵی (١٩٦٢)ەوە ئاهەنگی گۆرانی بەبێ تۆمارکردن راستەوخۆ لەتەلەفزیۆنی بەغدا گوتووەو لەساڵی ١٩٦٤یشدا بەرِدش و سپی گۆرانی (ئەی بووکی تازە)ی لەشیعری عەبدوڵلا پەشێو تۆمار کردووەو بەم دێرە شیعرە دەست پێ دەکات:

**هەستە باپڕۆین ئەی بووکی تازە**
**دڵم سەرچاوەی سۆزو ئاوازە!**

هەر لەتەلەفزیۆندا زۆر هۆنراوەی دیکەی شاعیرانی وەک قانیع و مەدحەت بێ خەو و مەجید ئاسنگەرو کەریم شارەزای کردووە بەگۆرانی پڕ سۆز وەک نموونەی سەرکەوتووی گۆرانی کوردی گوتوونی.

فوئاد ئەحمەد، چەندە هونەرمەندێکی بەهرەداری کورد بووەو خزمەتێکی زۆری هونەری نەتەوەکەی خۆی کردووە، ئەوەندەش نیشتمانپەروەرو خەباتگێڕ بووەو سروودی ئاگرینی بۆ شۆڕشی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد گوتووە. یەکێک لەو بەرهەمە پتەوانەی سروودە ناودارەکەی (ئێمە پێشمەرگەین) بووە، کە وەک یەکەم سروودی شۆڕشگێڕی لە رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق لە ساڵی (١٩٦١)ەوە پێشکێش کراوەو تاکو ئێستاکەش بەم سروودە ئاگرینە رادیۆکە کۆتایی بە بەرنامەکانی خۆی دێنێ و هۆنراوەکەیشی لەدانانی شاعیر (مەدحەت بێ خەو)ەو بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

**ئێمە پێشمەرگەین هەتا ماوین لە ژین**
**نیشتمان ئازاد دەکەین لە خوێنمژین**
**ئێمە کوردین نابەزین**
**جەنگاوەرین نابەزین**
**ئێمە کوردین، تێکۆشەرین نابەزین!**

ئەم سروودە پڕ جۆشەی گیانی شۆڕشگێڕیی یەکەمین سروودی نیشتمانی کاک فوئاد ئەحمەد بووە، بەدەنگە زوڵاڵەکەی بۆ ئەو ئێستگە تێکۆشەرەی کوردی تۆمار کردووە و تاکو ئێستاش لەنرخی هونەری و ئەدەبی شۆڕشگێڕیی کەم نەبۆتەوە، تاکو ئەم سروودە مابێ دەنگی فوئادی هونەرمەندو شێوەو ئەدگاری شیرینی لەبەر چاو و دڵی میللەتی کوردی بەوەفا ون نابن.

فوئادی هونەرمەند دوا قۆناغی ژیانی هونەری لەئاوارەیی بەسەربردو لەگەڵ تەحسین تەهای هونەرمەندی جوانەمەرگ روویان کردە وڵاتی هۆڵەندەو لێی نیشتەجێ بوون، تەحسین لەساڵی ١٩٩٥دا و فوئادیش لەرۆژی ٢٠٠٤/٨/١٧دا بەنامرادی لەئاوارەیی کۆچی دواییان کردو چوونە ریزی کاروانی نەمرانی کوردو کوردستان و سڵاو لەگیانیان.

# حاجی فەتاح شێخانی شمشاڵژەن

**بایز عەباس**

شمشاڵ ژەنی میللی ناوی (حاجی فەتاح شێخانی)یە. لە عەشیرەتی گەردییە. لە ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی (شێخان) نزیک ناحیەی سەلاحەدین لە دایک بووە، کاتێک تەمەنی (٩) ساڵ بووە، نۆ ساڵان شوانی کردووە، شەوان بۆ لەوەڕ (شەوین) مێگەلی مەڕ و بزنی بردووە بۆ ئاقاری گوندەکەیان، فووی لە شمشاڵەکەی کردووە و لەبەر مێگەلی مەڕی ئاوازی رەسەنی فۆلکلۆری شوانی لێداوە، وەکو ئاوازی (هەوارە بەلۆ-پێش مەڕ-دوا رەوەند- سەرچیایی). لە تەمەنی لاویدا لە گوندەکەیان ئیشی جوتیاری و سەپانی کردووە. لەسەر جۆخین جەنجەڕ و شەنەبای کردووە و کاتێک منداڵ بووە لە گوندەکەیان شەوان هیچ ماڵێک لەمپا و فانۆسیان نەبووە. لە شەوانی درێژی سەرمای زستان لەبەر ئاگردان دانیشتوون و بۆ رووناکی شەوان چرای فتیلەی بە دووکەڵیان داگیرساندووە. مام (حاجی فەتاح شێخانی) شمشاڵ ژەن، یەکەمین جار کە لەگەڵ (مام رەشید)ی باوکی هاتووە بۆ هەولێر، تەمەنی (١٠) ساڵان بووە، چونکە ئەو دەمە خەڵک هەژار و نەدار بوون، ژیان و گوزەرانی خەڵکی گوندی (شێخان) لەسەر باردار فرۆشتن بووە. (حاجی فەتاح)ی منداڵ لەگەڵ باوکی بە سواری گوێدرێژ بۆ بژێوی خێزانەکەیان داریان بۆ فرۆشتن هێناوە بۆ شاری هەولێر، کە ئەو کات شوێنی ئێستای (مەخفەری پۆلیسی خانەقا)ی هەولێر لە تەنیشت مزگەوتی (شێخەڵلا) گۆڕەپانێکی گەورە بووە و ئەوکات شوێنی دار فرۆشتن بووە. کە داریان دەبردە ئەوێ بە (٥٠٠) فلس دەیانفرۆشتە پیاوێکی جوولەکە. پاشان گوێدرێژەکانیان دەبرد بۆ خانەی (قۆجە) لەگەڵ (مام رەشید)ی باوکی پێکەوە دەچوونە ناو بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر. ئەوکات بازاڕی قەیسەری وەکو ئێستا قەرەبالغ نەبووە. جارێکیان لە نزیک مزگەوتی بازاڕی هەولێر لە کۆڵانی (فافۆن فرۆشان) باوکی ئەو شمشاڵە زەردەی بە (٢) دوو عانە بۆ (فەتاح)ی منداڵی کڕیوە.

ئەو شمشاڵ ژەنە خوێندەواری نییە، بەڵام هەگبەی پڕە لە ئاوازی ڕەسەنی فۆلكلۆری كوردەواری. بۆ فێربوونی شمشاڵ لێدان لە (حاجی ڕەزاق)ی برا گەورەی فێری شمشاڵ لێدان بووە. هەروەها پیاوێكی دیكەش لە گوندەكەیان شمشاڵژەن بووە ناوی (مام كەریم) بوو، كە پیاوێكی بە تەمەن گەورە بووە، ئەویش شمشاڵێكی باشی لێداوە، سوودی لێ وەرگرتووە. (حاجی فەتاح شێخانی) منداڵ بووە كە هاتووە بۆ شاری هەولێر. لە گەرەكی تەیراوە (زەنون)ی زوڕنا ژەنی دیتووە بۆ شایی ڕەشبەڵەک زوڕنای لێداوە. لە حەیران بێژەكان دەنگی ڕەسوڵ گەردی و عوسمان حەیران و حەسەن حەیران و حەسەن سیساوەیی پێخۆشە. لە لاوک بێژەكانیش دەنگی كاوێس ئاغا و مریەم خان و عەیشەشان و حەسەن جەزراوی و عیسا بەرواری پێخۆشە. دەڵێت ئێستا ئەوەندەی گوێ لە ئاواز و گۆرانی ئەو سەردەمە رادەگرم، هیچ كاریگەریم لێ ناكەن و هیچ چێژیان لێ وەرناگرم! لە كاتێكدا كەماڵیان لە گوند بووە، پیاوێكی حەقایەت زان و قسە خۆش هەبووە ناوی (عەوڵا سۆت) بووە خەڵكی گوندی (ئارماوان) بووە. زۆر هەقایەتی زانیوە. ساڵێكیان ئەو پیاوە هەقایەت زانە چووە بۆ گوندی (شێخان)ی نزیک مەسیف، شەوانی ساردی زستان لە دیوەخانی ماڵی (حاجی فەتاح شێخانی) شمشاڵ ژەن ماوەتەوە. هەموو شەوان تا درەنگ بە ئاوازی ڕەسەنی شمشاڵ و هەقایەتی كوردەواری مەجلیس و دانیشتنی دیوەخانیان ئاوەدان و گەرم و گوڕ كردووە. (عەوڵا سۆت)ی هەقایەت زان و قسە خۆش شەوان هەقایەتی بۆ گوتوون و (حاجی ڕەزاق شێخانی) حەیرانی گوتووە و (فەتاح شێخانی)ش بە شمشاڵە بە سۆزەكەی ئاوازی ڕەسەنی فۆلكلۆری لێداوە. مام (حاجی فەتاح شێخانی)ی نەخوێندەوار سێ جار عەسكەری كردووە لە زەمانی (عەبدولكەریم قاسم) لە (قەسر جەمهوری) لە بەغدا چووە بۆ سەربازی، ئەوكات جاحێڵ بووە، ئەو شمشاڵەی لەگەڵ خۆی بردووە بۆ بەغدا، یادەوەری خۆش و شیرینی هەیە لەگەڵ شمشاڵەكەی، پەنجا ساڵە لەبەر پشدێنی خۆی هەڵیدەگرێ، لێی جودا نابێتەوە. ئێستاكە پیر و بێتاقەت بووە، لەبەر پیری و بێهێزی زوو ماندوو دەبێت. پەنجە لەرزۆكەكانی دەخاتە سەر كونی شمشاڵەكەی هەگبەی دەوڵەمەندی ئاوازی ڕەسەنی كوردەواریمان بۆ دەكاتەوە دیاری وەكو ئاوازی شایی و هەڵپەڕكێ، كە جاران لە گوندەكەیان سازدەكرا وەكو شایی (سێ پێیی- چۆپەیی- دەمچە-شێخانی- سووسكەیی). لەگەڵ (سلێمان هەركی) لاوكبێژ شمشاڵی لێداوە و كاسێتیان تۆمار كردووە لە گوندی (دێرە). لە پێشانگای فۆلكلۆری لە هۆڵی میدیای شاری هەولێر شمشاڵی لێداوە.

تێبینی:

لە ڕۆژی ٢٠/٢/٢٠٠٦ لە باغی شاری هەولێر نزیک تەزبێح فرۆشان ئەو چاوپێكەوتنەم لەگەڵ (حاجی فەتاح شێخانی) شمشاڵ ژەن ساز كرد. ئاوازە فۆلكلۆرییەكانی شمشاڵەكەم لەسەر كاسێت تۆمار كردووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر) ژمارە (٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# قادر زیرەک
# ١٩٨١-١٩٥٤

**کەریم شارەزا**

قادر لە مێردمنداڵییەوە ئاشقی جوانی کوردستان و هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی بووەو پێشتریش لە تەمەنی شەش ساڵییەوە خراوەتە بەر خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی و ئەو قۆناغەو قۆناغی ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواو کردووە، بەڵام لەبەر هەژاری دەست لەخوێندن هەڵدەگرێت و لەساڵی ١٩٧٠دا لەفەرمانگەی کشتوکاڵی پارێزگای هەولێر بەفەرمانبەر دادەمەزرێ و لەساڵی ١٩٧٤دا لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شەڕ لەکوردستان، وەک خەباتگێڕێکی دڵسۆزو فیداکار تاکو نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لەساڵی ١٩٧٥ خەباتی چەکداری لەدژی دوژمنی داگیرکەر دەکات پاشان دەگەڕێتەوە هەولێرو ژیانێکی پڕ لەئەشکەنجە بەسەر دەبات. (قادر زیرەک)ی دەنگ خۆش، ئاشقی دەنگ و ئاوازە خۆشەکانی گۆرانیبێژی بەهرەمەندی کورد حەسەن زیرەک بووە. شەوو ڕۆژ گۆرانییەکانی ئەوی لەسەر زار بووە. هەر بۆیەش نازناوی کردووەتە (زیرەک) و بە (قادر زیرەک) ناوبانگی هونەریی ڕۆیشتووە. لەساڵی (١٩٦٨)ەوە تاکو ١٩٧٧ لەگۆرانی گوتن لاسایی ئەوی کردۆتەوە. بەڵام لەدواییدا بەهاندانی هونەرمەندانی مۆسیقازانی وەک وریا ئەحمەدو رزگار خۆشناو هەوڵی داوە دەنگی تایبەتی خۆی پەیدا بکات و زنجیرەیەک گۆرانی رەسەنی کوردی لەسەر خۆشترین ئاوازی سەرکەوتوو بچڕێ و ناوبانگ دەربکات.

ئەو گۆرانبێژە دەنگ خۆشەی کورد لەساڵی ١٩٧٧دا یەکەمین گۆرانی خۆی بەناوی (دوورم لەیاران) گوتووە کە لەشیعری سالار قادر رەواندزی و ئاوازی رزگار خۆشناوەو بەم جۆرە دەست پێدەکات:

**دوورم لەیاران، دوورم لەیاران**
**دوورم لە خونچەو گوڵی بەهاران**
**دوورم لە شارو شاخ و داخەکەم**
**دوور لە خوناوی چەم و باخەکەم**

دووەم گۆرانی کە تۆماری کردبێ سترانی (لە دوگمەی سینە) بوو، کە لە شیعری (نالی) و ئاوازی (وریا ئەحمەد)ە، ئەمەش سەرەتاکەیەتی:

**لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان**
**بەیانی دا سپێدەی باخی سێوان!**
**لە خەوفی تەلعەتی ڕۆژ هەروەکو شێت**
**بەڕوو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان!!**

گۆرانی سێیەمیشی بەناوی (ئەمان ساقی)یە، کە لە شیعری ئەمین ئاغای حەویزی ناسراو بە (ئەختەر)ەو ئاوازی مامۆستا رزگار خۆشناوەو ئەمەش بەشێکیەتی:

**ئەمان ساقی دڵی شەیدام لە جەوری دیدە غەمگینە**
**لە نەشئەی چاوەکەی مەستت پیاڵە پڕکە بۆم بینە**
**فیدای چاوی سیاهت بوو، کە هۆشم بوو، ئەویشم چوو**
**بەتاراجی نیگاهت چوو، ئەگەر عەقڵەو ئەگەر دینە!**

ئەم هونەرمەندە لەساڵی ١٩٨٠ لەستۆدیۆی تەلەفزیۆنی بەغدا گۆرانییەکی بەناوی (لەبنەوار) تۆمار کردووە.

قادر زیرەکی لاو لەو کاتەی، کە لەگەڵ برادەرانی لەهاوینە هەواری بێخاڵ بەرەو هەولێر گەڕاونەتەوە، لەدەشتی هەریر بەکارەساتی ئۆتۆمبێل لەرۆژی ١٩٨١/٧/١٧دا گیانی سپاردو چووە ریزی شەهیدانی هونەری کوردییەوە.

سەرچاوە:
١- تایەر کرمانج- ژیان و هونەر- بەغدا ١٩٩٠.
٢- جیهانبەخش محەممەد- رۆژنامەی برایەتی ژمارە ٢٧٤٠ لە ٢٠٠٢/٧/١٧.
٣- گۆڤاری گوڵان- ژمارە (٣٩١)ی رۆژی ٢٠٠٢/٧/٥- نووسینێکی رەشاد عەبدوڵلا رەواندزی.

# خەجێ ئەحمەد مروەت

## فەرهاد گۆمەشینی

لە کوردستان لە بۆنەکاندا، وەک (دروێنە، گێرە و جووتکردن، کاروانچیاتی، ساوارکوتانەوە، بووک گواستنەوە، مەشکەژاندن، دەستار لێکردن، لانک راژاندن... هتد)، گۆرانی و لاوک و حەیرانیان تێدا گوتووە و کارەکانیان بە خۆشی بردۆتەسەر هەروەها لە پرسە و کارەسات و ناخۆشییەکانی ژیانیشدا... گوتوویانە، لە کاتی تەنگانەشدا بانگی خزم و کەسانی تریان پێکردووە. جا ئەم بۆنانە بەشێکیان تایبەت بووە بە پیاوان و بەشێکیان بە ئافرەتان. جا هەم لە پیاوان و هەم لە ئافرەتان کاتەکانیان بەم شێوەیە بەسەربردووە. بەتایبەت ئەوانەی زیاتر دەنگیان خۆشتر و شیاوتر بووە، (خەجێ ئەحمەد) یەکێک بووە لەو ئافرەتانەی دەنگێکی خۆش و لەباری هەبووە، بۆیە زۆرێک لە خزمان و دراوسێی ناو گوند داوایان لێکردووە، بەشدارییان لەگەڵدا بکات لەو بۆنانەی تایبەت بوون بە ئافرەتان، یاخود لە کارەکانی خۆیدا لەو گۆرانی و حەیران و لاوکانەی دەیگۆت، بەشێکی زۆریان فۆلکلۆری بوون، وەک ئەم نموونە:

**کورم گەورە کرد، بەشیری مەرێ**
**رەزا شا بردی، پێی دەکا شەرێ**
**کورم گەورە کرد، بە قلی هەنجیری**
**رەزا شا بردی، بە رەشبگیری**
**یاخوا رەزا شا، تەختت وەرگەرێ**
**وەکی لە ئێمە، بوویتە... دەردی سەرێ.**

بەشێکیش لە گوتنەکانی لە دانانی خۆی بوو، بە تایبەت لە کارەساتەکان چ بەسەر خۆی یاخود خزم و جیرانی یاخود خەڵکی گوندەکەی، ئەو زیاتر حەزی لە حەیران بوو، بابەتی غەریبی تێدا دەگوت، بە تایبەت مردنی لە ناکاوی دوو کوڕی گەنجی (نوری و وەهاب) کە ماوەیەکی کەمیان بەین بوو. ئەم دوو کوڕەی دەنگیان زۆر خۆشبووە و زۆر بە زەوق بوون، هەردەم گۆرانی و حەیران و لاوکیان دەگوت. چ لە بۆنە و یادەکاندا یاخود بە هەوەسی دێ و لەناو گوند و دەرەوەی گوند و لە ئیشوکاردا یاخود لەم گۆڕە، بەتایبەت (نوری) یان کە زۆر دۆستایەتی خۆشی لەگەڵ (سەید شێمحەمەد گۆمەشینی) هەبووە، هەردەم بەیەکەوە گۆرانییان دەگوت، (نوری)یان لە بیتوێن دەمرێت، کاتێک هەواڵی مردنی دەگاتە گوندی خەڵکەکە دەتاسێن، زۆربەی زۆری خەڵکی گوندەکەی بە پێشوازی تەرمەکەیەوە دەچن، تەنیا پیر و پەککەوتەکان نەبێت لەبەر تەمەنی پیری ناتوانن بچن، بەشێکیان بە سواری ولاغ و بەشە زۆرەکەی تر بە پیادە، ماوەیەکی زۆر دەبڕن تاکو بە تەرمەکە دەگەن، (خەجێ ئەحمەد) لە کۆتایی ساڵەکانی حەفتا و سەرەتای ساڵەکانی هەشتاکان زۆرجاران، کارەسات و رووداوی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە، رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوکات، وەک گرانی گەورە و گەلێک رووداوی دیکە، بەتایبەت یەکێک لە رووداوەکانی

ژیانی خۆی، کە هەم لە خۆی و هەم لە خەڵکی دیکەم بیستووە، لە تەمەنی منداڵیدا، کە ئەوکاتە ماڵیان لە گوندی (دارەخورما) بووە، ڕۆژێک لەگەڵ دەستەیەک لە کچانی گوندەکەیان دەچێتە شەواشینکان لە چیای قەرەچووغ کچەکانی دیکە گەنج بوون، ئەو لە هەموویان منداڵتر بووە، هەریەکەیان تێلەگە شەواشینکێک دەکەن و لە پشتی خۆیانی هەڵدەدەن، لە گەڕانەوەیان لەسەر چیای قەرەچووغ چەند پیاوێکی بێگانە ڕێیان لێدەگرن، کە خەڵکی گوندەکەی خۆیان نابن، کچەکان زۆر دەترسێن و دەکەنە زاقوزرووق، بەڵام خەجێی بچکۆڵانە دەست لەبن گوێی دەنێ و بە چەند بەندێک هەرچەند شوان و جووتیاری لەو ناوە هەیە ئاگاداریان دەکاتەوە و بانگەوازیان بۆ دەکات، پیاوە خراپەکان سەریان لەم کچە سوڕدەمێنێ، لە ترسان هەڵدێن و ئەو شوێنە بەجێدێڵن، پیاوەکانی گوندی لە شوان و جووتیار دەگەنە لایان، دەبینن پیاوەکان رایانکردووە، خەجێ لەلایەن کچەکان و هەم لەلای جووتیار و شوانەکان، زۆر ڕێزی دەگرن و سوپاسی دەکەن. (خەجێ ئەحمەد) لە گوندی (دارە خورما) لەدایک بووە، باری گوزەرانی ئەو کاتەیان باش بووە، وەک لێیان دەگێڕنەوە (٧) مێگەل مەڕیان هەبووە، لە گرانی گەورە مەڕ و ماڵاتیان نامێنێ و هەژار دەبن، لەبەر خراپی گوزەرانیان دەچنە (گوندی بانەمورد) لەوێ باوکی دەکەوێتە ناو زێ و دەخنکێ، دوای ئەوە باردەکەن دەچنە گوندی (بانی ماران)، کە (٣) برا و (٦) خوشک بوون، دوایی دەچنە گوندی (گۆمەشینی شێخان)، خۆی و دوو خوشکی لە گۆمەشین شوودەکەن و دوو خوشکی لە گوندی (ئێلنجاغی گەورە) شوویان کردووە و خوشکێکیشی لە بانی ماران شووی کردووە، کە ئازایەتی زۆر لەم خوشکەی دەگێڕنەوە، براکانیشی یەکیان لە (بانی ماران) نیشتەجێ دەبێ و ئەوەکانی تر لەوێ دەگەڕێنەوە (دارە خورما). لە ساڵی ١٩٨٤ چەند پارچە حەیرانێکی بۆ گوتم ئەوەش نموونەی (یەک) لە پارچە حەیرانەکانێتی:

**گەوارەکی هینا**

**لە بنەی شەرگاتی، دەگری کلکەی جەبەل حەمرینی**
**یەکاوێ عارەبان، خەندەکی خەلیفەی**
**شۆڕی قەراجی، قەرەبۆتک و قەرەبێتکان**
**بستییەکی شەواشینکی**
**ئەوجا شۆڕیکەوە، زوورگەکەی سەراجی**
**بدا لەسەری سواران، پیادان بگری**
**لە بێژینگ بەسەری**
**ئەوجا بداتەوە لە جۆگەکەی مەلا محەمەدی**
**پاشا لە مورتکەی قادری**
**ئەوجا گەوارەکی رەشی رەشتارەی گەلە دادەهینا**
**دەیکردە رهێری بارانێ... حەوشە رادەماری**
**کلکەی گەوارەی، دەیگرتەوە، گردسۆری سیانان**
**ئازی کەندی بندیانان، قەپەکی مام خاران.**

دایکی خەجێ ناوی (لەیلێ) بووە. وەک لێی دەگێڕنەوە ئافرەتێکی زۆر ئازا و بە دەست بووە، (مەلۆ)ی لەدوای (٢٥) سەپان هەڵگرتووەتەوە، لەوانەشە خەجێ لە دایکییەوە فێری حەیران بووبێت، خەجێ و دایکی و خوشکەکانی قسە لە روو و هەڵسوکەوتیان وەک پیاوان بووە، خەجێ مێردەکەی ناوی (حەمەدەمین حەسەن عەباس) بوو، پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەچی بوو، خەڵک زۆر حەزیان لە قسەکانی بوو، ئەگەر جوێنیشی بە یەکێک بدایە دڵگیر نەدەبوو، لەبەرئەوەی جوێندانەکەشی بۆ گاڵتە و گەپ بوو، خەجێ تاکو ساڵی (١٩٨٤) لە (گۆمەشین) دادەنیشت، هەر لەو ساڵەدا هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی مابوو ماڵی لە هەولێر بوو، کوڕەکەی بردییەوە لای خۆی تاکو لە ڕێکەوتی (١٣/١٠/١٩٨٨) کۆچی دوایی کرد و لە هەولێر لە گۆڕستانی (سەید مەعرووف) نێژرا.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١٧)ی ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوبۆتەوە.

# میرزا کەریم خۆشناو

بایز عەباس

(میرزا کەریم خۆشناو) دۆست و هەڤاڵێکی نزیکی (حەسەن زیرەک)ی نەمر بوو، ئەویش وەکو (زیرەک) لە رۆژی دووشەممە و بە نەخۆشی (سەرەتان) کۆچی دوایی کرد! (میرزا کەریم خۆشناو) ناوی تەواوی (کەریم حەسەن فەتاح خۆشناو)ە لە گوندی (وەرێ)ی خۆشناوەتی سەر بە ناحیەی (بێتواتە) لە بنەماڵەیەکی ناودار و کورد پەروەر چاوەکانی هەڵهێناوە. منداڵ بووە لە ساڵانی چلەکانی سەدەی رابردوودا ماڵیان باری کردووە هاتوون بۆ شاری هەولێر. لە گەڕەکی دێرینی (تەعجیل) نیشتەجێ بوون. چۆتە قوتابخانە و قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە. مرۆڤێکی کورد پەروەر بووە. زۆر عاشقی سروشتی رەنگینی کوردستان و شەیدای دەنگی زوڵاڵی (حەسەن زیرەک)ی نەمر بووە. لە ساڵی (١٩٦٠) لە قشڵەی هەولێر لەگەڵ (عەریف عوسمان) و (عەریف سلێمان) پۆلیس بووە. (سائق)ی سەیارەی (مەسلەحەی) پۆلیسان بووە. لە ساڵی (١٩٦٦) بەهۆی زرووفێکی نالەبار و ناخۆشی ئەو کات بە خاووخێزانەوە رووی کردۆتە شاری (بانە)ی رۆژهەڵاتی کوردستان و نیشتەجێ بوون. لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی بە زەوق و دڵتەڕ و چاو لەدەر و هونەردۆست و هەست ناسک بووە. هەر لە شاری (بانە)دا، داخوازی خاتوو (مریەم)ی کچی (سەعید ئەمینی) کردووە و زەواجیان کردووە و بوون بە هاوسەر لە دوای خۆی کوڕێکی بە ناوی (ئاسۆ) و (٣) کچی لە پاش بەجێ ماوە. لەگەڵ دۆست و برادەرانیدا زۆر بە وەفا و بە ئەمەک و میوان دۆست بووە. لەبەر ئەوەی گەلێک شەیدا و عاشقی دەنگی زوڵاڵی رەسەنی (حەسەن زیرەک)ی نەمر بووە. ئەو پیاوە (٣٦) ساڵ بەر لە ئەمڕۆ بۆ ناسین و ئاشنایی و دیدەنی (زیرەک) زۆر گەڕاوە و هەوڵی داوە چەندین جار بۆ ئەم مەبەستە چۆتە شاری (بۆکان)، بەڵام چاوی بە (زیرەک) نەکەوتووە و بە نائومێدی و هەناسە ساردی گەڕاوەتەوە، بۆ بژێوی ژیانی ماڵ و منداڵی کاسبی کردووە لەبەر کارەکەی پتر هاتوچۆی شاری (سەقز)ی کردووە. لە (مسافر خانە-سێ ستارە) لە نهۆمی دووەم بۆ یەکەم جار (حەسەن زیرەک)ی ناسیوە و یەکتریان ماچ کردووە و میوانی بووە. بە دیدەنی زیرەک شاد بووە و خواست و ئاواتەکانی هاتۆتەدی. لە نزیکەوە بە (عائیلی) و خێزان پەیوەندی بەهێزیان هەبووە لەگەڵ (حەسەن زیرەک)ی نەمر، لە چەندین دانیشتن و بەزم و رەزم و ئاهەنگی کوردەواری لەگەڵ (زیرەک) بەشدار بووە و بە (تەسجیل)ی (نیڤاکۆ)ی بچووک بە پاتری لەسەر کاسێت لە ١٠/١٢/١٩٦٩ کە خاڵە (ئەبو سەباح خۆشناو)ی خوا لێخۆشبوو میوانی (حەسەن زیرەک) بووە (میرزا کەریم خۆشناو) دەنگی زیرەکی لەسەر کاسێت تۆمار کردووە. لە کاسێتەکەدا زیرەک لەسەر زاری خۆی ناوی (میرزا کەریم) و (ئەبو سەباح خۆشناو)ی هێناوە. هەندێک وێنەی یادگاریان

پێکەوە گرتووە و لە ئەرشیف پارێزراون. سالآنێک لەگەڵ زیرەک پێکەوە ژیاون تاکو دواجار کە (حەسەن زیرەک)ی هونەرمەند بە دەست کورتی و هەژاری و نەداری بە نەخۆشی (سەرەتانی جەرگ) لە تەمەنی (٥١) ساڵیدا لە ساڵی (١٩٧٢) کۆچی دوایی کرد. ئەو برادەرە بە ئەمەک و دڵسۆزە تا دوا هەناسەی (حەسەن زیرەک) و لە سەرەمەرگیشدا هەر لە دیاری بووە. لە دوای کۆچکردنی (حەسەن زیرەک) میرزا کەریم خۆشناو لە ساڵی (١٩٧٧) بە ماڵ و منداڵەوە بە یەکجاری لە ئێران گەڕایەوە. هاتەوە بۆ گوندی (سەروچاوە)ی خۆشناوەتی، لە ساڵی (١٩٧٨) ماڵی بارکردووە و هاتۆتەوە گەڕەکی (تەعجیل)ی شاری هەولێر لە خانووەکی تەسک و تەنگەبەردا بە (کرێچیاتی) نیشتەجێ بوون. دەستی بە کار و کاسبی کردووە، لە ساڵی (١٩٨٣) لەبن قەڵای هەولێر لە نزیک (چایخانەی مەچکۆ)ی دوکانی (کەپسی ناسنامە) و (کۆپیکردن)ی دانا. تابلۆ وێنەیەکی گەورەی (حەسەن زیرەک)ی هونەرمەندی لە پێش دوکانەکەیدا هەڵواسیبوو. لە ساڵی (١٩٨٥) لە گەڕەکی (تەعجیل) لە بەردەم ماڵەکەیدا لەناو کابینەیەکی (تۆتیا)ی بچووک (سەموونی) دەفرۆشت. لە ساڵانی (١٩٨٤-١٩٨٥) بەشی یەکەمی نامیلکەی (حەسەن زیرەک و هەندێک لە بەسەرهاتەکانی) نووسین و لەگەڵ چەندین وێنەی دەگمەن چاپ و بڵاوی کردنەوە. بەم کاردی لەلای عاشقان و هەوادارانی زیرەک پتر ناسراو شۆرەتی وەرگرت. دۆست و برادەران و هونەرمەندان لە ماڵ و لە دوکانەکەیدا بەردەوام هاموشۆ و سەردانیان دەکرد. لە ساڵی (١٩٨٥) کوڕە گەورەکەی کە ناوی (ئومێد) بوو لە بەهاری تەمەنی دابوو. بە کارەساتێکی دڵتەزێن جوانە مەرگ بوو. ئەو پیاوە هونەردۆستە تووشی گێژاوی دەرد و ناخۆشی و ژیانی تاڵ بوو. لە ساڵی (١٩٨٩) لەگەڵ برادەرێکی خۆشەویستی بە سەیارە پێکەوە سەفەر دەکەن. لە رێگای کەرکووک سەیارەکەیان (دەعم) دەکات و تووشی کارەساتێکی دڵتەزێن دەبن. بە داخەوە لەم رووداوەدا (میرزا کەریم خۆشناو) چاوێکی کوێر دەبێت! لە بینینی چاوێکی بێبەش دەبێت! بۆ عیلاج و چارەسەری چاوی ماوەیەک دەکەوێتە خەستەخانە و پاشان بۆ چارەسەر روو دەکاتە شاری (بانە)ی ئێران. یەک دووجار بە سەردان و ئیش و کاری تایبەتی هاتەوە شاری هەولێر. سەردانی دۆست و برادەرەکانی کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ ئێران. لە ساڵی (١٩٩٨) لە ئێران بە خاووخێزانەوە چۆتە شاری (ئەستەمبۆڵ)ی تورکیا. لە تورکیا کەوتە ناو گێژاوی دەرد و کەسەر و خەم. دووچاری ئێش و ئازاری نەخۆشی کوشندەی (سەرەتانی گورچیلە) بوو. لەبەر ئەو نەخۆشییە ترسناکە نزیکەی مانگێک لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانەی شاری (ئەستەمبۆڵ) بە دەرد و نەخۆشی و ئازار لەناو جێگا راکشا. بۆ دواجار لە سەعات (١٥،٨) شەو لە رۆژی دوو شەممە رێکەوتی ١١/٩/ ٢٠٠٠ لە غەریبی و بێکەسی ئەو هەڤاڵە نزیکەی (حەسەن زیرەک) کۆچی دوایی کرد و لە شاری ئەستەمبۆڵ بە خاک سپێردرا. بە داخەوە ئێمە سەبارەت بە هونەر دۆستان و هونەرمەندانمان کەمتەرخەمین، چونکە (٦) شەش ساڵ بەر لە ئەمرۆ (میرزا کەریم خۆشناو)ی دۆست و هەڤاڵی نزیکی (حەسەن زیرەک)ی نەمر. لە غوربەت و بێکەسیدا دوور لە شاری قەڵا و منارە کۆچی دوایی کرد بە نەخۆشی (سەرەتانی گورچیلە).

سەرچاوە:

١- بیرەوەری و یاداشتی (بایز عەباس) لەگەڵ (میرزا کەریم خۆشناو) هەولێر، گەڕەکی (تەعجیل) لە هاوینی (١٩٨٥).

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ١٩، ٢٠٠٦ بڵاوبۆتەوە.



# تیپی باواجی کۆیە

**زاهیر محەمەد کۆیی**

دوای ئەوەی کە تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەفەرمی و بە نووسراوێک ئاراستەی تیپ و لایەنە پەیوەندارەکان کرا هەڵوەشێندرایەوە، زۆربەی کەلوپەلەکانی کەوتە لای هەندێ هونەرمەندانی ئەندام. ماوەی نۆ ساڵان ئەم تیپە لە کار کەوت.

لەو ماوە زۆرەدا ئێمە هەموو هونەرمەندان تارادەیەکی زۆر پەرتەوازە بووین. دوای شکستی شۆڕشی مەزنی گەلەکەمان. هەندێ لە ئەندامانی تیپ گەڕانەوە شاری کۆیە و هەندێکی تریان بە یەکجاری ئەم شارەیان بەجێهێشت. لەو ماوە زۆرەدا تیپی مۆسیقای قوتابخانەکانمان دامەزراند، کە سەر بە چالاکی هونەری قوتابخانەکان بوو. لە هەولێر هەندێ ئامێری مۆسیقامان لە چالاکی قوتابخانەکان وەرگرت. کۆمەڵێکی زۆر لە قوتابیانمان فێری مۆسیقا و هەندێکی تریان لە کۆرسی سروود و هەندێکی تریان لە گۆرانی، راهێنانی باشمان پێدەکردن. هەروەها لە مەڵبەندی لاوانی کۆیە لەگەڵ هونەرمەند کاک (سەردار ئەحمەد) محازەراتمان پێدرا. راهێنانمان بە کۆمەڵێکی زۆر لە قوتابیان و لاوان کرد، ئێستا زۆربەی هونەرمەندانی ئەم شارە بەرهەمی ئەم (دوو) چالاکییەن لە مەڵبەندی لاوان و لە چالاکی قوتابخانەکان. بەڵام ئەم بزووتنەوە هونەرییە لەو ماوەیەدا بوو، زۆرلا سنووردار بوو. تەنها شتێکی ناو شار و هەندێ بۆنەی بچووک نەیتوانی بەشداری بکات. تەنها جارێک لە تەلەفزیۆنی کەرکووکەوە شاندێکی هونەری هاتن و چەند گۆرانییەکیان بۆ قوتابیان و لاوانی کۆیە لە رۆژێکی ئێجگار سارد و ناخۆش تۆمار کرد. هەروەها لە رەوشێکی ئێجگار ناخۆشی رۆژانی رەشی دیکتاتۆری بەعسی فاشیزم.

بۆ پڕوپاگەندە و دڵنەوایی خەڵکی کوردستان، کاتی هەڵبژاردنە ساختەکانی رژێم بوو بۆ ئەنجومەنی (بەناو نیشتمانەکەیان) رژێم هەندێ خەڵک و کەسایەتی کوردی دەناردە شارەکان تاوەکو خەڵک هانبدەن بۆ بەشداری کردن و دەنگدان بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان دەستنیشانیان کردبوون و خۆیان پاڵاوتبوو بۆ ئەو

(مەهزدلەیە)ی هەڵبژاردنە.

ئەوە بوو نوێنەری (سەدام)، کە هاتە کۆیە لە گۆڕەپانی حاجی قادری کۆیی بانگەوازیان بۆ خەڵک کرد و وتیان دەبێ هەموو کەس ئامادەبێ بۆ کۆبوونەوەیەک، کە نوێنەری سەرەک کۆمار هاتووە (بێگومان چەند کەسێکی دیکەشی لەگەڵدا بوو) و هەر داواکاریەکتان هەبێ بە زووترین کات بۆ شارەکەتان جێبەجێدەکرێ.

هەندێ کەس چوو بوون. نوێنەرەکە قسەی بۆ خەڵکەکە کردبوو و وتبووی من لەلایەن سەرەک کۆمارەوە بۆ ئەم شارە ناردراوم، بەتایبەتی بۆ ئەوەی هەر داواکاریەکتان هەبێ بیگەینم و بۆتان جێبەجێدەکرێ. ئەمە لە ساڵی ١٩٨٣دا بوو. خەڵکەکەش بە نابەدڵییەوە هەندێ قسەیان کردبوو، هەر یەکەو ئەوەی بە بیریدا هاتبوو شتێکی گوتبوو، ئەوانیش یەکە یەکە دەیاننووسی. وەک بیستم و دواتر بۆیان گێڕامەوە، چونکە من ئامادە نەبووم و نەچووبووم. دوو برادەریش کە پێشتر هەر قوتابی خۆمان بوون و ئێستاش هونەرمەندن یەکێکیان تا ئێستاش لەناو تیپە. ئەو دوو برادەرە (کاک جەلال عەزیز زەینەل و کاک کۆسرەت حاجی شەل) بوون. داواکاریەکیان پێشکەش بە نوێنەری رژێم کردبوو نووسیبوویان دەمانەوێ ئەو فەرمانە و نووسراوەی، کە تیپی مۆسیقای باواجی کۆیەی پێهەڵوەشاندراوەتەوە بسڕنەوە، واتە (ئیلغا) بکرێت. بۆ ئەوەی بتوانین تیپەکە هەروەکو خۆی وەکو جاران و بەناوی خۆیەوە دەست بکاتەوە بە



ئیشکردن و چالاکی. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو چونکە چەندین جار داوامان لێکردبوو ئەگەر ئێمە تیپێکی مۆسیقا دابمەزرێنین مۆڵەتی فەرمیمان پێدەدەن بەو مەرجەی ناوەکەی بگۆڕن و ناوێکی نوێی دیکە دابنێین. ئێمەش هیچ کامێکمان ئامادە نەبووین، کە ئەو کارە بکەین، هەر لەبەر رۆڵ و رابردوو و مێژوویی تیپی باواجی. جا کە ئەو داوایەیان پێشکەش کردبوو، نوێنەرەکە گوتبووی ئاسانە و دوای چەند رۆژێکی تر چاوەنۆڕی بروسکەیەک بکەن. وابوو دوای ماوەیەکی کەم بروسکەیەک بۆ قایمقامی کۆیە هاتبوو، رەزامەندی حکومەتی تێدا بوو بەو مەبەستەی کە داواکرابوو. قایمقام ئەو کاتە کابرایەکی کوردی بەعسی بۆگەن بوو ئەمە جاری دووەمی بوو بووە قایمقامی کۆیە. یەکەم جار ناردی بە دوای من و کاک (جەلال عەزیز) گوتی وابروسکە هاتووە تیپەکەتان مۆڵەتی پێدراوەتەوە وەکو خۆی دەتوانن ئیش بکەن. من رەزامەندیم نیشان نەدا و داوای لێبووردنم کرد و گوتم توانای ئیش کردنم نییە. هونەرمەندی دیکە زۆرن. زۆر هەوڵیدا و دواتر گوتی جارێ باشە با وابێ، دیار بوو هەندێ کەسی دیکەی راسپاردبوو، یەک لەوانە خوالێخۆشبوو (جەوادی شەفیق ئاغا) کە دراوسێم بوو برادەرانی تیپیش هەر داوایان کرد و گوتیان واباشە با رێکی بخەینەوە ئەو کاتە خەڵکی دیکە هەن ئیش بکەن. (چونکە ددمانزانی کە ئیش کردن لەو کاتانەدا زۆر ئاستەنگ و ناخۆشە لە ژێر سایەی رژێمێکی وا زۆردار).

جارێکی دیکەش قایمقام ناردییەوە و ئێمە و چەند هونەرمەندێک بووین و ئەو جارە زۆر بە خۆشی و بە نەرمی بە شێوەیەکی کوردانە قسەی لەگەڵدا کردین ئێمەش ناچار رازیبووین و تیپەکەمان دامەزراندەوە و ماوەی چەند مانگێکی پێچوو تاکو کەلوپەلمان بۆ کڕی و بارەگامان دانایەوە رۆژێک



پیاوێکی کۆنە ئەفسەر خانەنشین وابزانم ناوی (خالد) بوو خەڵکی هەولێر بوو، خۆی زۆر بە دڵسۆزی کورد نیشاندەدا، تەلەفۆنی بۆ کردم، گوتی: وەرە هەولێر لە (ئەمانەتی رۆشنبیری و لاوان) پارەیەکی باش بۆ تیپەکەتان دەرچووە، بەتایبەتی بۆ ئەوەی کاروباری خۆتانی پێ بەرێوەببەن و پێداویستییەکانتان پێ جێبەجێبکەن. خۆی لەگەڵم هات، بەڵام چەند جاری دیکە هاتووچۆی شتێکی ئێجگار کەمیان پێدایین.

تیپەکەمان دامەزراندەوە و ستۆدیۆیەکی تۆمارکردنی دەنگمان لەناو بارەگای تیپ دروستکرد، تا رادەیەک بۆ وێنەگرتنی تەلەفزیۆنیش خراپ نەبوو. کۆمەڵێکی باش لە بەرهەمان تۆمار کرد. چەند گۆرانییەکمان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمار کرد و دواتریش لە ستۆدیۆکانی هەمان تەلەفزیۆن کاری مۆنتاژ و وێنەکردنیشمان بۆ کرد. زۆر سەرکەتوو بوو. ماوەیەک بەم شێوەیە ئیشمان کرد تا ساڵی ١٩٨٧، لەو وەختانە قایمقام گۆڕدرابوو، حکومەتیش هیچ بایەختێکی بەو شارە نەدەدا و لە هەولی ئەوەدا بوو دەیویست وێرانی بکا و خەڵکەکەشی بگوازێتەوە، کرا بە (شارە دێ) دواتر بە یەکجاری رژێم پشت گوێی خست.

تیپ داوای کرد بە نووسراو بۆ قایمقامیەت، دەستەی بەرێوەبەری نوێ هەڵبژێرێتەوە، کە وەڵامی نووسراو بە هۆی قایمقامیەت هاتەوە، بەم شێوەیە بوو: قایمقامیەتی قەزای کۆیە (قلم سر) نهێنی ژمارە (س ٢٨) مێژوو: ١٠/١٠/١٩٨٧ بۆ تیپی مۆسیقای باواجی: بابەت ناردنی (جەدوەل). نووسراوتان ژمارە (٥٨) لە ٢٤/٩/١٩٨٦.

پارێزگای هەولێر ئاگاداری کردینەوە، بەرێوەبەرایەتی کاروباری ناوخۆ - رێکخراوەکان - الجمعيات - بە نووسراویان ژمارە (٢٤) لە ٤/١/١٩٨٧ وەک ئەمەی خوارەوە:

١. لاریمان نییە بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دەستەی بەرێوەبەری تیپەکەتان.
٢. رەزامەندی نیشان نەدراوە (لم تحصل علی الموافقة) بۆ پاڵاوتنی هەریەک لە زاهیر محەمەد ئیبراهیم و ئەنوەر تاهیر خدر بۆ زانیاریتان تکایە.

**فەتاح عەزیز محەممەد ئەمین**
**قایمقامی قەزای کۆیە**

دواتریش لە دائیرەی (ئەمن)ی کۆیە، بانگ کراین و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردین بە هۆی ئەوەی، کە من (برازایەکم) پێشمەرگە بوو و کاک ئەنوەریش (برایەکی) پێشمەرگە بوو. و ئەنوەریان بۆ ماوەیەکیش ناچاریان کرد دەست لە وەزیفەی مامۆستایەتی بکێشێتەوە، باش بوو بەندیشیان نەکرد (نەخۆش بوو) وا دیار بوو گوتبوویان بەودندە چاکەمان لەگەڵدا کردووە، هەتا پسولەی خۆراکیشیان لێ سەندەوە. لەو ساوە برادەرانی دیکە تارادەیەک ئیش و کاری تیپەکەیان بەرێوە دەبرد و خۆیان راگرت، تا راپەرینی پیرۆزی گەلەکەمان لە ساڵی ١٩٩١.

ئێستاش ئەم تیپە هەر ماوە و لە کارکردندایە. ئەگەرچی زۆر لە کادیرەکانی لە شاران و لە هەندەرانن. بەڵام ئێستا کۆمەڵێکی دیکەی لاوی بە توانای هونەرمەند پێگەیشتوون، کە ئومێدی دوارۆژێکی روون و باشیان لێ دەکرێ، بەتایبەتیش ئێستا لە شاری کۆیە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لێکراوەتەوە، ئەمەش گوڕ و تینێکی دیکە دەدا بە رەوتی هونەر لەم شارە خۆشەویستە.



# بیۆگرافیای هونەرمەندانی هەولێر

ئا: مەسعودی مەلا هەمزە

**پێشەکی**

دەمێکە گوتراوە و تا ئێستاشی لەگەڵدابێ دەگوترێ کە گەلی کورد باجی بە ئەرشیف نەکردنی رووداو و کارەسات و بەڵگەنامەکانی خۆی دەدا، گەر بۆ رووداوە سیاسییەکان وابێ و شتێکی ئەوتۆ نەکرابێ، ئەی دەبێ بۆ هونەر چی کرابێ؟ بێگومان شتێکی وا نەکراوە کە جێی باس و قسە لەسەر کردن بێ، راستە بە بەڵگە و دیکۆمێنت سەلمێنراوە یەکەم شانۆگەری کوردی لە ساڵی "١٩٢١" بە ناوی شانۆگەری "سەلاحەددینی ئەیوبی" لە شاری هەولێر نمایش کراوە، لە لایەنی مۆسیقاش باس لەوە دەکرێ هەر لە کۆنەوە و بە تایبەتی لە ئایین و رێبازە کوردییەکاندا بایەخێکی زۆر بە مۆسیقا دراوە، بە تایبەتی وەکو شتێکی رۆحی و نزاو بەشێک لە واجباتە ئایینییەکان، گەر باس لە هونەری شێوەکاریش بکەین ئەوە نکۆڵی لێ ناکرێ کە ئەگەرچی بەداخەوە لە لایەن کورد ئەو بایەخە گرنگە بە شێوەکاری نەدراوە، بەڵام هەر دیمەنێک لە دیمەنەکانی کوردستان بە هەزارەها تابلۆی لێ دروست دەکرێ، ئەوە جگە لەو هەموو کارەسات و قوربانیدانەی کە بەسەر کورد هاتووە و دەکرێ بە هەزارەها تابلۆ تەعبیری لێ بکرێ و بخرێتەروو، بەڵام ئەوەی جیا لەوانە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە، کەسانی هەڵسووڕێنەر و داهێنەری ئەو کارانەن، کە ئەویش چینی هونەرمەندانن.

لەوانەیە ئێمەی کورد جگە لەو چەند هونەرمەندەی ناسراون و بەردەوام باسیان دەکرێ بە دەیان و بگرە سەدان هونەرمەندی دیکەمان هەبێ کە کاریان کردووە، بەڵام بایەخیان پێ نەدراوە و وەکو پێویست باسیان نەکراوە، جا بۆیە بە ئەرشیفکردن و کارکردن لە ئەرشیفی هونەری کوردی کارێکی قورسە، لەبەرئەوەی ئێمەی کورد نەک هەر کارمان لەو ئەرشیفە نەکردووە، بگرە زۆربەی کات بایەخمان بە شتە ئەرشیفییەکانیش نەداوە و نەمانتوانیوە زیندووی بکەینەوە و درێژەی پێ بدەین.

لەو کاتەی لە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان خەریکی بە ئەنجام گەیاندنی ئینسکلۆپیدیای هەولێر بوون، دیاربوو "عەبدولرەحمان مەعروف"یش خەریکی ئامادەکردنی بیۆگرافیای نووسەران و شاعیران و چیرۆکنووسانی هەولێر بوو، لەوکاتدا بەو پێیەی وەکو رۆژنامەنووسێکی هونەری کارمدەکرد داوای لێکردم منیش شان بدەمە بەر ئامادەکردنی بیۆگرافیای هونەرمەندانی هەولێر، منیش قۆڵم لێی هەڵکرد و لە سەرەتا وەکو پرۆژەیەکی سادەو ساکار سەیرم کردو وامزانی کارێکی ئاسانە، کەچی دواتر بۆم دەرکەوت کە کارێکی چەندە قورسە و پێویستی بە چ

ماندووبوونێکه، بەڵام کۆڵم نەداو بڕیارمدا کاری تێدا بکەم، لە سەرەتادا تەنها هونەرمەندە شانۆکارەکانم تەواو کرد، لە دواییشدا دەستمکرد بە بەشەکانی دیکەی وەکو "مۆسیقا، گۆرانی، شێوەکاری، خۆشنووسان" کە بۆ بەشی شێوەکارییەکەی راستەوخۆ سوودم لە هەردوو کتێبی هونەرمەندان "دارا محەممەد عەلی و فەیسەڵ عوسمان" وەرگرتووە، لەبەرئەوەی ئەوان لە دوو کتێبی جیاوازدا "شێوەکارانی هەولێریان" بە چاپ گەیاندبوو.

ئەوەی گرنگە کە باسی لێوە بکەم دوای دەست بەکاربوونم لەو پڕۆژەیە لە سەرەتادا لە رێگای سەردانیکردن و چوون بۆ لای هونەرمەندەکانەوە داوام کرد "c.v" هەر هونەرمەندێک وەرگرم، ئەوەبوو بەشێک لە هونەرمەندان بە شێوەیەکی باش پێشوازییان لە پڕۆژەکەم کردو زانیاری تەواوی خۆیان دامێ، بەڵام بەشێکی دیکەیان هەر وەڵامیشیان نەبوو، بەوەشەوە نەوەستام و لێم چەند بارە کردنەوە، کەچی هەر بێ سوود بوو، ناچار هەوڵمدا لە رێگای دیدارە رۆژنامەوانییەکانی هونەرمەندانەوە بەشێک لەو زانیارییانەی پێویستمە دەستەبەری بکەم و بیخەمە ناو بیۆگرافیاکەوە، دوا بەدوای ئەوەش هەم دیسان بەوەشەوە نەوەستام و ئەوجارەیان لە رێگای رۆژنامە رۆژانەکان و ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکانەوە ئاگادارییەکم بڵاوکردەوە و تێیدا ئاماژەم بە پڕۆژەکە کردو ناونیشانی گەیاندنی "c.v"یەکانیشم خستبووە روو، دوای ئەوەش بەشێکی تر لە هونەرمەندان بەدەم پڕۆژەکەوە هاتن، بەشێکی دیکەی زانیارییەکانیشم لە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان وەرگرتووە، بە تایبەتی ئەو هونەرمەندانەی ماڵپەڕی تایبەتی خۆیان هەیە، بۆیە دەڵێم ئەو بیۆگرافیایە ناوی هەموو هونەرمەندانی شاری هەولێری تێدا نییە، بەڵکو دەتوانم بڵێم بەشێکی هەرەزۆریانی تێدایە، ئەوەشی کە ناوی نەهاتووە دڵگرانی ناوێ لەبەرئەوەی ئەو پڕۆژەیە بەردەوام دەبێ و چاپ و بەرگی دیکەشی دەبێ، جا بۆیە بۆ ئەوەی هەر هونەرمەندێک گلەیی نەبێ دەتوانن دوای چاپ بوونی ئەو بیۆگرافیایەش هەم دیسان زانیارییەکانی خۆیان بنێرن.

ئەوەی لەو بیۆگرافیایەدا کارم لەسەری کردووە بریتییە لە پێنج خاڵ، کە ئەوانیش خۆی دەبینێتەوە لە: "ناوی سیانی و نازناو ئەگەر هەیبێ، ساڵی لەدایکبوون، پلەی خوێندن، دەستپێک، چالاکی و بەرهەمەکان" ئەوەی کە زۆر جەختم لەسەری کردۆتەوە بریتییە لە "دەستپێک" واتا ساڵی دەستکردن و تێکەڵ بوون بە هونەر، لەبەرئەوەی لە باسکردنی ناوی هونەرمەندانی ناو ئەو بیۆگرافیایە نە بە شێوەیەکی هەرەمەکییە و نە بەپێی ساڵی لەدایکبوونیشە، بەڵکو بە پێی ساڵی دەستپێکردن و هاتنە ناو دنیای هونەرە، لەوەشدا تووشی کێشە بوومە و بەداخەوە هەندێ لە هونەرمەندان لە زانیارییەکانی خۆیان دەستپێکەکەیان زووتر نووسیبوو لەوەی کە دەستیان کردووە بە کاری هونەری، بەڵام هەوڵمداوە لەرێگای پرس و را و پشت بەستن بە کاتی نمایشکردنی شانۆگەرییەکان ئەو هەڵەیە راست بکەمەوە و وەکو خۆی بیخەمە روو.

بۆ مەسەلەی ساڵی دەستپێکیش ساڵی "٢٠٠٠"م وەکو دواکاتی دەستکردن بەکاری هونەری داناوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بتوانم کارەکان بە شێوەیەکی چاک و بێ کەم و کوڕی بە ئەنجام بگەیەنم، چونکە هەموومان دەزانین لەدوای ساڵی "٢٠٠٠" لێشاوێکی هاتنە ناو دنیای هونەر دەستی پێکردووە و جیاکردنەوەی هونەرمەند لە ناهونەرمەند کارکردنی دەوێ و هەروا ئاسان نییە.

لەو بیۆگرافیایەی بەردەستتان و بە تایبەتی لە بەشی شانۆدا هەر هونەرمەندەو "٢٠" کاری شانۆیی خراوەتەڕوو، تەنها ئەو هونەرمەندانە نەبێ کە کۆچی دواییان کردووە، یان ئەوانەی لەسەر جێگا کەوتوون و توانای کاریان نەماوە، هۆکاری سەرەکی ئەوەش

دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەداخەوە زۆربەی هونەرمەندانی ئێمە ئەرشیفی خۆیان نییە و نەیانپاراستووە، جا بۆیە بۆ ئەوەی نەڵێن جیاوازی کردووە لەنێوان هونەرمەندانلدا ئاوام کردووە، تەنها "c.v" چەند هونەرمەندێک نەبێ، ئەویش چونکە "c.v"یەکانیان بە شێوەیەکی زۆر جوان و ئەرشیفی خستبووەڕوو، بۆیە دوای راوێژکردن لەگەڵ مامۆستا عەبدولڕەحمان مەعروف وەکو سەرپەرشتیاری پرۆژەکە بە باشمانزانی و گەیشتینە ئەو بڕوایەی "c.v"یەکان وەکو خۆی دابنرێتەوە و هیچ دەستکارییەکیان نەکرێ.

لەو بیۆگرافیایەدا ناوی چەند هونەرمەندێک دەبینرێ کە لەدایکبووی هەولێر نین، بەڵام ماوەیەکی زۆرە لەو شارە نیشتەجێن بۆیە ناوەکانیان لەو بیۆگرافیایەدا هەیە.

نایشارمەوە ئەو پرۆژەیە کارێکی گەورەیە و کارکردنی زۆری دەوێ، بەڵام ئەوەی دەیبینن هەنگاوێکی سەرەتاییە بۆ بەردەوامبوونی ئەو پرۆژەیە و بە ئەرشیفکردنی هونەری کوردی، لە داهاتووشدا بە هەماهەنگی لەگەڵ هونەرمەندان هەوڵ دەدەین ئەو پرۆژەیە فراوان بکەین و وابکەین هیچ هونەرمەندێکی هەولێر لەیاد نەکرێ.

خۆ ناشکرێ گەورەیی و گرنگی پرۆژەیەکی وا لەبەرچاو نەگیرێ و بە کەم بایەخییەوە سەیری بکرێ، لەبەرئەوەی گەر لە پرۆژەیەکی ئاوادا و لە داهاتوو توانیمان ئەو کارە پەرە پێ بدەین و فراوانتری بکەین، بێگومان دەکرێ کار بۆ وەرگێڕان و چاپکردنی ئەو کتێبە بە هەرسێ زمانی "کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی" بکەین و ئەگەر لە داهاتوودا هونەرمەند و هونەردۆست یا کەسێکی بیانی هاتە وڵاتەکەم پێی بڵێین ئەوە ناو و کار و چالاکی و بەرهەمی هونەرمەندانی ئێمەیە، کە ئەوە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ناساندنی هونەری کوردی بە نەتەوەکانی بێگانە، لەبەرئەوەی دەزانین زمانی ئێمەی کورد تەنها بۆ خۆمانە و کەسێکی غەیرە کورد تێی ناگا، لەوەش گرنگتر ئەوەیە لە داهاتوودا و بۆ نەوەکانی ئایندە روون دەبێتەوە کە کێ بوونە ئەوانەی لەو وڵاتە کاری هونەرییان کردووە و خزمەتی هونەری کوردییان کردووە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە بە ئەنجام گەیشتن و چاپکردنی ئەو جۆرە کتێبانە هونەرمەندی کورد هەوڵی ئەوەدەدا رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر و چاکتر کار و چالاکی و بەرهەمەکانی خۆی ئەرشیف بکا.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی "حەمید بەدرخان" وەکو بەرپرسی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان کە زۆر هاوکاری بە ئەنجام گەیشتنی ئەو پرۆژەیەی کرد و هاوکارییەکی مەعنەوی تەواویشی کردم، هەروەها دەبێ سوپاسی "بەدرخان یوسف"یش بکەم لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، کە ئەرکی "سکان کردنی" هەموو وێنەکانی لە ئەستۆ گرت، هەروەها هەردوو ناوەندی "کۆیە و مەخموور"ی رێکخراوی هونەرمەندانیش کە هەریەکەو زانیاری و "c.v"ی هونەرمەندانی سنووری خۆیان بۆ هێنام تا ئەوانیش لەو پرۆژەیە بێ بەش نەبن، سوپاسی هەموو ئەوانەش دەکەم کە هاوکارییان کردم لەو پرۆژەیەدا.

ناڵێم ئەو پرۆژەیە بێ کەموکورییە، بەڵام هەنگاوێکی باشیشە بۆ بە ئەرشفیکردنی ناو و کاری هونەرمەندانی کورد، دەمێکیشە گوتراوە ئەوەی کار نەکا، هەڵە ناکا، گرنگ بەردەوامییە، بەڵێنیش بێ، تا هێزم تیا مابێ لە خزمەتی بە ئەرشیفکردنی هونەری کوردیدا بم و لە ماوەی داهاتووشدا کار لە بیۆگرافیای هونەرمەندانی کوردستان دەکەم.

**مەسعودی مەلا هەمزە**
**٢٠٠٩/٧/٢٢- هەولێر**



٨- مردووی زیندوو- ١٩٩٥- نواندن
٩- زامی هەڵەبجە- ١٩٩٧- دەرهێنان
١٠- پەپوولەکان- ١٩٩٨- دەرهێنان
١١- دەست پاکی- ١٩٩٩- دەرهێنان و نواندن
١٢- دێوەزمەکان- ٢٠٠٠- دەرهێنان و نواندن
١٣- تابلۆی هەڵەبجە- ٢٠٠٣- دەرهێنان

**موحسین حەمەدەمین حوسێن**
**(موحسین شوانی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٧١
**پلەی خوێندن:** دەرچووی خولی مامۆستا
**دەستپێک:** ١٩٨٧

**بەرهەمەکان:**
١- ئەگەر بایە و ئەگەر باران- ١٩٨٧- نواندن
٢- دایکی شەهید- ١٩٨٨- نواندن
٣- کاوەی ئاسنگەر- ١٩٨٩- نواندن



٤- نێچیری ئەمجارە- ١٩٩٠- دەرهێنان و نواندن
٥- سەد دینار- ١٩٩٠- نواندن
٦- پیری چاوچنۆک- ١٩٩٠- نواندن
٧- شۆڕشگێران- ١٩٩٤- نواندن
٨- مردووی زیندوو- ١٩٩٥- نواندن
٩- شێتەکانی ئەم رۆژگارە- ١٩٩٧- نواندن

**جەلال محەمەد ئەحمەد**
**(جەلال هیرانی)**

**لەدایکبووی:** ١٩٦٨/٣/٤
**پلەی خوێندن:** دبلۆم
**دەستپێک:** ١٩٨٧

**بەرهەمەکان:**
١- ئەگەر بایە و ئەگەر باران- ١٩٨٧
٢- دکتۆری نە شارەزا- ١٩٨٩- نووسین و دەرهێنان
٣- کاوەی ئاسنگەر- ١٩٨٨- نواندن
٤- ئەنجامی زۆرداری- ١٩٨٨- نووسین، دەرهێنان، نواندن
٥- خوێندن چرای ژیانە- ١٩٩٠- نواندن
٦- شیخ البخیل- ١٩٩١- نواندن، دەرهێنان، نووسین
٧- میری ماندوو- ١٩٩٢- نواندن
٨- قوتابی نەوەی دوارۆژ- ١٩٩٣- نواندن
٩- شۆڕشگێران- ١٩٩٤- نواندن و دەرهێنان
١٠- مردووی زیندوو- ١٩٩٥- نواندن
١١- سەد دینار- ١٩٩٦- نواندن



١٢- تۆ کەی بووی بە مدیر- ١٩٩٧- نواندن
١٣- وێنەیەک- ١٩٩٨- نواندن
١٤- شێتەکانی ئەم رۆژگارە- ١٩٩٩- نواندن
١٥- یەکگرتنەوە- ٢٠٠٣
١٦- مەحاڵە- ٢٠٠٥- نواندن
١٧- با تەبابین- ٢٠٠٦- نواندن
١٨- سازان و هەنگ- ٢٠٠٨
١٩- کراسی پیاوێکی بەختەوەر- ٢٠٠٩
٢٠- پیری و چاوچنۆکی- ٢٠٠٩- نواندن و دەرهێنان

**دلێر قادر حەمە شەریف**
**(دلێر پالانی)**

**لەدایکبووی:** ١٩٧٥
**پلەی خوێندن:** خوێندکاری زانکۆ
**دەستپێک:** ١٩٩٣
**بەرهەمەکان:**
١- قوتابی نەوەی دوارۆژ- ١٩٩٣- نواندن
٢- شۆڕشگێران- ١٩٩٤- نواندن
٣- مردووی زیندوو- ١٩٩٥- نواندن
٤- سەد دینار- ١٩٩٦- نواندن
٥- تۆ کەی بووی بە مودیر- ١٩٩٧- نواندن
٦- شێتەکانی ئەم رۆژگارە- ١٩٩٩- نواندن
٧- یەکگرتنەوە- ٢٠٠٣- نواندن و دەرهێنان
٨- سێ پشیلە- ٢٠٠٤- دەرهێنان
٩- مەحاڵە- ٢٠٠٥- نواندن
١٠- با تەبا بین- ٢٠٠٦- نواندن



١١- خەونێک- ٢٠٠٧- نواندن
١٢- سازان و هەنگ- ٢٠٠٨- نووسین
١٣- کراسی پیاوێکی بەختەوەر- ٢٠٠٩- نواندن

**نزار نوعمان شەریف**
**(دڵدار خۆشناو)**

**لەدایکبووی:** ١٩٨٢
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:**١٩٩٨

**بەرهەمەکان:**
١- بێ مراد- ١٩٩٨
٢- دکتۆری نەشارەزا
٣- فیلمی برەو- ٢٠٠٧
٤- پیری چاوچنۆک- ٢٠٠٩
٥- هەڵەبجە- ٢٠٠٨
٦- کاوەی ئاسنگەر- ٢٠٠٩



## مۆسیقاژەنەکانی هەولێر

### جەمال هیدایەت عەبدوڵڵا



**لەدایکبووی:** ١٩٣١- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدایە.
**دەستپێک:** چلەکان

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* ١٩٥٢ لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرگیراوە.
* ٣/ ١٠/ ١٩٥٦ لە قوتابخانەی ئیبن مستەوفی و ئەربیل ئولا وەک مامۆستای سروود دامەزراوە.

١٩٩٥- ١٩٩٦ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا بەشی مۆسیقای رۆژهەڵاتی- ئامێری عودی تەواو کردووە.
١٩٥٦ مامۆستای سروود بووە لە قوتابخانەی ئەربیل ئولا و ئیبن مستەوفی
١٩٥٧ مامۆستا و وانەبێژی سروود و مۆسیقا بووە لە خانەی مامۆستایانی کوڕان.
١٩٥٧ کردنەوەی یەکەم خولی زانیاری مۆسیقا و ئامێرەکانی لەهۆڵی ئیبن مستەوفی بۆ ماوەی شەش مانگ.
١٩٥٨- ١٩٥٩ دامەزراندنی یەکەمین مۆسیقا لە هەولێر لەژێر ناوی دەرسیم.
١٩٥٩- ١٩٧٠ بەشداری لە هەموو ئاهەنگ و



فێستیڤاڵی هونەری هەولێر بە ژەنینی عود.
١٩٧١ ئەندامی دامەزرێنەری تیپی هونەری هەولێر بووە و ماوەی ٢٠ ساڵ سەرۆکی دەستەی کارگێڕی بووە.
١٩٧٣- ١٩٩١ بەڕێوەبەری چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر بووە و بەشداری لەهەموو فێستیڤاڵ و کارە هونەرییەکانی وەزارەتی پەروەردە کردووە.
١٩٧٤- ١٩٧٥ وانەبێژی سروود بووە لەخانەی مامۆستایانی کچان
١٩٧٥ ئەندامی دامەزرێنەری سەندیکای هونەرمەندانی هەولێر بووە.
١٩٨٢- ١٩٩١ سەرۆکی دەستەی کارگێڕی لقی هەولێری سەندیکای هونەرمەندانی عێراق بووە.
١٩٩٧ سەرۆکی دەستەی کارگێڕی ئۆرکسترای کوردستان.
١٩٩٦- ٢٠٠٤ سەرپەرشتیاری پەروەردەیی سروود و مۆسیقای قوتابخانەکانی سەرەتایی.

### مستەفا رەئووف شێخۆ



**لەدایکبووی:** ١٩٤٢- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای مامۆستایان بەشی وەرزشی
**دەستپێک:** ١٩٥٨ لەتیپی مۆسیقای دەرسیم بە سەرپەرشتی مامۆستا جەمال هیدایەت دەستی بە ژەنینی مۆسیقا کردووە.

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

لەگەڵ تیپی مۆسیقای دەرسیم بەشداری چەندین ئاهەنگیان کردووە، لەوانە: ئاهەنگی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لەشەقلاوە کە هەریەک لە هونەرمەندان (تاهیر تۆفیق، رەسول گەردی، یەحیا مەرجان، باکووری و شەماڵ سائیب و فوئاد ئەحمەد) تێیدا بەشداربوون.

یەکەم ژەنیار بووە لەسەر ئامێری قانوون لە هەولێر.

چەندین کاسێتی تۆمار کردووە لە ئێزگە و تەلەفزیۆنی کەرکووک و بەغدا.

لەگەڵ ئەو هونەرمەندانە وەک ژەنیار بەشداربووە: عەبدولواحید مەرجان، جەوودەت شاکر، مشکۆ، محەمەد ئەحمەد ئەربیللی، عارەب عوسمان، نیزام شوکر.

هەروەها چەندین کاسێتی تایبەتی بۆ هونەرمەندان (تاهیر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد، رەسول گەردی، محەمەد عارف جەزراوی، مشکۆ، محەمەد ئەحمەد، جەبار ئەحمەد، محەمەد جەزا) تۆمارکردووە.

لەگەڵ ئەو تیپانەی خوارەوە کاری کردووە:

١- تیپی دەرسیم
٢- تیپی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان



٣- تیپی چالاکی قوتابخانەکان
٤- تیپی هونەری هەولێر
٥- تیپی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی و یەکەمین فێستیڤاڵی کوردییان لە بەغدا لە ١٩٧٤ گێڕا.
٦- تیپی مۆسیقای شۆڕش لە گەلالە ١٩٧٤.
٧- تیپی هونەرە میللییەکان.
٨- تیپی مۆسیقای هەولێر، کە چەندین ئاهەنگیان گێڕاوە لە ئەڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا و نەمسا و روسیا و گشت شارەکانی عیراق.

دواتر دەبێتە بەرپرسی تیپی هونەرە میللییەکان و بە هەڵبژاردن دەبێتە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لە هەولێر.

پێش ئەوەی خانەنشین بکرێ چەندین ئاهەنگیان لە فەرەنسا و سویسرا گێڕاوە.

لە ساڵی ٢٠٠٥ لەبواری شانۆ زۆر بەشداری هەبووە و لە زۆربەی شانۆگەرییەکان بەشداربووە.

لە تۆمارکردنی چلپاو بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا بەشدار بووە.

## سەردار ئەحمەد عەبدوڵلا
## (سەردار باب سەرداری)



**لەدایکبووی:** ١٩٤٥- بەفرقەندی- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە.
**دەستپێک:** ١٩٥٨

* لە ١٩٦٨/١/٢١ لە چالاکی قوتابخانەکان لە هەولێر دامەزراوە.
* لە ١٩٧١/١٢/٤ نەقلی کۆیە بووە.



* لە ژیانی دوو ئاوازی داناوە، یەکەم بەناوی چنارۆک لە ساڵی (١٩٧١) لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر بۆ رادیۆ و تەلەفزیۆن تۆمارکرا، دووەم پارچە میوزیکێک بوو بەناوی سۆزان لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە، لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک لەگەڵ چەندین بەرهەمی تر تۆمار کراوە.
* لە ١٩٧٤لە شۆڕشی ئەیلول پێشەکی سروودی (شاخی رەنگاورەنگی گوێژە) ی ئامادەکرد.
* لە بەهاری ١٩٧٥ لەگەڵ تیپی مۆسیقای شۆڕش بەشداری لە گەشتێک کرد کە ئاهەنگی گۆرانی و میوزیک بوو بۆ ئاوارەکانی کەمپی کوردەکانی ئێران.
* لە ١٩٧٨- ١٩٧٩ لەخولی فێرکردنی میوزیک لە کۆیە وەک وانەبێژ وانەی گوتۆتەوە.
* لەکاتی کردنەوەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کۆیە وەک مامۆستا وانەی گوتۆتەوە.

**یەحیا مەرجان**





**لەدایکبووی:** ١٩٣٦- هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٥٩/٤/٢٨ یەکەم گۆرانی لە ئاواز و هۆنراوەی خۆی تۆمارکرد.

**چالاکی و بەرهەمەکانی:**

١٩٦١- ١٩٦٢ بۆ یەکەمجار بۆتە مامۆستای هونەر لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی.

سەرۆکی دەستەی دامەزرێنەری تیپی یەکێتی مامۆستایان بووە.

لە ١٩٩٦/٩/٢٣ تا ٢٠/١٠/١٩٩٨ بەرێوەبەری چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر بووە.

**رزگار خۆشناو**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٢- شەقلاوە

**دەستپێک:** شەستەکان

**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای میوزیکی رۆژهەلاتی.

ماجستێر لە میوزیک لە نەمسا- ١٩٩٠



**بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵانی ١٩٦٧- ١٩٧٠ بەنهێنی بەشداری هەموو بۆنەکانی شۆڕشی ئەیلوولی کردووە.

٢- ئەندامی کۆمەڵەی ئاوازدانەرانی جیهانە.

٣- لە ساڵی ١٩٧٧ سەرپەرشتیاری تیپی میوزیکی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی بووە.

٤- ئاوازی بۆ چەندین هونەرمەند داناوە، لەوانە: (فوئاد ئەحمەد، شێرزاد عەبدولڕەحمان، جەلال سەعید، قادر زیرەک، محەممەد جەزا، جەبار ئەحمەد، ناسر ڕەزازی، مەرزیە فەریقی و چەندانی تر).

## جەودەت شاکر عەلی



**لەدایکبووی:** ٢١/١٠/١٩٤٦ - هەولێر

**پلەی خوێندن:** دەرچووی خانەی مامۆستایانی هەلیر - ١٩٦٤/١٩٦٥

دەرچووی خولی مۆسیقای مەرکەزی - پەیمانگای هونەرە



جوانەکانی بەغدا ١٩٧٥

**دەستپێک:** ١٩٦٢- تیپی مۆسیقای خانەی مامۆستایان

**بەرهەم و چالاکییەکان:**

- ئەندامی تیپی مۆسیقای خانەی مامۆستایانی هەولێر ١٩٦٢ - ١٩٦٥
- ئەندامی تیپی مۆسیقای چالاکی قوتابخانەکان لە ١٩٦٥ - ١٩٨٢
- ئەندامی تیپی مۆسیقای سەندیکای مامۆستایان ١٩٦٨ - ١٩٩١
- ئەندامی تیپی مۆسیقای هونەری هەولێر و بەشداری لە گشت چالاکییەکانی ئەم تیپە کردووە لە ١٩٧٠ - ١٩٩١
- ئەندامی تیپی مۆسیقای هونەرە میللییەکان لە ١٩٧٩ - ٢٠٠٥
- ئەندامی دەستەی کارگێری تیپی هونەری هەولێر لە ١٩٧٥ - ١٩٩١
- لە ساڵی "١٩٩٧"ەوە تا ئێستا ئەندامی دەستەی کارگێری ئۆرکسترای کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی عیراقە.
- ئەندامی ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستانە.
- بەردەوامە لە بەڕێوەبەرایەتی هونەرەکانی میوزیک تا ئێستا وەک لێپرسراوی بەشی میوزیک وە لەسەرجەم چالاکییەکانی ئەم بەڕێوەبەراتییە بەشداری کردووە.
- خەڵاتی یەکەم کەمانچە ژەنی وەر گرتووە لەسەر ئاستی عیراق ساڵی ١٩٧٩ لە گەڵ چالاکی قوتابخانەکان
- ئاوازی دوو تابلۆی هونەرە میللییەکان داناوە (لۆ شوانۆ

- سنجانی)
- چەندین ئاوازی بۆ گۆرانی بێژان داناوە وە هەندێکیان کۆمپانیای بابلی عیراقی تۆماری کردووە.
- ٢٣ بەرنامەی تەلەفیزیونی تۆمار کردووە بۆ پەنجا گۆرانی بێژی تورکمانی وە هەموویان لە ئامادەکردنی مۆسیقای خۆی بووە.
- لەگەڵ تیپی هونەرە میللییەکان گەشتی کردووە بۆ وڵاتانی:

ئەڵمانیای رۆژ ئاوا - ١٩٨١
ئەڵمانیای رۆژ هەڵات - ١٩٨١
یەکگرتووی سۆڤییێت - ١٩٨٢
نەمسا - ١٩٨٢

- بەشداریی کردووە لە ڤیستیڤالی هونەری

فەرنسا - ٢٠٠٥
سویسرا - ٢٠٠٥

- بەشداری کردووە لە ئاهەنگی نەورۆز لە ئەڵمانیا (شتوتگارت) ٢٠٠٥
- چەندین خولی مۆسیقای کردۆتەوە بۆ پێگەیاندنی منداڵ و لاو لە چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر.

**ئەبوزێد شاکر عەبدولرەحمان**
**(ئەبوزێد دێوانە)**



**لەدایکبووی:** ١٩٤٥
لە ساڵی ٢٠٠٩ کۆچی دوایی کردووە
**دەستپێک:** ١٩٦٤ لە تەحسین تەها فێری ژەنینی ئامێری گالتۆن بووە کە وەک عود بووە و تەحسین تەها دروستی کردووە.



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١٩٦٥ لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان تیپێکی پێکهێنا بۆ گوتنی گۆرانی کوردی و بەردەوام بوون لەسەر کاری خۆیان تا ساڵی ١٩٦٧ کە ئازادکران.

لە کۆتایی ١٩٦٧ کاسێتێک تۆمار دەکا وەک یەکەم بەرهەمی خۆی لەگەڵ حەسەن سیساوەی لاوکبێژ و حەیرانبێژ.

چەندین کاسێتی تۆمار کردووە بۆ هونەرمەندان: (مشکۆ، محەمەد ئەحمەد ئەربیللی، جەلال مەردان، حەسەن سیساوە، تاهیر تۆفیق و زۆرانی تر.

چەندین کاسێتی تۆمار کردووە کە خۆی وەک سازژەن و گۆرانیبێژ بەشداربووە تێیدا.

لە ٢٠٠٨/٩/١ لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی هونەرەکانی میوزیک لە فێستیڤاڵی کۆرالی کەرکوک بەشداری کردووە.

**جەمال جەمیل محەمەد عەلی**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٦- مەخموور.

**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی لە هەولێر- ١٩٧٨

**دەستپێک:** ١٩٦٤ لەسەر دەستی هونەرمەند تەحسین تەها فێری ژەنینی ئامێرە میوزیکییەکان بووە.

**چالاکی و بەرهەمەکانی:**

- ساڵی ١٩٧٣ بۆ یەکەمین جار لە سەر دەستی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (سەید ئەحمەد بەرزنجی) فێری ئامێری کەمانچە بووە.
- ساڵی ١٩٧٥ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی مەخموور (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) ی دامەزراندووە.
- ساڵی ١٩٧٦ کۆمەڵێک بەرهەمی بۆ رادیۆی بەغدا بەشی کوردی تۆمار کردووە.
- ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٨٢ لە مەخموور کاری هونەری ئەنجام داوە.
- (٨) ساڵ لە شەڕی عێراق - ئیران بە دیل گیراوە.
- ساڵی ١٩٩١ دەستی بە کاری هونەری کردۆتەوە.
- ساڵی ١٩٩١ ئەندامی دەستەی کارگێڕی کۆمیتەی مەخموور- ی (یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان) بووە.
- ساڵی ١٩٩٤ بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی -مەڵبەندی گشتیی هەولێر،ساڵی ٢٠٠٠ بۆتە ئەندامی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵە.
- بۆ چەندین هونەرمەندانی هەولێر و مەخموور ئاواز و مۆسیقای داناوە.
- ساڵی ٢٠٠٤ لە یەکەمین کۆنفرانسدا بە بەرپرسی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) هەڵبژێردراوە.
- ساڵی ٢٠٠٤ بۆتە بەرپرسی چالاکی قوتابخانەکان لە مەخموور.
- ساڵی ٢٠٠٧ بۆتە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی هونەری لە مەخموور.
- ساڵی ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨ لە فیستیڤاڵی چالاکی قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستان پلەی یەکەمی بە دەست هێناوە لە سەر ئاستی هەرێم.
- ئێستاش بەردەوامە لە کارە هونەرییەکانی لە مەخموور.
- جگە لە مۆسیقا لە هونەری شێوەکاریشدا چالاکی بەردەوامە.
- لە مەخموور (تیپی مۆسیقای خونچەکانی مەخموور) ی دامەزراندووە.
- ساڵی ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ سەرۆکی نووسینگەی مەخمووری (سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان) بووە.



### سەید ئەحمەد عەبدولکەریم ساڵح بەرزنجی



**لەدایکبووی:** ١/٧/ ١٩٥٢- مەخموور

لە ٣/٢/ ١٩٩٩بە نەخۆشی لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە

**پلەی خوێندن:** لە ساڵی ١٩٧٠ خانەی مامۆستایانی هەولێری تەواو کردووە

**دەستپێک:** ١٩٦٧

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لەگەڵ هونەرمەندی کۆچ کردوو «تاهیر تۆفیق»

بەشداری لەچەندین ئاهەنگ و گۆرانی کردووە وەکو ژەنیارێک
٢- چەند ئاوازێکی بۆ هونەرمەند بورهان خۆشناو داناوە لەوانە گۆرانی «نەشمیل»
٣- چەند ئاوازێکی بۆ هونەرمەند «عارەب عوسمان داناوە» لەوانە «باگیێ»
٤- چەند ئاوازێکی بۆ هونەرمەند «میران هەرکی» داناوە
٥- ئاوازی بۆ هونەرمەند «محەمەد جەزا» داناوە
٦- لەگەڵ هونەرمەند «تەحسین تەها» بەشداری چەندین گۆرانی کردووە وەکو ژەنیار
٧- لەگەڵ هونەرمەند «ئایشە خان» بەشدار بووە لە گۆرانییەکانی وەکو ژەنیار.
٨- ئاوازی بۆ هونەرمەند «سەعید گاباری» داناوە.
٩- لەگەڵ هونەرمەند «جەلال سەعید» بەشداری گۆرانیەکانی کردووە وەکو ژەنیار.
١٠- لە ساڵی ١٩٨٠ ئەندامێکی چالاکی تیپی مۆسیقای هەولێر بووە لەگەڵ هونەرمەندان «وریا ئەحمەد و رزگار خۆشناو و کامەران تەها و جان تۆماس و تەلعەت عارف»
١١- لە ساڵی ١٩٨٣ تیپێکی لە کۆمەڵێک لاو دامەزراند بەناوی تیپی مۆسیقای "کاوە" چەندین ئاهەنگیان بۆ هونەرمەندان ساز کرد.
١٢- لەپاشان دەبێتە بەڕێوەبەری بەشی مۆسیقا لە چالاکی قوتابخانەکان.
١٣- لە ساڵی ١٩٩٩ بەڕێوەبەرایەتی کەلتووری گۆرانی و هونەری کوردی لە شاری هەولێر دامەزراند و خۆشی بوو بە بەڕێوەبەری.

## شێرزاد محەمەد حوسێن
## (شێرزاد سەرسپی)



**لەدایکبووی:** ١٩٤٨
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی
**دەستپێک:** ١٩٦٨
**بەرهەمەکان:**
لە وڵاتەکانی (ئەڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا، نەمسا، فەرەنسا، سکوتلەندا، جنێڤ) کاری هونەری کردووە.
١- ساڵی ١٩٦٨ ئەندامی تیپی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووە.
٢- ساڵانی ١٩٧٠ سەرۆکی تیپی مۆسیقای کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی بووە.
٣- لە ساڵی ١٩٧٦- ١٩٧٧ ئەندامی تیپی هونەری هەولێر بووە.
٤- ساڵانی ١٩٧٩ سەرۆکی تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێر بووە.





٥- بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی هونەرەکانی میوزیکە.
٦- سەرۆکی ئۆرکسترای کوردستان بووە.
٧- سەرۆکی گروپی میوزیکی رەسەنە.

**مەجید خدر سەعید خۆشناو**
**"مەجید خۆشناو"**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣- شەقلاوە
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە بەشی میوزیکی هونەرە جوانەکانی بەغدا
**دەستپێک:** کۆتایی شەستەکان

**بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی بەشاخ کردووە، وەک پێشمەرگە و هونەرمەند لە راگەیاندنی "ی. ن. ک" و وەک میوزیکژەن ماوەی ساڵێک لە تیپی شەهید کارزان کاری کردووە.
٢- لە ساڵی ١٩٨٢ تا ١٩٨٧ وەک پێشمەرگە و میوزیکژەن و لە مەڵبەندی ٣ی "ی. ن. ک" کاری کردووە.
٣- لە دوای راپەڕین وەکو بەرپرسی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لقی شەقلاوە کاری کردووە و بەشداری گشت کۆنفرانسەکانی ئەو رێکخراوەی کردووە.
٤- لە ساڵی ١٩٧١ تا ١٩٧٤ بەشداری ئاهەنگەکانی بەغدای کردووە و لەتیپی ئێزگەی کوردی بەغدا بۆتە



ئەندام و بەشداری تۆمارکردنی چەندین گۆرانی بۆ هونەرمەندانی نەمر "تەحسین تەها، تاهیر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد، خەلیل مرادوەندی"ی کردووە.
٥- لەناو کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران ماوەی چەند مانگێک لەگەڵ هونەرمەندان "نەجمەی غولامی، مەرزیە فەریقی، ناسری رەزازی" کاری کردووە.
٦- لە مەڵبەندی ٣ی "ی. ن. ک" بەشداری رێکخستنی چەندان چلەی شەهیدی کردووە، وەک: "شەهید سەید کەریم، هاوڕێ کاوە، شەهیدانی کەرتی رێکخستنی شەقلاوە، شەهید مامەریشە..."
٧- بە بەردەوامی لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەنووسێ و زۆربەی نووسینەکانی تایبەتن بە هونەر.
٨- یەکەم ئاوازی سروودی "کۆچی قوربانی ولاتم" لە هۆنراوەی د. مارف عومەر گوڵ و بە دەنگی تاهیری خەلیلی تۆمارکراوە بووە.
٩- ژمارەیەکی یەکجار زۆر سروودی منداڵانی هەیە، کە لە ئاواز و هۆنراوەی خۆیەتی.
١٠- کتێبێکی لەژێر چاپە لەژێر ناونیشانی "لە ئاوێزانی هونەری میوزیکدا".
١١- جگە لەوە دوو کتێبی دیکەی لەسەر میوزیک وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ئەوانیش " دە ئاواز و سیمفۆنیای جیهانی" لە نووسینی سوردیا لەمحەس و "جیهانی میوزیک" لە نووسینی دکتۆر زەین نەسارە.
١٢- برای هونەرمەند "هێڤی خۆشناو"ەو دەستێکی باڵای هەبووە لە پێگەیاندنی.

**وریا ئەحمەد**



**لەدایکبووی:** ١٩٤٧- بەفری قەندی- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی خانەی مامۆستایان
دبلۆم لە زمان و ئەدەبی هۆڵەندی
**دەستپێک:** ١٩٦٥

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* ساڵی (١٩٧٠) لە قوتابخانەکانی شاری کۆیە بە مامۆستای (سروود و میوزیک) دامەزراوە.
* یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی (تیپی مۆسیقای باواجی-ـ کۆیە) کە بە نووسراوی (٨٣٢) لە (١٩٧٢/٣/١) لەلایەن (دەزگای سینەما و شانۆ) مۆڵەتی رەسمی پێدراوە.
* ساڵی (١٩٧٣) لەگەڵ کۆمەڵێک هونەرمەندی کورد بەشداری لە (فێستیڤاڵی دیەمی لاوانی جیهان لە بەرلین) لە پایتەختی ئەڵمانیای رۆژهەڵات کردووە.
* ساڵی (١٩٧٤-ـ ١٩٧٥) ئەندامی (تیپی مۆسیقای شۆڕش) بووە.
* ساڵی (١٩٧٥) لە خولێکی (میوزیک و ئاواز دانان) لە بەغدا بەشداری کردووە و لە نێوان چەندین دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بە پلەی (ئیمتیاز) دەرچووە.
* ساڵی (١٩٧٥) بەرەوژوور لێپرسراو و سەرپەرشتیاری (تیپی هونەری هەولێر) بووە.
* دوای هەرەسی شۆڕش خاوەنی بیرۆکە و هەم یەکێک لە



دامەزرێنەران و فێرکارانی (تیپی مۆسیقای منداڵانی هەولێر) بووە.
* لە هەشتاکاندا هەر لە هەولێر دامەزرێنەر و فێرکاری (تیپی مۆسیقای خانزادی کچان) بووە.
* ساڵی (١٩٧٨) ئەندامی ئەو شاندە هونەرییە بوو، کە بۆ سوریا نێردران.
* ساڵی (١٩٧٦) بە سەرەوە سەرۆکی (تیپی مۆسیقای چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر) بووە.
* دوای راپەڕین دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای (زیر وبەم) بووە، کە یەکەم تیپی هونەری بووە، مۆڵەتی کارکردنی فەرمی لە حکوومەتی کوردستانەوە وەرگرتووە.
* ساڵی (١٩٩٧) لەگەڵ گۆرانیبێژ (تەنیا عارەب عوسمان) و چەندین هونەرمەندی کوردی تر بە مەبەستی (کۆنسێرت) گێڕان داوەتی وڵاتی فەرەنسا کران.
* ماوەی چەندین ساڵ لە (میدیا و مەد و رۆژ TV)، لە (بروکسل) ی پایتەختی (بەلجیک) سەرپەرشتیاری (کۆما باخچەی گوڵان) بووە.
* لە ماوەی ژیانی پەنابەریدا لە وڵاتی (هۆڵەندا) کە (٧-ـ ٨) ساڵی خایاندووە، لەو ماوەیەدا توانیویەتی دوو تیپی میوزیک دامەزرێنێت: (تیپی میوزیکی دلارام) و (تیپی میوزیکی شەهابە هەولێری).
* لە هەندەران دەستی هەبووە، لە هاندان و بەدەرخستن و پێشخستن و ئاوازدانان بۆ چەندین هونەرمەند لەوانە: (چۆپی، تەنیا ئیدریس، شازاد خانم، فاتێ، رزگار

ڕەنجەڕۆ و (CD) ی یەکی تایبەتی کە چەندین پارچە میوزیکی نوێی ئاوازەکانی خۆی گرتۆتەخۆ).

* لە ئەوروپا لە دەیان کۆنسێرت بەشداری کردووە، لەوانە کۆنسێرتەکانی (ئەکادیمیای کوردی لە ئەڵمانیا).
* ئەمڕۆیش دوای گەڕانەوەی بۆ وڵات، وەک (شارەزا) لە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان کاردەکات.
* ئێستا سەرۆکی (تیپی هونەری زیر وبەمی هەولێر) ە.
* ئەندامی ڕاوێژکاری (دەزگای میوزیک و کەلەپووری کورد) ە لە هەولێر و سەرنووسەری گۆڤاری (چلاواز)ە، کە تا ئەمڕۆ (٣٢) ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە.
* لە سەرەتای دامەزراندنی (کۆلیجی هونەرە جوانەکان)ەوە لە هەولێر تا ئەمڕۆ وەک (ڕاهێنەری هونەری) لە بەشی میوزیکی ئەو کۆلێجە کاردەکات.
* وەک نووسەریش تا ئەمڕۆ خاوەنی ئەم بەرهەمە هونەرییانەیە:

١) کتێبی (ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی) کە ساڵی (١٩٨٩) ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێر بەچاپی گەیاندووە.

٢) کتێبی (باڵەبان) کە ساڵی (١٩٩٧) لە هەولێر بە هاوکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان بەچاپ گەییوە.

٣) ژمارە یەکی گۆڤاری (چلاواز) کە نۆتە و تێکستی (٤٩) گۆرانی کوردی بە هەردوو ئەلف وبێی (لاتینی و عەرەبی) گرتۆتە خۆ، کاری ڕاڤەو بە نۆتەکردنی لە لایەن (وریا ئەحمەد) ەوە بو کراوە، بە هاوکاری (دەزگای میوزیک و کەلەپووری کورد) لە هەولێر ساڵی (٢٠٠٥) بە چاپ گەییوە.

٤) کتێبی (تەمیرە)، کە زیاد لە نۆتەی (٤٠) گۆرانی گرتۆتەخۆ، هەندێ لە ئاوازەکان هی خۆیەتی و تیایدایە فۆلکلۆرن، ئەو ئەرەنجەی میوزیکی بۆ کردوون، هەیشە پەیژە و مەقامەکانی دەستنیشان کردوون و نووسیونی. شایانی باسە ئەم کتێبەیان لەلایەن (دەزگای میوزیک و کەلەپووری کورد) ساڵی (٢٠٠٨) بلاو کراوەتەوە.

## زرار محەمەد مستەفا
## (زرار ڕواندزی)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٧- ڕواندز

پلەی تا پۆلی پێنجی ئامادەیی خوێندووە و دوای خولێکی سێ مانگەی وەزارەتی پەروەردە بەمامۆستای سەرەتایی لە دەربەندی ڕایەتێ دامەزراوە.

**دەستپێک:** شەستەکان

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* لە ژیانیدا ٣٨ سوپاس و ڕێزی وەرگرتووە.
* ٨ خولی فێرکردنی میوزیکی بۆ منداڵان و مێردمنداڵان و قوتابیان و لاوانی ڕواندز کردۆتەوە.
* ١٩٧١ دەستپێک
* ١٩٧٤ لەگەڵ فوئاد ئەحمەد و شاکر سابیر ڕوو لەشاخ و شۆڕش دەکەن.
* ١٩٧٥ بەزەبر و زەنگ بەشداری چەند بەرهەمێک بۆ ڕژێم دەکا.



* ١٩٧٦ لە سلێمانی لە خولێکی کاری دەست بەشدار دەبێ و لەوێ سەردانی تیپی مۆسیقای سلێمانی دەکا و دەبینێ واخەریکن منداڵان فێری میوزیک دەکەن، بۆیە بریاری دا لەرواندز لەو جۆرە خولانە بکاتەوە.
* ١٩٧٧/٧/١ بۆ یەکەمجار لە رواندز دەستدەکا بە فێرکردنی میوزیک بۆ منداڵان کە منداڵەکان بریتی بوونە لە:
١- چەتۆ ساڵح نەورۆز- کەمان
٢- سیروان عەبدوڵڵا ئیسماعیل سیرینی - کەمان
٣- شێرزاد ئەکرەم حەیدەری- کەمان
٤- فاروق باپیر نیعمەت- کەمان
٥- رێبوار نوری سەعید- کەمان
٦- ئامانج غازی شاکر - عوود
٧- سەید ئەحمەد سەید جەبار - ئۆرکۆدیۆن
٨- رزگار جەودەت جەمیل- ئۆرکۆدیۆن
٩- بژار نوری سەعید- گیتار
١٠- نیعمەت بایز نیعمەت- تەپڵ
* لە ساڵی ١٩٧٩ منداڵە بەهرەمەندەکانی رواندز دێنێتە هەولێر و لەگەڵ وریا ئەحمەد و منداڵە بەهرەمەندەکانی هەولێر تیپی مۆسیقای منداڵانی هەولێر دروست دەکەن و بۆ یەکەمجار لەشاری سەماوە بەشداری لە میهرەجانی سەرتاسەری چالاکی قوتابخانەکان دەکەن و لەکۆی تیپی (١٨) پارێزگاکەی عێراق پلەی یەکەم بەدەست دێنن.
* ١٩٨٢ هەمان تیپ بەشداری میهرەجانی دووەمی هونەری کوردی لە هەولێر دەکەن.
* بۆ جاری یەکەم لەگەڵ تیپی پاشای گەورەی رواندز لە ١٩٨٤/١١/١٤ یازدە بەرهەمی نوێ بۆ ئێزگەی کوردی بەغدا تۆمار دەکەن.
* ساڵی ١٩٧٢ ئاوازی بۆ هۆنراوەی (ئەمڕۆ رۆژی ماتەمە) ی بێکەسی شاعیر داناوە.
* چەند ئاوازێکی بۆ هونەرمەندان وشیار ئەحمەد ئەسوەد و عوسمان هەورامی داناوە و لە ٢٠٠٧/٦/١ لەرۆژی جیهانی منداڵان لەهەولێر ئەو بەرهەمانە پێشکەش کراون.
* لە ٢٠٠٨/٨/٢٠ بە ئامادەبوونی نێچیرڤان بارزانی و خەڵکێکی زۆر مەراسیمێکی رێزلێنانی بۆ کرا و لەلایەن کۆمپانیای چوار چرا و وەزارەتی رۆشنبیریش خەڵات کراوە و رێزی لێنراوە.
* تا ئێستا دوو کۆری لەسەر میوزیک گێڕاوە لەژێر ناوەکانی:
١- پەروەردە و میوزیک: لە رواندز لە باڵەخانەی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی پێشکەشی کردووە.
٢- هونەری مۆسیقای منداڵان: لە هەولێر و رواندز و خەلیفان پێشکەشی کردووە.
* کتێبێکی بەدەستەوەیە لەسەردتای مێژووی هونەر تا ئەمڕۆ لە رواندز.
* جگە لە کاری مۆسیقا بەشداری لە چەندین کاری شانۆییشدا کردووە.

**فوئاد محەمەد فەقێ حەسەن رواندزی**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣- رواندز
**دستپێک:** ١٩٧١- تیپی مۆسیقای یەکێتی مامۆستایانی کوردستان- رواندز
**چالاکی و بەرهەمەکان:**
* ١٩٧١- ١٩٧٤ بەشداری گشت بۆنە و ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای یەکێتی مامۆستایانی کوردستان- رواندز کردووە.
* ١٩٧٤- ١٩٧٥ چۆتە ریزی شۆڕش و لە تیپی مۆسیقای شۆڕش کاری کردووە.
* ١٩٧٥- ١٩٧٩ لە تیپی شانۆی لادێ کاری کردووە.
* ١٩٧٧ بۆتە ئەندامی تیپی هونەری هەولێر و لەگشت چالاکییەکانی ئەو تیپە بەشداری کردووە.



* ١٩٧٩ یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی تیپی هونەرە میللییەکان لە هەولێر.
* لە وڵاتانی (ئەڵمانیای رۆژئاوا، ئەڵمانیای رۆژهەڵات، یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، لاتیڤیا، ریگا، نەمسا) کاری هونەری پێشکەش کردووە.
* لە ساڵی ١٩٩٦- ٢٠٠٥ لە ئەڵمانیا ژیاوە کاری بۆ زۆرێک لە هونەرمەندان کردووە، وەک (شوان پەروەر، ناسری رەزازی، مەرزیە، حەمە جەزا).
* ماوەی ٥ ساڵ لە وڵاتی بەلجیکا لە کەناڵی میدیا tv کاری کردووە.

**چەتۆ سالح نەورۆز**
**(چەتۆ نەورۆز)**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٣- رواندز
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ



**دەستپێک:** لە قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی پاشای گەورە لە رواندز

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

- ئەندامی تیپی پاشای گەورەی رواندزە.
- لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ بەشداری هەموو چالاکییەکانیان کردووە.
- لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد جەوادی ئۆرکسترایەک دادەمەزرێنن.
- لە تیپی رادیۆ و تەلەفزیۆنی موسڵ ئەندام بووە.
- ئەندامی دامەزرێنەری تیپی پاشای گەورەی رواندز بووە، لەگەڵ ئەو تیپە چەندین بەرهەمیان تۆمارکردووە بۆ هونەرمەندان ناسری رەزازی و نەجمەی غولامی و کالێ و سلێمان ئەحمەد و سەلام و ساماڵ و وەلی حەسەن دۆسکی و چەندین هونەرمەندی دیکە.
- لە ساڵی ١٩٨٨ لە ئێزگەی بەغدا چەندین ئەلبوومیان بۆ تیپی پاشای گەورەی رواندز تۆمار کردووە.
- لە ساڵی ١٩٩١ لە دەڤەری سۆران و شاری سلێمانی و رانیە و شوێنەکانی دیکە، چەندین کۆنسێرتیان بۆ شڤان پەروەر و ناسر رەزازی ئەنجامداوە.
- لە ساڵی ١٩٩٧ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ئۆرکسترای کوردستان بووە و تا ئێستا بەردەوامە وەکو مایسترۆی ئەو ئۆرکسترایە.
- تاکە کەس بووە توانیویەتی سروودی ئەی رەقیب بە دابەشکردن و ئامادەکردنێکی نوێ نوێ بکاتەوە و تیپی سەمفۆنیای نیشتمانی نەتەوەیی عێراقی لە هەولێر نمایش و تۆماریان کرد.

- لە ساڵی ۲۰۰۸ ئەندامی لیژنەی هەڵسەنگاندن بوو لە بەرنامەی ستۆدیۆی ئەستێران.
- ئێستا مامۆستای وانەبێژە لە کۆلیژی هونەرە جوانەکانی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر، لە بەشی ڤیۆلین.

**جان تۆماس**

**لەدایکبووی:** ٤/٤/١٩٤٧ - کۆیە
**پلەی خوێندن:**
**دەستپێک:**

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١٩٧٢- ١٩٧٤ دەستەی بەڕێوەبردنی تیپی باواجی کۆیە بووە

١٩٧٧- ١٩٨٠ لە دەستەی بەڕێوەبردنی تیپی مۆسیقای هونەری هەولێر بووە.

١٩٦٦- ١٩٦٨ لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی کاری کردووە.

١٩٧٦- ١٩٧٩ لەگەڵ یونس باکووری دامەزرێنەری تیپی جۆزیف تریۆ بووە.

١٩٨٠- ١٩٨٤ سەرپەرشتیاری تیپی مۆسیقای خانزادی کردووە.

١٩٧٤ بەشداری یەکەمین میهرەجانی هونەری کوردی کردووە.

لە چەندین خولی فێرکردنی مۆسیقا وەک مامۆستا بەشدار بووە.

چەند بەرهەمێکی بۆ قادر کابان و کۆڕی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە و تیپی خانزاد و تیپی باکووری ڕۆژئاوایی ئامادە و تۆمارکردووە.



١٩٩٨ کتێبی ڕەزمەکانی مۆسیقای کوردی لە چاپداوە.

ئەندامی دەستەی کارگێڕی ئۆرکسترای کوردستان بووە.

**ساڵح عیسا محەمەد**
**(ساڵح سەرچناری)**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٤
**پلەی خوێندن:** سەرەتایی.
**دەستپێک:** ١٩٧٥

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

لە ساڵی ١٩٨٣ بۆ یەکەم جار لەگەڵ تیپی هونەرە میللییەکان بەشداری کردو لەگەڵ ئەوان بەردەوام بوو لە هەموو فستیڤاڵ و کارە هونەرییەکان و تابلۆکانی هەڵپەرکێ و کارە کوردەوارییەکان بەشداری کردووە.

بەشداری کردووە لە زۆربەی فستیڤاڵەکانی عێراق و کوردستان بە تایبەتی مهرەجان دوەلی بابل..

بەرهەمی تۆمارکراوی زۆرن چ بەتەنیاو چ لەگەڵ زۆربەی گۆرانیبێژە ناسراوو بە تواناکان، وەک هونەرمەندان جلال سعید و خالید پشدەری و خوالێخۆشبوو ئەحمەد شەماڵ و هتد...

هەروەها چەند بەرهەمێکی تۆمارکردووە لەگەڵ تیپی هەولێر، یەک لەوانە گۆرانی (ساقی مەیخانە) بوو کە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووک تۆمارکرابوو.. هەروەها بەرهەمی تۆمارکراوی دیکەشی هەن لە کەناڵە ناوخۆییەکان وەکو تەلەفزیۆنی هەرێم.



ئەندامی تیپی میوزیکی کەلەپووری کورد و بەشداری هەموو فستیڤاڵەکان و کارو چالاکییە هونەرییەکانی ناوەوە و دەرەوەی شاری هەلێری کردووە.



٦- چەندین ئاوازی بۆ هونەرمەندانی کورد داناوە.
٧- چەندین بەرنامە و کۆنسێرتی هونەری بۆ هونەرمەندان سازکردووە.

**سەید ئەحمەد رواندزی**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٣- رواندز
**دەستپێک:** ١٩٧٧/٧/١
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ - ١٩٨٥.

**بەرهەم و چالاکییەکانی:**

١- ئەندامی ئۆرکسترای کوردستانە.
٢- ئەندامی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کورد- لقی رواندزە.
٣- بەرپرسی بەشی میوزیکە لە سەتەلایتی کوردستان.
٤- رابەری گروپی میوزیکی هونەرمەند زدکەریایە.
٥- مامۆستایە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر.

**ئامانج غازی**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٥ لە رواندز لە دایک بووە.
**پلەی خوێندن:** بەکالۆریۆس لە هونەرە جوانەکانی هەولێر - مۆسیقا
**دەستپێک:** ١٩٧٧ لەسەر دەستی هونەرمەند زرار محەمەد مستەفا فێری میوزیک بووە.

**بەرهەم و چالاکییەکانی:**

* ١٩٨٠ چوودتە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ.
* ١٩٨٥ بەیەکەم دەرچووە لەسەر هەموو بەشەکانی پەیمانگا.
* (٢٨) ئاوازی جۆراوجۆری داناوە بۆ هونەرمەندان.



* (٧) کۆڕالی گۆرانی لە شیعری شاعیران (کەریم دەشتی- سعداللە پەرۆش -بەختیار عەلی -قوبادی جەلی زادە- ئەحمەدی شامیلۆف- ئەدۆنیس) داناوە.
* خاوەنی درێژترین گۆرانی کوردییە (کۆچ و باران) کە باس لە کۆچڕەودکەی بەهاری ١٩٩١ دەکات.
* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر.
* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئۆرکێسترای کوردستان.
* ئەندامی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردییە لقی ڕواندز.
* ئەندامی ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستانە.
* سکرتێری ئۆرکێسترای کوردستانە.
* ٢٠٠٤- ٢٠٠٦ بەڕێوەبەری کەلەپووری کورد بووە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری.
* ٢٠٠٦ بەڕێوەبەری هونەرەکانی میوزیک لە وەزارەتی ڕۆشنبیری.
* ٢٠٠٧- ٢٠٠٨ کۆلێژی هونەرە جوانەکانی زانکۆی سەلاحەدینی بە پلەی یەکەم تەواوکردووە.
* خاوەنی دەیان وتار و لێکۆڵینەوەو ڕەخنە و بابەتی هونەری میوزیکە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان.
* ئەم کتێبانەی بەچاپ گەیاندووە.

١. بەزم و ڕەزمی منداڵان (ئاواز بۆ منداڵان).
٢. هارمۆنیای دەنگ.
٣. ژمارەیەکی تایبەت بە نەورۆز لە گۆڤاری (چلاواز) ئامادەکردن.
٤. میوزیکی ڕەسەن هزرو داهێنان.

* ئەم کتێبانەی ئامادەیە بۆ چاپ (وەرگێڕ ان).

١. هارمۆنی د. محەمەد عزیز زازا.
٢. فەرهەنگی میوزیک احمد بیومی.

## ئازاد محەمەد ئیسماعیل



**لەدایکبووی:** ١٩٦١- هەولێر
**پلەی خوێندن:**
**دەستپێک:** ١٩٧٧

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* وەکو میوزیکژەن بەشداری کردووە لە کردنەوەی چەندین - کردنەوەی مۆسیقا لە شاری هەولێر و کوردستان و وەکو مامۆستا وانەی تێدا گوتۆتەوە.
* لە چەندین تیپ وەکو میوزیکژەن کاری کردووە، لەوانە (تیپی مۆسیقای زیرەک، تیپی مۆسیقای هونەر وێژەی کوردی- لقی هەولێر،

تیپی هونەری هەولێر، تیپی نەتەوایەتی هونەرە میللییەکان - هەولێر، تیپی نەتەوایەتی هونەرە میللییەکان - بەغدا، تیپی یەکگرتووی هونەرمەندانی عێراق - بەغدا - فێستیڤاڵی بابلی نێودەوڵەتی، تیپی مۆسیقای بەڕێوەبەرایەتی هونەری مۆسیقا وەزارەتی



رۆشنبیری هەولێر، ئۆرکسترای کوردستان، سیمفونیای نیشتیمانی عێراق.

- وەک مامۆستایەکی میوزیک چەندین قوتابی و ژەنیاری لێهاتووی بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی پێ راگەیاندووە کە ئێستا لەناو گروپ و تیپەکانی میوزیک و گۆرەپانی هونەری گورانی میوزیکی کوردی کارەدەکەن.
- گرنگترین کارە هونەرەییەکانی هەنەرمەند بەشداری هەبووە لە چەندین فێستیڤاڵی هونەری لە کورستان - بەغدا - بابل.
- بۆ ماوەی (٨) ساڵ ئامادەکارو پێشکەشکاری پرۆگرامی هونەری میوزیک - دیداری هونەری - سولێو لە Tv هەرێم بووە.
- ئێستاش سەرۆکی بەشی میوزیکە لە بەڕێوەبەرایەتی هونەرەکانی میوزیک - هەولێر.

**ئاراس ئیسماعیل حەوێز**
**(ئاراس کۆیی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٩- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی
**دەستپێک:** ١٩٧٧- تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە
**بەرهەمەکان:**

* وەکو ژەنینی مۆسیقا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هونەرمەندە کوردەکان بەشداری کردووە، وەک: (ناسر رەزازی، نەجمەدین غولامی، شەهێن تالەبانی، سەلاح محەمەد، ئیبراهیم سابیر، زەکەریا عەبدوڵلا، مەرزیە



فەریقی، لەیلا فەریقی، حوسێن شەریف، چۆپی فەتاح، شوان پەرودر، فاتێ، محەمەد تەها، تەحسین تەها... هتد).

* وەکو ئاوازیش چەندین ئاوازی بۆ هونەرمەندانی کورد داناوە، لەوانە: (محەمەد عەزیز، ئیبراهیم ئیسماعیل، هاوژین ئەسعەد، سەردار قادر، دڵنیا قەرەداغی، خۆشەوی عەزیز، ئالان عومەر، هەژار عەبدولستار، ئەردەلان بەکر.... هتد).

لەو تیپانە ئەندام بووە: (باواجی کۆیە، زیر و بەم، کەلەپووری کورد، سەتەلایتی کوردستان، گروپی نالی، گروپی لاوانی کۆیە، گروپی بۆتان، گروپی کاردۆ).

**خەلیل عوسمان عەولا**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٦- هەولێر
**پلەی خوێندن:**
**دەستپێک:** ١٩٧٧



**چالاکییەکان:**

١- لە ساڵی ١٩٧٧ وەکو مۆسیقاژەنێک و کۆراڵ بەشداری کردووە لە چەندین کۆنسێرت و فێستیڤاڵی لە هەولێر و موسڵ و کەرکووک لە تیپی مۆسیقای منداڵان.

٢- لە ساڵی ١٩٩٢ سێ بەرهەمی لەگەڵ گرووپی باڵا بەسەرپەرشتی هونەرمەند ئازاد محەمەد تۆمار کرد.

٣- لە ساڵی ١٩٨٢ تاکو ١٩٨٤ لەگەڵ تیپی مۆسقای خانەی هونەر وەکو مۆسیقاژەنێک دەست بەکاربوو وەکو ژەنیاری ئالەتی ئیقاع، لەگەڵ ئەو تیپە چەند بەرهەمێکیان بۆ تەلەفزیۆنی موسڵ و کەرکووک تۆمار کرد، لەگەڵ بەرنامەی "نسمات من بلادي".

٤- لە ساڵی ١٩٨٤ وەکو مۆسیقاژەن لەگەڵ تیپی مۆسیقای هونەرە میللییەکانی هەولێر دامەزراوە و لە هەموو چالاکی و نمایشەکانی ئەو تیپە بەشدار بووە، گرنگترینیان فێستیڤاڵی بابلی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٨٦ بووە.

### جەلال شاکر سەعید

**لەدایکبووی:** ١٩٦١- رواندز
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٧٨ لە تیپی پاشای گەورە

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

٨٠ ئاوازی بۆ ٢٣ هونەرمەند داناوە، لەوانە (زیاد ئەسعەد، محەمەد عەزیز، نیزام شوکر، کامەران ساڵح، عەزیز سەلام، سابیر عەبدولرەحمان، نوری گەرمیانی،



چۆپی فەتاح، فەرهەنگ عەبدولرەحمان، ئیبراهیم ئیسماعیل، خۆشەوی عەزیز....).

* ئاوازێکیشی بۆ سروودی یەکی شوبات داناوە.

٤ کاسێتی مۆسیقای تۆمارکردووە ١٢ پارچە مۆسیقا هی خۆیەتی و ١٢ پارچە مۆسیقاشی کلیپ کردووە.

لەگەڵ ئەو تیپانەدا وەک میوزیکژەن بەشدار بووە: (تیپی پاشای رواندز، کاوە، هونەرە میللییەکان، تیپی هەولێر، سازان، هۆزان، کاردۆ، رەسەن، هاوناز).

### سالار شوکری عەلی ئازید
**(سالار ئازید)**



**لەدایکبووی:** ١٤/١١/١٩٦٧- هەولێر
**پلەی خوێندن:** بروانامەی دیپلوم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا - ١٩٨٢ - ١٩٨٨

* بروانامەی پرۆفیشناڵ دۆسێنت میوزیک لە زانکۆی فۆنتیاس - کۆنسەرفاتوار تیلبۆرغ - هۆڵەندا.



- Fontys Braba-t-Netherlands /T-burg Conservatory -
Professional Violin Study from 1994 to 1998 master level.

**دەستپێک: ١٩٧٨**

**چالاکی هونەری و پیشەیی:**

١- ١٩٧٨ - ١٩٨٠ سەرۆکی تیپی منداڵانی هەولێر
٢- ١٩٨٠ - ١٩٨٢ ئەندامی تیپی هونەریی هەولێر
٣- ١٩٨٤ - ١٩٨٦ ئەندامی تیپی ئێزگە و تەلەفزیۆنی موسڵ
٤- ١٩٨٦ - ١٩٩٠ ئەندامی تیپی ئێزگە و تەلەفزیۆنی بەغدا
٥- ١٩٨٧ - ١٩٩٠ ئەندامی تیپی سەمفۆنیای نیشتمانیی بەغدا
٦- ١٩٩٢ - ١٩٩٣ مامۆستای بەشی میوزیک لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا
٧- من ١٩٩٨ ئەندامی سەندیکای هونەرمەندان
٨- ١٩٩٣ - ١٩٩٤ ئەندامی تیپی ئۆرکێسترای ئۆسترهاوت لە هولندا

**Oosterhout Symphony Orkest in Netherlands**

٩- ١٩٩٤ - ١٩٩٥ ئەندامی تیپی ئۆرکێسترای بریدە لە هولندا وەک ژەنیاری ئامێری سۆلۆ

**Breda Symphony Orkest in Netherlands**

١٠- ١٩٩٥ - ٢٠٠٢ ئەندامی تیپی ئۆرکێسترای بەخلایدن لە تیلبۆرغ لە هولندا

**Tilburg Begeleiden Orkest in Netherlands**

١١ - ١٩٩٤ - ٢٠٠٠ ئەندامی تیپی ئۆرکێسترای زێویس ئۆرکێست فی زەیلاند لە هولندا

**Het Zeeuws Orkest in Zeeland Netherlands**

١٢- ١٩٩٧ - ١٩٩٩ مامۆستا لە پەیمانگای مۆزیک بەشی ئامێری ڤیۆلین لە ئۆسترهاوت لە هولندا.
١٤- ١٩٩٨ - ٢٠٠٨ مامۆستا لە پەیمانگای مۆزیک بەشی ئامێری ڤیۆلین لە ئەمەدویوس لە ئاودەنبوش لە هۆلندا.
١٥- لە ١٩٩٤ تاکو ئێستا ژەنیاری سۆلۆی ڤایلین و بەشداریکردن لە ژمارەیک فێستیڤاڵی نێودەوڵەتی کردووە.
١٦- لە ساڵی ٢٠٠٣ تاکو ئێستا ئەندامی گرووپی مەقامی عێراق بۆ گۆرانی رەسەنی عێراقی لە هۆڵەندا.
١٧- ١٩٩٨ - ٢٠٠٧ سەرۆکی تیپی میوزکی رۆژهەڵاتی لە بەلجیکا.
١٨- ٢٠٠٣ تاکو ئێستا ئەندامی تیپی کڤکنار بۆ میوزیکی جیهانیی لە هۆڵەندا.
١٩- لە ساڵی (٢٠٠٧) ەوە تاکو ئێستا مامۆستا لە کۆلێژی هونەرە جوانەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر.
٢٠- لە ساڵی ١٩٩٨ تاکو ئێستا کاری ئەرێنج و دانانی ئاوازی بۆ نزیکەی ٤٥ CD کردووە بۆ گۆرانی بێژانی کورد و عەرەب و تورک و هۆڵەندی کە ژمارەیک لە کارەکان لەسەر ئەم وێب سایتیەی هەیە.

**www. salarasidmusic. com**

٢١ - لە ١٩٩٨ یەکەم CD سۆلۆ ڤیۆلینی تایبەت بەخۆی دەرهێناوە کە هەموو کارە هونەرییەکانی بەدەستی خۆیەتی.
٢٣- لە ٢٠٠٤ دووەم CD سۆلۆ ڤیۆلینی تایبەت بەخۆی دەرهێناوە کە هەموو کارە هونەرییەکانی بەدەستی خۆیەتی.
٢٤- لە ٢٠٠٥ سێیەم CD سۆلۆ ڤیۆلینی تایبەت بەخۆی دەرهێناوە کە هەموو کارە هونەرییەکانی بەدەستی خۆیەتی.

**فەرهەنگ غەفوور**



**لەدایکبووی:** ١٩٧١

**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بەکالۆریۆس لە هونەرە جوانەکانی زانکۆی سەلاحەدین

**دەستپێک:** ١٩٧٩- تیپی میوزیکی قوتابخانە

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە سالآنی ١٩٨٠ تا ١٩٨٦ لە چەندین چالاکی میوزیکی و کۆرسی مندالآن وەکو ژەنیاری ئامێری ریتم و ساز و جەمبوش و عود لە بەڕێوەبەرایەتی چالاکی قوتابخانەکان بەشداری کردووە.

٢- لە سالّی ١٩٨٧ تا ١٩٩٢ لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشداری لە گشت چالاکییەکانی پەیمانگا کردووە.

٣- لە سالآنی ١٩٨٨- ١٩٨٩ لەگەلّ گروپی مەلبەندی گشتی کۆمەلّەی هونەر و وێژەی کوردی و تیپی میوزیکی سلێمانی بەشداری لە چەندین چالاکی کردووە.

٤- لە سالّی ١٩٩٢ یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر، وەکو مامۆستای میوزیکیش ماوەی "١٠" سالّ وانەی گوتۆتەوە.

٥- لە سالّی ٢٠٠٣ تا ٢٠٠٨ وەکو بەڕێوەبەری چالاکی قوتابخانەکان کاری کردووە.

٦- دەستەی دامەزرێنەری ئۆرکسترای کوردستانەو لە سەرجەم چالاکییەکانی ئۆرکسترا وەک ژەنیاری ئامێری کەمانچە بەشداری کردووە و بەڕێوەبەری هونەری ئۆرکسترای کوردستانیشە.

٧- خاوەنی چەندین بەرهەمی میوزیکی و گۆرانییە لەوانە



کۆرالّی: "زەمبیل فرۆش، دلّم دایمەن لە هەولێرێ، سەربازی ون، دەرویش عەبدوللآ، سێوە" و چەندان ئاوازی دیکە کە بۆ گۆرانیبێژانی کوردی داناوە.

٨- وەکو کاری میوزیک بەشداری کردووە لە چەندین شانۆگەری لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی.

٩- وەکو دەنگبێژ کاری کردووە لە "هەولێر، من شەرم ناوێ، کۆرالّی کۆتەلی ئەنفال، پەری، کۆچ و چەندانی دیکە".

١٠- چەندین ئاوازی بۆ گۆرانی مندالآن داناوە.

١١- ئێستا بەڕێوەبەری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێرە.

**سالار حەسەن حەمەد**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٦/٢/٢٥

**پلەی خوێندن:** پیشەسازی کاردبا

**دەستپێک:** ١٩٨٢



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵی ١٩٨٣ بۆتە ئەندام لە تیپی مۆسیقای کاروان.
٢- لە ساڵی ١٩٨٣ کاسێتێکیان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووک تۆمار کردووە بە سەرپەرشتی هونەرمەند شێرزاد عوزێری بۆ هەریەک لە هونەرمەندان: "نەجمەدین ئاوارە، خوالێخۆشبوو سەلاح بلباس، خوالێخۆشبوو دلێر ساڵح، کامەران ساڵح".
٣- لە ساڵی ١٩٨٦ چەند گۆرانییەکیان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووک تۆمار کردووە.
٤- لە ساڵی ١٩٨٩ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی چالاکی قوتابخانەکان لە بەغدا.
٥- لە ساڵی ١٩٩٠ بۆتە ئەندام لە تیپی مۆسیقای هەولێر، هەر لەو ساڵەدا چەند گۆرانییەکیان بۆ هونەرمەندان: "عارەب عوسمان، نیزام شوکر، رەمەزان حوسێن، تەحسین قادر، نەجمەدین ئاوارە... " تۆمار کردووە.
٦- لە ساڵی ١٩٩٤ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی گۆرانی و مۆسیقا لە شاری هەولێر و سلێمانی.
٧- لە ساڵی ١٩٩٤ تا ٢٠٠٦ وەکو مۆسیقاژەن بەشداری کردووە لە هەموو ئەو بۆنە و ئاهەنگ و فێستیڤاڵانەی لە شاری هەولێر سازدراوە.
٨- لە ساڵی ٢٠٠٤ تا ٢٠٠٨ بەشداری کۆنسێرتی ئەم هونەرمەندانەی کردووە: " جەلال سەعید، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، ئای نور، ئالان عومەر، چۆپی فەتاح، قادر ئەسعەد، بلند عەبدوڵلا.... ".
٩- لە ساڵی ٢٠٠٤ لەگەڵ تیپی مۆسیقای رەسەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی "ئەدەن بەرە" لە وڵاتی نوسکوتلەندا.
١٠- لە ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری کردووە لە یادی دامەزراندنی کلتووری کوردی لە وڵاتی بەریتانیا لە شاری لەندەن.

## زانا ئەنوەر تاهیر



**لەدایکبووی:** ١٩٧٤- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی کۆلێژی پەروەردە
**دەستپێک:** ١٩٨٦

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* وەکو ژەنیاری مۆسیقا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هونەرمەندە کوردەکان بەشداری کردووە، وەک: (زەکەریا عەبدوڵلا، ئەژدەر وەهبی، ئەردەلان بەکر، هەڤاڵ ئیبراهیم، مەرزیە فەریقی، شڤان پەروەر، لەیلا فەریقی، چۆپی فەتاح، نیلوفەر ئیقبال، بلند عەبدوڵلا،



بڵند ئیبراهیم، حەسەن شەریف، نەجمەدین غولامی، قادر ئەسعەد، گۆران ساڵح، ماهر حەمەدەمین... هتد).

* ئاوازی بۆ چەندین هونەرمەندی کورد داناوە، لەوانە: (ئەردەڵان بەکر، هۆزان دەروێش، سەردار قادر، هەژار عەبدولستار، گۆران ساڵح، رزگار کۆیی، عیماد، موحسین عەبدوڵڵا...).
* لەو تیپانە ئەندام بووە: (باواجی کۆیە، زیر و بەم، تیپی زانکۆی سەلاحەدین، سەتەلایتی کوردستان، گروپی نالی).

**رێبین جەمال حوسێن**



**لەدایکبووی:** ١٩٧١- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی
**دەستپێک:** ١٩٨٦

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* وەکو ژەنینی مۆسیقا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هونەرمەندە کوردەکان بەشداری کردووە، وەک (زیاد ئەسعەد، سەرکەوت رەسول، هەڤاڵ ئیبراهیم، ئەژدەر وەهبی، قادر ئەسعەد، ئەیوب عەلی، زەکەریا عەبدوڵڵا، ماهر حەمەدەمین، گۆران ساڵح، لوقمان سەلیم، بەهجەت یەحیا، سامان عومەر، نوێنەر ئەحمەد، ناسر رەزازی، نیلۆفەر ئیقبال، بڵند عەبدوڵڵا، دیاری قەرەداغی، هەردی سەلاح، سەرباز تۆفیق، زانا جەبەلی، محەمەد تەها ئاکرەیی، مەحمود بامەرنی، ئیسماعیل جومعە، عەبدولقەهار زاخۆیی و سەرجەم



چالاکی و کۆنسێرتەکانی کۆمپانیای چوار چرا و چەندین هونەرمەندی تر..).

* چەندین ئاوازی داناوە، لەوانە: (بۆ بێدەنگی، یادی تۆ نامگرێتێ، ئێوارە سەراب، بێداری، کۆچ، ئەزیزان، رازی پەشیمانی، هەناسەیەک بۆ خاڵە تایەر، لێوژە، دەزانم غەریبی سەختە. جگە لەوانەش ئاوازی بۆ هونەرمەندان: خۆشەوی عەزیز، عەدنان کەریم، ناسر رەزازی، خەندە عەبدوڵڵا.... هتد) داناوە.
* لەو تیپانە ئەندام بووە: (باواجی کۆیە، کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان- کۆیە، تیپی زانکۆی سەلاحەدین، سەتەلایتی کوردستان، تیپی مۆسیقای سەردەم، گروپی نالی کە لەو دوو تیپە دەستەی دامەزرێنەر بووە).

**دارڤان سەید ئەحمەد بەرزنجی**



**لەدایکبووی:** ١٦/٥/١٩٧٩

**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە هونەرە جوانەکانی هەولێر دبلۆمێکی تایبەت بە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان لە زانکۆی "ntnu"ی نەرویجی.

**دەستپێک:** ١٩٨٦



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- ساڵی ١٩٨٦ لە بەغدا بەشداری فێستیڤاڵی چالاکی قوتابخانەکانی کردووە و پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

٢- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری گروپی نالی بووە.

٣- هەموو قۆناغەکانی پەیمانگای بە پلەی یەکەم بڕیوە.

٤- ئەندامی ئۆرکسترای کوردستان بووە.

٥- لە ساڵی ٢٠٠٠ وەک گۆرانیبێژ سیدی "هەنسکی شەو"ی بڵاوکردەوە، کە ٨ تراکی لەخۆ دەگرت.

٦- وەک مۆسیقاژەن بەشداری لە زۆربەی بۆنە و یادەکانی کوردستان کردووە.

**چیایی کەمال سەعدی**



**لەدایکبووی:** ١٤/٨/١٩٨٢- هەولێر

**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکان

**دەستپێک:** ١٩٨٦ یەکەم پێشانگای منداڵانی کردۆتەوە.

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* لە ساڵی ١٩٩٧ لەپەیمانگای هونەرە جوانەکان بەشی میوزیک وەرگیراوە.
* لە گشت چالاکییە هونەرییەکانی پەیمانگا یا بەدەنگ یا بە ژەنین بەشداری کردووە.
* لە ساڵی ١٩٩٩ ئەندامی تیپی میوزیکی شەرەفخانی بەدلیسی بووە.
* لە ساڵی ٢٠٠٠ پارچە میوزیکێکی بەناوی (شادی) بۆ کەناڵی گوڵان تۆمارکردووە.
* لە ساڵی ٢٠٠١ پەیمانگای هونەرە جوانەکان بەشی میوزیکی بەپلەی سێیەم تەواو کردووە.
* لە ساڵی ٢٠٠٢ مامۆستای هونەری بووە لە قوتابخانەی ـ ڕێبەر لە کەلەک.
* لە ساڵی ٢٠٠٤ لە کۆلیژی هونەر بەشی میوزیک دەورەی یەکەم وەرگیراوە.
* لە ساڵی ٢٠٠٧ کۆلیژی هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە بەپلەی زۆر باشە.
* لە ساڵی ٢٠٠٨ لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بەشی میوزیک بووە بە بڕیاردەری بەش.
* ئێستاش بەرپرسی تیپی میوزیکی نەورۆزە.

**جەمیل محەمەد قادر**
**(جەمیل سنجاوی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٤/٧/١- مەخموور
**پلەی خوێندن:** دەرچووی کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەددین
**دستپێک:** ١٩٨٦

**بەرهەم و چالاکییەکان**

١- ئاهەنگی خانەی مامۆستایان لەگەڵ (تیپی خانەی مامۆستایانی هەولێر) ساڵی ١٩٨٦. بەرنامەی (کۆلکە زێرینە) ی تەلەفزیۆنی کەرکووک لەگەڵ (تیپی خانەی مامۆستایانی هەولێر) ساڵی ١٩٨٦ و ١٩٨٧ وەک میوزیکژەن.
٢- بەرهەمی (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) ساڵی ١٩٨٧ وەک میوزیکژەن و ئاوازدانەر.
٣- ساڵیادی هونەرمەندی گەل (تایەر تۆفیق) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن ساڵی ١٩٨٨.
٤- بەرهەمی ساڵی ١٩٨٩ ی هونەرمەند (ئەحمەد زەمانە) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن.
٥- بەرنامەی (کۆلکە زێرینە) ی تەلەفزیۆنی کەرکووک لەگەڵ (تیپی مۆسیقای مەخموور) ساڵی ١٩٩٠ لە مەخموور وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن.
٦- دانانی مۆسیقای فیلمی (ئازارەکانی کورد) لە ساڵی ١٩٩١. بەشداریکردن لە ساڵیادی هونەرمەندی گەل (تایەر تۆفیق) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن لە ١ / ١١ / ١٩٩١.
٧- بەرهەمی (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) ساڵی ١٩٩٢ وەک میوزیکژەن و ئاوازدانەر و ئامادەکار.
٨- لاوکی (لێ لێ سوارۆ)، تێکستی (خالید جووتیار)، گوتنی (ئەحمەد زەمانە) مۆسیقای (جەمیل سنجاوی) ساڵی ١٩٩٣.
٩- یادی هەڵەبجەی شەهید (تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان / لقی هەولێر) ساڵی ١٩٩٤ وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن و ئاوازدانەر. بەشداریکردن لە فیستیڤاڵی (گۆرانی راپەڕین) ی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ساڵی ١٩٩٤ لە هەولێر وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن و ئامادەکار.
١٠- فیستفاڵی گۆرانی و مۆسیقا (وەزارەتی رۆشنبیری) لە رۆژانی ٢٠ - ٢١ / ١٩٩٥ لە هۆڵی میدیا لەگەڵ (تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان) وەک سەرۆکی تیپ و ئامادەکار و میوزیکژەن، مارشی (سەربەخۆیی) ساڵی ١٩٩٥ وەک ئاوازدانەر، لاوکی (لێ نازێ) بۆ هونەرمەند (ئەحمەد زەمانە) ساڵی١٩٩٥ وەک میوزیکژەن.
١١- ئاهەنگی (٢٤) ساڵەی دامەزراندنی (کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان / لقی هەولێر) لە ٢٤ / ٦ / ١٩٩٦ لە هۆڵی میدیا (هەولێر) وەک سەرۆکی تیپ و ئاوازدانەر و ئامادەکار. دانانی مۆسیقای فیلمی (رەشەبای مەرگ) لە نووسین و دەرهێنانی (کەریم بایز).
١٢- یادی هەڵەبجەی شەهید (وەزارەتی رۆشنبیری) لەگەڵ (تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان) لە هۆڵی میدیا، وەک سەرۆکی تیپ و ئاوازدانەر و میوزیکژەن. تۆمارکردنی دوو گۆرانی بۆ هونەرمەند (ئەحمەد زەمانە) ساڵی ١٩٩٧ وەک ئامادەکار و میوزیکژەن.
١٣- ئاهەنگی رۆژی جیهانی مۆسیقا (وەزارەتی رۆشنبیری) لەگەڵ (تیپی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی- مەڵبەندی گشتی هەولێر) لە ١/ ١٠/ ١٩٩٨ (هۆڵی رۆشنبیری). یادی (٢٦) ساڵەی (کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی- مەڵبەندی گشتی هەولێر) لە رۆژانی ١٣- ١٥ / ٧ / ١٩٩٨ هۆڵی رۆشنبیری (هەولێر) وەک سەرۆکی تیپ و ئامادەکار و میوزیکژەن. تۆمارکردنی کۆمەڵێک گۆرانی و مۆسیقا بۆ بەرنامەی (مافی منداڵ) لە ساڵی ١٩٩٨



لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی (د. کەریم شەریف قەرەچەتانی) بۆ کەناڵە ئاسمانی و لۆکاڵییەکانی کوردستان، وەک ئاوازدانەر و میوزیکژەن و ئامادەکار.

١٤- گۆرانی (هەر ساتێ) وتنی (خۆشەوی عەزیز) ساڵی ١٩٩٩ وەک ئاوازدانەر و میوزیکژەن.

١٥- بەشداریکردن لە یادی دامەزراندنی رادیۆ و تەلەفزیۆنی هەرێم لەگەڵ (تیپی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی- مەڵبەندی گشتیی هەولێر) لە ساڵی ٢٠٠٠ وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن.

١٦- دانانی مۆسیقای زنجیرە درامای (هەڵچوون).

١٧- دانانی مۆسیقای زنجیرە درامای (رەجەبی دەرگەوان).

١٨- گۆرانی ئایینی (پاڕانەوە) بۆ هونەرمەند (کامەران عەبدولرەحمان) وەک ئاوازدانەر و میوزیکژەن.

١٩- ئاهەنگی (٣٢) ساڵەی (کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی - مەڵبەندی گشتیی هەولێر) لە کۆشکی هونەر لە ٢٠٠٤.

٢٠- ئاهەنگی (٣٣) ساڵەی (کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی - مەڵبەندی گشتیی هەولێر) لە کۆشکی هونەر لە ٢٠٠٥.

٢١- ئاهەنگی (٣) ساڵەی دامەزراندنی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) لە هۆڵی (بنکەی وەرزش و لاوانی مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن.

٢٢- ئاهەنگی (٤) ساڵەی دامەزراندنی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) لە هۆڵی (بنکەی وەرزش و لاوانی مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن لە ٢٠٠٦. هەروەها بەشداریکردن لە CD هونەرمەند (خۆشەوی عەزیز) ساڵی ٢٠٠٦ وەک ئاوازدانەر و میوزیکژەن.

٢٣- ئاهەنگی (٣) ساڵەی دامەزراندنی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) لە هۆڵی (بنکەی وەرزش و لاوانی مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن لە ٢٠٠٧. هەروەها بەشداریکردن لە CD هونەرمەند (سروود حاتەم) ساڵی ٢٠٠٧ وەک ئاوازدانەر و میوزیکژەن.

٢٤- ئاهەنگی (٥) ساڵەی دامەزراندنی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) لە هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکانی مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن لە ٢٠٠٨. هەروەها بەشداریکردن لە CD هونەرمەند (جەبار حەسەن) ساڵی ٢٠٠٨ وەک ئاوازدانەر.

٢٥- ئاهەنگی (٦) ساڵەی دامەزراندنی (سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچووغ) لەگەڵ (تیپی مۆسیقای قەرەچووغ) لە هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکانی مەخموور) وەک سەرۆکی تیپ و میوزیکژەن لە ٢٠٠٩.

## سروود فوئاد محەمەد



**لەدایکبوون:** ١٩٧٤/٨/١٤- هەولێر

**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایان

**دەستپێک:** ١٩٨٩

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* ١٩٩١ یەکێک لە دامەزرێنەرانی تیپی میوزیکی یەکێتی قوتابیان و لاوانی کوردستان بووە.
* ١٩٩٣ دەبێتە ئەندامی تیپی میوزیکی رەوا.
* ١٩٩٦ دەبێتە ئەندامی تیپی میوزیکی بەڕێوەبەرایەتی هونەرەکانی میوزیک و تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێر.
* ١٩٩٧ دەبێتە ئەندامی ئۆرکسترای کوردستان.



* ۲۰۰۸ دەبێتە ئەندامی تیپی میوزیکی رەسەن.
* لە چەندان فێستیڤاڵی هونەری لەسەر ئاستی هەولێر و هەرێمی کوردستان و عێراق بەشداربووە، هەروەها لە چەندان بۆنەی نیشتمانی و ئاهەنگی رەسمی وەکو کەمانچەژەن بەشدار بووە.
* خاوەنی چەندین ئاواز و سروودی نیشتمانی و کۆراڵ و ئۆپەرێتی منداڵان و گۆرانی منداڵانە.
* کاری میوزیکی وێنەیی بۆ چەند کورتە فیلمێک و چەند شانۆییەک و درامایەکی کوردی کردووە.

**هوشیار عبدالواحد مەرجان**
**(هوشیار مەرجان)**



**لەدایکبووی:** ۲۵/ ۳/ ۱۹۷۷- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێرە- ۱۹۹۷. بەکالۆریۆس لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان
**دەستپێک:** ۱۹۹۱



**چالاکی و بەرهەمەکان:**
* لە ساڵانی ۱۹۹۷- ۲۰۰٤ وەکو مامۆستای بەشی میوزیک لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان وانەی گوتۆتەوە.
* لە ساڵی ۲۰۰٤ بۆتە بەرپرسی چالاکی قوتابخانەکانی پەروەردەی دەوروبەر.
* لە ساڵی ۲۰۰٦ بۆتە بەرپرسی چالاکی قوتابخانەکانی پەروەردەی هەولێر- دوو.
* ئەندامی تیپی میوزیکی هونەری هەولێر ۲۰۰۷.
* لە ساڵی ۲۰۰۸ بۆتە بەڕێوەبەری چالاکی قوتابخانەکان لە وەزارەتی پەروەردە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر.
* لە ساڵانی ۱۹۹۲ تا۲۰۰٤ لە سەرجەم فێستیڤاڵەکانی هونەرە جوانەکان بەشداری کردووە، هەم وەک قوتابی هەمیش وەک مامۆستا بە دانانی چەندین ئاوازو ئامادەکردنی گۆرانی و میوزیک، هەروەها وەک سۆلیست لە سەر ئامێری ئۆبوا بۆ یەکەم جار لە شاری هەولێر هەروەها ئامێری کلارنێت کاری کردووە.
* لە ساڵانی ۱۹۹۱ تا ۱۹۹٤ بە ئامێری کەمان و زووڕناو کلارنێت ئەندامی تیپی یەکێتی قوتابیان ولاوانای کوردستان بووە.
* لە ساڵی ۱۹۹٦ ئەندامی تیپی هونەرە میللیەکانی هەولێر بووە.

* لە ساڵانی ١٩٩٩ - ٢٠٠٠. سەرۆکی تیپی کەلەپوری کوردی بووە.
* لە ساڵی ١٩٩٩ دامەزرێنەری تیپی جوق و میوزیکی سەربازی ئەکادیمیای عەسکەری بووە لە زاخۆ.
* لە ساڵانی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٧ ئەندامی تیپی میوزیکی بەڕێوەبەرایەتی هونەری میوزیکی سەر بەوەزارەتی رۆشنبیری بووە.
* لە ساڵی ١٩٩٨ تاوەکو ئێستا ئەندامی تیپی ئۆرکێسترای کوردستانە، هەر بەردەوامە وەک ئەندامی دەستەی کارگێری و بەرپرسی پەیوەندییەکان و ژەنیاری ئامێری کلارنیت.
* لە ساڵانی ٢٠٠٢ تا ٢٠٠٥ راهێنەری تیپی ئافرەتانی (مریەم خان) ی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری بووە.
* لە ساڵانی ٢٠٠٤ تا ٢٠٠٨ بەشداری لە سەرجەم چالاکییەکانی میوزیکی کولێژی هونەرە جوانەکانی هەولێر کردووە وەک سولستیتیش بەشداری کردووە.
* لە ٢٠٠٤ تا ٢٠٠٨ چەندین ئاوازو گۆرانی و ئۆپەرێتی داناوە لە چالاکی قوتابخانەکان، هەروەها چەندین میوزیکی بۆ شانۆی منداڵان داناوە.
* لە ساڵی ٢٠٠٧ ئەندامی لیژنەی هەڵسەنگانی پێشبرکێی هونەرمەندانی (لاوی ساڵ) بووە لە وەزارەتی وەرزش و لاوان.
* خاوەنی چەندین بروانامەی ورێزلێنانی هونەرییە.
* خاوەنی دانانی میوزیکی کورتە فیلمی مرۆڤ و ئەنیمەیشنە، کە خەڵاتی زێرینی وەرگرتووە لە فێستڤاڵێکی نێودەوڵەتی، کە فیلمەکە لە سینارێو و دەرهێنانی هونەرمەند توانا مەرجان بوو.
* شارەزایی لە چەندین ئامێری میوزیکی هەیە وەک کلارنێت و زوورنا و نای و باڵەبان و کەمان و عود و ئۆرگ و ریتم.
* خاوەنی دوو ئەلبۆمی سی دی منداڵانە، کە هەریەکەیان لە هەشت گۆرانی پێک دێت.

## سامان عەزیز کەرەم



**لەدایکبووی:** ١٩٧٧
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی.
**دەستپێک:** ١٩٩١

### چالاکی و بەرهەمەکان:

لە ساڵی ١٩٩١ بووە بە ئەندامی تیپی میوزیکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد - لقی چەمچەماڵ، لە ساڵی ١٩٩٢ دەستی بە کارە هونەرییەکانی کردووە وەک میوزیکڤانێک لەسەر ئامێری ئۆکۆردیۆن هەموو ساڵێک بەبەردەوام تاکو ئێستا بەشداری سەرجەم فستیڤاڵ و کارە هونەرییەکان و ساڵیادی دامەزراندنی کۆمەڵی کردووە..

هەروەها بەشداری فستیڤاڵی پێنجەمین ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەی شەهیدی کردووە لە ١٦/٣/١٩٩٢ لە هەڵەبجەی شەهید..

ساڵی ١٩٩٤ بوو بە ئەندامی کارای یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستان/ لقی کەرکوک - لیژنەی چەمچەماڵ وەک (سەنتور ژەن) بەشداری هەموو فستیڤاڵەکانی ساڵانەی یەکێتی هونەرمەندانی کردووە کە هەر ساڵەی لە شارێکی ناوچەی گەرمیان ساز دەکرا وەک شارەکانی (چەمچەماڵ - دەربەندیخان - کەلار - خانەقین - کەرکوک) وە ئێستا ئەندامی کارای رێکخراوی هونەرمەندانە - ناوەندی هەولێر..

بەشداری فستیڤاڵی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستانی کردووە لە ساڵی ١٩٩٥ لە شاری سلێمانی کە لەسەر ئاستی کوردستان بوو کە تایبەت بوو بە گۆرانی و میوزیک..

بەشداری هەموو فستیڤاڵەکانی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کەرکوکی کردووە، کە ئێستا بووە بە گەرمیان بە هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوە هونەرییەکان کە هەر ساڵەی لە شارێکی ناوچەی گەرمیان ساز دەکرا..

هەموو ساڵێک بەشداری مەراسیمی ساڵیادی کیمیابارانی گۆیتەپەو ناوچەی قەڵا سێوکەی کردووە..

لەگەڵ تیپە هونەرییەکانی شاری کەرکوک کاری کردووە وەکو ناوەندی عەلی مەردان بۆ مەقام و تیپی دەزگای شەفەق لە شاری کەرکوک..

ئەندامی تیپی میوزیکی نەورۆزە و بەشداری هەموو کارە هونەرییەکانی کردووە لەگەڵ زۆربەی تیپە میوزیکییەکانی شاری هەولێر کاری کردووە و بەشداری زۆر بەرنامەی هونەری تەلەفزیۆنی کردووە لە زۆربەی کەناڵە ناوخۆیی و سەرجەم کەناڵە ئاسمانییەکان.

لە ساڵی ٢٠٠٦ بۆتە ئەندامی گروپی میوزیکی کەلەپووری کورد کە سەر بە بەڕێوەبەرێتی کەلەپووری کوردە و بەشداری فستیڤاڵ و کارە هونەرییەکانی گروپی کەلەپووری کردووە چ لە ناوەوەو دەرەوەی شاری هەولێر..

ئێستا سەرقاڵی خۆ ئامادە کردنە بۆ تۆمارکردنی بەرهەمی نوێ و بە کلیپ کردنی لەگەڵ گروپی کەلەپوور و سازکردنی چەند کۆنسێرتێک.

**محەمەد ڕەسول اسماعیل**



**لەدایکبووی:** ١٩٧٢

**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی کارەبا

**دەستپێک:** ١٩٩٢

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

لە ساڵی ١٩٩٢ بوو بە ئەندام لە تیپی میوزیکی یەکێتی قوتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستان و یەکەم کاری بەشداریکردن بوو لە کۆنسێرتێک بە بۆنەی دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوەوە لە هۆڵی میدیا..

هەر لەگەڵ ئەم تیپە (٨) گۆرانی تۆمار کرد بۆ تەلەفزیۆنی کوردستان.. بەردەوام بوو لە کاری هونەری تاکو دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی جل و بەرگ و کلتووری میللی (کەلەپووری کورد) ی ئێستا، لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوو (سید احمد بەرزنجی)..

تاکو ئێستا بەردەوام و ساڵانە لەهەموو پرۆگرامە هونەرییەکان بەشداری کردووە.. ئەندامی کارای ڕێکخراوی هونەرمەندانە -ناوەندی هەولێر..

ئەندامی دەستەی دامەزراندنی گروپی میوزیکی نەورۆزە و لە سەرجەم کارە هونەرییەکانی گروپ بەشداری کردووە.. هەروەها بەشداری لە هەموو فستیڤاڵ و کارە هونەرییەکانی ناوەوە و دەرەوەی شاری هەولێرمکردووە.

چەندین بەرنامەی ڕاستەوخۆ تۆمارکراوی کردووە لە سەرجەم کەناڵە ناوخۆیی و ئاسمانییەکاندا بە تایبەتی یاد کردنەوەی هونەرمەندە ڕەسەنەکان..

لەگەڵ هەردوو گروپی میوزیکی کەلەپووری کورد و گروپی میوزیکی نەورۆز بە نیازی تۆمارکردن و بەکلیپ کردنی چەند بەرهەمێکە لە گەڵ سازکردنی کۆنسێرت.

**سیروان محەمەد مستەفا**



**لەدایکبووی:** ١٩٧١- هەولێر

**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی

ئێستا خوێندكاری كۆلیژی هونەرە جوانەكانە- مۆسیقا
**دەستپێک:** ۱۹۹۲

**چالاكی و بەرهەمەكان:**

۱- لە ساڵی ۱۹۹۳ ئەندامی تیپی رەوا بووە، كە بەشداری فێستیڤاڵی راپەرینیان كردووە.
۲- لە ساڵی ۱۹۹۵دا لەگەڵ تیپی مۆسیقای رەوا "۱۲" گۆرانیان تۆماركردووە بۆ چەند گۆرانیبێژێک.
۳- لە ساڵی "۱۹۹۷"دوە ئەندامی ئۆركسترای كوردستانە.

٤- لە ساڵی ۱۹۹۷ بەشداری كردووە لە تۆماركردنی سیدییەک لەگەڵ ئۆركسترای كوردستان، لەو سیدییەشدا پارچە میوزیكێكی هەبووە لە دانان و دابەشكردنی خۆی.
٥- لە ساڵی ۱۹۹۷ تا ۲۰۰۰ بۆتە ئەندامی تیپی هونەرە میللییەكان و لە چەندین نمایش لە شارەكانی هەولێر و دهۆک بەشداری كردووە.
٦- لە ساڵی "۲۰۰۰"وەوە لە بەڕێوەبەرایەتی هونەری مۆسیقا ئەندام بووە و لە كۆنسێرتی هونەرمەند ئالان عومەر لە شاری هەولێر و سلێمانی بەشداری كردووە.
۷- لە ساڵی "۲۰۰٥" بەشداری كردووە لە كۆنسێرتی هونەرمەندان چۆپی فەتاح و قادر ئەسعەد.
۸- لە ساڵی "۲۰۰٦"دا بەشداری كردووە لە كۆنسێرتی هونەرمەند چۆپی فەتاح و ژاڵە.
۹- لە ساڵی "۲۰۰۷" بەشداری كردووە لە كۆنسێرتی هونەرمەند "بلند عەبدوڵلا".
۱۰- لە ساڵی "۲۰۰۷- ۲۰۰۸" بەشداری كردووە لە دوو



وۆرک شۆپی ئەمریكی.
۱۱- وەكو كەمانچەژەن لەگەڵ سەمفۆنیای عێراق بەشداری كردووە.
۱۲- لە ٥/ ۱۰/ ۸/ ۲۰۰۸ لە ستۆكهۆڵمی پایەتەختی سوید بەشداری كردووە لە كۆنسێرتێكی هونەرمەند زەكەریا عەبدوڵلا.
۱۳- لە ۲۰۰۸/۱۱/۲۷ بەشداری كردووە لە ئاهەنگی رێزلێنان لە هونەرمەند زەكەریا عەبدوڵلا.
۱٤- لە ۲۰۰۸/۱۲/۲۲ وەكو میوزیكژەن لە یەكەم وەرزی مۆسیقای كۆلیژی هونەرە جوانەكان بەشداری كردووە.
۱٥- لە هەموو چالاكییەكانی ئۆركسترای كوردستان و بەڕێوەبەرایەتی هونەری میوزیک بەشداری كردووە.

**دیاری عبدالخالق عزیز**
**(دیاری بەرزنجی)**



**لەدایكبووی:** ۱۹۷۲
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای تەكنیكی موسڵ
**دەستپێک:** ۱۹۹۳

**چالاكی و بەرهەمەكان:**

لە ساڵی ۱۹۹۳ بوو بە ئەندامی تیپی میوزیكی باواجی.. یەكەم كاری هونەری بەشدار بوو لە یەكەم فێستیڤاڵی میوزیک و گۆرانی ساڵی ۱۹۹٥ لە شاری سلێمانی بە گۆرانییەک بە ناوی (بێ وەفا).. لەو كاتەوە وەک میوزیكڤان لەسەر ئامێری چەلۆ و وەک گۆرانیبێژ كاری كردووە..

لە هەموو فێستیڤاڵەکانی سلێمانی و کوردستان بە گشتی یەک لە دوای یەک لەگەڵ تیپی میوزیکی باواجی بەشدار بووە لە هەردوو بوار.. هەروەها لە هەموو بۆنەو ئاهەنگەکان.. لە ساڵی "١٩٩٨"دا بووە بە ئەندام لە گروپی میوزیکی (نالی).. لە هەموو کۆنسێرتە تایبەتەکان و ئاهەنگەکانی بۆنە تایبەتەکان و کۆنسێرت بۆ زۆربەی گۆرانیبێژانی کوردستان و دەرەوەی کوردستان تا ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥. هەروەها لە سەرەتای دامەزراندنی سەندیکای هونەرمەندانەوە ئەندامی کارای ئەم سەندیکایەیە.

لە ساڵی ١٩٩٩ یەکەم ئەلبومی تایبەتی خۆ بڵاو کردەوە لەژێر ناوی (سیمفۆنیای ئەوین).. لە دەستپێکی هونەرییەوە تاکو ئێستا چەندین گۆرانی تۆمار کردووە و بە وێنەو کلیپ گەیاندووە لە هەموو کەناڵە ناوخۆیی و ئاسمانییەکان نمایش کراوە.. لە ساڵی ٢٠٠٦ دوە ئەندامی گروپی میوزیکی کەلەپووری سەر بە بەڕێوەبەرایەتی کەلەپووری کورد وەک ژەنیاری عود و وەک گۆرانیبێژ و بەشداری هەموو کارە هونەرییەکانی گروپی کەلەپووری کردووە لە ناوەوە و دەرەوەی شاری هەولێرو ئیستاش سەرۆکی گروپی میوزیکی کەلەپووری کوردییە و هەروەها سەرقاڵی خۆئامادە کردنێ بۆ سازدانی چەند کۆنسێرتێک و تۆمارکردن و بە کلیپ کردنی چەند گۆرانییەک، ئێستاش ئەندامی کارای رێکخراوی هونەرمەندانە - ناوەندی هەولێر.

**هەڵبەست سەلاح احمد**





**لەدایکبووی:** ١٩٨٠- رانیە
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان
بەکالۆریۆس لە کۆلیژی هونەرە جوانەکان
**دەستپێک:** ١٩٩٣

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* مامۆستای بەشی میوزیکی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێرە.
* ئەندامی ئۆرکێسترای کوردستانە.
* سەرپەرشتیاری "گروپی میوزیکی کورد"ە، کە گروپێکی میوزیکییە و لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری مۆڵەتی رەسمی پێدراوە.
* خاوەنی خەڵاتی یەکەمە لەبواری دابەشکردنی میوزیک لەسەر ئاستی کوردستان لە فێستیڤاڵی چوارچرا ساڵی ٢٠٠٢ بە بەشداری سەرجەم هونەرمەندانی کوردستان.
* خاوەنی بڕوانامەی (media academy) لە شاری هیلڤەرسوم لە وڵاتی هۆڵەندا لە بواری میوزیکی راگەیاندن ٢٠٠٦.
* خاوەنی چەندین دابەشکردن و ئاوازدانانە بۆ سەرجەم هونەرمەندانی کورد لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان.
* وەک سەرپەرشتیارو میوزیکژەن لە کەناڵەکانی کوردستان tv وکوردسات و زاگرۆس tv و ڤین tv کاری کردووە.
* چەندین خولی فێربوونی میوزیکی کردۆتەوە بۆ منداڵان و لاوان بە شێوەیەکی زانستی.
* ٣ جار وەک میوزیکژەنی کورد بەشداربووە لەگەڵ تیپی سەمفۆنیای نیشتیمانی عێراقی.

* له ساڵی ٢٠٠٧ بە بانگهێشتی فەرمی لەلایەن ئینستیتوتی کورد له پاریس داوەت کراوە و چووەتە (کۆنسەر فاتواری پاریس) کە یەکێکە لە بەناوبانگترین پەیمانگا میوزیکییەکانی ئەوروپا.
* چەندین نووسین و وتاری هونەری زانستی هەیە لە رۆژنامە و گۆڤار و سایتە کوردییەکان.
* چەندان دانراوی میوزیکی ئۆرکێسترایی نووسیوە و بەرهەمیهێناوە.
* وەک مامۆستای بەشی میوزیکی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر دەستێکی باڵای هەبووە لە پێگەیاندنی چەندین میوزیکژەنی قوتابی هونەرمەند.
* لە خولی یەکەمی بەرنامەی ستۆدیۆی ئەستێران ئەندامی لیژنەی هەڵسەنگاندن و سەرپەرشتیاری گروپی میوزیکەکە بووە.

## ئومێد شێخ محەمەد ئیسماعیل
## (ئومێد باڵەبان)



**لەدایکبووی:** ١٩٨٢
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- سەرپەرشتیاری گروپی میوزیکی ئاراسە، کە گروپێکی گەلەری هاوچەرخەو تاکە گروپە لەم ستایلە لە باشووری کوردستان هەبێت.



٢- سەرەتای کاری هونەری لەگەڵ گروپی (یەکێتی گشتی قوتابیان) بووە.
٣- لەساڵی (١٩٩٥) بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی.
٤- لەساڵی (١٩٩٧) بۆتە ئەندامی گروپی بەڕێوەبەرایەتی هونەر و مۆسیقا سەربە وەزارەتی رۆشنبیری و بەبێ دابڕان لەکارە هونەرییەکانی گروپەکانی تر.
٥- لەساڵی (٢٠٠١) بۆتە کارمەند لە (گروپی سەتەلایتی کوردستان) و لە زۆربەی زۆری بەرنامەو کۆنسێرت و بۆنە تایبەتیەکانی ئەم تەلەڤزیۆنە بەشداری کردووە. کە گروپێکی گەلەری هاوچەرخەو تاکە گروپە لەم ستایلە لەکوردستانی باشور هەبێت
٦- وەکو گۆرانیبێژ سێ گۆرانی تۆمارکراوی هەیە.
٧- لە چەندین کۆنسێرت لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان وەکو میوزیکژەن بەشداری کردووە بە ئامێری "نای و باڵەبان".
٨- بە هاوبەشی لەگەڵ "ع. ج. سەگرمە" سیدییەکی میوزیکیان بەرهەمهێناوە، کە چەند پارچە میوزیکێکی فۆلکلۆری کوردی تێدایە.
٩- وەکو کاری دابەشکردنی میوزیک و دانانی ئاواز کاری بۆ چەندین هونەرمەندی کورد کردووە.

### رێبوار عەبدوڵڵا حوسێن



**لەدایکبووی:** ١٩٨٤- تەیراوە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی بەشی میوزیکی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر.
خوێندکاری کۆلیژی هونەرە جوانەکانە- بەشی مۆسیقا
**دەستپێک:** ١٩٩٧- لە بەڕێوەبەرایەتی هونەری مۆسیقا.

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* وەکو مۆسیقاژەن لەگەڵ زۆربەی گۆرانیبێژانی کورد کاری کردووە و لە زۆربەی بەرنامە هونەرییەکانی تەلەفزیۆن و سەتەلایتە کوردییەکان کاری کردووە.
* وەکو میوزیکژەن لە وڵاتەکانی (فەرەنسا، سویسرا، ئەڵمانیا، هۆڵەندا، سوید) کاری کردووە.



## مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژەکانی کۆیە

### وریا قادر حەسەن



**لەدایکبووی:** ١٩٤٣- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی خانەی مامۆستایان
**. دەستپێک:** ١٩٥٧

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵی "١٩٧٢ تا ٢٠٠٨" ئەندام بووە لە تیپی باواجی کۆیە و بەشداری لە هەموو بەرهەمەکانی کردووە.
٢- چەندین ئاوازی بۆ هونەرمەندان داناوە لەوانە: (خەزیم- ئیبراهیم صابر، دەخیلت بم لە عوشاقت- کۆرس، دڵداری تازە- دیاری بەرزنجی، ئۆپەرێتی گەشتێک بۆ باغی شار، ئۆپەرێتی نەسرین دەمێکە داخت لەدڵە).
٣- بیست و پێنج سروود و گۆرانی بەرهەم هێناوە کە هەموویان ئاوازی خۆیەتی، لەوانە: (کوردستان



شیرینە، ماسی، باخچەی ساوایانی کۆیە، بەخێربێن، باخچەی شیلان، پێنووس، قوتابخانەکەم، جەژنی سەری ساڵ، جەژنی نەورۆز، تەمەنم شەش ساڵانە، منداڵی بچووکم، باخچەی منداڵان، ئێمە قوتابین، ددان، ڕۆژانی هەفتە، منداڵی بچووکم، ئەز مناڵم، منداڵان وەرن وەرن، کەرویشک، ئامۆژگاری، نەورۆز، مافی مرۆڤ، خۆری خەبات، دایلە، وەرزەکانی ساڵ).

## سەردار ئەحمەد عەبدوڵڵا



**لەدایکبووی:** ١٩٤٥- کۆیە

**پلەی خوێندن:** دەرچووی بەشی مۆسیقای پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا- ١٩٦٧.

**دەستپێک:** ١٩٥٧

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- وەک مۆسیقاژەن بە ئامێری فلوت و شمشاڵ لە هەموو بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای باواجی بەشداری کردووە.
٢- لە ساڵانی ١٩٧١- ١٩٨٠ وەک مۆسیقاژەن بەشداری کردووە لە گشت بەرهەمەکانی تیپی هونەری هەولێر.
٣- لە ساڵانی ١٩٧٤- ١٩٧٥ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی گشت بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شۆڕشی کوردستان.
٤- لە ساڵانی ١٩٧٨- ١٩٧٩ لە کۆیە خولی فێربوونی میوزیکی کردۆتەوە.
٥- لە ساڵانی ١٩٨٠- ١٩٩٢ چەندین خولی مۆسیقای لە مەڵبەندی لاوانی کۆیە کردۆتەوە.
٦- لە ساڵی ٢٠٠٥ لەگەڵ تیپی مۆسیقای یەکێتی هونەرمەندان بەشداری فێستیڤاڵی تیپە مۆسیقییەکانی



کردووە لە دیاربەکر.
٧- لە ٢٠٠٧/٤/٦ لەگەڵ وریا ئەحمەد و هەنگاو ئەنوەر شێخانی چۆتە فەرەنسا بۆ گۆڕینەوەی کلتوور.
٨- ساڵێک لە پەیمانگای هونەرەکانی ڕانیە وەک مامۆستا وانەی گوتۆتەوە.
٩- لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شەهید جەعفەر وانەی مۆسیقا دەڵێتەوە.
١٠- تا ئێستا ئەندامی تیپی باواجی کۆیەیە.

## ئیبراهیم صابر حەمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٤٩- کۆیە

**پلەی خوێندن:**

**دەستپێک:** ١٩٦٠

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵی ١٩٧٢ بەشداری کۆرسێکی کردووە لە تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە.



٢- لە ١٩٧٣/٣/٣ لە تیپی باواجی کۆیە دوو گۆرانیان بۆ تۆمار کردووە "زاوا لە بووکێ مەدە، پەروانە" لە بەغدا.
٣- لە ساڵی ١٩٧٣ چەند گۆرانییەکی تۆمارکردووە وەک: "چاوڕەشێ، یاران".
٤- لە ساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ تیپی مۆسیقای هەولێر چەند گۆرانییەکی تۆمار کردووە، لەوانە: "ئۆف سەلام، یارم پەرێشانە، هەتیوێک بووم لە کاروانی، ڕۆژەک لە ڕۆژان".
٥- لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە چەند گۆرانییەکی دیکەی تۆمار کردووە، لەوانە: "نەسمەران، جوانێ هۆ جوانێ، گێژدنی خەیاڵ، مریەمێ، یارەکەم بە لالووکە، نەورۆزە".
٦- تا ئێستا زیاتر لە ٤٥ بەرهەمی تۆمارکراوی هەیە.
٧- لە ٢٠٠٨/٢/١٠ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە گۆرانی "لەیلا"ی تۆمارکردووە.

## جەلال عەزیز زەینەل عەزیز





**لەدایکبووی:** ١٩٥٧- کۆیە
**پلەی خوێندن:**
**دەستپێک:** ١٩٧٥

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- ساڵی ١٩٧٥ بنکەی لاوانی کۆیە بەشداری چەند کارێکی هونەری کردووە.
٢- ساڵی ١٩٧٦- ١٩٧٧ لەگەڵ تیپی باواجی کۆیە وەک "قانونژەن" بەشداری کردووە لە ئاهەنگی نەورۆز لە کۆیە.
٣- لە ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر وەک قانونژەن کاری کردووە لەگەڵ تیپی چالاکی قوتابخانەکان لە چەند فێستیڤاڵێکی سەرانسەری عێراق.
٤- لە ساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی "٣٠" گۆرانی و پارچە مۆسیقا، لەگەڵ بەشداریکردن لە چەندین ئاهەنگ و بۆنەی تایبەت.
٥- لە ساڵانی ١٩٨٠ تا ١٩٩٨ لە تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە وەکو ئەندازیاری دەنگ کاری کردووە لە تۆمارکردنی هەموو گۆرانی و ئاهەنگەکان و دانانی ئامێری دەنگ.
٦- لە ساڵی "١٩٨٠"وە تاکو ئێستا وەکو کەمانچەژەن کاردەکا.

## فازڵ سلێمان تەها



**لەدایکبووی:** ١٩٦٧- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٨٠

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە ساڵی ١٩٨١ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە بابل.
٢- لە ساڵی ١٩٨١ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە سلێمانی.
٣- لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە کۆیە.
٤- لە ساڵی ١٩٨٣ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە هەولێر.
٥- لە ساڵی ١٩٨٥ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە دهۆک.
٦- لە ساڵی ١٩٨٦ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی چەند گۆرانییەک بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووک.
٧- لە ساڵی ١٩٩٢ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە.
٨- لە ساڵی ١٩٩٣ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە.
٩- لە ساڵی ١٩٩٤ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە.



١٠- لە ساڵی ١٩٩٤ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی هەڵەبجە.
١١- لە ساڵی ١٩٩٤ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە سلێمانی.
١٢- لە ساڵی ١٩٩٥ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە سلێمانی.
١٣- لە ساڵی ١٩٩٦ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە سلێمانی.
١٤- لە ساڵی ١٩٩٨ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی مۆسیقاو گۆرانی لە سلێمانی.
١٥- لە ساڵی ٢٠٠٠ بەشداری کردووە لە سازدانی کۆنسێرتێکی گۆرانی لە کۆیە.
١٦- لە ساڵی ١٩٩٨ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی (١٦) گۆرانی و پارچە مۆسیقای بۆ تەلەفزیۆنی کۆیە.
١٧- لە ساڵی ١٩٩٢ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی بەرنامەیەکی تایبەت بۆ تاهیر تۆفیق لە کۆیە.
١٨- لە ساڵی ٢٠٠٠ بەشداری کردووە لە سازکردنی هەشت کۆنسێرت.
١٩- لە ساڵی ٢٠٠٠ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی چوار گۆرانی بۆ بەرنامەی گوڵ بۆ کێ.
٢٠- لە چەندین کۆنسێرت و بەرنامەی تایبەت و تۆمارکردنی گۆرانی وەکو ژەنیار بەشداری کردووە.

**سەفین عەبدولڕەزاق عەبدولقادر**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٦- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ- ١٩٨٦- ١٩٨٧.
**دەستپێک:** ١٩٨٤

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- کاری دانانی ئاواز و دابەشکردنی مۆسیقای بۆ ئەو بەرهەمانە کردووە: (قەومی کورد، یادی نەورۆز و راپەڕین، بەهارە بولبول، گیانی شیرین، یەک و دوو، شیرینە نیشتیمانم".
٢- سەرۆکی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیەیە.
٣- سەرۆکی بەشی میوزیکە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شەهید جەعفەر لە کۆیە.
٤- لە سالآنی "١٩٨٤ تا ٢٠٠٨ بەشداری کردووە لە



گشت بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە.
٥- لە ساڵی ١٩٩٨ لە تارانی پایتەختی ئێران لەگەڵ گروپی دەف و لەگەڵ گۆرانیبێژان "بەهروزی تەوەکلی، ئاغای میرزایی" لە تەلاری وەحدەت بەشداری کۆنسێرتی رۆژی میوزیکی جیهانی کردووە.
٦- بەشداری کردووە لە کۆنسێرتێک بۆ هونەرمەندانی گروپی کانزا لە سەقز.
٧- لە ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی سالآنەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی رانیە بە ئامادەبوونی هونەرمەند ناسری رەزازی.
٨- سالآنە بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵەکانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کۆیە.

**لێزان قادر حەوێز**



**لەدایکبووی:** ١٩٧٦- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی کۆلیژی زانست
**دەستپێک:** ١٩٨٦

**بەرهەمەکان:**

* لە ساڵی ١٩٩١ لەتیپی حاجی قادر بۆتە ئەندام.
* لە ساڵی ١٩٩٣ وەکو ژەنیار لە فێستیڤاڵی سالآنەی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان- لقی کۆیە بەشداربووە.
* لە ساڵی ١٩٩٤ لەتیپی باواجی کۆیە بۆتە ئەندام و تا ئێستا بەشداری گشت چالاکییەکانی ئەو تیپەی کردووە.



* لە ساڵی ۱۹۹۵- ۱۹۹۷ لەتیپی میوزیكی زانكۆی سەلاحەدین ئەندام بووە و بۆ ماوەی دووساڵ لە فێستیڤاڵی ساڵانە بەشداربووە.
* لە ساڵی ۱۹۹۹ بەشداری فێستیڤاڵی ساڵانەی گروپی نالی بكا وەكو ژەنیاری ئامێری عود.
* ساڵی ۲۰۰۰ پارچە میوزیكی زەمبیلفرۆشی بۆ كەناڵی كوردسات تۆماركردووە.
* كاری ئامادەكردن و ژەنینی بۆ زیاتر لە (٤٠) گۆرانی كردووە.
* كاری میوزیكی بۆ (١٤) كورتە فیلم و درامایەك كردووە، لەوانە (چارەنووس، بەختیار، تاسەی مەرگ، ئاواتی لادێ..)
* لە ساڵی خوێندنی (۲۰۰٦-۲۰۰۷) وەكو مامۆستا وانەكانی پراكتیكی و تیۆری رۆژهەڵاتی و هولفێچی رۆژهەڵاتی گوتۆتەوە لە پەیمانگای هونەرە جوانەكانی شەهید جەعفەر گوتۆتەوە.
* لە بەرواری (٢٠٠٨/٥/٥) كۆنسێرتێكی میوزیكی تایبەت بە ئامێری عودی ئەنجامداوە و گشت ئامادەكردنەكانی میوزیكی كردبوو.
* لە ساڵی (۲۰۰۰) كاری تۆماركردن و ئەندازیاری دەنگ دەكا بۆ هەموو ئەو بەرهەمانەی لە ستۆدیۆی تیپی باواجی كۆیە تۆماركراون.

**توانا فاروق فاتح**



**لەدایكبووی:** ١٩٧٦/٣/٦- رانیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای تەكنیكی.
**دەستپێك:** ١٩٨٦

**چالاكی و بەرهەمەكان:**

١- لە ساڵی ۱۹۸۹ بەشداری كردووە لە فێستیڤاڵی مێوزیك لە دهۆك.
٢- لە ساڵی ۱۹۸۷ بەشداری كردووە لە یادی چلەی تاهیر تۆفیق.
٣- لە ساڵی ۱۹۸۷ بەشداری كردووە لە بەرنامەی كۆلكە زێرینە لە كۆیە.
٤- لە ساڵی ۱۹۹۲ بەشداری كردووە لە یادی هەڵەبجەی شەهید.
٥- لە ساڵی ۱۹۸۷ بەشداری كردووە لە تۆماركردنی كۆمەڵێك بەرهەم لەگەڵ تیپی باواجی كۆیە بۆ



تەلەفزیۆنی کەرکووک.

٦- لە ساڵی ١٩٩٤ لەگەڵ تیپی منداڵپارێزی کوردستان بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی میزۆپۆتامیای هەولێر لە کۆیە.

٧- لە ساڵی ١٩٩٩ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی ئاهەنگ و مۆسیقا لە سلێمانی.

٨- لە ساڵانی "١٩٩٧، ١٩٩٨، ١٩٩٩، .....٢٠٠٠... هتد" لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە ساڵیادی هونەرمەند تاهیر تۆفیق لە "کۆیە، کورستان تیڤی، کوردسات، تەلەفزیۆنی کۆیە".

٩- لە ساڵی ٢٠٠٨ بەشداری کردووە لە بەرنامەیەکی تایبەت بە تیپی باواجی کۆیە لە سەتەلایتی نەورۆز.

١٠- لە ساڵی ٢٠٠٧ بەشداری کردووە لە بەرنامەیەکی تایبەت بە تیپی سەنتەری گەنجانی کۆیە لە زاگرۆس تیڤی.

١١- لە ساڵی ٢٠٠٧ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە بەرنامەیەکی تایبەت بە هونەرمەند ئیبراهیم صابر.

١٢- لە ساڵی ١٩٩٩ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە چەند گۆرانییەکیان بۆ تەلەفزیۆنی کۆیە تۆمارکردووە.

١٣- لە ساڵی ١٩٩٨ لە هۆڵی سەنتەری گەنجان لە کۆیە لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە ئاهەنگی یادی تەلەفزیۆنی کۆیە.

١٤- لە ساڵی ٢٠٠٣ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی ئاهەنگ و مۆسیقا لە سلێمانی.

١٥- لە ساڵی ٢٠٠٤ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی سەید برایم لە کۆیە.

١٦- لە ساڵی ٢٠٠٧ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە ئاهەنگی یادی شاعیری گەورە دڵدار.

١٧- لە ساڵی ٢٠٠٧ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەشداری کردووە لە ئاهەنگی یادی هونەرمەند و شاعیری گەورە "ئەختەر".

## ریاز رەزا عوسمان



**لەدایکبووی:** ١٩٧٣- کۆیە

**پلەی خوێندن:** دەرچووی بەشی مۆسیقای پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی.

**دەستپێک:** ١٩٨٧- لە مەڵبەندی لاوانی کۆیە

### چالاکی و بەرهەمەکان:

* لە ساڵی ١٩٨٨ وەکو کۆرس لەگەڵ تیپی باواجی کۆیە کاری کردووە.
* لە چالاکییەکانی قوتابخانە و پەیمانگا وەک "گۆرانیبێژ، مەقام، ژەنیاری کەمان" بەشداری کردووە.
* لە گشت بۆنە و ئاهەنگ و چالاکییەکانی تیپی باواجی کۆیە وەکو ژەنیاری کەمان بەشداری کردووە.
* سێ گۆرانی لە ستۆدیۆی سانا لە سلێمانی تۆمار کردووە.



## ئەمیر ئەحمەد حەمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٧٣- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەیی
**دەستپێک:** ١٩٨٦

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

* ساڵی ١٩٨٦ دەستەی دامە زرێنەری تیپی میوزیکی حاجی قادر بووە و وەکو کەمانژەن و دەستەی بەڕێوەبردنی تیپ کاری کردووە.
* لە ساڵی ١٩٨٦ تا ساڵی ١٩٩١ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لەسەرجەم ئاهەنگ و فیستیڤاڵی تیپی میوزیکی حاجی قادر.
* لە ساڵی ١٩٨٩ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی ئەلبومێک بۆ هونەرمەند ئیسماعیل شەیدا.
* لە ساڵی ١٩٨٩ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی لاوان لە دهۆک لەگەڵ تیپی حاجی قادر.
* لە ساڵی ١٩٩٢ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی ئەلبومێک بۆ هونەرمەند هاوتا ئەسعەد لەگەڵ تیپی میوزیکی ڕەوا لە هەولێر.
* لە ساڵی ١٩٩٣ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی یادی ڕاپەڕینی هەولێر لەگەڵ تیپی ڕەوا.
* لە ساڵی ١٩٩١ تاکو ساڵی ١٩٩٤ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی (٤، ٣، ٢، ١) ی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کۆیە.
* لە ساڵی ١٩٩٥تا ١٩٩٧ وەکو بەڕێوەبەری خول کاری کردووە لە کردنەوەی خولی میوزیک لە قوتابخانەی مەلای گەورە بەهاوکاری بەڕێوەبەرو مامۆستاکان.
* لە ساڵی ١٩٩٧ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی ئەلف و بێی کوردی بۆپۆلی یەک و دووی سەرە تایی.
* لە ساڵی ١٩٩٥ وەکو بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی هەڵەبجە لەگەڵ تیپی میوزیکی باواجی کۆیە.
* لە ساڵی ١٩٩٦ بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی گۆرانی (هۆ کوردستان).
* لە ساڵی ١٩٩٧ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی گۆرانی ( شەو بەخێر ) .
* لە ساڵی ١٩٩٨ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی چالاکی قوتابخانەکانی کۆیە.
* لە ساڵی "١٩٩٨"دوە تاکو ئێستا وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە سەرجەم کارەکانی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٢ وەکو مامۆستای خول بەشداری کردووە لە کردنەوەی خولی فێربونی میوزیک بۆ گەنجان بە هاوکاری سەنتەری هامون لە کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠١ و ٢٠٠٢ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی یەکەم و دووەمی یەکیەتی هونەرمەندانی کوردستان- لیژنەی کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٢ تا کو ئیستا دە ستەی دامە زرێنەر و بەڕێوە بەری سەنتەری چالاکی گە نجانی کۆیەیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە یادی هونەرمەندی گەل (تایەر تۆفیق) لە کەناڵی ئاسمانی کوردستان تیڤی و کوردسات.
* لە ساڵی ٢٠٠٦ وەکو سەپەرشتیاری تیپ و کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی میوزیک بۆ گشت سەنتەرە کانی چالاکی گەنجان لە سلێمانی.
* لە ساڵی ٢٠٠٧ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵی ئەختەر لە کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٧ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە تۆمارکردنی سیدیەک لە تیپی باواجی کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٧ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە کۆنسێرتێک بۆ هونەرمەند (محەمەد جەزا) لە کۆیە.
* لە ساڵی ٢٠٠٨ وەکو کەمانژەن بەشداری کردووە لە فیستڤاڵی ڕێزگرتن لە دەستەی دامەزرێنەرانی تیپی باواجی کۆیە.



## هێمن عەبدولحەمید شەمس



**لەدایكبووی:** ١٩٧٤- رانیە
**پلەی خوێندن:** ماستەر لە زمانی كوردی
**دەستپێك:** ١٩٨٧

**چالاكی و بەرهەمەكان:**

١- لە ساڵی ١٩٩٢ ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ گۆرانی "سكاڵا" كردووە.
٢- لە ساڵی ٢٠٠٠ ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ گۆرانی "پەپوولەی هونەر" كردووە.
٣- لە ساڵی ١٩٩٨ ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ گۆرانی "شیوەن بۆ گوڵ" كردووە.
٤- ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ گۆرانی پێشەكی و میوزیكی فیلمی ئەنگوستیلە كردووە.
٥- لە ساڵی ١٩٩٨ ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ مارشی پەیمانگای تەكنیكی كۆیە كردووە.



٦- لە ساڵی ١٩٩٨ دامەزرێنەری تیپی میوزیكی هەنگاو بووە.
٧- لە ساڵانی ١٩٩٨- ٢٠٠١ كاری ئاواز و ئامادەكردنی مۆسیقای بۆ "١٤" گۆرانی منداڵان كردووە.
٨- وەكو ژەنیار لە زۆربەی بەرهەمەكانی تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە بەشداری كردووە.
٩- وەكو مامۆستا ٣ خولی فێربوونی میوزیكی كردۆتەوە.

## شنۆ ئیبراهیم حەسەن



**لەدایكبووی:** ١٩٧٨- كۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەكانی سلێمانییە.
**دەستپێك:** ١٩٩٢

**چالاكی و بەرهەمەكان:**

١- وەكو گۆرانیبێژ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە گۆرانی "هەورێكی هێنا"ی تۆمار كردووە.
٢- وەكو گۆرانیبێژ بەشداری كردووە لە دوو فێستیڤاڵی ساڵانەی كۆمەڵەی هونەرە جوانەكان- كۆیە.
٣- لە ساڵی ١٩٩٤ وەكو گۆرانیبێژ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە هەردوو گۆرانی "دڵەی زامار، گوڵی سوور"ی لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە تۆماركردووە.
٤- لە ساڵی ١٩٩٧ دوو گۆرانی "خەم، كانی ئەوین"ی لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە تۆماركردووە.
٥- لە ساڵی "١٩٩٨" دوو گۆرانی "ماڵئاوا، یادی شەوێك" ی لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی كۆیە تۆماركردووە.



٦- وەكو گۆرانیبێژ و ژەنیاری كەمانچە لە تەواوی چالاكییەكانی پەیمانگای هونەرە جوانەكانی هەولێر و سلێمانی بەشداری كردووە.
٧- لە چەندین درامای تەلەفزیۆنی وەكو گۆرانیبێژ كاری كردووە، لەوانە درامای چارەنووس.
٨- لە ساڵی "٢٠٠٢"وەوە تاكو ئێستا وەكو مامۆستا لە پەیمانگای هونەرە جوانەكانی شەهید جەعفەر لە كۆیە كاردەكا.
٩- وەكو گۆرانیبێژ و كەمانچەژەن بەشداری كردووە لە فێستیڤاڵەكانی پەیمانگای هونەرە جوانەكانی شەهید جەعفەر لە كۆیە.

**عەبدوڵڵا مەجید قادر**

**لەدایكبووی:** ١٩٧٣
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی
**دەستپێك:** ١٩٩٣- تیپی میوزیكی تەق تەق

**چالاكی و بەرهەمەكان:**
١- وەكو مۆسیقاژەن بەشداری لە سەرجەم فێستیڤاڵەكانی تاهیر تۆفیق و سەید برایم كردووە.
٢- لە چەند بەرنامەیەكی كەناڵی كۆیەی تەلەفزیۆنی گەلی كوردستان وەكو مۆسیقاژەن بەشداری كردووە.
٣- دەستەی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای تەق تەق بووە.
٤- لە هەندێ بۆنەی نیشتمانی و جەماوەری بەشداری كردووە.
٥- لە بەرنامەی میلۆدی تەلەفزیۆنی كەركووك وەكو مۆسیقاژەن بەشداری كردووە.
٦- تا ئێستا ١٢٠ بەرهەمی تۆماركراوی هەیە.

**ئاسۆ محەممەد قادر**

**لەدایكبووی:** ١٩٧٥
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای مەڵبەندی ماموستایانی هەولێرە- ١٩٩٧- ١٩٩٨.
**دەستپێك:** ١٩٩٤

**چالاكی و بەرهەمەكان:**
١- وەكو ژەنیار بەشداری كردووە لە تۆماركردنی "٢١" گۆرانی تیپی مۆسیقای تەق تەق.
٢- لە هەندێ بۆنەی نیشتمانی و جەماوەری بەشداری كردووە.
٣- لە بەرنامەی میلۆدی تەلەفزیۆنی كەركووك وەكو مۆسیقاژەن بەشداری كردووە.
٤- لە چەند بەرنامەیەكی كەناڵی كۆیەی تەلەفزیۆنی گەلی كوردستان وەكو مۆسیقاژەن بەشداری كردووە.





٥- چەندین ئاوازی بۆ منداڵان داناوە.
٦- خاوەنی چەند ئاوازێکی تایبەتی خۆیەتی.
٧- دەستەی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای تەق تەق بووە.
٨- سەرۆکی تیپی مۆسیقای تەق تەقە.

**ئاری نادر حەمەد**



**لەدایکبووی:** ١٩٧٧- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٩٦

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- ساڵی ١٩٩٨ دەستەی دامەزرێنەری تیپی سەندیکای هونەرمەندان بووە.
٢- لە ساڵی ١٩٩٩ لەماڵی شەرەفخانی بەدلیسی چەند خولێکی میوزیکی کردۆتەوە.



٣- لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شەهید جەعفەر بووە لە کۆیە.
٤- ماوەیەک سەرۆکی بەشی مۆسیقا بووە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شەهید جەعفەر لە کۆیە.
٥- بۆ ماوەی ٥ ساڵ بەشداری کردووە لە یادکردنەوەی هەڵەبجە.
٦- ماوەی پێنج ساڵ بەشداری کردووە لە فێستیڤاڵەکانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر.
٧- کاری مۆسیقای بۆ چەند شانۆگەرییەک کردووە لەوانە "هێما سەرەتاکانی دۆزەخ، چۆلەکەیەک لەتاو ئازارەکانی سەما دەکات، فرمێسکەکانی مۆم".
٨- چەندین گۆرانی لە ئاواز و هۆنراوەی خۆی تۆمار کردووە، لەوانە: (کۆچ- گوتن، دووری عیشق- ئاواز و گوتن، دڵم نایە بەجێت بێڵم- ئاواز).
٩- مارشێکی تایبەتی بۆ قوتابخانەی چرۆی نموونەیی لە کۆیە داناوە.
١٠- گۆرانی "دەسماڵ"ی حەسەن زیرەکی بە شێوەیەکی نوێ تۆمار کردۆتەوە.
١١- لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان چەند گۆرانییەکی فۆلکلۆری ئامادە و نوێ کردۆتەوە.

**ئامانج محەمەد قادر**



**لەدایکبووی:** ١٩٧٨- سێگردکان
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی کۆیەیە.
**دەستپێک:** ١٩٩٨



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە سالّی ١٩٩٩- ٢٠٠٠ بەشداری کردووە لە ئاهەنگی پەیمانگای تەکنیکی کۆیە.
٢- بەشداری لە سەرجەم فێستیڤاڵەکانی "تاهیر تۆفیق و سەید برایم" کردووە.
٣- وەکو مۆسیقاژەن لە چەند بەرنامەیەکی کەناڵی کۆیەی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان بەشدار بووە.
٤- لە هەندێ بۆنەی نیشتمانی و جەماوەری بەشداری کردووە.
٥- لە بەرنامەی میلۆدی تەلەفزیۆنی کەرکووک وەکو مۆسیقاژەن بەشداری کردووە.
٦- دەستەی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای تەق تەق بووە.

## گۆرانیبێژانی هەولێر

**کاوە عەبدولڕەزاق ئەحمەد**
**(کاوە کاوانی)**





**لەدایکبووی:** ١٩٦٨/٢/١٢
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای باڵای تەل و بێتەل بۆ پۆست- بەغدا
**دەستپێک:** ١٩٨٨

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- لە سالّی ١٩٨٨ لەگەڵ هونەرمەندان (بژار دیلان، باسل سەباح، لوقمان شێخانی) ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای سازان بووە.
٢- لە سالّی ١٩٨٩ لەگەڵ تیپی مۆسیقای سازان چەند گۆرانییەکی فۆلکلۆریان تۆمار کردووە.
٣- لە سالّی ١٩٩٠ لەگەڵ تیپی مۆسیقای سازان چەند بەرهەمێکی نوێیان تۆمار کردووە.
٤- لە سالّی ١٩٩١ لەگەڵ تیپی مۆسیقای سازان یەکەم گۆرانی لەسەر بەرەی کوردستانی بەناوی "ئاڵاکەمان یەکگرتووە" تۆمارکردووە.
٥- لە سالّی "٢٠٠٢"ەوە تا ئێستا لە شاری ئەستەنبۆڵی وڵاتی تورکیا نیشتەجێیە و کۆمپانیای "کاوانی پرۆددکشن"ی دامەزراندووە.
٦- لە شاری ئەستەنبۆڵ یارمەتی چەندین گەنجی هونەرمەندی کوردی داوە و سەرەتای یارمەتییەکانیش بە یارمەتیدانی "زەکەریا عەبدوڵلا" لە ئەلبوومی "ڕۆژگار" دەستی پێکردووە.
٧- لە وڵاتی تورکیا کارئاسانی و کاری بۆ چەندین هونەرمەند کردووە، لەوانە: "هەردی سلاح، ئەیوب عەلی، ماهیر حەمەددەمین، قادر ئەسعەد، هێمن حوسێن، لەیلا فەریقی، عەدنان کەریم، ناسر ڕەزازی، ئالان عومەر، عەزیز سەلام، چۆپی فەتاح، هەیسەم یوسف، کازم ساهیر، جەیلان، عزەدین یلدزهان، نیهاد دۆغان....هتد".
٩- لە وڵاتی تورکیا وەکو ئاوازدانەر تا ئێستا "٢٤" ئاوازی کراوەتە گۆرانی.

## عومەر حەمەدەمین بایزاغا
(هۆمەر دزەیی)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٧- دووگردکان- هەولێر
**دەستپێک:** چلەکان و پەنجاکان
**بەرهەمەکان:**
١- لە ساڵی ١٩٥٤ هەشت گۆرانی لە رادیۆی کوردی لە بەغدا تۆمار کردووە.
٢- لە ساڵانی ١٩٥٧ تا ١٩٥٩ بەشداری لە فێستیڤاڵی لاوان و قوتابیانی مۆسکۆ و ڤیەننا کردووە.
٣- بە ٦ زمان گۆرانی دەڵێ.
٤- کتێبێکی لەسەر حەیران نووسیوە.

## عەبدوڵلا ئیسماعیل کۆیی



**لەدایکبووی:** ١٩٣٤- کۆیە
**دەستپێک:** ١٩٤٧



**بەرهەمەکان:**
١- لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ دامەزراندنی تیپی باواجی کۆیە لە زۆربەی چالاکییەکان بەشدار بووە.
٢- ئەو گۆرانیانەی تۆمار کردووە (پەری عەمرم پەری- شەستەکان، بۆ یارانی- ١٩٧٨، دوو گۆرانی بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا- ١٩٧٢، سەوزەڵێ، ئەسمەرێ).
٣- چەندین سروودی ئایینی تۆمار کردووە.

## ئەندریۆس خەمۆ یۆنان
(باکووری)



**لەدایکبووی:** ١٩٢٨/١١/٥- کۆیە
**پلەی خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی ئینگلیزی لە کۆلیژی بەغدا.
**دەستپێک:** سەرەتای پەنجاکان

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای باواجی کۆیەیە.





٢- هەندێ لە گۆرانییەکانی "سووک بن دەی دەی، هەی زێڕینێ، گۆرانی بەستۆڕە، ئەڵێن جانە، بەهیوای گیانە، کیژۆڵەی ناسک، وەرە لام بژی".
٣- چەندین خولی فێرکردنی مۆسیقای بۆ ئارەزوومەندانی مۆسیقا کردۆتەووە.
٤- ئەندامی بنکەی مەقامە و چەندین خولیان بۆ ئارەزوومەندانی مەقام کردۆتەوە.
٥- لە چەندین بۆنە و یادی تایبەت گۆرانی گوتووە.
٦- بە بەردەوامی لەئێزگەی کوردی بەغدا بە شێوەی راستەوخۆ گۆرانی گوتووە.

## سەلاح محەمەد ئیبراهیم کۆیی
## (مام عەوڵا)



١٩٤٧/٧/١- کۆیە
دەرچووی دووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٥٨ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە

**بەرهەمەکان:**
١- گۆرانی بازان باز قەتار قولینگان هەوایی لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە ١٩٧٢
٢- گۆرانی خەجێ لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر ١٩٧٧
٣- جوانی کوێستان لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر ١٩٧٩
٤- درۆیە گەر بڵێم ئاگام لەخۆیە لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر ١٩٧٩
٥- بەچاوی چاوەڕوانی لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی
٦- وەکو قومری لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی
٧- زیاتر لە (١٠) گۆرانی کلیپکراوی بۆ منداڵانی کورد تۆمار کردووە.

## سادق سەعید ئەحمەد
## (سادق هەریری)



**لەدایکبووی:** ١٩٤٧ هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی خانەی مامۆستایان ١٩٦٩-١٩٧٠.



**دەستپێک:** ١٩٥٥- ١٩٥٦ بە گۆرانییەکانی تاهیر تۆفیق دەست بەکاری هونەری دەکا.

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

لە ژیانیدا تەنها مەقام و گۆرانییەکانی تاهیر تۆفیقی گوتۆتەوە.

لەگەڵ ئەو تیپانەدا گۆرانی گوتووە:

تیپی مۆسیقای هەولێر

تیپی هونەرە میللییەکان

تیپی مۆسیقای باواجی

تیپی مۆسیقای سلێمانی

تیپی مۆسیقای پاشای گەورەی رواندز

**محەمەد قەدری**



**لەدایکبووی:** ١٩٣٨

**دەستپێک:** ١٩٥٧- ١٩٥٨



**بەرهەمەکان:**

١- (٤) ئاوازی بۆ یەحیا مەرجان داناوە.

چەندین ئاوازی بۆ هونەرمەندان داناوە وەکو: (قژی لەمل ئاڵاوە، یار... یار دوێت لەگەڵ غادە سالم، پێکەنە گوڵی بەیان، هەلاڵەی شاخان/ مائدە نزهت، بووک و زاوا/ گوڵبەهار، سوێند ئەخۆم بە کوردستان/ سۆزان محەمەد، کچە کوردە کورە کوردە قوتابی/ غادە سالم، تۆخوا وەرە لاوەکەم/ یارەکەم وەکو بووکە، دەردی دووریت، گوێ بگرە خورپەی دڵم).

**عارەب عوسمان جەرجیس**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٢- تەیراوە- هەولێر

**پلەی خوێندن:** ساڵی ١٩٥٧ لە پۆلی دووی ناوەندی وازی لەخوێندن هێناوە

**دەستپێک:** لە قۆناغی خوێندنی سەرەتایی دەستی بەکاری هونەری کردووە لەژێر دەستی مامۆستا جەمال هیدایەت.



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

گۆرانی بلوێری شوان یەکەم بەرهەمییەتی لە ساڵی ١٩٧٦- ١٩٧٧ تۆماری کردووە.

خاوەنی دوو کاسێتە:

یەکەم"چەند حەیران و بەستە و لاوکێکی فۆلکلۆری کوردییە لە ١٩٩٨ لەخانەی مۆسیقا لە پاریس بەرهەمی هێناوە.

دووەم" لاوک و حەیران و بەستەی فۆلکلۆری لە ساڵی ٢٠٠٥ لە تاران بەرهەمی هێناوە.

لەو فێستیڤاڵانە بەشداری کردووە:

١- میزۆڵ دۆلە میوزیک پاریس- فەرەنسا
٢- سیتی دۆلە میوزیک پاریس- فەرەنسا
٣- فرانک مارتا- جنێڤ
٤- ئۆپێرا ئەدامبارا- ئوسکوتلەندا
٥- شتوتگارت- ئەڵمانیا

**حەسەن سیساوەیی**





**لەدایکبووی:** ١٩٢٦- گوندی ئاری سیرەک- دەڤەری هەریر.

**پلەی خوێندن:** نەخوێندەوارە.

**دەستپێک:** حەفتاکان- لە خەوندا فێری حەیران گوتن بووە.

بەرهەمەکانی: ئەسمەر و مامەر، محەمەد و سێوێ، خەج و سیامەند و چەندین حەیرانی دیکە.

لە زۆر دانیشتن و بۆنەی تایبەت و گشتی حەیرانی گوتووە.

**جەلال سەعید ڕەمەزان**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** سەرەتای حەفتاکان

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

ساڵی ١٩٧٨ گۆرانی چاوی رەشی جوانە تۆمار دەکا و پێی دەناسرێ





لەگەڵ ئەو تیپانەدا کاری کردووە:
١- تیپی هونەری هەولێر
٢- تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێر کە ماوەی ٢٨ ساڵە لەگەڵیان بەردەوامە.
سەردانی وڵاتانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ونەمسا و روسیایان کردووە بۆ ناساندنی هونەری کوردی بەجیهان.
لە چەندین دانیشتنی تایبەت و ئاهەنگەکان گۆرانی گوتووە.

### محەمەد عەزیز قادر



**لەدایکبووی:** ١٩٦٥- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی
**دەستپێک:** ١٩٨٠ لە تیپی لاوانی هەولێر
خاوەنی (١٠) سیدی تایبەتە، وەک (سەفەر، چاوکاڵ، مامۆستای عەشق، بەخێرهاتی، گوڵە نێرگزە)

### سوهام حەسەن



**لەدایکبووی:** ١٩٦٩- کۆیە
**دەستپێک:** ١٩٨٣ لە تیپی هونەرە میللییەکار دامەزراوە.

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
لە شانۆگەری مۆڵەت بۆ یەکەمجار بەشداری کردووە.



٤ سیدی بەرهەم هێناوە (عەشق، ژوان، پەشیمانم، خەون و خولیل)
بەشداری لە ۳۰ شانۆگەری و ٦۰ درامای فیلم کردووە.

**زیاد ئەسعەد مەجید**



**لەدایکبووی:** ۱۹٦٦- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی هەولێر
**دەستپێک:** دوعا ۱۹۸٦

**چالاکی و بەرهەمەکان**

۱- لە ساڵەکانی (۱۹۸۸، ۱۹۹۰،، ۱۹۹۱، ۱۹۹۳، ۱۹۹۸، ۲۰۰۰، ۲۰۰۲، ۲۰۰۳) سیدی تایبەتی خۆی هەبووە.
۲- زیاتر لە ۱۰۰ هۆنراوە و ئاوازی داوەتە هونەرمەندانی کورد و چەندان هونەرمەند لە کارەکانیان پشت بە ئاواز و هۆنراوەکانی ئەو دەبەستن.



۳- لە چەندین کۆنسێرت لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات کاری کردووە.
٤- ئێستا نیشتەجێی وڵاتی سویدە.

**شێروان نورەدین محەمەد**
**(شێروان بێرکۆتی)**



**دەستپێک:** ۱۹۸٦

**چالاکی و بەرهەمەکانک**

۱- لە ساڵی ۱۹۹۱ کاسێتێکی بەناوی لێ لێ خانم بڵاوکردۆتەوە.
۲- تا ساڵی ۱۹۹٦ تیپێکی میوزیکی هەبوو لە ئاهەنگە خێزانییەکان لە هەولێر بەشداری دەکرد.
۳- لە نێوان ساڵی ۱۹۹۱ تا ۱۹۹٦ زیاتر لە "٤" کاسێتی تۆمارکردووە و زیاتر لە "۱٥"شی کلیپ کردووە.
٤- لە ساڵی ۲۰۰٥ ئەلبوومێکی بەناوی "گوڵە خزم" بڵاوکردەوە.



٥- وەکو حەیرانبێژێکی سەرکەوتوو چەند حەیرانێکی تۆمار کردووە.
٦- لە چەندین کۆنسێرت لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان بەشداری کردووە.

**هاوتا ئەسعەد مەجید**



**لەدایکبووی:** ١٩٦١- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی لە بەغدا
**دەستپێک:** هەی شیرینێ و خانم ١٩٨٧

**بەرهەم و چالاکییەکان:**
* ١٩٨٨ لەگەڵ تیپی پاشای گەورەی رواندز یەکەم کاسێتی بلاوکردۆتەوە
* خاوەنی چەندین سیدییە.
* لە ساڵی ٢٠٠٩ چەندین گۆرانی ئایینی و نیشتمانی تۆمارو بلاوکردەوە.



**دانا عەبدولجەبار شەوکەت**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٩
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی
**دەستپێک:** ١٩٨٧

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- لە چەندین کۆنسێرت و بەرنامەی تایبەت بەشداری کردووە.
٢- چەندین گۆرانی بە شێوەی سینگڵ "تاک تاک" تۆمار کردووە.
٣- تا ئێستا "٧" ئەلبوومی گۆرانی بلاوکردۆتەوە، لەوانە:
ا- لە ساڵی ١٩٩٠ ئەلبوومی یەکەمی بلاوکردۆتەوە.
ب- لە ساڵی ١٩٩٣ ئەلبوومی دووەمی خۆی بەناوی "جێم مەهێڵە" بلاوکردۆتەوە.
ج- لە ساڵی ١٩٩٦ ئەلبوومی سێیەمی خۆی بلاوکردۆتەوە.



د- لە ساڵی ٢٠٠٠ ئەلبوومی چوارەمی خۆی بەناوی "قەدەر" بڵاوکردۆتەوە.
هـ- لە ساڵی ٢٠٠٢ ئەلبوومی پێنجەمی خۆی بەناوی "سەمای دڵ" بڵاوکردۆتەوە.
و- لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەلبوومی شەشەمی خۆی بەناوی "دیاری" بڵاوکردۆتەوە.
ز- لە ساڵی ٢٠٠٦ ئەلبوومی حەوتەمی خۆی بەناوی "تۆ گوڵ نەبووی" بڵاوکردۆتەوە.

## زەکەریا عەبدوڵڵا



**لەدایکبووی:** ١٩٧٦
**پلەی خوێندن:**
**دەستپێک:** ١٩٩٣
**بەرهەم و چالاکییەکان:**

لە سەردەمی منداڵیدا زۆربەی کات و خولیای خۆی بە مۆسیقا بە سەر بردووە. ئەو لەبنەماڵەیەکدا گەورە بوو کە مۆسیقایان بە مەزنترین هۆگری خۆیان دادەنا.

لە ساڵی ١٩٩٣ کۆچی کرد بۆ سوید و کاری مۆسیقای دەست پێ کرد، هەر لە وێ دەستی بە ژەنینی کیبۆرد کرد لە گەڵ سترانبێژانی ناوداری کورد، لە ساڵی ١٩٩٨ یەکەم ئەلبوومی خۆی بە ناوی "تۆ هاتی" بڵاو کرد و بوو بە سەکۆیەکی پەرینەوە بۆ ناو دونیای مۆسیقا و توانی ناوی خۆی لە وێدا دیاری بکات.

لە ساڵی ٢٠٠٠ دووەمین ئالبوومی بەناوی "بگەڕێوە" بڵاو کردەوە، پاشان پەرەی بە کارەکانی دا و بە هۆی بڵاوکردنەوەی ئاڵبوومی "دایە" لە ساڵی ٢٠٠١ دا زیاتر لە



ملیۆنێک لایەنگری کوردی پەیدا کرد. هەر لەوە بە دواوە گەشەسەندن و پێشکەوتنی بەردەوامی هەبووە تا ئەو رادەیە کە هەموو کات بە ئاسانی دەیتوانی لایەنگرانی زۆر لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٢ ئاڵبوومە نوقرەییەکەی خۆی بە ناوی "رۆژگار" بڵاو کردەوە و هەموو لایەنگرانی مۆسیقای کوردستانی بۆ لای خۆی راکێشا. ئەم ئالبوومە تا ئێستا ١.٥ ملیۆن کۆپی لێ کراوە و بووەتە ئالبوومی نوقرەیی ئەو لە کوردستان. بە هۆی ئەم ئالبوومەوە لایەنگرانی زۆری لە کوردستان پەیدا کرد کە 14 ستران لە خۆی دەگرێ و هەروەها کلیپ و ڤیدیۆی زۆری بۆ سترانەکانی کردووە و لە هەموو کەناڵە کوردیەکانی وەکوو Kurdistan TV و KURDsat بڵاو دەکرێنەوە و تەنانەت لە ئەستێرەیەکی هونەریش گەورەتر و رێزدارتر بووە.

زەکەریا بەبوون بەئەستێرە قەناعەتی نەکردووە و ئالبوومی "تیلیناز" ی لە ساڵی ٢٠٠٤ بڵاو کردەوە کە بوو بە ئالبوومی زێڕینی زەکەریا کە لە کوردستان سێ ملیۆن کۆپی لێ بڵاو کرایەوە، زەکەریا لایەنگری لاوی زۆری هەیە، بەڵام لایەنگرانی مۆسیقاکەی لە هەموو تەمەنێک دەگرنە خۆ.

دوایین ئالبوومی (گەنجی پیر)ە، کە لەگەڵ دەسپێکردنی ساڵی نوێی ٢٠٠٧ بڵاو کرایەوەو تیایدا هەوڵی داوە لەهەموو روویەکەوە چ وەک مۆسیقا، چ وەک تەکنیک و تەکستی گۆرانییەکان شێوازێکی تازە و هەندێک جیاواز لە بەرهەمەکانی پێشووی پێشکەش بکات.

ئەم بەرهەمە کە دوای چاوەڕوانییەکی زۆر هات، هەر لەگەڵ یەکەم بڵاوبوونەوەی لەهەموو ناوەند و شوێنە

گشتییەکاندا لەکوردستان بوونی خۆی سەپاند و وای لێ هات روو بکەیتە هەر شوێنێکی کوردستان گوێبیستی دەبیت، تەلەفزیۆن و رادیۆکانی کوردستانیش بە شێوەیەکی زۆر فراوان و بەربلاو گۆرانییەکانی ئەم ئالبوومە تازەیەی زەکەریا پەخش و بلاو دەکەنەوە.

وێرای هۆنراوەکانی شالاو عەلی کە لەهەموو ئالبوومەکانی زەکەریادا جێ پەنجەی بەرچاو و دیارە، لەم بەرهەمەدا بۆ جاری یەکەم لەکۆی ١٢ گۆرانی: نۆ هۆنراوەی سامی ئەرگۆشی کردووەتە گۆرانی کە ناوی ئالبوومەکە (گەنجی پیر) و کلیپی (گولێ) دوو لەو هۆنراوانەن.

بەپێی ژمارەی فرۆشراوی بەرهەمەکە، نێوەندە هونەرییەکان لەو باوەڕەدان ئالبوومی تازەی زەکەریا دەبێتە پرفرۆشترین ئالبوومی.

* لە سالّی ٥/ ٢٠٠٨/١٠ وەکو تاکە گۆرانیبێژی کورد بەشداری کرد لە فێستیڤاڵێکی گەورە لە سوید.
* چەندین کۆنسێرتی گۆرانی لە شارەکانی کوردستان و ولاتانی جیهانی سازکردووە.
* لە ٢٠٠٨/١١/٢٧ وەکو هونەرمەندێکی سەرکەوتوو رێزی لێنرا.



٢- وەکو میوزیکژەن لە چەندین کۆنسێرت و بۆنەی تایبەت و بەرنامەی تەلەفزیۆنی بەشداری کردووە.
٣- وەکو گۆرانیبێژ لە چەندین کۆنسێرت لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان بەشداری کردووە.
٤- بەشی زۆری هۆنراوەی بەرهەمەکانی هی خۆیەتی.
٥- ئاوازی بۆ چەندین گۆرانیبێژی لاو داناوە، وەکو "گۆران سالّح، تارق زیاد و چەندانی دیکە".

## هەردی سلاح



**لەدایکبووی:** ١٩٨١
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان
**دەستپێک:** ١٩٩٤

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- خاوەنی سێ ئەلبوومی گۆرانییە وەک "دلّی من، من و تۆ، تۆیە".

## عوسمان عەبدوللا



**لەدایکبووی:** ١٩٧٨
**پلەی خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای مامۆستایان
بەکالۆریۆس لە کۆلیژی پەروەردە- کوردی
**دەستپێک:** ١٩٩٩

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

سەرەتایی کاری هونەری دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٩٩) بە تۆمارکردنی گۆرانی"ئەبێ چی بێ" کە لە ئاوازی خۆی بۆ، هۆنراوەی "مەدهۆش"بوو، مۆسیقا "ئەحمەد چاوشین" بوو، دوای هەمان ساڵ گۆرانی"گومان"ی تۆمارکرد کە لە ئاوازی خۆی و هۆنراوەی "فەرید زامدار" و مۆسیقا"ئەحمەد چاوشین" بوو.

دوایی لە ساڵی (٢٠٠١) گۆرانی "شەکرە سێو"ی مامۆستا عەلی مەردانی تۆمارکرد بە ئاوازێکی تر کە لە ئاوازی خۆی و مۆسیقای "هێمن حسێن" بوو، پاشان ئەلبوومی"خاک"ی لە ساڵی (٢٠٠٣) بلاوکردەوە کە خۆی لە (١٠) گۆرانی گرتبوو کۆکراوەیی بەرهەمەکانی پێشوو بوو.

لە کارەساتە دڵتەزێنەکەی (١) ی شوبات دا وەک هونەرمەندیک سروودێکی تۆمارکرد بە ناوی "نامەیەک لە شەهیدەوە" کە لە ئاوازی خۆی و هۆنراوەی "بەختیار بەرزنجی" و مۆسیقای "ئەحمەد چاوشین" بوو.

لە ساڵی (٢٠٠٤) توانی چوار گۆرانی لە سیدییەکدا کۆبکاتەوە بە ناوی "گوڵستانی خۆزگەکان" بلاوکرایەوە، تا ئێستاش خاوەنی (١٤) گۆرانی و سروودێکە، وە هەروەها خاوەنی (٧) کلیپە لە سەرجەم راگەیاندنەکانی کوردی دا.

لەمانگی (٥) ی (٢٠٠٥) کۆنسەرتێکی بە ناوی "سێبەری سۆز" لە هۆڵی میدیا لە شاری هەولێر ئەنجامدا، کە لەسەر ئاستی زانکۆی سەلاحەدین بوو ئەم کۆنسێرتە "١٠" گۆرانی و مەقامێکی پێشکەش کرد لەگەڵ زۆربەی ژەنیارە دەستلێهاتووەکانی ئەم شارە وەکو"ئاراس کوێی و زانا قانون، هەڵبەست سەلاح، سۆران دەف، موکریانی چەلۆ، ئاراس کەمان، چەندین ژەنیاری تر، کەلەبەر لەوەش کۆنسێرتێکی تری سازدا بوو بە ناوی "ئازادی" لەکاتی ئازاد کردنی عیراق و شارە داگیرکراوەکانمان دا،

دواین کۆنسێرتی لە ٢٠٠٦/١/٤ لە گەڵ چەند هونەرمەندێکی بەرێز (دڵنیا قەرەداخی و ئالان عومەر) سازکرا.

لە رێکەوتی ٢٠٠٩/٤/٨ بە یەکجاری وازی لە گۆرانی گوتن هێنا.

**خۆشەوی عەزیز خدر**



**لەدایکبووی:** ١٩٧٢
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** کۆتایی نەوەدەکاان

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- گۆرانی تایتڵی بۆ شەش درامای تەلەفزیۆنی گوتووە.
٢- خاوەنی یەک ئەلبوومی تایبەتە بەناوی (زوڵفت).
٣- زیاتر لە دوازدە گۆرانی بە شێوەی تاک تۆمارکردووە.



## هونەرمەندە تورکمانەکان

### جەمیل ئیبراهیم محەمەد
### (جەمیل قاپقاپچی)



**لەدایکبووی:** ١٩٠٤- هەولێر
**پلەی خوێندن:** خوێندەواری نییە
**دەستپێک:** ١٩١٦

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- بەشداری لە مەولود خوێندنەوە کردووە.
٢- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی فۆلکلۆری دیکەی گوتووە و لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ بەشداری کردووە.

### شەوکەت سەعید ئیبراهیم
### (مشکۆ)





**لەدایکبووی:** ١٩١٥- هەولێر
**پلەی خوێندن:** خوێندەواری نییە
**دەستپێک:** لە منداڵییەوە حەزی لە گۆرانی گوتن بووە

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لەگەڵ گۆرانیبێژانی تورکمان و کورد بەشداری کردووە.
٢- زۆر مەقام و قۆریات و کەردەم و گۆرانی فۆلکلۆری گوتووە.
٣- زیاتر لە هەزار کاسێتی تۆمار کردووە.

### حەمید مەجید میکائیل
### (حەمید کورەچی)



**لەدایکبووی:** ١٩١٩- هەولێر
**پلەی خوێندن:** خوێندەواری نییە.
**دەستپێک:** تەمەنی منداڵی

**چالاكی و بەرهەمەكان:**
چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی دیکەی گوتووە و لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ بەشداری کردووە.

**حەیدەر عەبدولرەحمان حوسێن**
**(حەیدەرە كەچەڵ)**



**لەدایكبووی:** ١٩٢٦- هەولێر
**پلەی خوێندن:** خوێندەواری نییە
**دەستپێك:** کۆتایی سییەکان
**چالاكی و بەرهەمەكان:**
هەر لە منداڵییەوە حەزی لە گۆرانی گوتن بووە، لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لەگەڵ گۆرانیبێژانی کورد و تورکمان بەشداری کردووە و چەندین مەقام و قۆریات و کەردم و گۆرانی فۆلکلۆری گوتووە.

**یونس شاكر مەجید**
**(یونس خەتات)**



**لەدایكبووی:** ١٩٣٣- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێك:** ١٩٥٩- رادیۆی بەغدا/ بەشی تورکمانی

**بەرهەم و چالاكییەكان:**
١- غەریب قالدیم
٢- بابا عەبدولقادر
٣- بەس صیزلاما کەمەنجەم
٤- شاهدتی بانا
٥- یاواش یاواش
٦- بویلە دەگیل
٧- عەیب نەدی عەیبتی
٨- باجی
٩- کردم هاواسی
١٠- مقام جەمال
١١- بولبول گیی
١٢- ئەی هاوار ئەی باغوانچی
١٣- قالا
١٤- یارا
١٥- یەنگی سەنی سەومیشەم
١٦- ئاوازی بۆ هونەرمەندان یونس مەحمود و جاسم لەتیف داناوە.
١٧- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**نوردین نادر محەمەد**
**(نوردین عەسافلی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٢٨- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٥٩- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- اربیل قلعەسی
٢- قەنەفیل
٣- چماغیردیم ئەی واتانیم
٤- یەشیل گوزلرین
٥- بەکلەمە
٦- نصیحت
٧- شرف بنردە شان بنردە
٨- انا بیر قیز گوردوم بەلیندە قورشاغ
٩- چەندەها مەقام و گۆرانی تر
١٠- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**محەمەد ئەحمەد شێخە**
**(محەمەد ئەحمەد ئەربیللی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٣٣- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٥٩- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- مەن سەنی سەودیم
٢- گون باتارکەن



٣- قیزلار
٤- شوفیر
٥- مەنیم ایپەک یاغلیغیم وار
٦- غەریبەم
٧- سەیراندا
٨- گول یاریم
٩- نە دەدیم گوزەل سانا
١٠- گوزلری ماوی
١١- جمالیو گوردوم
١٢- مەن یولدا بیر قیز گوردوم
١٣- هلال قاشلی
١٤- خاستاخانە اولدو مەنیم مسکینم
١٥- گەلین
١٦- تلفزیون
١٧- املیم حیاتیم
١٨- گەنە گەلین
١٩- ابی شوفیر
٢٠- نافورا
٢١- گیدین باخین نەدەندی
٢٢- ایربلیغ ایستە مەدەن
٢٣- مەن اربیلدەن چیختیم
٢٤- گوزەل قیزگەل یانیما
٢٥- امان گوزوم التونجو
٢٦- صامانجی قیزی
٢٧- ایربلدیم نازلی یاریمنان
٢٨- گوزەل گیتمە قال بوردا
٢٩- سەنیو کیمین دەگیلەم

٣٠- اسمریم
٣١- اولدوم
٣٢- ئاوازی بۆ هونەرمەندان (یونس مەحمود، جەبار ئەحمەد، سەدرەدین کورەچی، نەجات تونجو، عەبدوللا خەتات، غانم فەتاح ئەربیللی) داناوە.
٣٣- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات بەشداری کردووە.

**فائیق محەمەد سوڵتان**
**(فائیق بازرگان)**



**لەدایکبووی:** ١٩١٨- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دستپێک:** ١٩٥٩- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- مقام صبا- گوز یاشیمی سیلەن یوخ
٢- اربیل بەستەسی



٣- مقام حجاز/ ایشتە باخ ئەی سەوگیلی
٤- بەکلەتمەوین
٥- بەنی جاندان اوصاندیری
٦- قارشیمدا گون صارالدی
٧- گوزەل یارا باخ
٨- اغام دا ایندی گەل
٩- مقام ناری/ عقاب ئەتقەین دوستلار
١٠- مقام حجاز/ جانا
١١- چەندەها مەقام و گۆرانی تر.
١٢- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لەگەڵ گۆرانیبێژانی تورکمانی هەولێر و کەرکوک بەشداری کردووە.

**محەمەد ئیبراهیم عاشق**
**(محەمەد عاشق)**



**لەدایکبووی:** ١٩٣٤- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دستپێک:** ١٩٦١- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- مەقام بەیات- اخ بەن سەنین ئەلیندەن
٢- گوزدلیم چوخ گوزەلسەن
٣- مەقام بەیات/ بیرگوروشتە عاشق اولدم
٤- چەندەها مەقام و قۆریات و کەردم و گۆرانی فۆلکلۆری تر.

## جاسم لەتیف عەبدوڵلا



**لەدایکبووی:** ١٩٤٧- هەولێر

**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی

**دەستپێک:** ١٩٦٣- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- سەودیم بیرگوزەل یاری
٢- نازلی یار
٣- گەلی تاریم
٤- اننه
٥- عشقین شرابی
٦- دورغون عاشق
٧- کوستوردوم
٨- گیدەرکەن مەت یولوما
٩- مکتوب
١٠- گوزول یاریم گوروم سەنی
١١- سەودیم بیر صاری صاچلی
١٢- گەجەلر بیلدیز سایاریم
١٣- سەنی سەودیم
١٤- چەندەها قۆریات و گۆرانی دیکەی گوتووە و لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ بەشداری کردووە.

## جەبار ئەحمەد شێخە
## (جەبار ئەحمەد ئەربیللی)



**لەدایکبووی:** ١٩٤٣- هەولێر

**پلەی خوێندن:** خوێندەواری نییە

**دەستپێک:** ١٩٦٧- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- مقام بیات/ باهار اولور یەشیل اولور شود اغلار
٢- سوزلربوە اینانمارام
٣- یالانجی
٤- اخ یاریم
٥- یار کورستمه
٦- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی دیکەی گوتووە و لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ بەشداری کردووە.

## یونس مەحمود چەلەبی





**لەدایکبووی:** ۱۹٤۰- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ۱۹٦۹- رادیۆی بەغدا/ بەشی تورکمانی

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

۱- مەقام بەیات/ سەوردەیم بیر گوزەلی
۲- هەلە یاریم هەلە
۳- مەقام حیجاز/ چانتام ئەلمیدە
٤- گرزەن خاللی
٥- واتان سەوگیسی
٦- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی تر.
۷- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**فوئاد عوسمان عەلی**
**(فوئاد عوسمان ئەربیللی)**



**لەدایکبووی:** ۱۹۳۹- بەغدا
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە بەشی مۆسیقای پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا
**دەستپێک:** ۱۹۷۳- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی

**بەرهەم و چالاکییەکان**

۱- سەوبیوروم
۲- اونوتتوم
۳- اومید
٤- سەوگی باهاری
٥- صوچ موباپتیم
٦- دەگیشمەم
۷- سەنی گوروم
۸- گەنجلیغ بیزدە ئەی وەڵلا دەدی
۹- اربیلیم
۱۰- چەندین ئاوازی بۆ هونەرمەندە تورکمانەکان داناوە.

**یەشار شەوکەت سەعید**
**(یەشار مشکۆ)**



**لەدایکبووی:** ۱۹٥۰- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ۱۹۷٥- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

۱- اربیل شهدی
۲- گوزەلدی اربیل گەلینی
۳- حیرانام گوزەل یارا
٤- نەلردەدیو قارشیمدا

٥- ئەسکی شهریم
٦- شاولیق بەنیمدیر
٧- سەودا
٨- یار ئەیلەمەنی
٩- یەمەکلر تابلوسو
١٠- یالنیز دەگیلیم
١١- وای نەدەدیم
١٢- یارا دەدیم
١٣- سەوەردم سەنی
١٤- ئەی شاولیغ
١٥- قیز سەندەکی
١٦- بایرام
١٧- قیز
١٨- گوزەلیم
١٩- اوتوبدا
٢٠- ایریلیغ
٢١- دالما بالام دالما
٢٢- سەنیو اودیو
٢٣- اوغول
٢٤- امان یاریم بونە ایشتی
٢٥- گەلەنە یار گەلەنە
٢٦- ئاوازی بۆ هونەرمەندان (سەدرەدین کورەچی، موراد یەشار) داناوە.
٢٧- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانی لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات بەشداری کردووە.

**سالم فەتاح پیرداود**





**لەدایکبووی:** ١٩٥٤- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٧٦- بەشی تورکمانی رادیۆی بەغدا

**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- یاغیمیز
٢- بیرگون یولوم دوشتو کویە
٣- گەنە ئەستی گوزەللرین روزگاری
٤- سەن
٥- گەلەمەنە
٦- ساناچوخ دددیم
٧- هانی سەن
٨- جانان شیرین
٩- اندیمیز
١٠- ئولەز عشقیم
١١- عشقینا چاریار گیولیم
١٢- باریشماغ
١٣- کمیسەسیزەم مەن
١٤- عشقا دالدیم
١٥- ئەللر بیلمە سین
١٦- یەربو اوسکەک
١٧- سەودیم سەنی
١٨- گەلینم
١٩- چەندەها مەقام و غەزەل و قوریات و گۆرانی تر.
٢٠- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لەناوەوە و دەرەوەی وڵات گۆرانی گوتووە.

## غانم فەتاح پیرداود
## (غانم فەتاح ئەربیللی)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٦- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی
**دەستپێک:** ١٩٧٩- تەلەفزیۆنی کەرکووک
**چالاکی و بەرهەمەکان:**
١- عاف ئەت مەنی
٢- وار گونومدە
٣- دویما دیو هاواریمی
٤- اونوت بەنی
٥- بیرخاندا
٦- گوزیریو
٧- سەن گیدەلی ئەی نەنە
٨- قاووشماغ
٩- زامان
١٠- سویلە گونولە یەتەر
١١- قدەریم
١٢- باغلی باختیم
١٣- شهلا گوزلوم
١٤- اوموتلار پاریدا قالدی
١٥- اجیمادین
١٦- باهار اولدو
١٧- گونلوم دەریەدەر اولدو
١٨- نەخایدا ای نە خایدا
١٩- تومور جوقلار
٢٠- پەروانە گەزەر چیراغ باشیندا



٢١- گوزیریمین یا شیبیلا سانا مکتوب یازاریم
٢٢- باخ گوزەلیم حالیم نولدو
٢٣- نەنە سەنسیز مەن یاشا بیلمەن
٢٤- اسلام دیبە بیز یا شاریخ
٢٥- یارب بیزی عاف ئەیلە
٢٦- یا محەمەد ئەی مبارک دینیمیزین سرودەری
٢٧- ئاوازی بۆ هونەرمەندان (یونس توتونجو، رزگار فیتەر، موزەفەر سەلیم، محەمەد عیماد) داناوە.
٢٨- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات بەشداری کردووە.

## نەجات ئیسماعیل حوسێن
## (نەجات ئالتونچی)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٧- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٨٦- رادیۆی بەغدا- بەشی تورکمانی



**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- ئەلیمدە دەگی
٢- گەنە خبر یوخ سەننەن
٣- بوتویون گەلینی
٤- گەل مەنیم اول
٥- گەنە
٦- یولجولوغ بەستەسی
٧- یاراگیدەییم
٨- عشقا دالدیم
٩- اونوتمام سەنی
١٠- جانانیم
١١- یەتمەدیم و صالامەن
١٢- التون کەمەر
١٣- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی تر.
١٤- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**یونس جەلیل خەلیل**
**(یونس توتونجو)**





**لەدایکبووی:** ١٩٨٠- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- سەوگی ایشەر
٢- سەودیم سەنی
٣- گەلیردە
٤- نەنە
٥- حسرەت یوواسی
٦- قیز
٧- نەلردەسەم
٨- گەل سورمەنی
٩- دەمەوین
١٠- اربیل قیزی
١١- بیر دەگەل
١٢- دە دیلەر
١٣- سەندەن صونرا
١٤- دورغونام ورغون
١٥- یارمەن اولایدیم
١٦- بو دونیا
١٧- گور
١٨- اولونجا
١٩- گومون مەنی
٢٠- گەرچەک
٢١- غوربەت
٢٢- یورغون یورغون
٢٣- ئەلی قیربلسین

٢٤- مەن نەجەسەو مەم سەنی
٢٥- حیات اورتاغیم
٢٦- نەدەن ایریلدیو
٢٧- سودوم سەنی
٢٨- عزیز قارداش
٢٩- حسرەتیم
٣٠- دون بالام

**فوئاد شەهاب سدیق**
**(فوئاد ترزی)**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٤- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- هەنمدی
٢- بەستی گیویل
٣- گەل بیراخ گیویل
٤- نەنە
٥- سەوگیمیز
٦- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی تر.
٧- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**عەبدوڵڵا غەفوور کەریم**
**(عەبدوڵڵا خەتات)**



**لەدایکبووی:** ١٩٥٩- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- بیر دونیامیز واریدی
٢- سەودیم سەنی
٣- مەن عەشقی
٤- گولگەلی دالدا
٥- عاشقام گەزیردم
٦- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی دیکە.
٧- لە زۆر ئاهەنگ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.





### سەدرەدین خالید رەشید
### (سەدرەدین کورەچی)



**لەدایکبووی:** ١٩٧٠- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- هەولێر- رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- هوروکلریو
٢- جان جان
٣- بەیاز صدف دیشلریو
٤- قارداشلیغ تورکوسو
٥- باشیمدا صاچ بەیاز اولدو
٦- سەنی گوردوم
٧- نەردەسەن گوزەل سەسلەنیم
٨- غوربەت
٩- بیر نەنە بالا سیچین اغلیری
١٠- بەستی گیویل
١١- سەوینجە دوندو
١٢- بیرگوزو گوزەلی
١٣- یوجە داغ باشیندا
١٤- بیر باخیشتا
١٥- بازیف الداندیم
١٦- سەنین گیبی
١٧- گیتی گەنچلیغ
١٨- عاشق اولوبسان
١٩- گەل
٢٠- ئولسون بوغوربەت
٢١- قالیر



٢٢- عشقیمیز بیتمەسین
٢٣- کویلوم
٢٤- چەندەها مەقام و گۆرانی تر.
٢٥- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانی لەناوەوە و دەرەوەی وڵات بەشداری کردووە و گۆرانی گوتووە.

### سەردار ئیحسان رەحمەتوڵڵا



**لەدایکبووی:** ١٩٧٠- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- هەولێر/ رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- سەلەوین
٢- سەومەنی سەومەنی
٣- ئوز ئوزومە
٤- گەل سەومەنی
٥- وەفا صوردوم



٦- باشا تاختی گەلین تاجی
٧- قدەر سوندوردو عشقین چیراغین
٨- چالیم چوخ یامان
٩- بتیتی
١٠- اوزاغ اولدوو
١١- بیلمیردم
١٢- سویلە نەزامان
١٣- قاراو جدانلی
١٤- وەفاسیز سەوگیلیم
١٥- گەلین
١٦- دوغوم گونو
١٧- بوشا گبتتی
١٨- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی تر.
١٩- لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا بەشداری کردووە.

**ئازاد بەهجەت عەساف**
**(ئازاد بەهجەت قەساب)**



**لەدایکبووی:** ١٩٦٦- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی ناوەندی
**دەستپێک:** ١٩٩٤- رادیۆی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- گەل ئەی
٢- قدەردەن
٣- عاف ئەتمەم سەنی
٤- سەوگییە قوناع
٥- چەندەها مقام و قۆریات و گۆرانی تر.
٦- لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ و دانیشتنی گۆرانیدا لەگەڵ گۆرانیبێژانی تورکمانی بەشداری کردووە.

**جەلال ئەحمەد شێخە**
**(جەلال حردان)**



**لەدایکبووی:** ١٩٣٧- هەولێر
**پلەی خوێندن:** دەرچووی سەرەتایی
**دەستپێک:** ١٩٩٦- تەلەفزیۆنی تورکمان ئیلی
**چالاکی و بەرهەمەکان:**

١- بەن شەهیدی بادەییم
٢- قارشیکی داغلار
٣- یەری یەری یولومدا دورحا
٤- قارشی
٥- گەلیردم
٦- اویناسین
٧- چەندەها مەقام و قۆریات و گۆرانی دیکەی گوتووە و لەزۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵ بەشداری کردووە.

## بیۆگرافیای شێوەکارانی هەولێر

**سلێمان شاکر**



**لەدایکبووی:** ١٩٣٥/٤/٢- گوێر
**پلەی خوێندن:** دبلۆم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا
**دەسپێک:** ١٩٥٢

**چالاکی بەرهەمەکانیان:**

١- ماوەی چەند ساڵێک مامۆستا بووە لە شارەکانی کوردستان
٢- ١٩٥٢ بۆ یەکەم جار بەشداریم کرد لە پێشانگا گشتییەکەی کە بەڕێوبەرایەتی (معارفی) هەولێر سازی دابوو.
٣- لە وێنەگایەکەی خۆم خەریکی کاری هونەریم و گەلەرییەکی تایبەت بە خۆم بنیادکردووە و پێشانگایەکی بەردەوامی تایبەت بەخۆمی تێدا نمایش کراوە هەموو رۆژانی دووشەمە و سێ شەمە بەیانیان و پاش نیوەڕۆیان کراوەتەوە لە حەفتەیەکدا.

**کورتەی جم و جۆڵەکانی هونەریم:**

١- ١٩٦٧- دامەزرێنەر و سەرۆکی تیپی نوێی کورد بووم لە هەولێر.
٢- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی عێراق و کۆمەڵەی شێوەکارانی عێراق بووم.
٣- ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستان بووم.
٤- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان بووم.

لە ساڵانی ١٩٥٢- ٢٠٠٧ بەشداریم کردووە لە



پێشانگای بە کۆمەڵ لە هەولێر و سلێمانی و دهۆک و کەرکووک و کۆیێ و بەغدا و ناسریە. هەروەها پۆلۆنیاو یابان.

**چەند تابلۆیەکم لەم ولاتانە هەیە:**
بەریتانیا و ئەلمانیا و فەرەنسا و پۆلۆنیا و یابان و ئەمریکا.

**(عەبدولکریم ئەحمەد عەبدولرەزاق)**
**کەریم دیار**



**لەدایکبووی:** ١٩٤٢ کێشکێ سەر بەقەزای کۆیێ
**پلەی خوێندن:**
**دەسپێک:** لە ١٩٥٣ دەستم بەکاری شێوەکاری کرد بە شێوەیەکی ساکار.

